# نهج البلاغة






## بەکوردی

وتار و نامە و وتەکانی میری بڕواداران

عەلی کوڕی ئەبوتالیب

وەرگێڕانی
مەلا عبداللطیف بامۆکی



# نهج البلاغة

# به كوردى

## ڕێبازی ڕەوانبێژیی

## وتار و نامه و وته‌كانی میری باوه‌ڕداران

## عه‌لی كوڕی ئه‌بی تالیب


كۆكردنه‌وه‌ی

**شه‌ریف ئه‌لڕه‌زی**

پێشه‌كی و شیكردنه‌وه‌ی

**محه‌مه‌د عه‌بده‌**

به‌ كوردیكردنی

**عبداللطيف بامۆكی**




نـــــاوی کتێـــــب : نهج البلاغة بە کوردی (ڕێبازی رەوانبێژی) وتار و نامـە و وتەکانی میری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالیب

کۆکردنـــــــــەوەی: شەریف ئەلرەزی

پێشەکی و شیکردنەوەی: محەمەد عەبدە

بــە کـــوردی کردنـــی: عەبدوللەتیف باموٚکی

وردبینی و راستکردنەوە ئارام باموٚکی

پێداچوونەوەی زمانەوانی ئاری عەبدوللەتیف

چــاپ و بڵاوکردنــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

تایـــــــــپ: شاخەوان غەریب – جیهاد غەریب

دیزاینـــــی نـــاوەوە : نووسینگەی هیوا

خـــــــــــەت: نـــەوزاد کۆیـــی

بـــــــــــەرگ : بەرگ ئەمین مخلص

نـــۆرە و ســـاڵی چـــاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز

تـــــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

له بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی گشتی سلێمانی ژمارەی سپاردنی ( ١٦٩٤ ) ی ساڵی ٢٠١٠ دراوەتێ

بۆبڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر لوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ – ١٣٨٧٢٩١ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

**www.al-tafseer.com**

**( أنا مدينة العلم ، و علي بابها )**

أخرجه ابن جرير الطبري في (تهذيب الآثار)

والطبراني في (المعجم الكبير) والحاكم (١٢٦/٣).

**واته :**

**من شاری زانستم و عەلی دەرگاکەیەتی.**

شێخ محمد ناصرالدين الالبانی لە کتێبی (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة) بەرگی (٦) لە لاپەڕە (٥١٨-٥١٩) دەڵێ ئەم قسەیە بە زمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵبەستراو (موضوع)ە

**( نوسینگەی تەفسیر )**

## چەند دێڕێك لە تایبەتمەندییەكانی پێشەوا عەلی

* یەكەم كەس و دووەم كەس بوو، كە لە ناو ماڵی كەعبەدا لەدایك بێت.
* نە بە منداڵیی و نە بە گەورەیی، كڕنووشی بۆ بت نەبردووە.
* یەكەم منداڵ بووە، كە باوەڕی بە پێغەمبەر هێناوە،
سێیەم كەس بووە، لە پاش خەدیجە و ئەبوبەكر.
* زاوای پێغەمبەرو ئامۆزای میرات بەیەك ڕەوا بوون .
* لە كێبەركێی نێوان خانەوادەی پێغەمبەرو خەڵكی تردا.
* كۆدەنگیی هەیە لەناو هەموو موسڵمانانـدا، كە خەلیفەی ڕاشیدە.
* عەلی و فاتیمەو حەسەن و حسەین بە خانەوادەی پێغەمبەر دانراون[١] .

---

[١] هەروەها خێزانەكانی پێغەمبەرو منداڵەكانی بە (أهل البيت) دانراون، وەك ڕازی لە (تفسير الرازي) لە بەرگی ٢٥ لاپەڕە ٢٠٩ وایگوتوە . (بلاوكار)

# پێش خوێندنەوە...

لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسەی وەرگێڕان و کوردانـدنی ئـەم شـاکارەی پێـشەوا عەلی لەلایەن باوك و مامی گەورەمان مامۆستا مەلا لـەتیفی بـامۆکی، کـە هـەمووومان بە (باوەمەلا) بانگی دەکەین، هاوڕێی بووین و کەم تا زۆر، ئاگامان لە شەونخوونیی و هەوڵە چڕ و بەردەوامەکانی بووە، بۆچی نا، ئێمە کـە پـەروەردەی دەسـتی ئـەو زاتـە دڵسۆز و ڕۆشنبیرە مێژوویيە بین، هەر دەبێ نەك لە گەڵیـدا بـژین، بـەڵکو لـە نـاخی پڕ لە هاژەیشیدا بـین و تێکـەڵ بـین بـە دەسـت و پەنجـە و ڕۆحـی مانـدووی، لەگـەڵ تەواو بوونی وەرگێڕانەکەیدا ئیدی ئیشی قورسی ئێمەش دەستی پێکرد، بـڕوا بکـەن تا نزیکەی هەشت مانگ، ئێمە لـە بیرمـان چووبووییەوە خـەو تـامی چۆنـە، جـاری وا هەبووە بۆ وشەیەك، یان دێڕێك، دوو ڕۆژ دەوەستاین و بیرمان لە وشەیەکی باشـتر و زاراوەیەکی شایستەتر دەکردەوە، هەر ئەوە نا، شەوی وا هەبوو لە ڕسـتەیەکدا دەیـان جار کەوتووین بەسەر بێکەسیی و گریـانی خۆمانـدا و بـە دەم فرمێـسکەوە خـەومان پێدا کەوتووە، لەگەڵ هەر وشـەیەکیدا گەڕاوینەتـەوە بـۆ کوچـەکانی مـاڵی پێـشەوا و لەگەڵ هەر وتار و نامەیەکیدا، هەزارجار تووشی فڕین و سەمای یەقین بووینەتـەوە، بۆ ئەو زەمەن و زەمانەی نەمان بینیوە، بەڵام هەستی پێ دەکەین.

ئەم شاکارەی میری باوەڕداران بە زمانی کوردی، جێگەی شانازیی کـوردە لـە هـەر پارچە خاکێکی ئەم دنیایە بێت، بڕوامان وایە بە خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە، مـرۆڤ دووبارە لە خودی خۆی و بوون و ماهییەتی خۆی و ئایین و ئەم گەردوونە دەگاتەوە و هەست دەکات خـاوەنی هێزێکـی گـەورەی مـەعریفیی و زەمینەیـەکی ئەفسوناویی سەرنجڕاکێـشە و خـودان ئـاین و سیـستەم و پـرۆژە و گوتـارێکی هـەرە مـەزن و بـێ وێنەیە، بۆیە وەك ئەرك هاتە پێش چاومان، کە هەر تاکێکی کورد بۆ یـەك جاریش بـووە ئـەم بەرهەمـەی پێـشەوا عـەلی بخوێنێتـەوە، کـە ئێـستەش هـەر درەنـگ نییـە، ئـەوەتا خـەڵکی تـر و وڵاتـانی بێگانـە و دەسـەڵاتی دوور لـە ئـاین دەمێکـە وتـە و

فەرمایشت و ئامۆژگاریی و فەلسەفە بەهێزەکانی ئەم پێشەوایەیان کردۆتە پرۆژە و پنتی یەکەمی کارنامەی خۆیان و زۆرێك لە وتە و حیکمەتنامەکانی ئەم بەرهەمەیان لە دیو و دیواری بەرزی دیوەخان و فەرمانگە و کۆشك و تەلارە حکوومیی و مەدەنییەکانی خۆیاندا بە گەورەیی هەڵواسیوە، تەنانەت زۆرێك وڵات کردوویانەتە پرۆگرامی خوێندن و نەوەکانی خۆیانی پێ گۆش دەکەن، بێ ئەوەی موسڵمانیش بن، کەواتە حەیفە ئێمەی کوردی موسڵمان کە ئاگامان لە بەرهەم و شاکار و ئەدەبیاتی ئاینەکەی خۆمان نەبێت و هەروا بێ خوێندنەوە و بەدواداچوون و دیراسە، تەمەنێکی هەرزەیی بەڕێ بکەین و تەنیا بە ناسنامە موسڵمان بین.

ئومێدمانە ئەم هەوڵەی مامۆستا بامۆکی، ببێتە توێشووی قیامەتی و ئێمەی نەوەی باوەمەلاش لەو دنیا عەجوولانە، خۆمان بگەیەنینە پێشەوا عەلی و دانەیەك لەم کتێبە بە کوردیکراوەی خۆیی بدەینێ و بە زمانی کوردییش کەمێکی بۆ بخوێنینەوە، ئێمە دڵنیاین لەو بەهەشتە پەقینەی، کە خوا یار بێت دەیبینین، پێشەوا دەبینین و کتێبەکەشمان لێ وەردەگرێ و پێمان دەڵێ: ئەوا من و مەلا لەتیف گوێمان گرتووە و دەی ئێوەش نەك کەمێك، هەمووی بخوێننەوە! (إن شاء الله).

ئاری عەبدوللەتیف

ئارام بامۆکی

٢٠١٠/٣/١٦

# پێشەکی

## لە پێش خزمەتی پێشەوا و میری موسڵمانان
## عەلی کوڕی ئەبی تالیب

ئەم شاکارەی پێشەوا، پاش قورئانی پیرۆز و فەرمووده پەسەندەکانی ڕابەر و پێغەمبەر محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (صلى الله عليه وسلم)، پلەی سێیەمی هەیە لە ڕەوانبێژیی و چڕوپڕیی مانا و مەبەست و ئامۆژگاریی و جوانبێژیی و وشەئارایی و قوڵیی و ڕەسەنیی زمانی عەرەبیدا، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ زمانی یەکگرتووی عەرەب، دەیان حەشارگەی زمانەوانیی و ڕێزمانیی تێدا کۆبووەتەوە، ڕابەری هۆشیاریی و بزاڤی ئیسلامی سەردەمە، دانا و زانای عەرەب، محەممەد عەبدە وشەکانی لێکداوەتەوە و بەراوردکاریی بۆ کردووە و بەشایەتی قورئان و فەرمووده، کێشانەو شیکاری بۆ کردووە، دەقێکی پوخت و پاکی لەبەرچاوی کوردان بووە هەتا ئێستە و بەندەش بۆ زەکاتی سەرو تەمەنی ڕابوردووم بەزمانی شیرینی کوردیی دەق بەدەق بێ زیادوکەم لەبەرچاوو دڵ و هەست و سۆزی گەلی کوردستانی دادەنێم، کورد زۆر پێویستی بەم سەرچاوە ڕوون و ڕەسەن و سازگارانە هەیە، بە تایبەت لەم جۆرە شاکارانە، زمانەکەشی ئەوەندە گەشەی کردووە جێگەی ئەم گەوهەرانەی تێدا ببێتەوە.

مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی
٢٠٠٨/١٠/٣١

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## مامۆستای پێشەوا شێخ محەممەد عەبدە

# پێشەکی

سوپاس بۆ خوا کە پەرژینی نازو نیعمەتە، بەزەیی لەسەر پێغەمبەر وەفایە بۆگەردن ئازادیی، بارانی ڕەحمەت لەسەر یارو یاوەرانی پاك و بێگەرد، وەك دانپێدانانی چاکەیان و یادگاری ڕێنیشاندان و ڕابەرییان، لە دوای ئەمانە...

قەدەری خودا وابوو ئاگاداری کتێبی (نهج البلاغة)بم، بێ ئەرك و ماندوو بوون کەوتە دەستم، لەکاتی گۆڕانی باری ژیان و ئالۆزیی دەروون و زۆری کارو هەرمان و پشووی جێبەجێ کردنیان، بە هەلم زانی بۆ دڵدانەوە و بێکاریی، چاوم گێڕا بەلاپەڕەکانیدا، شۆڕ بوومەوە بۆ ناو ڕستە و دەربڕینەکانی، بە شێوەی پچڕپچڕ و جیاواز، وام بۆ دەرکەوت جەنگگەلێك هەلگیرساوە، چەپاو و تالانیی گەلێك کراوە، ڕەوانبێژیی دەوڵەت و دەسەلاتی هەیە، جوانبێژیی هێرشی هەیە، خەیاڵ و وەهم چەتوونیی و بەدڕەوشتیی بووە، گومان و چەوت حاڵی بوون و لادانی هەیە، سوپا و فۆشەنی وتاردان لە گۆڕەپانی ڕێسا و یاسادا شەڕە فۆچییە لەگەڵ شیری سپی و تیری گەنم ڕەنگ، کە خوێنی لە دڵ و گیانی گومان مژیوە، بە بەلگە ڕوون و پرشنگدارەکانی بوومتە هۆی شکان و نوچاندنی پەستی دڵە ڕاوکێ، شوێن کاریگەری پێکاوە، لە حەشارگەی گشت پروپوچیەك، باتڵ شکاوە و باخی گومان پوکاوەتەوە، هێرشی دوودڵی لەلاوازییە، ڕێنیشاندەری ئەم دەسەلاتە و قارەمانی ئەم هێرشە و ئالا هەلگری سەرکەوتووی ئەم نەبەردییە، میری باوەڕداران عەلی ئەبوتالیبە.

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لەباسێکەوە دەچوومە باسێکی ترو لەشوێنێکەوە دەمگواستەوە بۆ لایەکی تر، هەستم دەکرد بەگۆڕانی دیمەنەکان و جێگۆڕکێی پەیمانگەکان، کاتی وا هەبوو خۆم دەدی لە جیهانێکی پڕ لە ڕۆحی بەرزەفڕ، لە

بەرگ و كاڵای دەستەواژە گەلێك بەدەوری گیانە بێ گەردەكاندا دەگەڕان، نزیك دەبوونەوە لە دڵە خاوێنەكانەوە، پەیامی ڕێگەیان نیشاندەدا، مەبەستەكانی ڕێكدەخست و دووری دەخستەوە لە چاڵی نوچدان، دەستی دەكێشا بۆ گەورەیی و كەماڵ، هەندێ جاریش كۆمەڵە ڕوو و ڕوخسارێك دەهاتە بەرچاوم كە مرومۆچ بوون بە كەڵبەی چڕ و شێوەی پڵنگ و دەنووكی واشەی پەلاماردەر بۆ نێچیرێ، بەم كارەش دەروون پاك دەكاتەوە لە ئارەزووی ناپەسەندو و دڵان پاكژ دەكات لە ئارەزووی نابەجێ و بیری ناڕەوا.

هەندێ جار شتێكی فام و ژیرییم دەبینی كە وەك جەستە نەبوو، جیا دەبوو لە لاشەو جەستە، پەیوەند دەبوو بە گیانی مرۆڤ و پیسیی و پۆخڵیی سروشتی لەبەر دادەڕنی و بەرزی دەكردەوە بۆ شوێنە باڵاكانی فریشتەكان، دەچووە ناو كۆڕی گشت ڕوناكییە بریسكەدارەكان و لەپەنای ڕاستگۆیی دیوەخانە پیرۆزەكاندا ئاودامان دەبوو، لەو بەرزەوە بانگی وشەی چاخ و قەڵەوی دەكرد لەكاربەدەستانی میللەت دوور لە چەواشەكاریی ساختەكاران، هەندێ جاریش گوێم لە ناڵە و ئازاری دەروونی وتاربێژی پڕ لە حیكمەت دەبوو، بانگبێژی دەكرد و ڕێگەی ڕاستی نیشاندەدا و دەیپاراست لە جێگا و شوێنی گومانـاویی و چاڵی كەوتن و نوچدان و فێری وردەكاریی ڕامیاری دەكرد و دەستی دەگرت بۆ فام و ژیریی و دانانی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، وانەی بەرزی ڕاوێژی پێدەدان.

ئەوەش ئەم كتێبە پایەدارەیە كە ڕێزدار (شەریف ئەلڕەزی) (ڕەحمەتی خودای لەسەر)، دەربارەی فەرمایشتەكانی ڕابەرو پێشەوامان، میری باوەڕداران (عەلی ئەبو تالیب) خودا ڕووی گەش بكات، (چونكە ڕووی خۆی پاراستووە لەبتپەرستیی).

هەموو بەشە پەرش و بڵاوەكانی كۆكردوەتەوە و ناوی ناوە (نهج البلاغة) كە ناوێ نابینم گونجاوتر بێت لەو ناوە و ناتوانم وەسفی لەوە زیاتر بكەم، كە دانەر لە پێشەكیەكەیدا باسی كردووە.

ئەگەر ڕەوشتی ڕەسەنی خۆڕسكیی و دادوەریی لە ئەستگیری نەبوایە كە پێویست دەكات ئەمەكدار بین بۆ چاكەی چاكەكارو ستایشی دەست و دڵ گوشادی بەخشندەیی پێویست نەبوو ئاماژە بكەین بەبەرزی و شكۆیی ناوەڕۆكی جوانبێژیی و ڕەوانبێژیی و ڕاستبێژیی و هونەروانیی و زمانپاراویی هەموولایەنەكانی كە

نیشانەیەك نەمابوو نەیپێکێ و ڕێڕەوێکی بیرو هوشیاریی نەمابوو کە دیاریی نەکردبێ.

بەڵام لەبەر دوورکەوتنەوەی نەوەی نوێ لە زمانی ئەم کتێبە و پچڕانی وەچەی تازە لە شێوەزمانی ئێمە، وشەی زبر و نامۆی تێدایە لەگەڵ پڕمانایی و ژیریی کە ئاشنایی ئەنجامی ئێمەمانان لە ڕستەکانی، زۆر کات ئەوەی ورد نەبێتەوە لە وشەو ڕستەو دەستەواژەکانی باش لێی تێناگات، ئەوەش لاوازی وشە یان کزی مانا نییە بەڵکو کەمحاڵی بوونی ئێمەیە، لەبەر ئەوە حەزمکرد لەگەڵ تەماشاکردن و موتاڵاکردنی دووبارە پێیدا بچمەوە و لەگەڵ خوێندنەوەدا ڕوونکردنەوە بکەم و ڕاڤەی هەندێ بکەم و بازێ ڕستەی شیبکەمەوە و پارچەکانی یەك بخەمەوە لە سەر هەندێ شوێنی مەبەست ڕاوەستم، بە کورتیی و بە پێی توانا پشت دەبەستم بە کتێبی دیاری زمان و هەواڵی ڕاستی باس و خواس و دەست نابەم بۆ ئەوەی دەیگێڕنەوە لە پێشەواوە دەربارەی ڕابەرایەتیی لە ڕووی ڕاستی و ڕەدکردنەوەی، ئەوەم هێڵاوەتەوە بۆ خوێنەر کە ورد بێتەوە بە پێی بنەمای ڕێبازەکان و هەواڵەکان کە ڕاستییان پێوە دیارە، بەڵام هەرگیز خۆم لانەداوە لە شیکردنەوەی دەستەواژەو دیاریکردنی ئاماژە، تەنها مەبەستم پاراستنی ئەوەی لەبیرمەو بەیانی ئەوەی لەبیرمە بۆ ئەوەی لە بیری نەکەم ئەوەی لەبەرم کردووە و لانەدەم بۆ لاڕێ.

هەوڵ ئەدەم لە ڕێڕەوی کتێبەکەدا لانەدەم، مەگەر هەندێ باسی جوانبێژی و ڕاستبێژی نەبێ بۆ خۆم و بۆ شارەزایی زمانی عەرەبی، زۆر زانای گەورە گرنگییان داوە بە شیکردنەوەی ئەم کتێبەو زیاتر درێژەیان داوە بەڕوونکردنەوەی نهێنییەکانی، بەڵام هەر کەس بۆ پاڵپشتی ڕێبازی خۆی و بەهێز کردنی بۆچوونی خۆی، بەڵام من (محەممەد عەبدە) تەنها دانەیەك لەو کتێبانەم لا نەبوو جگە لە شتێکی کەم لە کتێبەکەدا باس کرابوو، ئەگەر بۆچوونەکانم لەگەڵیان ڕێك بێت ئەوە هەڵکەوتە و ئەگەر جیاواز بێت ڕاستی لای منە (بە گومانی خۆم ئەوەش ئەڵێم ئەمەی من ناچێتە ڕیزی شیکردنەوەی ئەوان، بەڵکو کەمێ ڕازانەوەی (نهج البلاغة)یەو نەخش و نیگاری ئەملاو ئەولایەتی، هیوادارم ئەم کورتە سوودی لاوانی تێدا بێت کە ئەبینم لە کۆششدان بۆ زمانی عەرەبی، بۆ زمانێکی گۆیاو قەڵەمێکی بەتوانا، بەڵام ئەیانەوێ لە دەقە ڕەق و قورسەکانەوە کە غەیرە عەرەبەکان دایانناوە

**فێربن، كه جگه له وردیی شاراوەیی و كێش و سەرواو جوانبێژیی و هاوكێشیی، شتی تریان مەبەست نەبووە، هەمیشه وشەئارایی بێ ناوەرۆك و بێ سوودیان داهێناوە، ڕاسته ئەم جۆره نوسینه بەشێكه له زمانی عەرەبی و هەمووی نییه، خۆ ئەگەر تەنها بۆ ئەم مەبەسته دانرابێت ئەوه ناوەندیش نییه، ئەگەر پەیڕەوی خاوەن زمانەكەیان بكردایه بەتایبەتی چینی باڵا، ئەوكاته به ئاواتی خۆیان دەگەیشتن، خاوەنی ئەم زمانه دەڵێن: (وتاری پێشەوا عەلی ئەبو تالیب) خوا لێی ڕازی بێت، دوای فەرمایشی خودا و فەرمودە صەحیحەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەهەموو دەقەكان بەرزترو و قوڵترو پڕماناتره.**

**بەهیوام ئەوانەی ئارەزوو دەكەن شارەزابن، ئەم كتێبه لەبەر بكەن و بیكەنه سەر چاوەی زانیارییان، داواكارم له خودا كاری من و كاری ئەوان سەركەوتوو بكات و ئاواتی من و ئاواتی ئەوان جێبەجێ بكات.**

# بنەچەی ( شەریف ئەلڕەزیی )

ئەبو حەسەن محەممەد کوڕی حوسەین کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی موسا کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەری سادق کوڕی محەممەد باقر کوڕی عەلی زەین ئەلعابدین کوڕی حوسەین کوڕی عەلی ئەبو تالیب، دایکی فاتیمەی کچی حوسەین کچی حەسەن ناسری کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی حوسەین کوڕی عەلی ئەبو تالیب لە (٣٥٩ ) لەدایك بووە، دەستی داوەتە زانستی شەرع و فەرائیزو دەرکەوتووی کاتی خۆی بووە. خاوەن کتێبی (یتمیە) دەڵێ : ئەمڕۆ هەڵکەوتووی کاتی خۆیەتی، لە وەجاغزادەکانی عێراقە لە گەڵ پاکی بنەچەو شانازی نەسەبی خاوەن گەورەیی و ئەدەب و هەموو چاکەیە، سەرۆکی سەیدەکانی تالیبەکانە لە ساڵی (٣٨٨)ەوە هەموو کارەکانی باوکی لەدەستایە کە پرسینەوەی سکاڵا و حەجی خەڵکە.

لەبەر بەرزیی جێگا و مەزنی خۆی نامەی دەنوسی بە شیعر بۆ خەلیفەی عەبباسی قادر بیللا و خۆی هاوتا دەکات بەخەلیفەو دەڵێ:

(پێشەوای موسڵمانەکان لابکەرەوە، هەر دووکمان خەڵفی دارێکین و جیانابینەوە ئەگەر ئەمڕۆ جیاوازی هەبێ، بەڵام لەڕەگدا هاوبەشین، تەنها خەلافەیە تۆی لە من جیا کردووەتەوە، من بێبەشم و لەگەردنی تۆدایە.)

خەلیفەش لە وەڵامیدا وتی: (بەخۆڵاوی لوتی شەریفتان، شیعری زۆر جوان و پاراوی هەیە، کە دەڵێ هەوڵی گەورەی باڵامدا و بە دەنگمەوە نەهات، ناکۆکیی نێوان دڵداریی و ئەڤیندارە، بەئارام بووم هەتا دەستم کەوت، هەرگیز ناڵێم: دەرمانی دەزگیران، تۆران و جیا بوونەوەیە، دەستی داوەتە شیعروتن لە تەمەنی دەساڵاندا، لەهەموو تالیبەکانی کۆن و نوێ شاعیر ترە، جگە لە عەلی ئەبوتالیب (خوای لێ ڕازی بێت) ئەگەر بڵێم لە هەموو قورەیش لە ڕاستی دوور ناکەومەوە، هەندێ لەوانەی باسیان کرد و دەڵێن: شاعیرێکی زمانپاراو، وشە قەڵەو، خاوەن توانای گەورەیە لە پیاهەڵدانندا، بەرز لە لاوانەوە لە ڕیزی پێشەوەی بوێژەکان هەناسە بڕکێیانە بەدوایدا، لەگەڵ ئەوەش نوسەرێکی بە توانا و ڕستە قورس و مانا بەرز، هەموو

بەرهەمەكەی كۆكراوەتـەوە لەچوار بەرگدا لەلایـەن ئـەبو حـەكیمی حەیدەرییـەوە، لەسەر مانای قورئان كتێبی هەیە، زۆر شارەزای زمان و نەحو ئوسولی ئاین بووە، زۆر پـاك و خـاوێن بـووە، خـەڵاتی كەسـی وەرنـەگرتووە فـەرمانڕەوای (بـویهی) ویـستیان خەڵاتی بكەن وەری نەگرت، تەنها داوای ڕێزو شكۆی پەیڕەوانی دەكرد.

ئەبو حامیدی ئەسفەراینی شافیعی دەگێڕێتـەوە كـە ڕۆژێـك لای فـەخر ئـەلولك محەممەد كوڕی خەلەف وەزیری بەهائولدەولە دانیشتبووم (شـەریف ئـەلرەزی) هاتـە لای زۆر ڕێـزی گـرت و لـە شـوێنی بـەرزو شایـستەدا پێشوازی لێكـرد، هـەموو پـەڕەو چـیرۆكەكانی لـێ وەرگـرت و ڕووی خۆشـی دایـە، ئـەو ڕۆیـشت و براكـەی (مورتـەزا شـەریف) هاتــە ژووره، وەك براكـەی ڕێـزی نـەگرت و كارەكـانی جێبـەجێ كـرد و ڕۆیشت، وتم بۆچی جیاوازیت كرد لە نێوان ئەم دوو برایەدا، وتی كە خـەڵك بـڵاوەی كرد وەڵامـت ئەدەمـەوە، بڕیارمـدا بـوو كـە هەسـتم بـەڵام ڕێكـەوت بـۆم نـەكرا هـەتا كۆڕەكە چۆڵ بوو، وتـی بەبەردەسـتەكە ئـەو دوونامەیـەی دامـە دەسـتت بـۆم بهێنـە، وتی ئەوە نامەی (شەریف ئەلرەزی)یە منداڵیان بووە، هـەزار دینـارم بـۆ نـاردووە بـۆ مەسرەفی مامان و شتی تر پارەكەی ناردوەتـەوە و دەڵـێ ئێمـە پـارەی مامـان نـادەین پیرەژنی خۆمان ئەو كارە ئـەنجام دەدەن و پێویـستم بـەو دراوە نییـە، بـەڵام براكـەی (شەریف مورتـەزا) ماوەیـەك لەمەوبـەر ویـستمان جۆگـەو بیرێـك پـاك بكەینـەوە لـە نزیك ڕوباری (عیسا)، كە هەنـدێ زەوی مورتـەزا بەركـەوت، بـایی بیـست درهـەم كـە دەكاتە یەك دینار، ئەم نامەیەی نوسیوە بیخوێنەرەوە، حەوت دێڕە چەندە پاڕانـەوە و هات و هاوار ئەكات كە ئەو پوڵەی پێ ببەخشین، ئەنجا وتی ئەم دوو برایە كامیـان شایستەی ڕێزگرتنە.

شــەریف ئــەلرەزی وەفــاتی كــردووە لــە موحــەڕڕەمی (٤٠٤)دا و لــە مزگــەوتی ئـەمباری نێـژراوە لـە (كـەرخ)، مورتـەزای بـرای لەناڕەحەتیـدا توانـای نـەبوو لەسـەر تابوتەكەی ئۆقرە بگرێ، چووە كازمییە و وەزیر نوێـژی لەسـەر كـردو چـوو براكـەی هێنایـەوە، ئیبنـو خەلـەكان باسـی دەكـات: هەنـدێ زانـا دەدەن بـەلای مـاڵی شـەریف ئەلرەزیدا لە (سُرَّ من رأی) واتە سامەڕا، كە تێكچووبوو ڕوخابوو شیعرێكی ئەم كەڵە شاعیرە دەخوێنرایـەوە لەلایـەن كەسـێكەوە، وتم ئـەزانی ئـەوە شـیعری خـاوەنی ئـەم ماڵە ڕوخاوە شەریف ئەلرەزییە.

# پێشەکی

پاش سوپاس بۆ خودا کە سوپاسی کردوەتە پاداشتی هەموو نیعمەتەکان و کردویەتی بە پەناگا لە هەموو بەلاکان، هۆکارێکە بۆ گشت بەهەشتەکان و فرمبوونی چاکەکان، ڕەحمەتی خودا لەسەر پێغەمبەری ڕەحمەت و ڕابەری پێشەوایان و چرای گەل(صلى الله عليه وسلم)، پالفتە لە گلی خاوێن، وەچەی بەرزی پێشینی، فەرمانگەی شانازی بنەچەی ڕەسەن، خەلفی پڕ بەری بەرزی شۆخ و شەنگ، لەسەر ئال و مالّ و خانەوادەی، چراگەلی تاریکیی و پارێزەرانی گەلان و منارەی تیشکداری ئاین و ترازووی گەورەیی بەزەیی خودا، لەسەر هەموویان ئەو بەزەییە کە هاوشان بێت بۆ گەورەییان و شایان بێت بۆ پاداشتیان و هاوشان بۆ ڕەگ و لق و پۆپیان هەتا گزنگ ڕوناکیی بدات و هەسارە تیشك بدات.

من لەهەرەتی لاویم و ناسکی پەرو بالم دەستم داوەتە دانانی کتێبێك دەربارەی پێشەوایان کە هەوالی جوانیان و گەوهەرەکانی وتاریان، ئەوەی هانیدام لە پێشەکی ئەم کتێبەدا وەك دەستپێك باسم کردوە لەو تایبەتییە گەیشتم ئەو تایبەتمەندییە پێشەوای باوەڕداران (عەلی ئەبو تالیب) (خوای لێ ڕازی بێت) بەلام ڕووداوەکانی کات و گرفتەکانی ژیان ڕێگەی لێگرتم تەواوی بکەم، لە پێشدا لەم کتێبەدا بەشەکان و پارچەکانم ڕێك کردبوو، لەکۆتایدا بەشێکم دانا بۆ وتارە کورت و پڕ ماناکانی پێشەوا (عەلی)(خوای لێ ڕازی بێت) لە ئامۆژگاریی و حیکمەت و پەندو داب و نەریت خۆم پاراست بوو لە وتارە درێژەکان و نامە گەورەکانی، هەندێ لە دۆستەکان ئەو بەشەیان زۆر لاپەسەند بوو، سەرسام بوون لە وتە بەنرخ و جوانەکانی، داوایان کرد بەتایبەتی کتێب لەسەر بژاردەکانی فەرمایشتی پێشەوا و میری باوەڕداران لە هەموو هونەرەکان و گەوهەر بەخشەکان چ وتار و چ نامەو وێژەو ئامۆژگاری، بۆ زانیاری ئەوەش ڕەوانبێژی سەرسوڕهێنەری تێدایەو زمانپاراوی دەگمەن و گەوهەری پوختەی عەرەبی و چرا هەسارە گەلێکی پرشنگداری ئاینی و ژیانی تێدا بوو کە لەوتاری کەسی تردا نییە، چونکە سەرداری موسلمانان سەرچاوەی زمانی پاکی و

**کانیاوی ڕەوانبێژی بووە و لە جەنابیانەوە ئاوی زوڵاڵی ئەدەب و کانی (یاسا) هاتووە، لە شێوەی ئەوان خەڵك فێر بوون و وتاربێژەکان و زمانڕەوانەکان لەوانەوە فێربوون، پێش هەموویان کەوتووە و ئەمان دواکەوتوون، چونکە بێژەکانی ئەم، گرنگی زانستی خودایی و تام و چێژو بۆنی فەرمودەی پێغەمبەری لێ دێت(صلی الله علیه وسلم)، منیش لەسەرەتادا قەولم پێدان، دەمزانی سودی گەورەی تێدایە، ناوی پەسەند و پاداشتی فرەی پاشەڕۆژی هەبوو، نیازیشم لەم کارە ڕێزی میری باوەڕداران بەیان بکەم لەسەر فەرمانی چاکە و جوانییەکان و بەرزییەکانی دانێم.**

**پێشەوا تاکە سواری مەیدان بووە لە پێشینەکان کە ئەوەی لێیان دەگێڕنەوە زۆر کەم و دەگمەنە، بەڵام فەرمایشتی پێشەوا دەریای بێ کەنارو چەشمەیەکی بێ بڕانە، ئەوەم بۆیە کردووە بۆ ئەوەی بتوانم شانازی بکەم بە قەولی (فەرەزدەق): (ئەوانە باوك و باپیری منن ئەگەر ئەتوانی ئەی جەریر لەناو کۆڕی خەڵك نمونەیان بدۆزیتەوە).**

**سەید شەریف ئەلڕەزیی**

# وتـار و گوفتـارەكانی پێشەوا لەسەر سێ تەوەرە:

**یەكەم: وتـارو فەرمان.**
**دووەم: كتێب و نـامە.**
**سێیەم: ئـامۆژگاریی و پەندی پەسەند.**

بەیارمەتی خودا هەموو وتارەكانی كۆدەكەمەوە، ئینجا نوسراو و نامـەكان، پـاش ئــەوە ئامۆژگــای و پەنــدەكانی، ئەگــەر فەرمایــشتێك جگــە لــەم تەومرانــە وەك فەرمایشتی لە دانوسـتاندا یـان وەڵامـی پرسـیارێك یـان هـەر مەبەسـتێك هـەبوو، لـە شوێنی گونجاو دایدەنێم، لەوانەیە ئەو دانانە رێك و پێك نـەبێ و بەشـوێن یەكـەوە نەبێ، بەڵام من تۆمارەكەم مەبەستە، لـەو كـارە سەرسـوڕهێنەرانەی پێـشەوا ئەوەیـە كە كەس هاوتای نییە، ئەو تـەنها لەخۆیـەوە بـووە، وتارەكـانی لـە دنیـا نەویـستیی و ئامۆژگـاریی و بیرهێنانــەوە و دورخــستنەوەیە لــە خراپــە، ئەگــەر لێـی وردبێتــەوە خاوەن بیر، باش دڵی بداتێ و بزانێ ئەوە فەرمایشی ئەو زاتە گرانقەدرەیە كـە ڕێـزو قـەدری لەگـەردنی هەمووڵایەكـە، بـاش بـۆی دەركـەوێ ئـەم زاتـە لـە دنیانەویـستیی هیچی نەهێڵاوەتەوە، تەنها كاری بەندایەتیی بووە لـە سوچـی دەوارێكـی شـڕ یـان لـە دامێنی چیایەكدا، تەنها هۆشـی بـەلای هەسـتی خۆیـەوە بـووە، وانـازانی ئـەوە وتـاری جـەنگاوەرێكی شیربەدەسـتە و دەمیـان سـەری پەڕانـدووە و قارەمانـانی لـە خـوێنی خۆیانـدا گەوزانـدووە و هەمیـشە سـەرقاڵی پاككردنـەوەی دەمـی شـیرەكەیەتی كـە خوێنی لێ ئەچۆڕێ و پارچەی سەروگوێلاكی پێوە نووساوە، لەگەڵ ئەوەی سـەروەری دنیانەویستەكانە و سەرداری (ئەبدالەكان)ە، كە ئەركی جیهانیان پـێ سـپێراوە، ئـەوە لـە سـیفاتە تایبەتـە سەرسـوڕهێنەرەكانی و تایبەتمەنـدە جوانـەكانی كـە شـوێنی هاودژەكانــەو شــوێنی كۆبونــەوەی ناكۆكەكانــە كــە زۆر كــات لەگــەڵ هاوەڵــەكانم باسمدەكرد و سـەرەنجم ڕادەكێشان كـە مایـەی پەنـدو بیرلێكردنـەوە بـووە، زۆر جـار لـەكاتی بـەكارهێنانی وشـەیەك لەوانەیـە دووبـارە بێـت لـە بێـژەو مانـادا، بـەڵام

دەتگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەكانی گێڕانەوە، زۆر ڕێك دەكەوێ وتەیەكی دیاریكراو لە گێڕانەوەدا جیاوازی دەبێ لە گێڕانەوەیەكی تر یان جێگۆڕكێی پێكراوە، یان زیادەی لەسەر دانراوە، بەڵام چونكە وتم كە لە دەقە ڕەسەنەكەیە دەبێ بنووسرێتەوە، یان لەبەر دووریی كات وشەیەك بەكارهاتووە لە گێڕانەوە و لە بیرچوون و سەهو پەیدا بووە و بەدەستی قەسدیی نەبووە.

لەگەڵ ئەوەش من ناڵێم توانیومە هەموو لایەنەكانی فەرمایشەكانی پێشەوا بەسەر بكەمەوە و هیچم لێ وننەبووە و بەدووری نازانم كورتبینیی من هەندێ شتی لەدەست داوم، تەنها ئەوەی لە ئەستۆی منە هەوڵ و كۆششە و هەموو تاقەت و توانام بەكارهێناوە و داوا دەكەم خودا ڕێگەی ڕاست و ڕەوانم پیشان بدات و شارەزای ڕێگام بفەرموێ، ئەوەشم بە باش زانی ناوی لێ بنێم (نهج البلاغة)، چونكە ڕێگە تەخت ئەكات بۆ ئەوەی سەرنجی بداتێ و ئەوەی مەبەستی بێت، چ زاناو چ شاگردی تێدایە، ئامانجی وتاربێژو دنیانەویستیی تێدایە، مەبەستی سەرسوڕهێنەری تێدایە، لە یەكخواپەرستیی و داد و پاكڕاگرتنی زاتی پاكی پەروەردگار، لە چواندن بەخەڵك كە تینووی هەموو گەروو وشكێ تەڕ دەكات و چارەی هەموو دەردێ دیاری ئەكات و هەموو گومانێك دەڕەوێنێتەوە.

لەخودای پاك داوای سەركەوتن و سەرفرازیی دەكەم، داوای یارمەتیی دەكەم و پەنا دەگرم لە هەڵەی دڵ و دەرون، پێش زمان و گوتار لە خزانی وتار پێش خزانی پێ، خودا بۆ من بەسەو چاكترین بریكارمە.

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# وتـارەکـانـی سەردارمان میری بـاوەڕداران

# (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)

## فەرمانەکانی، وتەکانی، کە وەك وتار و ئامۆژگارییە

(١)

# باسی پەیدابوونی ئاسمان و زەوی و دروستکردنی ئادەم و باسی حەج

سوپاس و ستایشی خودای بەدیهێنەری بونەوەرو فریشتەو ڕەوانەکاری پەیامبەران و هاتنی پێغەمبەری خۆمان (صلی الله علیه وسلم) و قورئان و فەرمانی شەرعی، سوپاس بۆ خودا، کە کەس ناتوانێ ستایشی تەواوی بکات، ژمیار ناتوانێ خشتەکانی هەژمار بکات، هیچ توانا کارێك ناتوانێ مافی تەواوی بدات، ئەو زاتەی، کە هیچ زاناو پیتۆڵێك دەرکی ناکات، هیچ مەلەوانێکی زیرەك ناتوانێ بەدەستی بهێنێ، ئەو زاتەی، کە سیفەتەکانی بێ سنوور و بێ کات و بێ ماوەیە، هەموو بونەوەری بەتوانای هێناوەتە بوون، بە بەزەیی خۆی بای بلاو کردوەتەوە و بەچیاو بەردی سەخت، زەوی بەستوەتەوە.

سەرەتای ئایین، ناسینی خودایە، تەواوی ناسینی باوەڕ پێکردنیەتی، تەواوی باوەڕ پێکردنی، بەتاك ناسینیەتی، تەواوی یەکتابوونی دڵسۆزییە بۆی، تەواوی دڵسۆزی، نەچواندنیەتی بە سیفەتەکانی دروستکراوەکانی خۆی، چونکە هەموو سیفەتێك شاهیدە، کە جیاوازە لە خاوەنەکەی و هەموو خاوەنێك، کە دوورە لە سیفەتەکە، هەرکەس بتوانێ وەسفی بکات بەرامبەری کردووە، ئەوەی بەرامبەری بکات، بەدوانی دەزانێ، ئەوەی بەدوانی بزانێ پەل پەلی ئەکات، ئەوەی پەل پەلی بکات نایناسێ، ئەوەی نەیناسێ ئاماژەی بۆ ئەکات، ئەوەی ئاماژەی بۆ بکات سنووری بۆ دادەنێ، ئەوەی سنووری بۆ دانێ ئەیژمێرێ، ئەوەی بڵێ لە کوێ لەناوەندی داناوە، ئەوەی بڵێ لەسەر چی، لەخاڵی بەتاڵ دایناوە.

هەیە، بێ تازەکاریی بوونی هەیە نەك لە نەبوون، لەگەڵ هەموو شتە، بێ بەراورد، جیاوازە لە هەموو شت نەبەدژی، کارایە نەك بە بزاوت و ئامێر، بینایە بە بوونی دروستکراوەکانی پێش بوونیان، تاك و تەنهایە نەك پێویستی بە هاودەم و بێئارام نابێ بە نەبوونی هاوڕێ.

## دروستکردنی جیهان

خەڵکی لە نەبوون پەیدا کرد، سەرەتای سەرەتابوو، بێ بیرکردنەوە بەڕێوەی برد، بێ ئەزموونی پێشینی وەری گرت، بێ جوڵەو لڤین پەیدای کرد، بێ ماندوو بوون و شڵەژان لە دروستکردن، هەموو بوونەوەرەکان بەکاتی خۆیان، گونجاندنی پێکەوەی جیاوازەکان، سروشتەکانی چاندو گونجاندی لە شوێنی خۆیان و هەریەکەیان لە تارمایی خۆیدا دانا، زانا بەسەرەتایان، بەدەسەڵات لەسەر سنووریان و کۆتاییان، ئاگادارە بەسەر بەڵگە ئاشکراو شاراوەکان، ئەوجا، پاکیی شایستەی خۆیەتی، کەش و هەوای جیاکردەوە و ڕێڕەوی دیاریکرد بۆیان، هەر بایەکی لەسەر ڕێگەیەك دانا، ئاوی شەپۆل بەهێزی تێدا دانا، لەسەر پشتی هەوای بارکرد، بەدەنگی هەورە گرمەو و هێژێن، فەرمانی پێدابوو بارەکەی شەتەك بدات و هەڵیگرێ بۆ شوێنی دیاریکراو، هەوا لە ژێرەوە کون کونە و ئاویش ورد و تەنك لەسەرەوە، خودا بۆ خۆی بای نەزۆکی ڕەوانە کرد و لە جێگای خۆی ڕایگرت، بەدەنگی توندو بەهێز لە یەکی جیا کردنەوە، فەرمانی بەشڵەقاندنی ئاوی تیژڕەو و جولانی شەپۆلی دەریاو پاش ژەندنی وەك ژەندنی مەشکە، پژاندنی لە بۆشاییدا و ئەمسەرەو سەری پێ کردو سەرەژوورو سەرەو خواری پێکرد، هەتا تێکەڵ بوو و کەفی کرد، لەبایەکی فراوانی بەهێزدا بەرزی کردەوە لە کەشێکی کشاودا، حەوت ئاسمانی پێدروست کرد، ئەوەی ژێرەوەیش شەپۆلێکی بێ چۆڕان و سەرەوەی بانێکی پارێزراو و دەوارێکی هەڵکراو بێ کۆڵەکە و بێ بزمارو پەتی بەستنەوە، ئەستێرەی بۆ جوانی لەسەر ڕواند، هەندێك بۆ تیشك و ڕوناکین، چرایەکی پرشنگبلاوی مانگی ڕوناکی لە چەرخێکی گەڕۆك و بانێکی ڕێبوار و تەنێکی جولاوی داناو ڕێکی خست.

## دروستکردنی فریشتە

ئەوجا لە نێوان ئاسمانە بالاکان بۆشایی دروستکرد، پڕیکردن لە هەموو جۆرە فریشتەیەك، هەیانە تەنها لە سوژدەدان بێ چەمینەوە، هەیانە لە چەمینەوەدان بێ ڕاست بوونەوە، هەیانە لە ڕیز وەستاون بێ گۆڕان، هەیانە تەنها پاك و بێگەردی پەروەردگار دەبێژن بێ ماندوو بوون، خەو لە چاویان ناکەوێ، ژیرییان لە بیر

**ناچیّ، لە لەشیان ماندوو بوون نییە، بێئاگاییان بەسەردا نایە، هەیانە ڕازگری سروشەو زمانی گۆیایە بۆ پەیامبەران، کارو فەرمانەکانی ئەنجام دەدەن، هەیانە پاسەوانی بەندەکانیەتی و هەیانە ماڵداری بەهەشتییەکانە، هەیانە لە ژێر توێژە ژێرەکانی دامەزراون، هەیانە لە ئاسمانەوە چاودێرن، هەیانە دەستیان گرتووە بەهەرێمەکانەوە و هەیانە شانیان داوەتە بەر عەرش و چاویان لە ئاستیدا شۆڕ کردووە، باڵیان لە خۆیان ئاڵاندوە، لە نێوانی ئەوان و بارەگای زۆر پیرۆزدا پەردەی بەتواناو پەرژین دانراوە، بیر لەوێنەی پەروەردگاریان ناکەنەوە و نایچوێنن بە سیفەتی دروستکراوەکان و شوێنی بۆ دیاری ناکەن و ئاماژەی بۆ ناکەن بەچاوو دووربین.**

## شێوەی درووستکردنی ئادەم

**ئەوجا خودای پاك و بێگەرد لە زەوی ڕەق و نەرم و شیرین و شۆرەك تۆپەڵێ گڵی کۆکردەوە، شێلای بە ئاو، هەتا بوو بە قوڕێکی شل و هەویرێکی پتەو، لەو قوڕە وێنەو پەیکەرێکی لارو وێرو سوچدارو قوپاوی درووستکرد، کە ئەندام ولەش و بەشی هەبوو، وشکی کردەوە هەتا وەك قوڕی گۆزەو دێزەیەکی گرت و ڕەق بوو وەك کەندوو، دەستت لێبدایە دەنگی لێوە دەهات، بۆ ماوەیەك و کاتی دیاریکراو، ئەوجا گیانی کرد بەبەریا و بوو بە مرۆڤ و ڕاست ڕاوەستا، بیر و هۆش و ئاوازی پێدا بۆ گەڕان و پشکنین، پەلوپۆی دایە وەك ڕەنجبەرێ خزمەتی بکات و ئامێری بۆ درووستکرد بۆ هەموو لایەك جوڵەی پێبکات، زانستی فێرکرد بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست و چەشتن و بۆن و ڕەنگ و جۆرەکانی سەرما و گەرما و تەڕ و وشك و هەموو شێوەکانی هاوتا و دژەکانی بەیەك جیا و تێکەڵەی گەرما و سەرما و تەڕ و وشك، خۆشی و ناخۆشی، خودای پاك داوای کرد لە فریشتە ئەو سپاردەی پێی وتبوون و ئەو بەڵێنەی لێوەرگرتبوون لە گەردنکەچیی و کڕنوشبردن ئەنجامی بدەن بۆ ڕێزلێنانی، ئەوجا خودای بێوێنە و بێهاوتا فەرمووی: (سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس) و کەس و کارەکانی کە خۆبەزلزانین و لاساریی زاڵ بوو بەسەریاندا، خۆیان بەگەورە هاتە پێش چاو کە لە ئاگر**

درووستكراون و درووستكردنى ئادەم لە قوڕى هەمە جۆريان بەكەم زانى، ئەوجا خودا مۆڵەتى دايە بۆ زياتر تورە بوون و تەواوى بەڵاو كارەسات و بەجێگەياندنى بەڵێن: (تۆ مۆڵەتت هەيە هەتا كاتى دياريكراو)، ئەوجا خودا ئادەمى لە ماڵێك دانا بە ژيانى بەختياريى و كامەرانيى و ئارامىى و بێترس و ئاگاداريكردن لەشەيتان و دوژمنداريى، بەڵام شەيتانى دوژمن هەڵى خەڵەتان، چونكە ئيرەيى پێدەبرد بەشوێنەكەى و هاوڕێى چاكمەردان بەڤينگەريى و گومان، خۆڕاگريى بە لاوازيى و خۆشى و هێمنى، بە ترس و دڵە ڕاوكێ و دڵئاراميى بە پەشيمانى، خوداى پاك گەڕانەوە و پەشيمانى لێومرگرت و وتەيەكى خستە دڵييەوە و بەڵێنى پێدا بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت و هێنايە خوارەوە بۆ ماڵى پڕ لە كێشەو دەردى سەريى و زاوزێى وەچەو نەوەكان.

## هەڵبژاردنى پێغەمبەران

## ( درودو سڵاوى خودايان لەسەر بێت )

خوداى پاك و بێگەرد لە نەوەى ئەو (ئادەم) پێغەمبەرانى هەڵبژاردو پەيمانى لێومرگرتن بەگەياندنى سروش و سپاردەى پەيام، هەركات خەڵك بەڵێنى خودايان گۆڕى، نەفاميان هەبوو لە مافى خوداو هاوەڵيان بۆ پەيدا كردو شەيتانەكان وەريانگێڕان لە خوداناسيى، لە ڕەگى بەندايەتى هەڵيانكەندن، ئەو كاتە پەيامبەرانى ڕەوانەكردو لە نێوان پەيامبەرێك و پەيامبەرێك پێغەمبەرانى هەنارد، بۆ ئەوەى داواى جێبەجێكردنى سپاردەى فيترەتيان لێبكات و نازو نيعمەتيان بيربخاتەوە، بەڵگەيان لە سەر تۆمار بكات كە ئاگاداركراون و ژيريى شاراوەيان بيربخاتەوە، نيشانەكانى توانا لەسەرەوەيان پيشانبدات، لەگەڵ تەنى ڕاخراوى ژێرەوەيان و ژيوارى ژيان و كۆتايى تەمەن و كەموكوڕى پيريان پيشانبدات و ڕوداوەكانيان بەسەردا بهێنێ، هەرگيز خودا خەڵكى خۆى بەبێ پێغەمبەرێكى ڕەوانەكراو يان كتێبى هەنارده يان بەڵگەيەكى سەپاو يان ڕێبازێكى تەخت و بێگرێوگۆڵ بێبەش نەكردووە، پێغەمبەران كەمى ژمارەيان ئەركى سەرشانيان كەم نەكردوەتەوە و زۆرى بێباوەڕان ماندوى نەكردون، هەموو پێشين ناوى پاش خۆيان دياريكردوە و پاشين

پێشینی خۆیان ناسیووه، چەرخ و سەدەو كات بەم شێوە ڕابوردووە، ساڵان و ڕۆژان ڕۆیشتووە، باوك و باپیر پێش كەوتوون و ڕۆڵەكان بەدوادا هاتوون.

## ڕەوانەكردنی پێغەمبەر
## (صلی الله علیه وسلم)

ئەمە درێژەیدا، هەتا خودای پاك و بێگەرد (محەممەد) (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانە كرد، بە پێی ئەو بەڵێنەی كە دابووی لەسەر زمانی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ تەواوكردنی پەیامبەرایەتی كە وەك پەیمانێك لەسەر پێغەمبەران دانابوو، لە ناو پەیامەكەیان باسكراو نیشانەكانی دیاری كرابوو، كە لەدایكبوونی بەپاكیی و لە كاتێك لە دانیشتوانی نەوەی جیاجیا و هەواو ئارەزوی بڵاو و ڕێگا و ڕێبازی پرش و بڵاو، كە هەیان بوو خودایان ئەچواند بە دروستكراوی خۆی، یان بێباوەڕ و لادەر، یان پەرستنی هاوەڵ، ئەوجا بە هۆی ئەم پێغەمبەرەوە لە ڕێگەی ون وگومڕا ڕزگاری كردن و گێلیی و نەفامیی لەسەر لابردن، ئەوجا خودا پێغەمبەر (محەممەد)ی (صلی الله علیه وسلم) بردەوە بۆ لای خۆی، ڕازی بوو بەو هێندەی بۆی ڕەوانە كردبوو، ڕێزی گرت لەدنیای ڕۆشن، وابەستەیكرد كە دەستبەرداری ئازار بێت و بەسەر بەرزیی بردیەوە بۆ لای خۆی، لەپاش خۆی لەناو ئێوەدا ئەوەی پێغەمبەران پاش خۆیان بەجێی دەهێڵن داینا، چونكە نایەوێ بێ بەرنامە و ڕێگە بەرەڵا بن، بێ ڕێگەی تەخت و ڕوون و بێ زانست و بێ نیشانەیەكی ڕاوەستاو و دیار.

## قورئان و فەرمانە شەرعییەكان

ئەوەی خودا لەپاش (محەممەد) (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئێوەی داناوە كتێبی پەروەردگاری ئێوەیە، كەباس لە حەڵاڵ و حەرام و فەرزو سوننەت دەكات، هەمواركارو هەمواركراو و ڕێپێدراو و عەزیمە، تایبەت و گشت، پەندو ئامۆژگاریی، ڕەها و سنوردار و پتەو وەك یەك جۆرا و جۆرو جۆرهەڵگر، ڕوونكراوە، ڕستەو دەستەواژەكانی ڕوونكراوە، مەبەستە شاراوەكانی، ئەوانەی كە پێویستە زانستین و ئەوانەی نەزانینیان لەسەر خەڵك ئەرك نییە، لەوانە لە كتێبەكەدا پێویستكراوە و

ئەوانە بە کردارو و ڕەفتارو بڕیاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێویستکراوە و لابراوە و ئەوانە لە فەرمودە پێویستکراوە و لە کتێبدا ماوەی پێدراوە بۆ نەکردنی، ئەوانەی پەیوەستە بەکاتەوە و بە تێپەڕکردنی ماوەی بەسەردەچێ، جیاوازی تێدایە لە حەرامەکان، هەیانە هەڕەشەی لەسەرەو هەیانە سووکە و لێخۆشبوون دانراوە بۆی، هەیانە پلەی نزم و بەرزی هەیە.

## باسی حەج

خودا لە سەر ئێوەی داناوە نیازی ماڵی (کەعبە) بکەن کەبووەتە ڕووگەی نەوەی ئادەم، کە دەچنە دیدەنی وەك ڕانەمەڕ پەنای بۆ دەبەن، وەك پۆلە کۆتر خودای پەروەردگار کردویەتی بە نیشانەی گەردنکەچیی خەڵك بۆ گەورەیی خۆی و بڕوابوون بە بەرزیی و شکۆیی خۆی و کۆمەڵێ گوێڕایەڵ و گوێگری داناوە، کە بەدەنگ بانگەوازەکەیەوە بڕۆن و بڕوایان بە فەرمایشەکان هەبێ و شوێنی پەیامبەران بگرنەوە، خۆیان بچوێنن بە فریشتە لەگوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بەدەوری عەرشی خۆی، قازانج و سود وەرگرن لەبازاڕی بەندایەتی، دەستپێشخەری بکەن بۆ کاتی لێبوردن و لێخۆشبوون، خودای پاك کردویە بە ئالای ئیسلام و پەناگەی ئاسایشی پەنابەران، زیارەتی چەسپاندووە و مافی دیدەنی سەپاندووە لەسەرتان، خودا دەفەرموێ:( وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ. خودا داینـاوە لەسەر خەڵکی، زیارەتی ماڵی خودا لەسەر ئەو کەسەی توانای دارایی و بەدەنی هەیە، ئەوەی باوەڕی نییە خودا پێویستی پێی نییە بە هەموو جیهانیان) ئاڵ عمران:٩٧ .

(٢)

## وتارێکی پاش گەڕانەوە لە سیفین ( صفّین )
## لەم وتارەدا ژیانی خەڵك پێش هاتنی سروش و
## سیفەتی یارو یاوەرانی و سیفەتی هەندێ خەڵکی تر

سوپاسی خودا دەکەم بۆ کامڵبوونی بەخششەکانی، گەردنکەچیی بۆ شکۆو گەورەیی، خۆپارێزیی لە گوناح و سەرپێچی و داوای یارمەتی لێئەکەم، لە هەژاریدا تەنها ئەوم بەسە، چونکە ئەوەی ئەو لەسەر ڕێگەی دابنێ هەرگیز ونනابێ، ئەوەی دوژمنکاریی لەگەڵ بکات، ڕزگاری نابێ ئەوەی ئەو بەخێوی بکات هەژار نابێ، ئەم سوپاسە پارسەنگی تەرازوی کارەو باشترین گەنجینەیە.

بەدڵ باوەڕم هەیەو بەزمان بڕیار ئەدەم، کە جگە لە خودا کەس شایەنی پەرستن نییە، گەواهی بەئەزموونی دڵسۆزی، باوەڕم هەیە بەخاوێنی و بێخەوشی، توند دەستم پێگرتووە هەتا ماوم و پاشەکەوتمە بۆ نەهامەتەکانی کە توشم ئەبێ، چونکە ئەوە باوەڕی جوامێرانەیە و دەسپێکی چاکە خوازییە و ڕەزای خودای بەخشندەیە و تروکردن و دەرکردنی شەیتانە.

بەدڵ باوەڕم هەیە و بەزمان دەڵێم، کە (محەممەد) (صلى الله عليه وسلم) بەندەی خودا و ڕەوانەکراویەتی، بەئایەتێکی دیارو ئاشکرا و ئاڵا و نیشانەگەلێکی بۆ ماوە و کتێبی نوسراو و ڕوناکی تیشکدارو پرشنگی بریسکەدار، بۆ لابردنی گومان و بەڵگەی باوەڕپێکراو، ئاگادار کردنەوە لە نیشانەی سزا و تۆڵەی بەزەبر، ئەوکاتە خەڵك لە ئاژاوەیەکدا دەژین کە پەیوەندی پچڕاوە و کۆڵەکەی بەتین لەرزۆك بووە، بنەماکان ناکۆکیی تێکەوتووە، هەرمانەکان پەرش و بڵاو بوون، ڕێی دەربازبوون تەنگەلانەو سەرچاوە کوێر بووەتەوە، شارەزای ڕێگا کزەو نابینایی گشتگیرە، بێفەرمانی خودا ئەکرێ و یارمەتی شەیتان ئەدرێ، باوەڕ بێکەسەو هەموو پایەکانی ڕوخاوە و شوێنەواری کوژاوەتەوە، ڕێگەو بانەکەی ڕزیووە، بەن و پردی ڕوخاوە. بەفەرمانی شەیتان کاریانکردو شوێنی ئەو کەوتن و لە سەرکانی و ئاوی ئەو کۆبوونەوە بەهۆی ئەوانەوە ئاڵاکانی ڕێگە دەکات و بە پێشڕەوی دەڕۆن بۆ پێشەوە. لەناو ئاژاوەگەلێکدا کە بەپێلاو بەسەریاندا دەڕوا و بوون بە ژێرسمیەوە و

دواكەوتوون و لە ژێرناڵەكانیدا ڕاست بوونەتەوە، ئەوانە سەرلێشواو، نـەفام و شـێت، لە یانەیەكی چاك و دراوسێیەكی خراپ خەویان بێدارییە و كلی چاویان فرمێسكە، زانایان لغاوكراوە و نەفامیان ڕێزی لێگیراوە.

## لە وتـارەكانی، كە مەبەستی خانەوادەی پێغەمبەرە
## ( درودو سڵاوی خوایان لەسەر بێت )

ئەوانــە حەشــارگەی نهێنییەكانیــەتی، پەناگــەی كارەكانیــەتی، پارێزگــەی زانیاریەكەیــەتی، پرســگەی فەرمانڕەوایــەتی، ئەشــكەوتی نامەكانیــەتی، چــیای ئاینەكەیەتی، بەهۆی ئەوانەوە پشتی ڕاست بووەتەوە، ئەندامەكانی ترسیان نەماوە.

## لە وتـارەكانی، كە ئـاماژە بە كەسانی تر ئەكات

ئەمانــەش بێبەنــدو باوییــان چاندووە، ئـاوی لـەخۆبایی بوونیـان داوە، نــەمان و لـەناو چـونیان درەو كـردوە، كـەس نـاتوانێ كێـشانەی خـۆی لەگـەڵ ئـال و بـەیتی (محەممەد)(صلى الله عليه وسلم) بكـات، هاوتایـان ناكـات، ئەوانــەی لـەنازو نیعمـەتی ئەمانـدا دەژیـن، ئـەوان بناغـەی ئـایین و كۆڵەكـەی بـاوەڕن، ئـەوەی توندڕەوی بكـات دەبـێ بـۆ لای ئـەمان بگەڕێتـەوە، پەشـیمانی تـەنها بـۆ لای ئەمانـە، مـافی دەسـەڵاتی تایبەتی ئەمانە ڕاسپاردەو میرات، ئێستە ماف گەڕایـەوە بـۆ خاوەنەكـەی، گوازرایـەوە بۆ شوێنی خۆی.

( ٣ )

## وتـارێك كە نـاوی ( شەقشەقە* ) یە سكاڵای لە جێنشینیی هەیە، ئـارامگرتن بەچاك دەزانیێ، باسی دەنگدانی خەڵك ئەكات

بەڵام سوێند بەخوا كـە (فلان) لەبـەری كـرد پـاك ئـەیزانی مـن وەك (تـەوەرەی ئاش) وەهام، لەمنەوە لافاو دەردەچێ، باڵدار ناتوانێ سەركەوێ بۆ لام، بەڵام من ئـەو بەرگەم لە خۆم كردەوە، هەناوم لە ئاستیدا پێچدا، بـیرم كـردەوە دەستـی بـڕاوی بـۆ بەرم یان خۆم بگرم، لەستەمێكی چەموش كە گەورە پیر ئەكات و بچووك ڕیش سپی ئەكات، باوەڕدار ماندووە هەتا دەگاتە لای پەروەردگاری خۆی.

*( پرمەی ولاخ)

## پەسەند كردنی خۆگرتن

وام پەسەند كرد كە خۆگریی لەسەر ئەوە ژیرانەیە، ئارامم گرت لەگەڵ ئەوەی پووش لەچاومدابوو، ئێسقان لەگەرووم‌دابوو، میراتم تالان كرابوو، هەتا (یەكەم) بەرێگەی خۆی ڕۆیشت، سپاردی پاش خۆی بە(فلان) ئەمجا شیعری ئەعشای هێنایەوە بە نموونە، زۆرجیاواز بوو، ئەو ڕۆژەی لە سەر كەژاوە سوار بووم و ڕۆژی (حیان) برای جابر زۆر سەیرو سەمەرەیە لەكاتێكدا لەژیانی خۆیدا لێی بێزار بوو، كەچی پاش مردنی سپاردی بەیەكێكی دیكە، هەردوو گوانیان لەناو خۆیان بەش كرد، ڕەوانەی شوێنێكی زبری كرد كە زەوییەكەی زۆر ڕەق بوو، زبر بوو، چاڵی نێوچاوانی زۆر بوو، دەبوو داوای لێبوردنی لێبكرێ، ئەوەی لەگەردنیدا بوو وەك سواری وشترێكی سەركەش وایە، ئەگەر جڵەوی بگری كونەلوتی ئەدڕێ و ئەگەر بەرەڵای بكات دەیخاتە كەندەڵانێكەوە، خەڵك (قەسەم بەخوا) تووشی ڕێگەی كوێرەڕێ بوون، ناشارەزا بەرێدا ڕۆیشتن، خۆم گرت لەگەڵ درێژی ماوە و ناڕەحەتیی باری سەرشانم كە ئەویش ڕۆیشت لەناو كۆمەڵێك دامیاننا و بەنیازی خۆی منیش یەك لەوانم (پەنا بەخوا لەم ڕاوێژكارییە).

چەند گومانیان هەبوو لەمن لەگەڵ یەكەمدا كەچی هاوتایان كردم لەگەڵ ئەم نموونانە، بەڵام كە ئەوان ناكۆكیان كرد من ناكۆكیم نەكرد، من ڕۆیشتم و ئەوان ڕۆیشتن، پیاوێكیان بەگوێی كینەی خۆی كردو یەكێ تریان بەگوێی خەزوری كرد لەگەڵ (هین و هین) تا سێیەم دەست بەكاربوو، دەستی دوانیانی خستە بن باڵی بۆناو تەرس و ئاخوڕ، كوڕانی باوكی دەستیان كرد بە لەوەڕاندنی ماڵی خودا، وەك كڕانی وشتر بۆگیای بەهار، هەتا گوریسەكەی خاو بووەوە و كردەوەی خۆی پەلاماریدا و سكەڕۆیی و زۆرخۆریی دای بەزەویدا.

## پە یماندان بە عەلی

## ( سلاوی خودای لەسەر بێت )

ئەوەی منی ڕاچڵەكان ئەوەبوو خەڵك ئاپۆرەیان بۆ هێنام وەك یاڵی كەمتیار كەوتنە سەرشان و ملم، لە هەموولامەوە بەسەرما دابارین، بە ڕادەیەك حەسەن و حوسەین(سلاوی خوایان لێ بێت) بوون بە ژێر پێوە، هەردو شانم ئازاری پێگەشت،

لە دەورم گەلەکۆمەکێیان کرد وەك مەڕی ناو پەچە لەملاولامەوە کەوتن، کاتێ شانمدایە بەری ئەم ئەرکە، تاقمێك پەیمانیان شکاند، هەندێکی تر پێیان پچڕاندو بەشێك ستەمکار بوون و یاخی بوون، وەك نەیانبیستبێ فەرمانی خوای بێهاوتا: (ئێمە ماڵەکەی دوا ڕۆژ هەر بۆ ئەوانە دادەنێین کە لەم عەرزە نایانەوێ خۆ بەزلتر بزانن و بەدفەڕیی بکەن، پاشەڕۆژیش هەر بۆ خۆپارێزانە)، بەڵێ بە خوا ژنەوتبویان و تێیگەیشتبوون، بەڵام دنیا لەبەر چاویان ڕازێنرابووەوە و خشڵ و جوانییەکەی سەرسامی کردبوون، بەڵام سوێند بەو زاتەی کە (دانەی چەکەرە پێداوە) و (گیان)ی دروستکردوە، لەبەر ئامادەکاری ئەمانەی ئێستە هەن، هەبوونی سوپا بۆ بڕینی بەهانەو خودا بەڵێنی وەرگرتووە لە زانایان کە سەرکەشی زۆر قەبوڵ نەکەن و ماوە نەدەن بە ئێمە لای ستەمکارو برسیەتی ستەملێکراو، ڕەشوۆی ئەم کارەم دەخستە سەر ملی و بەرەڵام دەکرد، جامی پاشەوەم وەك جامی یەکەم دەرخوارد ئەدان، ئەو کاتە ئێوە بۆتان دەر ئەکەوت ئەو دنیای ئێوە وەك پژمەی بزنێك بێ نرخە لام.

دەگێڕنەوە، پیاوێك کە خەڵکی (سەوادی عێراق) بوو گەیشتە ئەم ئاستە نامەیەکی دایە دەستی و دەستیکرد بە خوێندنەوەی و کە لێ بووەوە، کوڕی عەباس وتی: (میری باوەڕداران خۆزگە وتارەکەت تەواو ئەکرد)، فەرموی:( زۆر دوورە کوڕی عەباس، ئەوە نزگەرمیەك بوو، پەیدا بوو نیشتەوە).

کوڕی عەباس ئەڵێ: ( قەسەم بەخوا بۆ هیچ وتارێك خەفەتم نەخواردوە بەئەندازەی ئەم کۆتایی وتارەی پێشەوای باوەڕداران کەتەواوی نەکرد وەك ویستی).

(٤)

## وتارێك لە وتارە جوانەکانی

## ئامۆژگاری ئەکات پاش کوشتنی تەڵحە و زوبەیر

بە ڕابەریی ئێمە لە تاریکیی دەرباز بوون، پلەی بەرزتان بەدەست هێنا، لە ڕێگەی ئێمەوە گزنگێ لە شەوی تاریکتان بەرکەوت، یاخوا کپ و کەڕ بێت ئەوگوێیەی ئامۆژگاری هۆشیاریی نابیستێت، کەی گوێبیستی دەنگی نزم دەبێ ئەوەی

دەنگی گەورە کەڕی کردبێ، یاخوا ئەو دڵە ئارام بێت کە هەمیشە لە خورپەدایە، هەمیشە چاوەڕێی ئەنجامی  نهێنیگری ئێوەم، پێشبینی و سەرناسیم هەبووە بۆ لە خۆبایی ئێوە، ئەوەی ئێوەی لە من شاردەوە بەرگی ئاینی بەرتان بوو، نیازپاکی خۆم بوو ئێوەی نیشاندام، لەسەر ڕێگەی ڕاستم دانان لەو هەموو کوێرە ڕێگەی بەهەڵەتاندا دەبات، پێکەوە بێشارەزا ڕێگە دەبڕن و چاڵ هەڵدەکەنن و ئاوتان دەست ناکەوێ، ئەمڕۆ بێزمان و بەستە زمان هاتووەتە گۆ، ئەوەی لە من بترازێ ڕای پەسەندی نییە، گومانم لە ڕاستی نییە، ئەوەتەی پیشانمدراوە، (موسا پێغەمبەر)(سلاّوی خوای لێ بێت) ترسی لە خۆی نەبوو، بەڵکو ترسی زاڵبوونی نەفامیی بوو لەسەری و دەسەڵاتی گومڕا و سەرلێشێواو، ئەمڕۆ لە دووڕیانی ڕاست و ناڕاستدا وەستاون، ئەوەی ئاوی پێیە تینوی نابێ.

( ٥ )

## عەباس و ئەبو سوفیان داوایان لێکرد کە بیکەنە خەلیفە پاش ئەوەی پەیماندرا بە ئەبو بەکر لە سەقیفەدا باسی نەکردنی ئاژاوە و ڕەوشتبەرزیی و زانستی خۆی ئەکات

### ( نەکردنی ئاژاوە )

ئەی خەڵکینە.. لەشەپۆلی ئاژاوەدا بە کەشتیی ڕزگاریی خۆتان دەرباز بکەن، خۆتان لادەن لە ڕێگەی دووبەرەکیی، وازبێنن لە خۆهەڵکێشان، ئەوەی باڵی بەهێزی هەبێ سەرکەوتووە، ئەوەش کە دانیشتووە پشووی داوە، ئەمە ئاوێکی ڕەنگ و تامگۆڕاوە، پارووییەکە ئەوەی بیخوا دەیخنکێنێ، ئەوەی بەرهەمی بڕینی پێش پێگەیشتنی وەك گەشتیارێ وایە لە زەوی خۆی کشتوکاڵی نەکردبێ.

## ڕەوشت و زانستی

ئەگەر بڵێم، ئەڵێن: سوورە لەسەر دەسەڵات، ئەگەر بێدەنگ بم، ئەڵێن: لە مردن ئەترسێ، زۆر زۆر دوورە کوڕی ئەبو تالیب پاش ئەم هات و هاوارە، قەسەم بە خودا

بە مردن ئاشناترم بە مەرگ، لە منداڵ بۆ مەمکی دایکی، بەڵکو تێکەڵاو بووم بە شاراوەیی زانیارییەوە، ئەگەر ئاشکرای بکەم ئێوە دەشڵەژێن وەك بەنی ناو بیری قوڵ و ئاودوور.

( ٦ )

## کاتێ داوایان لێکرد دوای تەڵحە و زوبەیر نەکەوێ بۆ کوشتنیان! باسی ئەوە ئەکات کە ناخەڵەتێ

قەسەم بە خوا هەرگیز وەك کەمتیار نابم ڕاوچی بە پاژنەی لە زەوی ئەدا، بەدەنگی نزم بانگی دەکات، ئەویش خەوی لێدەکەوێ، هەتا بە پەت لەقاچی گیر ئەکەن و بەگەردنی لە کونەکەی ڕایدەکێشن، بەڵام بەوەی لەگەڵ ڕاستیدایە ئەدەم لەوەی پشتی تێکردووە، ئەوەی بەگوێم ئەکات، ئەماڵم بەسەری ئەوەی یاخی بووە، هەتا ڕۆژم کۆتایی دێت، دووبارە قەسەم بە خوا هەتا ئێستەش دەیانەوێ مافی خۆم لێزەوت بکەن و لەمنی وەرگرن بۆ خۆیان لەو کاتەی کە خودا پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) بردومتەوە بۆ لای خۆی هەتا ئەمڕۆی ئەم خەڵکە.

( ٧ )

## وتارێکی کە زەمی شوێنکەوتوانی شەیتان ئەکات

ئەوانە شەیتانیان کردووە بەسەرداری خۆیان، ئەویش ئەوانی کردبووە تەڵەوە و ڕاوی پێئەکردن، ئەویش لە سنگیاندا هێلکەی کردوە و هەڵی هێناوە وگاگۆڵکێ و پێیانگرتووە لە کۆشیدا، بە چاوی ئەوان ئەبینێ و بەزمانی ئەمان قسە ئەکات و سواری هەڵەی کردوون و خراپەی لایان شیرینکردووە، ئەوە کاری ئەومیە کە هاوبەشی شەیتانە لەدەسەڵات و وتاری ناڕەوا بە زمانی ئەوانەوە ئەدات.

(٨)

## وتارێکی کە باسی زوبەیر ئەکات و داوای تازەکردنەوەی پەیمان ئەکات

ئەڵێ پەیمانم بەدەست داوە و بەدڵ نەمکردوە، لە ڕاستیدا بڕیاری پەیمانی داوە و پڕوپاگەندەی شاردنەوە ئەکات، ئەگەر ڕاست ئەکات با بەڵگەی سەلماندن بێنێ، دەنا با بگەڕێین بۆ ئەوەی لەگەردنی لابردووە.

(٩)

## باسی خۆی و نەیارەکانی دەکات لە جەنگی وشتردا( جمل )

ئەوان وەك هەورەگرمە بزیسکەیان کردو دۆڕاندیان، بەڵام ئێمە ناگرمێنین هەتا کاری خۆمان جێبەجێ نەکەین، لافاو ناکەین هەتا نەیبارێنین.

(١٠)

## وتارێك لەسەر شەیتان و خەڵکی تری مەبەستە

ئاگادار بن! شەیتان کۆڕی خۆی کۆکردووەتەوە، سوارو پیادەی خۆی هێناوە، من چاوساغ و بەڵەدی ڕێگام، نەخۆ خەڵەتاوم، نەکەس ئەم ئەخەڵەتێنێ، سوێندم بە خودا حەوزیان لێ پڕئەکەم و خۆم ئاوی لێ دەرئەکەم، ناتوانن لێی دەرچن و ناشتوانن لێی دەربازبن.

(١١)

## وتاری بۆ محەممەد حەنەفیەی کوڕی کە لە ڕۆژی حوشتردا ئاڵای دایە دەستی

ئەها شاخ دەجوڵێ تۆ ناجوڵێی، بە ددان بیگرە و سەری خۆت بدە بە خودا، جێێت لە زەوی توند بکە، بۆ دوور بڕوانە لە خەڵکەکە، بزانە سەرکەوتن بەدەست خودایە.

(١٢)

## وتاری كاتێكی، كه خودا سه‌ركه‌وتنیدا به‌سه‌ر خاوه‌ن وشتردا

له‌و كاته هه‌ندێ له‌یارانی وتی: حه‌زم ده‌كرد فلانی برام به‌رچاو بوایه كه خودا سه‌ری خستی به‌سه‌ر نه‌یاره‌كانتدا، ئه‌ویش فه‌رمووی: براكه‌ت دڵی لای ئێمه‌یه؟ وتی: به‌ڵێ، فه‌رمووی: ئێمه دیمان، پاش ئێمه‌ش له‌م سوپایه‌ی ئێمه خه‌ڵكانێ ده‌بینرێ له پشتی باوك و له ڕه‌حمی دایكدایه كه زه‌مانه به‌خشنده ده‌بێت پێیان و باوه‌ڕ به‌وانه به‌هێز ده‌بێ.

(١٣)

## وتارێك له‌باره‌ی زه‌می (به‌سره) و دانیشتوانی پاش ڕوداوی وشتر

ئێوه سه‌ربازی ژنن، شوێنكه‌وتووی وڵاخن، كاتێ قۆڕاندی ئێوه‌ش وه‌ڵامتان دایه‌وه، كه سه‌ربڕا ئێوه‌ش به‌زین و ڕاتانكرد، ئێوه خۆتان ورده مه‌یلتان له ئاژاوه‌یه، ئاینتان دوو فاقییه، ئاوتان سوێره، ئه‌وه‌ی له ناوتان بێت له‌بارمته‌ی گوناهی خۆیه‌تی، ئه‌وه‌ی له پێشتان بێت خوا ڕه‌حمی پێبكات، ئه‌م مزگه‌وته‌ی ئێوه وه‌ك سنگی كه‌شتییه، خودا تۆڵه‌ی بۆ ڕه‌وانه ئه‌كات، له‌سه‌ره‌وه و له ژێره‌وه و هه‌موویان نقوم ده‌بن، له گێڕانه‌وه‌یه‌كی تردا: قه‌سه‌م به‌خوا ئه‌م شاره‌ی ئێوه نقوم ده‌بێ، وا ئه‌زانم چاوم لێیه مزگه‌وته‌كه وه‌ك پێشه‌وه‌ی كه‌شتی یان وه‌ك نه‌عامه قنچه‌كه‌ی داوه.

(١٤)

## وتاری بۆ هه‌مان مه‌به‌ست

خاكه‌كه‌تان له ئاو نزیكه، دووره له ئاسمانه‌وه، عه‌قڵتان سووكه، ئاوه‌زتان گێلییه، ئێوه نیشانه‌ن بۆ تیرهاوێژ و لوقمه بۆ بخۆر و نێچیرن بۆ ڕاوچی.

( ١٥ )

## وتارێکی، ئەوکاتەی گەڕانەوە زەوی موسڵمانان کە ( عوسمان ) بەخشی بووی

بە خوا ئەگەر ئەو زەوییە ژنی لەسەر مارە بڕابێ و کۆیلەی پێکڕابێ، هەڵیئەوەشێنمەوە، لەدادپەروەریدا گوشادی زۆرە، ئەوەی دادی لەسەر تەنگ بێت ستەمی لەسەر تەنگترە.

( ١٦ )

## ئەوکاتە پەیمانی پێدرا لە مەدینە، باسی پاشەڕۆژ دەکات و دابەشیان دەکات

گەردنم بارمتە بێت لەوەی باسی ئەکەم و من کەفیلم لەسەری ئەوانەی ئامۆژگاری و پەندیان وەرگرت لەسزا و تۆڵە، ئەوانەیە کە خۆپارێزیی نەیهێشت بکەونە گومان و تاوانەوە، ئاگاداربن ئەو بەلا و کارەساتەی لەپێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەبوو هەمووی گەڕاوەتەوە بۆتان، قەسەم بەو کەسەی بەڕاست ڕەوانەی کردووە، ئێوە تێکەڵ و پێکەڵ دەبن و شەن و کەو دەکرێن وەك دانەوێڵەی ناو دێزە، سەرەوژێر دەکرێن و تێکدەدرێن، ئەوەی لە ژێرەوەیە ئەکەوێتە سەرەوە و ئەوەی لە سەرەوەیە ئەکەوێتە ژێر، ئەوەی لەپێشەوە لە دوابوو پێش ئەکەوێ و ئەوەی زۆر لە پێش بوو دوا ئەکەوێ، قەسەم بەخودا خاڵێکم نەشاردووەتەوە، تەنها درۆیەکم نەکردوە، ئەم شوێنە و ئەم ڕۆژەم پێوتراوە، هۆشیار بن: تاوان وڵاخی سرك و چەموشە خەڵکیان سوار کردوە و ڕەشۆیان لەسەر داماڵیوە و خاوەنەکانیان دەبەن بۆ ناو ئاگر، خۆ پارێزیی لە گوناهیش وڵاخی هێمن و ئارامە و خەڵکیان سوار کردوە و ڕەشۆیانداوە بەدەستیانەوە و دەیانبەنە بەهەشت، ڕاست هەیە و ناڕاست هەیە، هەردوو لایان پەیڕەوانی هەیە، ئەگەر ناڕاست خەڵکی زۆربێت و فەرمانبەری بێت لە کۆنیش هەر وابووە، ئەگەر ڕاست دۆستی کەم بێت

زۆر کەم ڕێك ئەکەوێ ئەوەی ڕۆیشت بگەڕێتەوە، دووریش نییە بگەڕێتەوە.

منیش (شەریف ڕەزی) ئەڵێم ئەم وتارە نزیکە ئەوەندە جوانی تێدایە، جوانکردن پێی ناگا، ئەوەندە ڕامانی تێدایە لە خۆبایی بوونی تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەش زیادە جوانبێژیی و ڕەوانبێژیی تێدایە، کە بە زماندا دێت و کەم ڕێبوار پێیدا گوزەری کردوە، ئەوە لەم قسەی منە حاڵی ئەبێ کە ڕەوانبێژیی شارەزا بێت و لەسەرچاوەوە ڕێگر بێت (تەنها زانا دەیزانن و تێیدەگەن).

## بەشێك لەم وتارە خەڵك دەکات بە سێ بەشەوە

بێئاگایە ئەو کەسەی بەهەشت و دۆزەخ لەبەرچاوی بێ و هەمووکاتی بۆ چاکە تەرخان نەکات، مرۆڤ سێ تاقمە: زۆر چالاکە و تیژە بۆ چاکە، ئەوە سەرکەوتووە، چالاکە بەڵام سستە، ئەوە بەهیوا دەژی، بێ پەروایە، کاڵ قەرارە، ئەوە کەوتووەتە ئاگرەوە، ڕاست و چەپ ڕێونکەرە، ڕێگە ناوەڕاستە، ئەو شەقامە قورئان و ئاسەواری پێغەمبەری لەسەرە(صلى الله عليه وسلم)، لەوێوە فەرمودە جێبەجێ دەکرێ و سەرفرازیی لەوێیە، ئەوەی بەزارەکیی بانگەواز بکات تیاچووە، ژێرکەوتووە ئەوەی ساختە بکات، ئەوەی ڕووی لە ڕاستی وەرچەرخێنێ تێدا چووە، بەسە بۆ نەفامی ئینسان کە قەدری خۆی نەزانێ، لەگەڵ خۆپارێزیدا ڕەگی ڕەسەن نافەوتێ، ڕووەکی کەس تینوی نابێ، لەماڵی خۆتان خۆوەشێرن و نێوانتان چاك بکەن، پەشیمانیی لەدواتانەوەیە، جگە لەخوا سوپاسی کەس مەکەن و تەنها سەرزەنشتی خۆتان بکەن.

(١٧)

## وتارێ لەبارەی ئەو کەسەی شان ئەداتە بەر فرمانێك و شایستە نییە

ئەوانەی لای خودا زۆر بێزراون، دووکەسن: یەکەم کەسێکە کە خودا ئاگری داوەتە دەست هەواو ئارەزووی خۆی، ئەوە بۆ خۆی لادەرە لە ڕێگەی ڕاست، خوی داوەتە وتارگەلێك کە خۆی دایهێناوە و بانگەشەی گومڕایی دەکات، ئەوە خۆی بۆ لەخشتە بردنی ئەوانەیە کە بڕوایان پێیانە، ڕێگەی ونکردووە لە ڕێبازی پێش خۆی و ڕێگەی ئەوانەی دوایان ئەکەون و وندەبن کاتێ لە ژیان دایەو پاش مردنی،

كۆلكێشى گوناهى كەسى تره، بارمتەى تاوانى خۆيەتى، پياوێكى تر نەزانينى كۆكردوەتەوه و هەنگاوى ناوه بۆ خەڵەتاندن و فێڵكردن لە نەفامەكانى ميللەت، بەپەلە دەڕواتە ناو تاريكايى نەزانينەوه، كوێره لە ئاستى گرێ بەستى ماوه و مۆڵەت، نيوەپياوه و ناويان ناوه زاناو زانا نييە، زوو هاتووه و زۆرى كۆكردوەتەوه، لەوەى كەمى باشتره لە زۆرى، هەتا تێر ئەبێ لە ئاوى شلێو و خەزنە بە مشتى پڕو پوچ كۆ ئەكاتەوه، دانيشتووه بۆ دادوەريى و لە ئەستۆى گرتووه، گوايە ئەوەى لاى خەڵك نەزانراوه ئەم ڕوونى ئەكاتەوه، ئەگەر مەسەلەيەكى گرنگى بكەوێتە بەردەم كۆمەڵێ بيرى ڕزيو ئامادە دەكات بۆى و بڕيارى لەسەر دەدا، لە تێكەڵكردنى گوماناوييەكان وەك تەونى جاڵجاڵۆكەيە، نازانێ ڕاستى كردوه يان هەڵە، ئەگەر بەڕاستى بزانێ ترسى هەڵەى هەيە، ئەگەر بە هەڵەى بزانێ ئومێدى ڕاستى هەيە، نەفامێكە كۆمەڵێ نەفامى تێكەڵكردووه، شەوكوێره و بارى لەسەر كۆمەڵێ ولاخى چەموش و شەوكوێر داناوه، هەرگيز دانى نەناوه بە زانست و زانياريدا، گێڕاوەكانى پێشينى ئەدا بەبا، وەك پووش و پەلاش شارەزا نييە، قەسەم بەخوا بە بڕيارى پەسەند لەسەر ئەو مەسەلەى بۆى باسكراوه شايستەى ئەو كاره نييە كە پێيدراوه، گومانى زانينى ئەوەى كە پەسەندى ناكات ئەيكات، نازانێ ئەوەى باسى ئەكات ڕێبازى كەسانى تره، ئەگەر كارێكى لەسەر تاريك بوو ئەيشارێتەوه، چونكە ئەزانێ نەزانە، لە بێداريى و ستەمەكانى خوێن ئەچۆڕێ و هات و هاوارى ميراتبەرانە.

من تەنها سكاڵا بۆ لاى خودا ئەبەم لە كۆڵێك نەزان و نەفام كە بەنەفاميى ئەژين، بەنەزانيى ئەمرن، لايان خوێندنەوەى مافێك لە نوسراوێكدا بازاڕێكى شكاوه، گرانترين شتومەك لايان گۆڕينى ناوەڕۆكى نوسراوه، چاكە لايان لەهەموو خراپەيەك خراپتره، خراپە لايان لەهەموو چاكەيەك چاكتره.

(١٨)

## وتەیەکی لە دژی ناکۆکیی زانایان لە فەتوادا، دژی ئەوانە بە قەولی خۆیان کار دەکەن و پێیانوایە کاری ئاینیی دەگەڕێتەوە بۆ قورئان

ئەگەر مەسەلەیەك هاتە لایان بەڕای خۆیان فەرمان دەردەکەن، هەر هەمان مەسەلە دەبرێتە لای کەسێکی دیکە جیاوازی ئەوان دەڵێت، پاشان هەموویان کۆدەبنەوە لە پێشەواکەیان کە ئەوانەی کردووە بەدادوەر، ئەویش ڕای هەموویان پەسەند ئەکات! خوایان یەکە، یەك پێغەمبەریان هەیە، یەك کتێب و دەستوریان هەیە، ئایا خوای پاك فەرمانی بە ناکۆکیی و جیاوازی بیروڕا داوە؟ ئەوانیش فەرمانی جێبەجێ دەکەن، یان نەیکردوە لە جیاوازی و ئەوان بێگوێی دەکەن، ئەی خودای پاك و بێگەرد ئاینی ناتەواو ناردووە و داوای یارمەتی لەوان کردوە تەواوی بکەن؟ یان ئەوانە هاوەڵی خودان بۆیان هەیە گفت بدەن و ئەویش دەبێ ڕازی بێت، یان خودای پاك ئاینی کامڵ و تەواوی ناردووە و پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) کەمتەرخەمی کردوە لەگەیاندنیدا، خودا خۆی دەفەرموێ: (مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ... ئێمە لەناو ئەم کتێبە هیچ شتمان هەڵنەبواردووە) الانعام:٣٨، ئەم کتێبە بەیانی هەموو شتێکی کردووە، ئەم کتێبە بازێکی تری باوەڕ پێهێنانە و جیاوازی تێدا نییە، خودا دەفەرموێ: (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا... ئەگەر قورئان کاری کەسێکیتر بوایە بە غەیرەز خودا دیارە مەبەستی ناڕێك و دژ بە یەکتریان فرە تێدا پەیدا دەکرد) النساو:٨٢، قورئان دەرەوەی سەر سوڕهێنەرو ناوەوەی زۆر قوڵە، دەگمەنەکانی کۆتایی نییە، نادیارەکانی تەواو نابێ، تاریکاییەکان تەنها بە قورئان ڕۆشن دەبێتەوە.

(١٩)

## وتەیەکی، لە وەڵامی (ئەشعەسی قەیس)دا لەسەر دوانگەی کوفە

پێشەوا لەکاتی وتاردا بوو بە ئەشعەسی گوت: میری موسڵمانان ئەو قسەیە دژی خۆتە! بۆ سودی تۆ نییە! پێشەوا بەنرمی بۆی ڕوانی و وتی: جا چوزانی کامەیان دژمە و کامەیان سودمە؟ نەفرەتی خودا و نەفرەتی نەفرەتکاران لەسەرت بێت، جۆڵای کوڕی جۆڵا، دوو ڕووی کوڕی بێ باوەڕ، قەسەم بەخوا، لە بێباوەڕیدا جارێك بەدیل گیراوی و لە ئیسلام جارێکی تر، لەهەردوو دیلییەکەتدا سامانی خۆت و کەس و هۆزت سەرانەیان بۆ نەدای، ئەو کەسەی شمشێر لەسەر ملی خێڵی خۆی دابنێ و مردنیان بۆ ڕەوانە بکات، مافی خۆیەتی خزمانی ڕقیان لێ بێت و (بیانی) بێگانە باوەڕی پێنەکەن.

(٢٠)

## وتەیەکی دژی بێئاگایی و کەمتەرخەمییە و داوای گەڕانەوە بۆ لای خودا دەکات

ئەگەر ڕووبەڕوو بەرچاوتان بکەوێ ئەوەی پێش ئێوە مردووە و چاوی پێکەوتووە زۆر نارەحەت دەبوون و ترس دایدەگرتن و گوێگر دەبوون و فەرمانبەردار دەبوون، بەڵام لە ئێوە شاراوەیە ئەوەی ئەوان بینیویانە و بەم نزیکانە پەردە لەسەر چاوتان لادەدرێ، پێتان نیشاندراوە و ئەگەر بتانەوێ ببینن پێتان دراوە ئەگەر گوێبگرن ڕێگەتان نیشاندراوە، ئەگەر خۆتان بگرن، ڕاستیتان پێ بڵێم من پەند و ئامۆژگاری خۆمم کردووە و ترساندومن، وەك پێویستە ترساندن، ئەوە لە خوداوە هاتووە بۆ پێغەمبەران(صلى الله عليه وسلم) لە پەیام، جگە لە هاوڕانی پەیامی ئاسمان هەر مرۆڤە.

( ٢١ )

## وتارێكی گشتگیری پەندو كارزانی

مەبەست لە پێشتانە، ڕۆژی قیامەت لەبەردەمتانە و بەتەماتانە، بارتان با سووك بێت، زوو ئەگەنە جێگە، ئەوەی لە پێشەوە ڕۆیشتووە زۆر نابات ئەوەی دوای پێی ئەگات.

( ٢٢ )

## وتارێكی، لەكاتی بیستنی پەشیمانییدا
## هەندێك لە بەڵێن و زەمی ئەو كارەیان دەكات و خوێنی عوسمان ئەخاتە ئەستۆیان و  هەڕەشەی بەگژداچوونیان لیٚ ئەكات

ئاگاتان لێیە كەشەیتان بالۆرەی بۆ تاقمی خۆی لێداوە، جڵەوی خۆی داوەتەبەر، بۆ ئەوەی ستەم بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەكەیان و ناڕاستی بگەڕێتەوە بۆ بنجی خۆی، سوێند بەخوا كاری خراپیان لەسەرم نەبینیوە، لە نێوان من و خۆیان دادپەروەریان نەكردوە، داوای مافێك ئەكەن، كە خۆیان وازیان لێهێناوە، خوێنێك داوا ئەكەن خۆیان ڕشتویانە، ئەگەر من هاوبەشبم لەو مافە، ئەوا پەشیمانی لە خوێنەكە هەیە، ئەگەر ئەوان خۆیان كردووە بەخاوەنی، ئەوە ئۆباڵی لە ئەستۆی ئەوانە، گەورەیی بەڵگە لەسەر ئەوانە، ئەوان مەمكیٚ ئەمژن، كە لە شیری بڕیونەتەوە، كارێكی نایاسایی مردوو زیندوو ئەكەنەوە، بێئومێد بێت ئەوەی ئەم بانگەوازە ئەكات، داوای لە كێیە؟ وەڵامی چی ئەدرێتەوە، من ڕازیم بە بەڵگەی خودا لەسەریان و ئاگاداری خودا لەسەریان.

ئەگەر بێفەرمانی بكەن بە دەمی تیژی شمشێر وەڵامیان ئەدەمەوە، هەر ئەوە دەرمانی ناڕەواییان و یارمەتی مافدەدا، سەیرو سەمەرەیە كە داوای ڕوو بەڕووبونەوە ئەكەن لە من و خۆم ڕائەگرم لە بەگژا چووندا، دایكی كۆسكەوتوو ڕۆڵەڕۆیان بۆ بكات، كەی من هەڕەشەی جەنگم لێكراوە، كەی ترسم هەبووە لە شەڕ؟ من بڕوای تەواوم بەخودایەو گومانم لە ئاینی خۆم نییە.

(٢٣)

# وتاريك بۆ هەلنانی هەژاران لەسەر ئارامگرتن و دەولەمەند لەسەر بەزەیی

لە پاشدا رۆزی لە ئاسمانەوە دیتە سەر زەوی و دلۆپی باران بۆ هەموو گیانلەبەریکە بە پیی ئەو بەشەی بۆیدانراوە، کەم و زۆر، ئەگەر دیتان برایەکتان زیادەی پیدراوە، لە خیزان، سامان، نەفەر، (سۆدەرمیی) و شەر هەلگیرسان و فیتنەنانەوەی بۆ مەنینەوە، مرۆڤی باوەردار چاو بەس لە خۆی نەکات، ئەگەر کاریکی پەستی لیدەرکەوێ هەمیشە دلی لە ئاستی ئەلەرزێ کە باس بکرێ، بەلام نەفس نزمەکان خۆیانی پیوە هەلئەکیشین، وەك یاریکەری سەرکەوتوو چاوەرێی یەکەم بۆ دەرچوونی خۆی ئەکات، کە دەسکەوتی دەستکەوێ و قەرزو قۆلەی لە مل بیتەوە، هەر وەك مرۆڤی موسولمانی بیتاوان چاوەرێی دوو پاداشتی چاکەیە: ئەوەیان کە خودا بەلینی پیداوە یان رۆزی خودا، کەواتە هەم خاوەن مال و سامانە و هەم ئایین و رەسەنیی خۆی پاراستووە، مال و مندال، کشتوکالی دنیا، کاری چاکەش، گشتی ئەو دنیایە، زۆر کات خودا کۆیان دەکاتەوە بۆ هەندێ کەس، دوورکەوتنەوە لە ئیرەیی کە خودا بۆ خۆی داوای کردوە دوورکەونەوە، لە خودا بترسن بەو شیوەیەی کە سەرزەنشت بەسەرتان نەهینێ، بێ رووپامایی و بێ ناو و ناوبانگ کاربکەن، چونکە ئەوەی کار بۆ غەیری خودا بکات، خودا رەوانەی دەکا بۆ لای ئەوکەسەی کاری بۆ کردووە، داواکارم لە خودا شوینی شەهیدان و هاورێی بەختەوەران و هاورازی پیغەمبەران( درودی خوایان لە سەر بیت) بین.

## فیرکردنی دەولەمەندەکان

خەلکینە! هەرگیز هیچ کەس هەرچەند ساماندارب دەست لە خیلی خۆی هەلنەگرێ، بەرگری بکات بەدەست و زمان لە هۆزی، ئەوانە باشترین پاسەوانن لە پشتییەوە، باشترین کۆکەرەوەی پرش و بلاوی ئەون و چاکترین دلسۆزن بۆ کاتی روودانی کارەسات، زمانی خیر کە خودا بیبەخشێ بە مرۆڤ لەناو خەلکدا وا لەمال و سامان باشترە، کە کۆی دەکاتەوە و جیبیدیلێ بۆ میراتبەران، لەوانەش دەبێ هیچ

كەس لە ئێوە خزم نەگۆڕێتەوە بەبێگانە، ئەگەر هەژاری لێدیت، بۆی جێبەجێ بكات، چونكە ئەگەر نەیبەخشێ ماڵی زیاد ناكات و ئەگەر بەخشی كەم ناكات، هەر كەس دەستی بەرامبەر هۆزەكەی نوقاو بێت، تەنها دەستێك نوقاوە لە ئاستی هەژاران، بەڵام دەست زۆر لە ئاستی ئەمدا قوچاوە، هەركەس نەرم بێت لە ڕووی خزمی خۆیدا هەمیشە خۆشەویستە لای خزمانی خۆی.

( ٢٤ )

## وتەیەكی گشتگیر، لە بارەی درووستیی دژایەتیی نەیار و بانگەشەی فەرمانبەرداریی خودا

لعمری! (بەوخودایەی گیانی منی بەدەستە) لەسەرم قورس نییە كوشتاری ئەوەی نەیارە لەگەڵ حەق و ئەوەی هەنگاوی كوێرانە ئەهاوێ لە لاساریدا بە دوو ڕوویی و خۆحەشاردان لە ڕاستی بە فێڵ و خەڵەتاندن، كەواتە بەندەكانی خودا لە خودا بترسن، بڕۆن بۆ لای خودا لە خوداوە، بۆ ئەو ڕێگە بڕۆن كە بۆی دیاری كردوون، بەو ئەرك و پێویستییە كە لە سەری داناون، لەمەولا (عەلی) كەفیلی سەركەوتنتانە، هەرچەند تائێستا یارمەتیتان نەداوە.

( ٢٥ )

## وتارێك

(هەواڵ گەیشتبوو بە پێشەوا كە یارانی مەعاوییە دەستیانگرتووە بەسەر وڵاتدا وە هەردوو كارگێڕەكەی لە یەمەنەوە هاتبوون بۆ لای كە عەوبەیدللای كوڕی عەباس و سەعیدی كوڕی تەمران ئەوكاتەی كە بوسری كوڕی ئەرتات زاڵبووبوو بەسەریاندا ئەوكات پێشەوا هەستایەوە و چووە سەر دوانگە بە تووڕەییەوە لە قورسی و گوێ نەدانی یارانی لە جیهاد و بەرگریی وە سەرپێچییان بۆ پێشەوا)، ئەوجا پێشەوا وتی: تەنها كوفە ماوە بەدەستمەوە بیگرم و بەرەڵای بكەم، ئەگەر هەر تەنها تۆ مابی لەگەڵ ئەو هەموو ئاژاوە و گەردەلول و گێژاوەدا، خودا بتبڕێ و بتباتەوە،

ئەم شیعرەی خوێندەوە: بە گیانی باوکی باشت ئەی عەمر! تەنها کەمێ ئاو و چەوری بنەوە ماوە بۆ من!! ئەو فەرمووی ئاگادارم کە (بوسر) یەمەنی گرتووە، قەسەم بەخوا بڕوام وایە ئەوانە بەهۆی یەك باوەڕیان بە ناڕاستی خۆیان سەر ئەکەون بە سەر ڕاستی ئێوەدا، بەناکۆکیی و پەرش و بڵاوی بیروڕاتان و بەگوێ نەکردنی پێشەواتان لەگەڵ ڕاستیداو گوێڕایەڵی ئەوان بەسەرکردەی خۆیان لەگەڵ ناڕاستیدا، بەدڵپاکیی و پاکیی ئەوان بۆ ڕابەری خۆیان و خیانەتی ئێوە و بە چاکی ئەوان بۆ وڵاتی خۆیان و گەندەڵی ئێوە، ئەگەر جامێکی گەورە بسپێرم بە یەکێ لە ئێوە ئەترسم سەرقاپەکەی بدزێ.

خودایە! من ئەوانەم لێ بێزراوە و ئەوانیش منیان لێ بێزراوە، من لەوان بێزارم و ئەوانیش لە من بێزارن، خودایە ئەوانەم بۆ بگۆڕە بەچاکتر لەوان و ئەوانیش بکە بە تووشی لە خۆیان خراپتر، خودایە ورەیان بتوێنەوە وەك بەفر لە ئاودا، قەسەم بەخوا حەزم ئەکرد لە باتی ئێوە هەزار سوارم لە کوڕانی فیرسی کوڕی غەنەم بوایە، لەناو ئەوان ئەگەر داوا بکەم سوارەی زۆر دێن بەدەنگمەوە، بە پەلە وەك هەوری هاوین، ئەوجا پێشەوا هاتە خوارەوە لەسەر دوانگە.

(٢٦)

## وتارێ، وەسفی عەرەب ئەکات پێش پەیام و باسی خۆی ئەکات پێش پەیمان

### (عەرەب پێش پەیام)

خودای پاك و بێگەرد (محەممەد) (صلی الله علیە وسلم)ی ڕەوانە کردوە بۆ هۆشیارکردنەوەی هەموو خەڵکی جیهان، ئەمیندارى سروش ڕەوانەکراوە، ئێوەی عەرەب لەسەر خراپترین ئاین و ڕێبازو بەرنامە بوون، لە خراپترین شوێن و ماڵدا بوون، نیشتەجێی خاکێکی زبر بوون، جێگەی ماری بێگوێ و کەڕ بوون، ئاوی لێڵ و شێلوتان ئەخواردەوە، نانی زبر و بێ پێخۆرتان ئەخوارد، خوێنی یەکدیتان دەڕژاند، بەندی پەیوەندیتان دەپچڕاند، (بت)تان دانابوو بۆ پەرستن، تاوان لەناوتان باو بوو.

### هەر لەم وتارەدا :

تەماشائەکەم و سەرنج ئەدەم هاوکارم نییە، جگە لەخانەوادەی خۆم، حەزم نەکرد بۆ مردنیان بەرم، پووش لەچاو بووم و ئاو لەگەرو گیراوم، ئارامم گرت لە سەر ئێشی گەروم و دەمم لە گوژالکە تالتر.

### هەر لە هەمان وتاردا، کە باسی عەمری کوڕی عاس ئەکات

پەیمانی نەدا هەتا کرێی پەیمانەکەی وەرنەگریْ، یاخوا دەستی پەیمانـدەر سەر نەکەویْ و بیْ ئابڕو بێت سپاردەی پەیمانپێدراو، کەواتە کەرەسەی جەنگ ئامادەکەن و هەموو ئامێرەکانی پەیداکەن، چونکە گڕی بەرزبووەتەوە و شۆڵەی زمانەی کێشاوە، خۆ ڕاگربن چونکە دەستەبەری سەرکەوتنە.

( ٢٧ )

## وتارێکی، داوای بەرگریی ئەکات
## کە هەواڵی پەلاماری مەعاوییەی بۆ ئەنبار پێگەیشت،
## لەگەڵ ئەوە یارانی ڕانەبوون و باسی شارەزایی خۆی ئەکات لەجەنگدا
## ( گەورەیی جیهاد )

لەپاش ئەمە.. جیهاد دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، خودا واڵای کردووە بۆ دۆستەکانی خۆی، بەرگی شمشێرنەبڕی خودایە و مەقامی قایمییە، هەر کەس وازی لێبێنیْ و پشتگوێی بخات، خودا بەرگی سەر شۆڕیی لەبەر ئەکات و بەلا دامانگیریی دەبیْ، بە ئەنجام نەدانی جیهاد پەستیی و سەرشۆڕیی و بێنرخی توش دەبیْ، خودا پەردە بەسەر دڵیدا دەهێنیْ و دەسەڵاتی لێوەردەگرێتەوە، ستەمی لێئەکریْ و ئەچەوسێتەوە و لە دادپەروەریی بێبەش دەبیْ.

## داوای ڕا پەڕین لە خەڵك دەكات

ئاگاداربن من شەو و ڕۆژ ئێوەم بانگكردووە بۆ جەنگ، ئەم تاقمە بە ئاشكراو بە نهێنیی بە ئێوەم گەیاندووە، ئێوە پەلاماربدەن پێش ئەوەی ئەوان پەلاماربدەن، قەسەم بەخودا هەر كەس لەماڵی خۆیدا پەلامار بدرێ دەشكێ و سەرشۆڕ دەبێ، ئێوەش بێتوانا بوون و لەسەر شانی یەكدیتان داناوە و سەركز بوون، هەتا پەلاماردران و وڵاتەكەتان لێداگیر كرا.

ئەوە براكەی (غامید) سوارانی هێناوەتە ئەنبار، (حەسانی كوڕی حەسانی بەكر)یان كوشتووە سوارانی ئێوەی لەسەنگەرەكانیان دەركردووە، بۆیان گێڕاوەمەتەوە كە پیاوێ لەوانە سەر ئەكات بەماڵی ژنی موسڵمان و ژنی پەنادراو بازن و خڕخاڵ و گەردنبەندو گوارەیان لێ دادەڕنێ، تەنها دەسەڵاتی پاڕانەوە و لالانەوەیان هەیە لەگەڵ گریان، ئەوجا بەكۆڵ و بارەوە وازیان هێناوە، یەك كەسیان برین لە لەشی نەكەوتووە و خوێنی نەڕژاوە، ئەگەر مەردی موسڵمان لەداخا بمرێ كەس لۆمەی ناكات، بەڵكو لای من شایستەیە بۆ مردن، ئەی هاوار زۆر سەیرو سەمەرەیە، قەسەم بەخودا مایەی فەوتانی دڵەو خەم و خەفەت ئەهێنێ، ئەوانە لەسەر ناڕاستی خۆیان ئەوەندە كۆكن و ئێوەش لەسەر ڕاستی خۆتان ئەوەندە ناكۆكن، دەك نەفرەت و خەجاڵەت و سەرشۆڕیی و لاتیی بارو نەسیبتان بێت، وەك نیشانەتان لێ هاتووە، تیرتان بۆ دەهاوێژرێ و جووڵە ناكەن، پەلامارتاندەدەن و ئێوە دەنگ ناكەن، داگیرتان ئەكەن و ئێوە نقە ناكەن، بێفەرمانی خودا ئەكرێ و ئێوە پێی ڕازین.

ئەگەر لە گەرما بڵێم با پەلامار بدەین، ئێوە ئەڵێن: بەم گەرما گیانسوتێنە مۆڵەتمان بدە، هەتا گەرما كز ئەبێ ! ئەگەر لەسەرما و زستاندا داوا بكەم ئەڵێن: بەم سەرماو سەهۆڵبەندانە، ماوەمان بدە هەتا سەرما نامێنێ، ئێوە لە سەرما و لە گەرما ڕائەكەن، ئەگەر لە گەرما و سەرما ڕابكەن، قەسەم بەخودا لە شمشێر باشتر ڕائەكەن!.

## بێ هیوایی لەخەڵك

ئێوە ئەی شێوە پیاو، پیاویش نین، فام و ژیریتان وەك ساوایە و ئاوەزتان وەك كەیبانۆی ناو ماڵە، حەزم نەكرد ئێوەم بینی و ئێوەم ناسی، قەسەم بەخودا ئەو

ناسینە پەشیمانیی پێدام و خەفەتم پێخوارد، دەك خودا بتانكوژێ ! دڵی منتان پڕ كردووە لە زوخاو، سنگم داغان بووە لە ڕق و كینە، بە قوم قوم داخ و خەفتتان دەرخوارد داوم، هەموو ڕاوو بۆچونمان گۆڕاوە لەبەر بێگوێی و سەرپێچی ئێوە، هەتا ئەو ڕادەیە قورەیش ئەڵێ: كوڕی ئەبو تالیب ئازایە بەڵام لەجەنگدا ناشارەزایە، خودا بگاتە فریای باوكیان! كەس هەیە لەوان بەقەدەر من شارەزای جەنگ بێت، كەس بە ئەندازەی پێشینەو ئەزموونی منی هەبێ؟ تەمەنم نەگەیشتبووە بیست دەستم داوەتە شەڕو جەنگ، ئەوەتا بۆ شەست ئەڕۆم! ئەوەی بەگوێی نەكردی ڕاوێژی نییە.

( ٢٨ )

## وتارێ لەبارەی چەند بێداریی و هۆشیارییەكەوە

سوپاس بۆ خودا كە هەرگیز بێئومێد نیم لەبەزەیی، لەپاشان دنیا پێشی هەڵكردووە و ئامازەی داوە بەماڵئاوایی، ڕۆژی دوایی لە ناكاو بەرەو ڕوو دێت، ئەمڕۆ ڕامكردن و خزمەتكردنی ئەسپە، سبەی ڕۆژی كێبەركێیە، خەڵاتی سەركەوتووش بەهەشتە، پاداشتی پەككەوتوو دۆزەخە، ئەوە كێیە لە تاوان بگەڕێتەوە پێش مردنی، ئەوە كێیە كار بۆ خۆی بكات، بۆ ڕۆژی پێش داواكاری و پێویستی، ئێوە لە ڕۆژانی ئومێددا دەژین كەوەختی مردنی لەدواوەیە، هەر كەس لە ڕۆژانی ئومێد كار بكات پێش هاتنی ئەجەلی، ئەوە كارەكەی سوودی هەیە، كەواتە كارا بن لە خۆشیدا وەك كاران لە ناخۆشیدا، ئاگادارن كە شتێك نییە وەك بەهەشت كە داواكاری خەوتبێ، یان وەك دۆزەخ ئەوەی دەبێ هەڵبێ خەوتبێ، ئەوەی حەق سوودی بۆ نەبێ باتڵ زیانی هەیە بۆی، ئەوەی ڕێگەی ڕاست نەگرێ، ونبوون بوڵای خۆی كێش ئەكات، فەرمانتان پێدراوە بۆ كۆچ و بارو تێشووتان بۆ دیاریكراوە، ئەوەی زۆر ترسم لێیەتی شوێنكەوتنی ئارەزووە، درێژی هیوایە لەم دنیا تێشوو هەڵگرتن بۆ ڕزگاریتان سبەی لەو دنیا.

( ٢٩ )

## زەحاکی کوڕی قەیس پیاوی مەعاوییە دای لە کاروانی حاجییەکان

خەڵکینە کە لەشتان کۆیە و ڕاوتەگبیرتان پرش و بڵاو، گوتارتان بەردی ڕەق پارچە پارچە ئەکات و کردارتان دوژمنتان هانەدا، لە کۆبوونەوەتان دەڵێن واوا ئەکەین، کە وەختی جەنگ هات دەڵێن بۆ ئەولا، دوور بکەوە لە ئێمە، سەرکەوتوو نابێ ئەوەی بانگی ئێوە بکات، دڵئارام نابێ ئەوەی گیری بەدەستی ئێوەوە خواردبێ، بیانووتان هەموو پڕوپوچە و بیانووتان وەك بەرگری قەرزکوێرە بۆ دانەوەی قەرز، پەست و سەرشۆڕ ناتوانێ ستەم لەسەر خۆیلادا، ماف بە ئیشی جددی دەست ئەکەوێ، لەپاش ئەم یانەیە بەرگری لەکام یانە دەکەن، لەپاش من لەگەڵ کام ئیمام شەڕ ئەکەن، خەڵەتاو، قەسەم بەخودا ئەوەیە ئێوە خەڵەتاندووتانە، ئەوەی بە ئێوە سەرکەوتنی دەستکەوێ تیری بێ بەشی بەرکەوتووە، ئەوەی بە ئێوە تیرئەندازی بکات تیری شکاوی هاوێشتووە، قەسەم بەخودا بڕوام بە قسەتان نەماوە، بەتەمای سەرکەوتنتان نیم، هەڕەشە لە دوژمن بە ئێوە ناکەم، ئەرێ ئەوە چیتانە، دەرمانتان چییە؟ چارتان چییە؟ ئەو خەڵکەی ئەولا هەر وەك ئێوە پیاو نین؟ گفتاری بێ کردار، بێ ئاگای بێ پارێزگاریی، تەماعی ناحەق!؟

( ٣٠ )

## وتارێ، لەبارەی کوشتنی عوسمانەوە

ئەگەر بەفەرمانی من بووە، من بکوژم!، ئەگەر دژی بام یارمەتی دەربووم، بەڵام ئەوەی یارمەتیدەری بوو ناتوانێ بڵێ دەستبەرداری ئەوەی من لەو باشترە، ئەوەی دەستبەرداری بوو، ناتوانێ بڵێ یارمەتیداوە، ئەوەی ئەو لە من باشترە، بەڵام من کۆی هۆکارەکانی ئەزانم، ئەم پیاوە خۆپەسەندی کرد بۆ خۆی، خراپ بەکاری هێنا، ئێوە توڕە بوون، توڕە بونتان خراپ بەکارهێنا، خودا فەرمانی خۆی هەیە لە هەردوو بەخراپ بەکارهێنانی دەست بەسەرا گرتنی ئەو توڕەیەی ئێوە.

( ٣١ )

## وتەیەکی ئەوکات ( عەبدوڵڵای عەباس )ی نارد بۆ لای زوبەیر لە ڕۆژی وشتر پەشیمانی کاتەوە

بە عەبدوڵڵای گوت: پەیوەندی بە تەڵحەوە مەکە، چونکە ئەگەر پەیوەندی پێوە بکەی، دەبینی شاخی قنج کردووەتەوە و بەوە ماوە سواری کاری قورس ئەبێ و بەئاسانی دێتە بەرچاو، بەڵام زوبەیر بێنە، چونکە ئەو نەرم و نیانە پێی بڵێ، کوڕی خاڵت پێت ئەڵێ کە لە حیجاز بووم دەتناسیم و لە عێراق نامناسی، چی پاڵی پێوەنای بۆ ئەوە و چی لایدای لەمە.

( ٣٢ )

## وتارێکی، کە زەمی زەمانە ئەکات خەڵك دەکات بە پێنج گروپ و داوای نەویستیی دنیا دەکات

### ( زەمی زەمانە )

خەڵکینە! ئێمە لەچەرخێکی سەرشێتیی و کاتێکی پێنەزاندا دەژین، پیاوچاك بە خراپ ئەژمێردرێ و ستەمکار زیاتر هار و هاج ئەبێ، سود وەرناگرین لەوەی فێری بوین، پرسیار ناکەین لەوەی نایزانین، ترسی ڕوداوی دڵکوتمان نییە هەتا تووشی دەبین.

## ڕیز بەندی پیاوخراپان

خەڵك لەسەر چوار جۆرە، یەك لەوانە ئەوکەسەیە، کە داوای مەزنایەتیی ئەکات لە بەر پەستیی و کەمنرخی خۆی، شمشێری کول و نەبڕو دەستبەتاڵی و بێماڵیی، یەکێکی تر، شمشێری هەڵکێشاوە و خراپەی ئاشکرا کردووە و سوارو پیادەی هێناوە خۆی بۆ لاساریی ئامادەکردوە، دینی فەوتاندووە بۆ ماڵی دنیاو هەلی بۆ ئەقۆزێتەوە، سوارەی بۆ کۆ ئەکاتەوە، دوانگەی بۆ بەرز ئەکاتەوە، خودا ئەو (دوکان)ە ببڕێ کە خۆت بکەیتە (دراو) و پاداشتی نەبێ لای خوا.

یەکێ تر ئەوەیە دنیای ئەوێ بەکاری ئەو دنیا، ئەو دنیای ناوێ بەکاری ئەم دنیا، لە خۆی دڵنیایە، هەنگاوی وردی بۆ دەنێ و خۆی هەڵکردوە و خۆی ڕازاندوەتەوە بۆ مەزنایەتیی، خۆی لە ژێر پەردەی خودادا شاردووەتەوە بۆ گوناح و تاوان، یەکێکی تر لەوانە کە داوای گەورەیی ناکات لاوازیی و سوکیی خۆیەتی و نەبوونی دام و دەزگا، چوار مشقی داوە بە ناوی قەناعەتەوە و بەرگی دنیانەویستیی لەبەر کردووە، لەوەش نە پەچەی هەیە و نە لەوەڕگە.

## ئەوانەی لایەنی خودایان گرتووە

با ئەو دنیایە لەبەر چاوتان سووک بێت، وەك گەڵاو وردە سەلەم و وردە خوری دەمی برینەی مەڕ، پەند وەربگرن لەوانەی لە پێشەوە ڕۆیشتوون، پێش ئەوەی لە ئێوە پەند وەربگرێ، ئەوانەی پاش ئێوە دێن، وازی لێبێنن بەبێ نرخیی، چونکە ئەو وازی لەوانە هێنا، کە لە ئێوە زیاتر دڵبەندی بوون.

( ٣٣ )

## وتارێکی کە ڕۆیشت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەهلی بەسرە کە کرۆکی هەناردنی پێغەمبەران باس دەکات ( درودی خوایان لەسەر بێت )

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێ: لەزیقار چوومە لای میری موسڵمانان، کە خەریکی پینەکردنی پێڵاوەکەی بوو، فەرمووی: نرخی ئەم پێڵاوە چەندە؟ وتم: بێنرخە، فەرمووی قەسەم بەخودا لای من لەمەزنایەتیی ئێوە باشترە، مەگەر مافێك پیادە بکەم، یان بەتاڵێك لەناو بەرم، ئەوجا لەسەر دوانگە ئەمەی گوت: حیکمەت لەرەوانەکردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، خودای پاك محەممەدی ڕەوانەکردووە و لەناو عەرەب تەنها کەسێ نەبووە نامەیەك بخوێنێتەوە و داوای پێغەمبەرێ بکات، ئەو خەڵکەی دایەبەر، ئەم بەرزییەی دایەو بەم شوێنەی گەیاندن، ئەوەتا داری دەستیان ڕاستەو ژێر پێیان پتەوە.

## چاكەی عەلی
## ( سلاوی خوای لەسەر بێت )

بەلام قەسەم بەخودا، من لە دامێنی سوپا بووم، هەتا هەمووی گەڕایەوە سەر ڕێگەی ڕاست، هەرگیز بێ توانا نەبووم و ترسنۆك نەبووم، ئەم سەفەرە هەر بۆ ئەو مەبەستەیە، ئەبێ كاری بەتاڵ ونجڕ ونجڕ بكەم، هەتا ڕاستی و حەق لە بنبالی دەر ئەكەم.

## سەرزەنشتی یاخیبوان

ئاخر من چیم داوە لە قورەیش، قەسەم بەخودا لەكافرییاندا شەڕم لەگەڵ كردون و شەڕیان لەگەڵ ئەكەم، لەیاخیبوون و سەرشێتییاندا، من هەمان هاوڕێیان بووم، دوێنێ و ئەمڕۆش هاوڕێیان دەبم.

( ٣٤ )

## وتارێكی بۆ هاندانی خەڵك
## پەلاماری شام بدەن پاش تەواو بوونی ( خەواریج )

ئاخ... داخ لە خەڵك، ئۆف لەداخی ئێوە!، خەفەتبارم لەگلەیی ئێوە، چۆن ڕازیت بە دنیا لەباتی ڕۆژی دوایی؟ بۆچی نزمتان هەڵبژاردووە بەسەر بەرزیدا؟ كە بانگتان ئەكەم بۆ جیهاد، چاوە كوڕەتانە وەك كاتی سەرەمەرگ، خۆتان گێل ئەكەن وەك سەرخۆش، قسەتان ئەگۆڕێ، سەرتان لێتێك ئەچێ، وەك ئەوە تووشی نەخۆشی دەروونی بووبن، ئێوە گەمژەو بێعەقڵن.

هەرگیز ئێوە جێگەی متمانەی من نابن، ئێوە ئەو كەنارە نین جێگای باوەڕ بن، ئەو بەرهەیوانە نین، كە پێویست بن، ئێوە گەلە حوشترێكی شوانەی ونبوون، لەهەموو لایەكەوە كۆتان بكەنەوە لەلایەكی ترەوە بلاوەی لێئەكەن، بە خودا زۆر خراپە، شەڕ بە ئێوە گەرم بكرێ، فێڵتان لێ ئەكرێ، وەلامی فێڵ نادەنەوە، ئەملاولاتان دائەپاچن و تورە نابن، دوژمن ناخەوێ بۆتان و ئێوەش بێئاگاو خەوالوون، قەسەم بەخودا ئەوەی ورەی نەبێ ژێر ئەكەوێ، سوێندم بەخودا كە شەڕ

گەرم بوو مردن گەرمایی هات، دەوری (كوڕی ئەبو تالیب)تان چۆڵكردووە، قەسەم بەخودا هەر كەس دوژمنی بەسەر خۆیدا زاڵكرد گۆشتی لێئەكاتەوە و ئێسقانەكانی ورد ئەكات و پێستەكەی لێدائەماڵێ، پاشەڵی قەڵی لاواز دڵە، تۆ ئەگەر حەز ئەكەی، ئەم جۆرە پیاوەبە، بەڵام من قەسەم بەخودا مەگەر شمشێری ئەشرەفیی سەرم لە لاشەم بكاتەوە، ئەم كارە بكەم و دەست و قاچم لێبكەنەوە هەروا دەبم، پاش ئەوە خودا چی ئەكات فەرمانی خۆیەتی.

## ڕێگەی ڕاست و ڕەوان

خەڵكینە! من حەقم لەسەر ئێوە هەیە، ئێوەش مافتان لەسەر من هەیە، مافی ئێوە لەسەر من ئامۆژگاریتانە و دەستكەوت دابەش بكەم بەسەرتاندا، فێری زانیاریتان بكەم بۆ ئەوەی نەفام نەبن و فێری ئەدەب و ڕەوشتتان بكەم بۆ ئەوەی زانابن، بەوەفا بن بۆ پەیمان، بەڵام حەقی من لەسەرتان ئەوەیە، دڵپاك بن لە بەرچاو و پاشملە بەدەنگمەوە بێن، كە بانگم كردن و فەرمانم پێدان بەگوێم بكەن.

( ٣٥ )

## وتارێكی، پاش ( تەحكیم ) و بڕیاری هەردوو حەكەم

سوپاس بۆ خودا هەرچەندە زەمانە كارەساتی قورسی هێناوە و ڕوداوی ناهەمواری داهێناوە، بڕیار ئەدەم، كە هیچ پەرستراوێك جگە لە(الله) شایەنی پەرستن نییە و هیچ هاوەڵی نییە و (محەممەد) (صلی الله علیه وسلم) بەندەو پێغەمبەری ئەوە، پاش ئەوە... ئاگادار بن بێفەرمانی ئامۆژگاریی و دڵسۆزیی بە ئەزموونی شارەزا، ئەبێتە مایەی هەناسە ساردیی و خەم، پەشیمانی لەدوایە، من هەرچی لە خەزێنەی ڕاو ڕاوێژم هەبوو بۆ ئێوەمدا لە كەو و بێژەنگ، ئەگەر بەگوێی (قەیسەر) بكرایە، ئێوە وەك دژێكی دڵڕەق و خۆپەسەند بەگوێتان نەكردم، یاخی بوون و سەرسەختانە هەڵگەڕانەوە، بەڕادەیەك ئامۆژگاری گومانی پەیڕەو ئەكرد، لە ئامۆژگاریەكەی دەست و بازووی سارد بووە، وەك شاعیری هەوازنم لێهات، دەڵێ: من فەرمانم پێكردن لە ناو پێچی بەلەمەكەدا، كەچی ئێوە لە ئامۆژگاری یەكەم نەگەیشتن، هەتا چێشتەنگاوی سبەی.

( ٣٦ )

## وتارێکی بۆ ترساندنی تاقمی نەهرەوان

من هۆشیارتان ئەکەمەوە، لەوانەیە بکوژرێن و فرێ بدرێنە ناو ئەم ڕوبارە و بکەونە ناو ئەم چاڵ و زیندانە، بەبێ ڕێنومایی خودا و بێ بەڵگەی ڕوون، کە هەتان بێت خانەوادەکانتان فرێیداون، قەدەری خودا داوی بۆ داناون، ئەوە من بووم دژی (تەحکیم) و ئێوە بوون دژو دژوار بەگوێتان نەکردم، بەڕادمیەك ڕای خۆم گۆڕی بۆ ئارەزووی ئێوە، ئێوە کەللە پوچ و نەفام و بێعەقڵن، ئاخر من چیمکردووە باوك نەتان بینێ، چ خراپەیەکم کردووە زیانم بۆ ئێوە بووە و (بەلاّ)م بەسەر هێناون!.

( ٣٧ )

## وتارێکی، پاش ڕوداوی نەهرەوان

من بەباشی شانم دایە بەری ئەوکارە، کاتێ ئەوان شکستیان هێنابوو، من دەرکەوتم بەڕوونی ئەوکاتە، ئەوان چووبوونە قەوانەکەیانەوە، من لەبەر تیشکی ڕووناکی خودا کارم دەکرد ئەوکاتەی ئەوان وەستابوون لەکار، من زۆرینەی دەنگ بووم و زۆر لەپێشەوە بوم، لە فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپەدا، جڵەوی ئەسپم بەردابوو، لە مەیدانا گرەوم بردبوەوە، وەك چیا بووم زریان نایجوڵێنێ و گەردەلول پرش و بڵاوی ناکاتەوە.

هەرگیز عەیب و عارم نەبوو خەڵك باسم بکات، کەس نەیتوانی توانجم لێبگرێ، بێکەس و لاواز لای من کەسدارو بەهێز بوو، هەتا حەقی بۆ ئەسێنم، بەهێز لای من بێدەسەڵاتە هەتا حەقی لێوەرئەگرم، ڕازین بەقەزاو قەدەری خودا، هەموو کارمان بەو سپاردووە، ئایا قابیلە درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) بکەم. قەسەم بەخودا یەکەم کەسم کە بڕوام هێناوە، چۆن یەکەم کەس ئەبم درۆ هەڵبەسم، لەکاری خۆم ورد بوومەوە، تەماشا ئەکەم پێش ئەوەی پەیمانم پێبدرێ فەرمانم جێبەجێ کردو ئەرکی سەرشانم بۆ کەسانی تر جێبەجێ کرد.

( ٣٨ )

## وتارێکی لەبارەی ناونانی گوماناویی بە گومان

ئەزانن بۆچی کاری گوماناویی بەم ناوە ناونراوە؟ چونکە نزیکە لە حەقەوە، مەردانی خودا لە ژێر تیشکی یەقیندا ئەڕۆن و، ڕێناسییان چاو ڕوون و شارەزایە، دوژمنانی خودا بانگەشەی گومڕایی ئەکەن و شارەزاییان بێ بیناییە، ئەوەی لە مردن بترسێ لێی ناخەڵەسێ، ئەوەی حەزی لە مانەوە بێ پێی نادرێ.

( ٣٩ )

## وتارێکی کە ئاگاداری گرتنی( عين التمر ) بوو لەلایەن نەفامانی بەشیرەوە

چیبکەم تووش بووم بەوانەی گوێڕایەڵ نابن بۆ فەرمان، کە بانگیانم کرد بێوەڵامن، بێوەجاخ بن، چۆن وەڵامی هاوکاری و یارمەتی خودا دەدەنەوە؟ ئەوە ئاینێك نییە کۆتان بکاتەوە؟ ئەی غیرەتێ نییە پاڵتان پێوە بنێ بۆ یەکێتی؟ هەمیشە هاوارتان لێئەکەم و بەپاڕانەوە بانگتان ئەکەم ئەی هاوار!! بەڵام ئێوە گوێ بیستم نابن، بەفەرمانم ناکەن، هەتا هەموو عارو شورمییتان دەردەکەوێ، بە ئێوە تۆڵە ناسەندرێت، مەبەست بە ئێوە نایەتەدی، بانگم کردن بۆ یارمەتی براکانتان، ئەقۆڕێنن وەك حوشتری قۆڕەگرتوو و قورس و بێ هێزن وەك حوشتری ناوەکەڕێژو پشت زامار، پاش ئەمە سەربازێکی بچووکی کەم لە ئێوە، کەلاواز و لەرزۆك (وەك بەئاشکرا ببینن کە بەرەو مردنیان دەبەن).

( ٤٠ )

## وتارێکی لەسەرخەواریج کە ئەیانوت: ( فەرمان هەر فەرمانی خودایە )

ئەوجا فەرمووی: وتەیەکی حەقە بۆ مەبەستێکی بەتاڵ بەکار دێت، ئەوانە مەبەستیانە بڵێن، مەزنایەتیی و فەرمانڕەواییە، پێویستە بۆ خەڵك میریان هەبێت،

چاك یان خراپ، باوەڕدار لە ژێر فەرمانیدا بێت، بێباوەڕیش بە ئارامیی بژی، هەتا خودا کۆتایی پێئەهێنێ، باج و خەرج کۆکاتەوە، بچێ بەگژی دوژمندا، مەردم لە ژیاندا بێترس بن، مافی لاواز بستێنێ لە زۆردار، پیاوچاك دڵئارام و پیاوخراپ بێ زۆر و ستەم.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا کە تەحکیم فەرز کرایە سەر پێشەوا، چاوەڕێی فەرمانی خودا ئەکەم لەسەرتان، ئەوجا فەرمووی: میرایەتی چاك کاری پیاوی چاك و پارێزگارە، مەزنایەتیی خراپ، پیاوخراپ سوودی لێوەرئەگرێ، هەتا ماوەیەك هەبێت و مەرگ پێی ئەگات.

## (٤١)

## وتارێکی کە ( نا ) لە غەدر ئەکات و هەڕەشەی لێئەکات

وەفا هاولفی ڕاستییە، هیچ پارێزگاری نابینم لەو باشتر، هەرگیز تاوانی کوشتنی پەنامەکی نادات، ئەوەی بزانێ پاشەڕۆژی چۆنە، ئێمە لە زەمانێکدا ئەژین، کە خەڵك پیلان و غەدر بەژیریی دائەنێن و خەڵکی نەفامیش بەژیریی و فام و تەگبیری جوانی دائەنێن، ئەوە چیانە!! خوا لەناویان ببات، ئەوانە شارەزای ڕامیاری و زیرەکین، ئەتوانن فێڵ و پیلان بگێڕن، بەڵام لەترسی فەرمان و نەهی خودا نایکەن، باش بەچاو ئەیبینن و توانایان هەیە ئەنجامی بدەن، بەڵام بەهەلی ئەزانن ئەوەی بێپەروایە لە ئایینداریی و گوێ ناداتە گوناح.

## (٤٢)

## وتارێکی لەسەر شوێننەکەوتنی ئارەزوو و هیوا درێژیی بەدنیا

خەڵکینە! ئەوەی زۆر ترسم هەبێ لە سەرتان دووشتە: شوێن هەواو نەفس کەوتن، دڵ بەندی بەدنیاوە، چونکە شوێنکەوتنی ئارەزووی نەفس، ڕێگە لە ڕاستی ئەگرێ، دڵبەندی بەدنیاوە، ڕۆژی دوایی لە بیردەباتەوە، ئاگادار بن! دنیا زۆر بەپەلە پشتی هەڵکردووە و ڕۆیشتووە، تەنها چۆڕێك لە بنی کاسەکەدا ماوە، بخۆرەکە بۆی

نەخوراوەتەوە و لێی جێماوە.

ئاگادار بن! ئەوە ڕۆژی دواییە بەرەو ڕوومان دێت، هەریەکەیان کوڕی خۆی هەیە، ئێوە کوڕی ئەو دنیابن، کوڕی ئەم دنیا مەبن، چونکە هەموو ڕۆڵەیەك بۆلای دایکی خۆی ئەڕوات، ئەمڕۆ کاری لێپرسینەوەیە و سبەی لێپرسینەوەی بێ کاروکردارە.

( ٤٣ )

## وتارێکی کە یارانی داوایان لێکرد بچێ بۆ شەڕی شام ئەوکاتەی کە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای نارد بۆ لای مەعاوییە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگی شام

ئامادەبوونی من بۆ جەنگی ئەهلی شام و ئەوکاتەش کە جەریرلای ئەوانە، ئەوە ئاماژەیە بۆ داخستنی دەرگای شام و لادانی ئەهلی شامە لەچاکە ئەگەر ویستیان، بەڵام من کاتم دیاریکردووە بۆ مانەوەی جەریر، لەوێ نامێنێتەوە، مەگەر بێ فەرمانی بکات، یان فێڵی لێبکرێ، باش وایە پەلە نەکەین، ئێوە خۆتان ئامادە بکەن و خۆ ئامادەکردنم لا خراپ نییە، من ئەم کارەم باش تاوتوێ کردووە و ورد بوومەتەوە لە لووت و چاوی و ناوو دەرەوەم ئەمدیوودیوو کردووە، جگە لە شەڕ یان بێ فەرمانی شتیتر نابینم، ئەمەش هەر بووە فەرمانداری لەسەر میللەت بووە و چەند کاری نەکردەی کردووە، خەڵك تووڕە بووە لە خەلیفەو کاریان کردو نارازی بوون و گۆڕییان.

( ٤٤ )

## فرۆشتنی دیل

مەسقەلەی کوڕی هوبەیرەی شەیبانی چوو بۆ لای مەعاوییە، پاش ئەوە دیلەکانی فرۆشت، پێشەوا داوای پوڵەکەی لێکرد، پێشەوا گوتی: خوا ڕووی مەسقەلە ڕەش بکات، کاری پیاوانەی کرد وەك بەندە ڕایکرد و ماوەی نەدا وەسف بکرێ، ئەگەر لای ئێمە بوایە، ئەوەی پێی بدرایە لێمان وەردەگرت و پاشماوەمان دوا ئەخست.

( ٤٥ )

## وتاری لە جەژنی ڕەمەزاندا

سوپاس بۆ خودا، کە هەرگیز بێئومێد نیم لەبەزەیی و هەرگیز بێبەش نیم لە بەخشندەیی، نائومێد نیم لە لێبوردنی، هەرگیز لە بەندایەتی ڕووم وەرنەگێڕاوە، ئەو خودایە، کە بەزەیی بێ بڕانەوەیە و بەخشندەیی نابڕێتەوە.

### زەمی دنیا

دنیا یانەیەکە تێداچوونی بۆ بڕاوەتەوە، دانیشتوانی ئەبێ کۆچ بکەن، شیرین و سەوزە، بە پیری داواکارییەوە پەلەیەتی، تێکەڵاوی گیانی ئەوەی چاوی لێی بووە، ئێوەش باربکەن و بگوازنەوە بەو تێشوەی پێتانە، جگە لە بژێوی مەسرەفی تێدا داوا مەکەن، داوای زیاتر لە بژێویی مەکەن.

( ٤٦ )

## وتارێکی، کاتی چوونی بۆ شام
## لە کاتێ پای نایە ئاوزەنگیی، نزای کرد

خودایە پەناگرم بە تۆ لە ناخۆشیی و ماندوو بوونی سەفەرو لە گەڕانەوە بە نائومێدیی و دیمەنی ناخۆش لە خێزان و ماڵ و منداڵ، خودایە! تۆ هاوڕێی سەفەرمی و تۆ ئاگاداری ئەهل و عەیالی، تەنها تۆ ئەتوانی بەیەکیان شاد بکەی، چونکە بۆ ئێمە ئەوەی جێماوە لەگەڵمان نییە و ئەوەی لەگەڵمانە جێنەماوە.

( ٤٧ )

## وتارێکی کە باسی کوفە ئەکات

ئەی کوفە وا ئەبینم! وەك چەرمی عوکاز سیرمە سیرمەت ئەکەن، جەنگ، کارەسات گەلێك بەسەرتا دەهێنن، لەسەر باڵی بومەلەرزە دەهەشۆکێیت، من ئاگادارم هەر ملهوڕێك نیازی خراپت لەگەڵ بکات خودا تووشی دەکات بەکاری سەرگەرمەوە و ڕووبەڕووی دەردی کوشندەی ئەکات.

( ٤٨ )

## وتـارێكی كه چوو بۆ كوفه، نزیك نوخه‌یله به‌ره‌و سیفین

سوپاس بۆ خودا هه‌ركات شه‌و دادێ و تاریك ده‌كات، سوپاس بۆ خودا هه‌ر كاتێ ئه‌ستێره ده‌ركه‌وێ و له‌چاو ڕوون بێ، سوپاس بۆ خودا كه نازو نیعمه‌تی نه‌بڕاوه‌یه، ناتوانرێ پاداشته‌كه‌ی بدرێته‌وه.

پاش ئه‌مه... من پێشه‌نگی سوپام ناردووه، فه‌رمانم داوه له كه‌ناری ئه‌م شیوه له‌نگه‌ر بگرن، هه‌تا فه‌رمانیان بۆ دیاری ئه‌كه‌م، ئه‌مه‌وێ ئه‌م ناوچه بسپێرم به هه‌ندێ له ئێوه، له كه‌ناری دیجله جێگیربن، ئێوه و ئه‌وان پێكه‌وه په‌لاماری دوژمن بده‌ن، ئێوه پاڵپشتی ئه‌و هێزه‌بن.

( ٤٩ )

## وتـارێكی كه باسی په‌روه‌ردگار و زانستی خودایی ئه‌كات

سوپاس بۆ خودا كه نهێنی كاره‌كانی شاردووه‌ته‌وه، به‌هه‌ندێ نیشانه ئاماژه‌ی پێكردووه، چاوی زاناو دانا ته‌واو نابینێ، نه چاوی ئه‌وه‌ی، كه نه‌یبینیوه لاری هه‌یه له‌سه‌ری و نه دڵی ئه‌وه‌ی كه په‌ی پێ بردووه ته‌واو ئه‌یبینێ، له‌سه‌ری هه‌موو سه‌ره‌وه‌یه، هیچ شت له‌سه‌ری نییه، له هه‌موو شتێ نزیكه‌و هیچ شت له‌و نزیك تر نییه، هه‌رگیز به‌رزییه‌كه‌ی دووری نه‌خستووه‌ته‌وه له بوونه‌وه‌ره‌كانی و نزیكی له‌وانه‌وه هاوشانی نه‌كردووه له گه‌ڵیان، ژیریی و فام ناتوانێ سنووری سیفه‌تی دیاری بكات، له پێویستی ناسینی نه‌یشاردووه‌ته‌وه، ته‌نها ئه‌وه كه گه‌واهیی ده‌دات، گشت ئالآكانی بوون له‌سه‌ر به‌زۆر باوه‌ڕپێكردنی له دڵی بێباوه‌ڕ، شكۆ و به‌رزیی ته‌نها بۆ ئه‌وه، ناجۆره له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی ئه‌یچوێنن و ئه‌وانه‌ی بێباوه‌ڕن.

( ٥٠ )

## وتارێکی لەبارەی وێرانیی ئەم گەردوونە بەهۆی ئاژاوە و گەندەڵییەوە

ڕوودانی هەر ئاژاوە و گەندەڵییەك بەوە دەست پێدەكات، كە خەڵك دوای هەواو ئارەزوو ئەكەون، فەرمانگەلێك دروست دەبێت، كە دژە لەگەڵ پەیامی خودا، هەندێ مەردم یارمەتی پیاوان دەدەن بۆ ئاینی جیاواز لە ئاینی خودا، ئەگەر باتڵ پاڵنەر بێت لە ئاوێتەی حەق شاراوە نەدەبوو لەسەر ئەوانەی پێی هەڵئەسن، خۆ ئەگەر حەق پاڵفتە بكرێت لەگومانی باتڵ، زمانی نەیارانی لێ كۆتا دەبوو، بەڵام لەمەیان بەرداسێك وەرگیراوە و لەویان بەرداسێك وەرگیراوە و تێكەڵاو بوون، ئالێرە شەیتان سواری سەری دۆستەكانی دەبێت و ئەوانەش لە خوداوە چاكەی پێ ڕەوابینراوە ڕزگار دەبن.

( ٥١ )

## ئاو برین لە سوپاكەی عەلی

ئەو كاتەی پیاوانی مەعاوییە ئاویان لە سوپاكە بڕی لەسەر جۆگەیەكی فورات، ئەوان كوشتنیان دەرخوارد داون، یان ئەوەتا دان بنێن بە سەرشۆڕیی و پێینی جێگە بۆ خۆتان دابنێن یان شمشێرەكانتان ئاوبدەن لە خوێنیان تێر ئاو ئەبن، مردن لە ژیانی ژێردەستیدایە، ژیان لە مردنی سەركەوتوان دایە، ئەوە بزانن مەعاوییە دەستەیەكی كەمی لەبەرەڵاكان هێناوە و ڕاستی لەبەرچاویان شاردووەتەوە، بۆیە سنگی خۆیان كردووە بە نیشانەی مردن.

( ٥٢ )

## وتارێ لەبارەی دنیا نەویستیی

ئاگادارن كە دنیا پەكی كەوتووە، بەرەو ماڵئاوایی دەڕوا، چاكەی خراپ بووە، پشتی هەڵكردووە لە دۆستەكانی، پاڵی ناوە بەدانیشتوانەكەیەوە، جیرانەكانی ڕازی كردوە بۆ مردن، هەموو شیرینی تاڵ كردووە، هەموو ڕوونەكانی لێڵ كردووە، هیچ نەماوە جگە لە كەمێ تەڕایی لە بنی كاسەكەدا، یان چۆڕێ كە كەم ئاو بنجی پێوە

ئەنێ، ئەگەر تینوو بیمژێ تێر ئاو نابێ، خۆتان ئامادە بکەن بەندەکانی خودا بۆ کۆچ و بار لەم ساڵەی کە بڕیارە نەمێنێ، هیوا زاڵ نەبێ بەسەرتانا، باکات لەسەرتان درێژ نەبێ.

## پاداشتی دنیا نەویست

قەسەم بەخودا ئەگەر وەك دایکی منداڵمردوو شیوەن بکەن، بانگ و سەڵا هەڵدەن وەك گمەی کۆتر، دەنگ بەرزکەنەوە وەك ئاوازی زەبورخوێنەکان، هەرچیتان لەماڵ و منداڵ هەبوو ببەخشن بۆ نزیکبوونەوە لە خودا، یەکیان لێبوردنی خراپەیەکتان کە فریشتە تۆماری کردووە لە سەرتان، زۆر کەمترە لەو پاداشتەی من داوام کردووە بۆتان و لەو تۆڵەی کە ترسم هەیە ترستان بێت، قەسەم بەخوا ئەگەر هەناوتان بتوێنمەوە و چاوتان دەربێت بە ئارەزوو یان لە ترسان بەخوێن و تەمەندرێژ بن، هەرگیز ئەو دنیایە نامێنێ، هەرگیز ئەم کردارەتان پاداشتی ئەو هەموو نازو نیعمەتە نابێ کە پێتان دراوە، ئەگەر هەموو تواناتان خەرج بکەن بەرامبەر ئەو بەخشینە گەورانە کە پێتان دراوە و ڕێگەی باوەڕتان دراوە.

## باسی قۆچی قوربانیی ئەکات

بۆ قۆچی قوربانی باش ورد بینەوە لەگوێی و چاوی، ئەگەر چاو و گوێی ساغ بوو ئەوە قوربانییەکە تەواوە، هەرچەندە شاخ شکاو بێت و قاچەکانی بە شوێنی خۆیدا ڕاکێشێ بۆ کوشتارگەکە.

( ٥٣ )

## وتارێکی، وەسفی یارانی دەکات لە سیفین ئەو کاتەی کە نەیاندەهێشت شەڕی شام بکات

ئەوکاتەی هێرشیان هێنایە سەرم وەك پەلاماری گەلەحوشتری تینوو، ڕۆژی ئاودانیان کە شوانەکەیان ڕەشوەی داماڵی بن و هەوی لێ کردبن بۆ ئاو خواردنەوە، بەڕادەیەك کەمی مابوو بمکوژن یان یەکتر بکوژن، منیش سەرو ژێری ئەم کارەم ئەکرد، بەڕادەیەك خەوم لێ زڕا، بۆ هیچ دەرفەتێك نەماوە لە بەردەمم یان

بەگژیانـدا بـچم یـان بێبڕوایـی بـەو پەیامـەی کـە محەممـەد(صـلی اللە علیـە وسـلم) هێناویە، لەبەر ئەوە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ شـەڕ لام چاکتر بـوو لـە تۆڵەی خـودا، مردنی ئەم دنیایەم لا سووکتر بوو لەمردنی ئەو دنیا.

( ٥٤ )

## وتـارێ کە یارانی گلەییـان ئەکرد لە دواکەوتنی شەڕ لە سیفین

بەڵام ئەو قسەیەتان کە ئەڵێن، ئەم هەموو دواکەوتنە لەبـەر ئەوەیـە کـە حـەزم لەجەنگ نییە؟ دەی قەسـەم بـەخودا گـوێ نـادەمێ بـچم بـۆ مـردن یـان مـردن بێـت بۆلام، ئـەو قـسەیەتان کـە ئـەڵێن: گومـانم لەڕاستی خـەڵکی شـامە، قەسـەم بـەخودا پەلاماری هیـچ شـەڕێکم نـەداوە یـەك ڕۆژێـك کـە حـەزم نـەکردبێ کۆمـەڵێك ڕێگـەی ڕاست بگرن و بەهۆی منەوە ڕزگار بن یـان خـەڵکێك شـەوارە بکـەن بـۆ لای ڕوونـاکی مـن بـێن، ئـەوکارەم زۆر لاپەسـەند بـووە، کوشـتاریان لـە سـەر ڕێـی ونکردنیـان، هەرچەندە تاوانی خۆیان بێت.

( ٥٥ )

## وتـارێ کە باسی یارانی پێغەمبەر ئەکات
## لە ڕۆژی سیفیندا کە داوای ئاشتی کرد

ئێمە لەسـەر دەمـێ کـە لـە خزمـەت پێغەمبـەردا(صـلی اللە علیـە وسـلم) بـووین، باوك و کوڕو براو مامی خۆمان ئەکوشت، هـەتا ئـەهات بیروباوەڕمـان بـەهێز ئـەبوو، زیاتر گەردنکەچ دەبووین و ڕێگەی ڕاستمان دەبڕی، زیاتـر بەئارام بـووین لـە ئـێش و ئازار و سوور بـووین لەسـەر جیهاد، ڕێـك ئەکـەوت پیـاوی ئێمـەو پیـاوی ئـەوان وەك پاڵـەوان یـەکتریان ئـەهێنا و ئـەبرد و خۆیـان ئـەخواردەوە و ئـەجویی، کـە کامیـان کاسەی مەرگ دەرخواردی ئەویکەیان بـدات، ئـەوکات جـارێ بەسـەر دوژمـن و جـارێ دوژمن بەسەر ئێمەدا سەر ئەکەوت، کە خـودا ڕاسـتی ئێمـەی بـۆ دەرکـەوت دوژمنـی شکاند و پیرۆزی و سەرکەوتنی بۆ ئێمە نارد، هەتا ئیسلام جێگیر بوو، خەڵك ملی بۆ ڕاکێـشاو وڵاتـەکانی خۆیانیـان دابەدەسـتەوە، لعمـری! (بەوخودایـەی گیـانی منـی

بەدەستە)، ئەگەر ئەوەی ئێوە ئەیکەن ئێمە بمانکردایە تەنها یەك پایە بوو ئیسلام نەدەبوو، تاقە خەڵفێك سەوز نەدەبوو، ئەوەی ئێوە ئەیکەن سوێندم بەخودا بەخوێن دایدەدۆشن و پەشیمانیی بە دواوەیە.

( ٥٦ )

## وتاریٚ بۆ یارانی

حەز ئەکەم ئاگادار بن کە دوای من پیاوێك پەیدا ئەبێ، گەروی فراوانە! ورگی دەرپەڕیوە و شۆڕ بووەتەوە، ئەوەی دەستی بەسەردا بگات ئەیخوات و ئەوەی دەستی بەسەردا نەگات هەوڵی بۆ ئەدا، شەڕی لەگەڵ بکەن و بیکوژن، بەڵام ناتوانن بیکوژن، ئاگاداری بن داواتان لێ ئەکات کەجنێوم پێ بدەن و خۆتان بێوەری بکەن لە من، جنێو بدەن چونکە زەکات و پاککەرەوەی منەو بۆ ئێوەش ڕزگارییە، بەڵام بێوەری لە من مەکەن، چونکە من بە پاکیی و چاکیی لەدایکبووم، لەباوەڕو کۆچدا لە پێشەوە بووم.

( ٥٧ )

## وتارێکی، کە لەگەڵ خەواریج وتوێژ دەکات کە دەڵێن: ( فەرمان تەنها بۆ خودایە )

خودا گەردەلولتان بەسەردا بکات، قەرەچۆڵتان ببڕێتەوە، پاش باوەڕهێنان و جیهادم لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) گەواهی بدەم لە سەر بێباوەڕیم (بەڕاستی ڕێم ونکردووە و شارەزای ڕێگا نیم)، دەبڕۆن بۆ خراپترین پاشەڕۆژ و پاشگەز ببنەوە بۆ دواوە، بەڵام پاش من سووك و ڕسوا ئەبن و لەژێر شیری بڕندەدا بن و بێبەش بن لەدەسەڵات و دەسەڵات ستەم لەسەرتان بکاتە پەیڕەو.

( ٥٨ )

## وتاریّ، کە نیازیەتی شەڕی خەواریج بکات

یاران پێیان وت: خەواریج لە ڕوباری فورات لەسەر جسری نەهرەوان پەڕیونەتەوە، فەرمووی: کوژرانیان لەتەنکاوەکە دەبێت، قەسەم بەخودا دەکەسیان ڕزگاریان نابیّ و دەکەس لە ئێوە تیا ناچیّ.

( ٥٩ )

## پاش کوشتاری خەواریج

(بە میری مسوڵمانان وترا میری باوەڕداران ئەو کۆمەڵ هەموو تێدا چوون، لە وەڵامدا پێشەوا وتی: نەوەڵلا دڵۆپەیەك بوون لە پشتی باوك و ڕەحمی ئافرەت، هەرکەسیان لێپەیدا بێت شاخی ئەشکێت، هەتا وایان لێدێت دەبنە چەتەو ڕێگر.

( ٦٠ )

## وتارێك*

پێشەوا وتی: پاش من خەواریج مەکوژن، چونکە ئەوەی داوای ماف بکات و بە هەڵەدا بچێت وەك ئەوە نییە کەداوای باتڵ بکات و وەدەستی بێنیّ.

* مەبەستی پێشەوا مەعاوییە و هاویارانییەتی.

( ٦١ )

## وتاریّ کە وتیان ئاگاداربە بەنهێنیی ئەتکوژن

من لەخوداوە پارێزەرێکی قایمم هەیە، کە وەختی کوشتنم هات نامێنیّ و ئەمدەن بەدەستەوە، ئەوکاتە نە تیر وێڵەو نە زام چاك دەبێتەوە.

(٦٢)

## وتاری ئامۆژگاریی دوورکەوتنەوە لەخشتەبردنی دنیا

هۆشاربن دنیا بەتەنها ئەوکاتەی تێیدا دەژیت دەتوانی بێوەی بیت، ئەوەش بۆ خۆشی دنیا دەکرێ مانەوەی نییە، خەڵك بەدنیا تاقی دەکرێتەوە، کە پێیەوە گیرۆدە دەبن، ئەوەی لە دنیا دەستیان کەوتووە هەر لەوێدا لێیان وەردەگیرێتەوە و بەرپرسیاریش دەبن لەسەری، ئەوەش لە دنیا وەرگیراوە بۆ غەیری دنیا دەچن بۆ لای و لەسەری پاداشت دەدرێنەوە، ئەو وەك سێبەر وایە لای خاوەن فام و عەقڵ، زۆر جار دەیبینێ بەلێشاو دێت و بەماوەیەکی کەم وەردەگیرێتەوە، بەزیادە دێت کەم دەبێتەوە.

(٦٣)

## وتارێك بۆ کاری چاکە، هاندان

لەخودا بترسن و خۆپارێزبن، بەندەکانی خودا بەرەو پیری کۆتایی تەمەن بڕۆن بەکردەوەی چاك، بەو شتەی ئێستە لەبەردەستە کڕیاری ئەوە بن کە بۆتان دەمێنێتەوە، زۆر زووبن بۆ بارکردن، چونکە پەلەتان لێئەکرێ و پێڕا ناگەن، خۆتان ئامادە بکەن بۆ مردن، وا خەریکە سێبەری دێتە سەرتان، لەو نەتەوە و کۆمەڵەبن ئەگەر هاواریان لێکرا گورج بە ئاگا دێن، ئاگادارن کەدنیا یانەی ئەوان نییە! لەبەر ئەوە گۆڕیویانەتەوە، خودا ئێوەی بێ مەبەست دروست نەکردووە و بەخۆڕایی وازتان لێ ناهێنێ، نێوان یەك لە ئێوە و بەهەشت و دۆزەخ مردنە، کە دەبێتە میوانتان! توخودا ئامانجێك بە چرکە کەم بکات و بەکاتژمێر لێی بروخێ ئەوە ناگەیەنێ کە ماوەکە زۆر کورتە، مەبەستێك کە شەو و ڕۆژی تازە بەرەو ڕێگای بەری مانای زوو گەیشتنی نییە؟ میوانێك کە سەرکەوتن یان کۆسکەوتنی پێیە، پێویستە چاك خۆتی بۆ ئامادە بکەیت، لەم دنیا لە خودی دنیا لەگەڵ خۆتان بۆ سبەی تێشوتان هەبێت، چاکترین بەندەی خۆپارێز ئەوەیە خۆی ئامۆژگاریی خۆی و پێشکەشکاری پەشیمانیی و زاڵ بوون بەسەر نەفس و هەوایە! چونکە ئەجەل شاراوەیە و ئەمەل فێڵبازە و شەیتان سوکایەتی تاوانی لەبەر چاو شیرین ئەکات، بۆ

ئەنجامدانى و هانى ئەدا پەشيمانى و گەڕانەوە دوا بخات، هەتا ئەوكاتە مردن سوارى سەرى ئەبێ لەهەموو كات بێئاگاترە.

لەخوا دەپاڕێمەوە ئێمە و ئێوە لەوانەبين كە نازو نيعمەت لەخۆباييان ناكات و كەمتەرخەمى ناكات لەفەرمانى خودا، ئەنجامدانى فەرمانى خودا مەبەستيەتى و پاش مردن تووشى پەشيمانى و خەم و خەفەت نابێ.

(٦٤)

## وتارێك لە بارەى زانستى پەروەردگارەوە

سوپاس بۆ ئەو خودايە كە هيچ مالێكى پاش و پێشى تێدا نييە، يەكەم پێش ئەوەى كۆتايى بێت، ئاشكرايە پێش ئەوەى شاراوە بێت، هەر كەسى ناو ببرێ بەتاك زۆر لەزاتى حەق كەمترە، هەر كەس بلندو بەرێز بێت جگە لەو پەست و داماوە، هەركەس بەهێزو توانا بێت جگە لەو بێدەسەلات و لاوازە، هەر كەس خاوەندار بێت جگە لەو كۆيلەيە، هەر كەس ناوى زاناو فێركار بێت جگە لەو خوێندكار و فێرخوازە، هەر كەس بەتوانا بێت جگە لەو تواناو بێتوانايە، هەر كەس گوێبيست بێت جگە لەو كەڕواڵەيە و دەنگى نەرم نابيسێ و دەنگى بەرز كاسى ئەكا و دەنگى دوور نابيستێ، هەر كەس تيژو ڕوون بێت كوێرو مژمۆڵە جگە لەو ڕەنگى شاراوە و تەنى ناسك نابينێ، ئەوەى بەدەرەوەيە جگە لەو شاراوەيە، هەر شاراوەيەك هەبێ جگە لەو بەدەرەوەيە، ئەوەى هێناويەتى بەبوون بۆ زياتر دەسەلات نييە و ترسى خراپى پاشە ڕۆژى نييە و بۆ يارمەتى دژێكى جەنگاوەر و بەهێز نييە و بۆ هاوەڵ و هاوتايەكى شانازكار نييە يان دوژمنێكى ڕەسەن و دادوەر، بەلام ئەوانە هەموو بونەوەرێكى بەندەو كۆيلەن و كارگوزارێكى كەم و بچووكن، لەناو شتەكاندا نەتواوەتەوە، هەتا بڵێى تێيدايە و لێى جيا نەبووەتەوە، هەتا بڵێى لەو تەنە جيابووەتەوە، درووستكرنى هيچ بوونەوەرێك لەلاى قورس نييە، بە بيركردنەوەى پێشوەخت نەيهێناوەتە بوون، هەرگيز ڕێگرێك نەبووە لە ڕێگەى دروستكردن، هەرگيز گومانى نەبووە لەفەرمان و بڕيارەكانى، بەڵكو هەميشە دادوەرێكى بەتواناو بێهەڵە و زانيارى پتەو و فەرمانى بێگومانە، جێگاى ئومێد لە كاتى سزاو تۆڵە و جێگاى ترس و بڕينە لەكاتى نيعمەت و بەخشين.

( ٦٥ )

## وتاری بۆ ئەوانەی لە شەڕو جەنگدان لەڕۆژانی سیفیندا

گرۆهی باوەڕداران! بەرگی لەخودا ترسان بپۆشن، پوزەوانەی هێمنی لە پێکەن، دانەکان لەیەك توند بکەن، چونکە ئەوانە زیاتر لە شمشێر سەرتان دەپارێزێ و بەتەواوی بەزرێ و باڵبەندو دەست بەندو دەست و بازووتان بەتوندی ببەستن، شمشێرەکانتان لەناو کێلانەکاندا هاتووچۆ پێبکەن، پێش بەکارهێنانی بەتیلەی چاو بنوارن و بەڕاست و چەپ دەست بوەشێنن، هەمیشە بە تیژیی شیرەکان بەکاربهێنن، بە ئەندازەی شیرەکانتان هەنگاو بنێن، ئەوەش بزانن ئێوە لەژێر چاودێری خودان و لەگەڵ ئامۆزای پێغەمبەرن(صلی الله علیه وسلم)، پەلامار و هێرش دووبارە بکەنەوە و شەرم بکەن لە ڕاکردن، چونکە شورەییە بۆ نەوەی نوێتان و ئاگر بۆ ڕۆژی حساب و کتاب، بەدڵی ئارامەوە بەرەو مردن بڕۆن و بەئارامی هەنگاو بگوازنەوە، ئێوە و ئەم ڕەشاییە گەورەیە و ئەو دەوارە بەپەت و گوریس توند کراوە، ڕێك لەناوەڕاستی بدەن چونکە شەیتان لەپەنایدایە، دەستێکی بۆ ڕاپەڕین ڕاکێشاوە و قاچێکی بۆ هەڵاتن داناوە، لەسەر ڕای خۆتان سووربن هەتا کۆڵەکەی حەق بەدیار دەکەوێ، (سست مەبنەوە و داوای شەڕ وەستان مەکەن، هەر ئێوە بەسەر ئەواندان، ئێوە خوداتان لەگەڵە، هەرگیز پاداشتی خەباتەکەتان کەمناکاتەوە).

( ٦٦ )

## وتاری دەربارەی مانای ( ئەنسار )

پاش ئەوەی دەنگوباسی کەپرەکەی (نەوەی ساعیدە) بە پێشەوا گەیشت لە پاش وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پرسی: ئەنسار چی ئەڵێن؟ لە وەڵامدا وتیان: میرێ بۆ ئێمەو میرێ بۆ ئێوە، پێشەوا فەرمووی: ئەی بۆ نەتان وت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) داوای لە ئێمە کردووە چاکە لەگەڵ چاکەکانیان و لێبوردن لەگەڵ خراپەیان، وتیان: دەی ئەوە کەی بەڵگەیە؟ فەرمووی ئەگەر میری هەبێت پێویست بە ڕاسپاردە نییە، ئەوجا فەرمووی: قورەیش چی ئەڵێن؟ وتیان ئەوان خەڵفی داری پێغەمبەرن(صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: بیانوویان درەختە و بەروبوومەکەیان

لەناو بردا!.

( ٦٧ )

## وتارێ لەبارەی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکر
## کە زەمینی ( میسر )ی پێداو لێی داگیرکراو کوژرا

بە خواستی خۆم حەزم ئەکرد هاشمی کوڕی عوتبە بکەم بـە والی میـسر، ئەگـەر ئەو والی بوایە هەرگیز ئەو خاك و زەمینـەی جێنـەدەهێشت، هەلی نەدەدا بەدەستەوە، ئەوە زەمی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکر نییە، چـونکە خۆشەویـستی مـن بـوو لـەماڵی مندا ژیاوە.

( ٦٨ )

## وتارێ لەزەمی یارو یاوەرانیدا

تا کەی من لەگەڵتان بەدڵدانەوە بم وەك نازکێشانی پارێنەی دووساڵەی حوشـتر، یان وەك بەرگی ڕزیو و کۆن بـە هێواشـی دەسـتی بـۆ دەبـرێ، لەهـەر لایەکـەوە پینـە بکرێ لەلایەکیکەوە دەدڕێ، هەر کات دەستەیەك لە سوپای شام سەر دەربێنێ هەموو پیاوەکانتـان دەرگـا لەسـەر خـۆی دادەخـا، وەك سوسـەمار خۆتـان ئەکـەن بـە کونەکانتاندا، وەك کەمتیار لەلانەکەیدا، سەر شۆڕ، قەسـەم بـەخوا ئەومیـە کـە ئێـوە یارمەتی ئەدەن ئەوەی بە ئێوە تیر ئەنداز بکات تیری بێنـوك فڕێـدەدا، ئێـوە قەسـەم بەخوا لە گۆڕەپانـدا زۆر و فـرەن، لـە ژێـر پەرچـەمدا زۆر کـەمن، مـن شـارەزام ئێـوە بەچی چاك ئەبن و بەچی ڕاست ئەبنەوە، بەڵام بەخودا هەرگیز بەخراپکردنی خۆم ئێـوە چـاك ناکـەم، خـودا داماوتـان بکـات و چاوشـۆڕ بـن، بـەش و بارتـان دابـەزێ بـۆ خوارەوە، ئێوە ئەوەنـدەی شـارەزای باتـڵ بـوون شـارەزای حـەق نـین، ئەوەنـدەی دژی حەقن دژی باتڵ نین.

(٦٩)

## لەو بەیانی و پارشێوەدا کە پێکرا، فەرمووی:

کەمێ وەنەوز بردمیەوە و چاوم چووە خەو، بەدانیشتنەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەلامدا ڕۆیشت و وتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەزانی چیم بەسەر هات، لەلایەن ئاژاوە و گێروگرفت و بێفەرمانی؟ فەرمووی: نزای شەڕیان لێبکە. وتم: نەوەڵلا، ئەوانم بۆ بگۆڕە بۆ سەدان باشتر بۆ من و منیش بۆ ئەوان بگۆڕە بەزۆر خراپتر.

(٧٠)

## وتارێك لە زەمی عێراقدا

## سەرزەنشتیان ئەکات کە بەزیوون لەو کاتەی سەرکەوتن نزیکبوو

**ئەی ئەهلی عێراق! ئێوە وەك ژنی باردارن، کە لە منداڵبوون نزیك دەبێتەوە، منداڵەکەی لەبار ئەبا و بێوەژن ئەکەوێ و مێردەکەی دەمرێ و بووبە میراتی خزمی زۆر دووری، ئەرێ وەڵلا، بەخۆشی خۆم نەهاتووم بۆلاتان، نا، بەلام بەزۆر هێنایانم، پێمگەیشتوە وتووتانە: (عەلی) درۆ ئەکا! خودا بتانکوژێ درۆ لەسەر کێ بکەم؟ لەسەر خوا درۆ ئەکەم؟ من یەکەم کەسم، کە باوەڕم هێناوە، یان لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) درۆ ئەکەم، من یەکەم کەسم کە بەڕاستمزانی، نەبەخودا، ئەوەی من پێتان یەژم زاراوەیەکە، کە ئێوە لەماناکەی حاڵی نابن، شایستەی ئەوە نین، دایك ڕۆڵەڕۆتان بۆ بکات! من بێبەرامبەر زانیاریتان بۆ ئەپێوم، بەلام کوا مەنێك تێیدا پێوانە بکەم؟ (بێ گومان پاش ماوەیەك دەنگوباسی ڕاستی ئەوەتان بۆ دەردەکەوێ و ڕوون ئەبێتەوە).**

(٧١)

## وتارێ بۆ درود لەسەر پێغەمبەر( صلی الله علیە وسلم ) و سیفەتەکانی خودا و پێغەمبەرو جۆری نزا

ئــەی خــودای ڕاخــەری فەرشــی زەوی، بــێ کۆڵەکــە ڕاگــیری ئاسمانــەکان و دروســتکەری هــەموو دڵان، بەشــێوەی دوولایــەن، دامــاو و بــەختیار، داوا ئەکــەم جوانترین درودی خۆت و زیادترین بەرەکەتی خۆت برژێنــە بەسـەر محەممـەد(صلی الله علیە وسلم) بەندەی خۆت و پێغەمبەر و ڕەوانەکرا و کۆتایی هێنـەر بـە پـەیامی پێش خۆی، دەرگا والاکاری هەموو داخراوەکان، ئاشکراکاری ڕاستی، کە بەڕاستی مۆری ناوە بەهەموو ئاراستەکان، داوایە لە سەری هەر پەلامارێکی گومڕاکان، ئـەوەی پێـی سـپێردرا بەڕاسـتی گەیانـدی، هەسـتا بـە فرمـانی تـۆ، زۆر بەپەلـە بـوو بـۆ ڕەزامەنـدی تـۆ، هـەرگیز لـە پـەلاماری دوژمـن سـست نـەبوو، لـە بڕیـاردان لاواز و بێئیرادە نەبوو، پارێزگاری سروشی تۆ بوو، پەیمان پارێزی تۆ بوو، لەسـەر ڕێبـوو بـۆ ئەنجامدانی فەرمانت، هەتا ئەو ڕادەیە، کە سەرە بزوزسکی دایـە دەسـتی داواکـاری و ڕێگای تاریکە شەوی بۆ ڕێبواری وێڵ ڕوونکردەوە، گەلێ دەروونی خـستە سـەر ڕێگـا، پاش ئەوەی هێرشی بەدفەڕی داگیریکردن، نیشانەی ڕێگەو بـانی بـۆ دیـاری کـردن و دەستوری ڕوون و بێ هەڵەی نیشاندان، ئەو پێغەمبەرە(صلی الله علیە وسلم) ڕازگری بێ گرێی تۆیە، خەزنەداری زانـستی تۆیـە، ڕەوانـەکراوی ڕاسـتی تۆیـە، ڕەوانـەکراوی تۆیە بۆ خەڵك و شایەتحاڵی تۆیە بۆ ڕۆژی پاداشت.

## نزا بۆ پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم )

خودایا جێگای زۆر فراوانی بۆ دابنێ، لـە ژێـر سـێبەری چاکەی خۆتـا، پاداشـتی خێری گەورەیی بدەرەوە، لە بەخشندەیی خۆت، خودایـە مـاڵی لەسـەر هـەموو مـاڵان بەرزتر بکەرەوە، ڕۆشنایی و ڕوناکی بێئەندازەی پێببەخشە، لەبەر ئەوە هەمیشە لە ڕەزامەنـدی تـۆدا بـووە، شـایەتی لێـوەرگرە و وەڵامـی داواکـانی بـەوەرگرتن بـدەرەوە، خـاوەن فەرمایـشتی دادوەر و چـاکەخوازە، خودایـە! ئێمـەی لەگەڵـدا کۆکـەرەوە، لـە

ژیانێکی نەرم و سازگار و بەردەوامیی نیعمەت و گەشبین بەهەموو ئارەزووەکانمان و خۆشیی و کامەرانییەکانمان، بە هێمنیی و ئارامیی و دڵنیایی و خەڵات و بەراتەوە بدەریّ و پێببەخشە.

( ٧٢ )

## وتاری ئەوکاتەی، کە مەروانی کوڕی حەکەم لە بەسرە بە دیل گیرا

دەگێڕنەوە مەروانی کوڕی حەکەم لە ڕۆژی جەمەلدا گیرا، حەسەن و حوسەین(سلاّوی خوایان لێ بێت) لە خزمەتی میری باوەڕدارانـدا داوای بەرەڵا کردنیان کرد، پێشەوا ئازادی کرد وتیان ئەیەویّ پەیمان بدات بە میری موسڵمانان، فەرمووی: بۆچی هەتا ئێستە بێپەیمانە، دوای کوشتنی عوسمان(سلاّوی خوای لێ بێت)، من پێویستم بە پەیمانی ئەو نییە، ئەو دەستە نهێنیگرو پیلانگێڕە بەدەستێکی پەیمان ئەداو بەدەستەکەی تری پاشەوەی نهێنیگرە، ئەم کابرایە مەزنایەتیی دەست ئەکەویّ بە ئەندازەی لێسانەوەی سەگێك، ئەو باوکی چوار ساوریّنی تگەیە، میللەت لە دەستی ئەم و کوڕەکانی تووشی ڕۆژی خوێناوی دەبن.

( ٧٣ )

## وتارێك، لە کاتێکدا کە بڕیاردرا پەیمان بدریّ بە عوسمان

بەخودا ئەتانزانی من بۆ مەزنایەتیی شایستەم لە هەموو کەس زیاتر، قەسەم بەخودا من گەردنم کەچ ئەکەم هەتا ئەوکاتەی کاری موسڵمانان بەهێوری بڕوات، تەنها ستەم لە سەری من بێت بەتایبەت، ئەوەش تەنها لەبەر پاداشت و زیادە بەخشندەیی و بۆ دەربڕینی نەویستی خۆم لەو کارەی ئێوە لەسەری ناکۆکن، بۆ زێڕ و زیوو و دوڕو گەوهەر.

( ٧٤ )

## وتاریٚ ئەوکاتەی ئەمەوییەکان وتیان دەستی هەبووە لە کوشتنی عوسماندا

ئەوە زانیاری ئەمەویەکان دەربارەی من بەس نەبوو، کە لەکەدارم نەکەن؟ ئەی نەفامەکانیان شتیٚ نەبوو بیانگێڕێتەوە، کە پێشینەی موسڵمان بوونم لە تاوانبارکردنم دەربازم ئەکات، ئەوەی خودا ئامۆژگاری کردون، کە باسی برای خۆیان نەکەن لە زمانی من ڕەوانترە!

من دوژمنی ئەوانەم لە ئایین دەرچوون و نەیاری ئەوانم کە بە گومانن، پێویستە هەموو کارەکان بەتەرازووی قورئان کێشانە بکریٚ، بەوەی لە دڵدایە، خودا سزاو پاداشت ئەداتەوە.

( ٧٥ )

## وتارێکی بۆ چاکەخوازیی

خودا بەزەیی بەو بەندەدا بێت کە فەرمانێکی لێئەکا و لێی تێئەگاو ڕەوانی ئەکات، کە بانگکرا بۆ ڕێی ڕاست خۆی نزیك دەکاتەوە، دەست دەگریٚ بە کەمەری شارەزایەکەوە و ڕێگە دەر ئەکات، هەمیشە لەخودا دەترسێت و لەگوناح و تاوان دەترسیٚ، کاری پوخت ڕەوانە بکات و کاری باشە بکات، پاشەکەوتی کاری باشەی بۆ پاشە ڕۆژ بکەن و خۆی پاراستووە لە تاوان و نیشانەی پێکاوە و پاداشتی وەرگرتووە، دژی ئارەزووی ناپەسەندی کردووە، بەرپەرچی ئارەزووی خراپی داوەتەوە، ئارامی کردووە بەهۆی گواستنەوە بۆ ئازادیی و ڕزگاریی، خۆپارێزیی کردووە بە کەرەسەی پاش مردنی، ڕێگەی ڕێك و ڕوناکیی گرتووەتە بەر، دانیگرتووە بە بەڵگەی گەش و ڕووندا، ماوە پێدانی بەهەل وەرگرتووە، هەنگاوی ناوە بەرەو ئەجەل، تێشووی کاری بۆ خۆی هەڵگرتووە.

( ٧٦ )

## وتاری ئەوکاتەی کە سەعیدی کوڕی عاس مافی زەوتکرد

ئەمەویەکان کە دەیانەوێ چۆڕە چۆڕە کەلەپوری محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بدەن بە من، قەسەم بەخودا دەبێ ئەگەر بۆیان مام پاکیان بکەمەوە، وەك پلەگۆشتێك لە خاك و خۆڵ پاك دەکرێتەوە.

( ٧٧ )

## وتارێ لەبارەی شێوازی نزاکردن

خودایە لەو گوناهەم خۆشبە، کە ئاگاداری لێی لە من زیاتر، ئەگەر من گەڕامەوە بۆ گوناح تۆ بیگێڕەوە بۆ لێخۆشبوون، خودایە لێمخۆشبە لەو گفت و پەیمانەی کە داومە و نەمتوانیوە جێبەجێی بکەم، خودایە لێمخۆشبە لەوکارەی کە بە زمان ئەنجامم داوە و دڵم دژی بووە، خودایە لێمخۆشبە لە تیلەی چاو بۆ حەرام و لە دەرچوونی وشەی خراپ لە دەمم و ئارەزووی ناپەسەندی ناو دڵ و هەڵەی زمان.

( ٧٨ )

## وتارێك دەربارەی خەواریج

بۆ بازێ لەیارانی کە دەیانوویست بچن بۆ لای خەواریج، میری باوەڕداران وتی: ئەگەر ئێستە بڕۆم ئەترسم ئاواتی تۆ نەیەتە دی لە ڕێگەی ئەستێرەناسییەوە، پێشەوا فەرمووی: بۆچی گومانت هەیە هەر کەس لە ساتێکی تایبەت سەفەر بکات دوور ئەبێ لەناخۆشی؟ ترس دەخەیتە بەرچاوی، ئەوە لەو ساتەوەختەدا بڕوات تووشی زیان ئەبێ؟ هەر کەس لەم بۆچوونەت باوەڕت پێبکات، قورئان بە درۆ دەخاتەوە، پێویستی بە پەنابەخوداگرتن نامێنێ، لە گەیشتنی بەدڵخوازو دوورخستنەوەی کاری ناقۆڵا، ئەتەوێ لەم گفتدانەت بەوانە بڵێیت کە بە ڕات نەکەن، لە جیاتی خودا سوپاست بکەن، چونکە گومانی خۆت کاتی گەشت نیشانداوە بۆ سوودوەرگرتن و دوورکەوتنەوە لە زیان، ئەوجا پێشەوا ڕووی کردە خەڵك و

فەرمووی: نەکەن فێری ئەستێرەناسیی ببن، جگە لەو ئەندازەی لە وشکانیی و دەریا سوودی هەیە، چونکە ئەوە جادوکارییە، ئەستێرەناس وەك جادوو وایە، جادوو سیحربازییە، سحرباز کافرە و کافر لە دۆزەخە، دەی بڕۆن لەسەر ناوی خودا.

( ٧٩ )

## وتارێ پاش لێبوونەوەی شەڕی جەمەل لە بارەی ژنانەوە*

خەڵکینە! سروشتی ژنان ئەوەیە ماوەی بەندایەتییان کەمە، بەشیان کەمە، فام و ژیرییان لاوازە، لەبارەی ئەنجامدانی ئەو کاتەوە نوێژ نەکردنیان و ڕۆژو نەگرتنیان لەکاتی سوڕی مانگانەیان، کەم ژیریان ئەوەیە، شتیان زوو لە بیر دەچێ، دوانیان وەك یەك پیاو دانراوە، بەشی کەمیان لە بابەتی میراتەوە کە کەمتر دەبێ لە پیاوان، خۆتان لەئافرەتانی خراپەکار بپارێزن، هاوڕاو هاوسەری چاکەکانیان بن بەترسەوە، بە گوێیان مەکەن، لەبەر خۆیان نەوەك لە خراپەدا بەگوێیان بکەن.

* مەبەستی پێشەوا ئەوە نییە لە چاکەدا بە گوێیان نەکرێ، لەبەر ئەنجامدانی فەرمانی ئەوان بەتەنها، چونکە ئەنجام نەدانی چاکە پێچەوانەی ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەرە (درودی خودای لە سەربێت) بەتایبەت ئەگەر چاکەکە فەرمان بێت، یان ئەرك بێت، بەڵکو چاکەکە تەنها بە گوێکردنی ئەوان بێت، چاکە بکە لەبەر ئەوەی چاکەیە نەك تەنها لەبەر ئەوەی بەگوێی ژن ئەکەی، چونکە چاکە چاکەیە، نەك لەبەر ئەنجامدانی فەرمانی ئافرەت.

ئەم فەرمایشتەی پێشەوا ئەزموون تاقیکردوەتەوە، بێ هەڵاوردەکردنی هیچ نموونەیەك تەنها لە هەندێك فێرترەتی خودایی کە داوییەتی بە هەندێ لە ئافرەت کە بە سروشت پێی بەخشراوە نەوەك بەگشتی.(محمد عەبدە) .

( ٨٠ )

## وتارێکی لەبارەی تەرکی دنیاوە

خەڵکینە، تەرکی دنیا، دڵ نەبەستنە بە ئومێد، سوپاس کردنە لەسەر نیعمەت، دورکەوتنەوەیە لە قەدەغە، ئەگەر ئەمانەتان لێ هاتەدی، حەرام سەر ناکەوێ بەسەرتاندا، لەکاتی هاتنی خۆشی و نازو نیعمەتدا سوپاستان لەبیر مەکەن، خودا بەهانەی بڕیوون بە بەڵگەگەلێك کە زۆر ڕوون و دەرکەوتوون و چەند دەقێکی بەهانەبڕوو ئاشکران.

( ٨١ )

## وتارێ لەبارەی دنیاوە

ناتوانم وەسف و سەنای ماڵێك بکەم سەرەتاکەی ژانەو کۆتاییەکەی تیاچوونە، لەناوەندا بەرپرسیارییەو پرسینەوەیەو لە قەدەغەیدا تۆڵە هەیە، ئەوەی دەستی لێهەلگرێ تاقی ئەکرێتەوە، یان ئەوەی دەوڵەمەند بێت بەر تاقیکردنەوە دەکەوێ، ئەوەی نەدار بێت غەمبار و داماوە، ئەوەی زۆر خۆی بۆ ماندوو بکات لە دەستی دەرئەچێ، ئەوەی نرخی پێنەدا دێتە بەردەستی، ئەوەی بیکاتە چاو ساغی خۆی ڕێگەی پێدەرئەکا و ئەوەی زۆر چاوی تێبڕێ کوێری ئەکات.

( ٨٢ )

## وتارێکی چلە پۆپەی سەرسوڕهێنەر
## ( ستایشی خودا )

ستایش و سوپاس بۆ ئەو خودا بەرزو بڵندە، بە توانا مەزنەکەی، نزیك و بەرچاوە بە بەخشندەیی و بەزەییەکەی، بەخشندەی هەموو دەستکەوت و زیادەیەك، لابەرو لادەری هەموو تەنگانە و ڕووداوی گەورەیە.

سوپاسی ئەکەم لەسەر سۆزو کەرەم و نازو نیعمەتە فراوانەکەی، بەدڵ باوەڕم هەیە و بەزمان بڕیار ئەدەم کە پێش هەموو پێشینەیەك لە بووندا، تەنها ئەو

بوونــەوەری بــەدی هێنــاوە و داوای ڕێنومـایی و ڕێنیـشاندانی لێئەکـەم، لـە نزیکـەوە داوای کۆمەکی لێئەکەم، لە بەر زۆری تواناو دەسەڵاتی، تەنها پشت بەو دەبەستم، کە بە فریادم بێت و یارمەتیم بدات، بـەدڵ بـاوەڕم هەیـە و بـە زمـان بڕیـار ئـەدەم کـە محەممــەد(صــلی الله علیــە وســلم) بەنــدەو ڕەوانــەکراوی خوایــە، ناردویــەتی بــۆ ئەنجامــدانی فەرمانــەکانی و بڕینــی هەربیانوویــەك و پێــشدەستی لــەناردنی پەیامبەرانی هەڕەشەکاری لە بێفەرمانی ڕاسپاردەی بۆ خۆپارێزیی.

بەندەکانی خودا! ئامۆژگاریی و ڕاسپاردەتان ئەکەم کە هەمیشە خۆپارێز و دوور لە گومڕایی بن، ئەو خودایە کە بە پەنـدو نموونەی زیندوو هۆشیارتان دەکاتـەوە، تـا کاتی تەواو بوونی تەمەنی دیاری کردووە، لاشەو تـەنی پۆشـتەکردوەتەوە بەبـەرگ و سـیپاڵ، لـە ڕووی خۆراکـەوە لـە بـەرزیی داینـاون، فریـشتەی دانـاوە بـۆ تۆمـاری کارەکانتــان، پاداشــتی بــەدیارەوە دانــاون، زۆربــەی نیعمەتــەکانی بــە ئێــوە داوە و سەرچاوەی ژیواری بەنرخی بۆ دروستکردوون، هەڕەشـەی سـەختی کـردوە لێتـان بـە بەڵگەی حاشا هەڵنـەگر، ئامـاری کـردوون بەکـەش و هـەواو ڕۆژو سـاڵ، کـاتی دیـاری کــردووە بۆتــان بــۆ تاقیکردنــەوەتان، ئێــوە لــە ژێــر لێکۆڵینــەوە و ئەزموونــدان و لێپرسینەوەتان هەیە.

## بێزاندنی دنیاویستیی

ئەم دنیایە سەرچاوەیەکی لێڵ و شلێوە، جۆگەی پـڕ لـە قـوڕو لیتەیـە و دیمـەنی جوانە، ئەنجامی لەناو بەرە، هەڵچونێکی کاتییە، تیشکی ئاوا ئەبێ و ئەڕوا، سێبەری ڕاوەســتاو نییــە، پاڵپـشتی لارە، هــەرکات ئــەوەی لێــی تــۆراو و ئاشـت بــووە، ئــەوەی لەیارمــەتی دڵنیــا بــوو هــەردوو دەســت و قاچــی شــەتەك ئــەدات و بەبارەکەیــەوە ئەیبەستێتەوە و بەو داوە ئەیکوژێ و پشك پـشك دابەشـی دەکـات، پـەتی مـەرگی لـە مل ئاڵاندووە، پەلکێشی ئەکات بۆ شوێنی تەنگەبـەری و پاڵدانـەوە، بـۆ چـۆڵەوانیی و ئارامگریی، بەچـاو بینینـی شـوێنی خـۆی و پاداشـتی کـرداری، پێـشینەو پاشـینەیەك دەخات، مردن (کان)ی تێکردون و یەکە یەکە هەڵیکەنـدوون، ئـەوەی زینـدووە هـەر خـەریکی تاوانــە، لاساری پێـشینەی خۆیـان دەکـەن وەك جڵەوی مێگـەل ئـەڕۆن بـۆ سەرنەویستی کۆتایی و لەناوچوون.

## پاش مردن، زیندووبوونەوەیە

ئەو کاتەی کاروبار بڕایەوە، کۆتایی ساڵ و کات هات، وەختی زیندوو بوونەوە گەیشت، خودا ئەوانە لەئارامگای گۆڕەکان، هێلانەی باڵندەکان و پەچە و گەوڕی درندە و گۆڕەپانی شەڕگەکان دەردەهێنێ، ئەوانیش زۆر بە پەلە بەدەم فەرمانەکەوە دێن، بەلەز دەگەڕێنەوە بۆ لای خۆی، پۆل پۆل و دەستەدەستە بەپەلەو بێ دەنگ و هەرا، وەك ڕەوگی چارەوی بەڕیزو بەیەکەوە، بەچاودێری زۆر توند و بەدەنگی ئەوەی بانگی کردوون، سەر شۆڕی دایپۆشیون، زۆر بێهێزو بێتوانا خۆیان داوەبە دەستەوە، فێڵ و تەڵەکەبازییان هەموو ونبووە، بێ ئومێد و بێ هیوا، دەروونیان چۆڵە لە خۆشی و خۆیان ئەخۆنەوە، گوێیان نارەحەتە لەدەنگی بەهێزی ئەوەی پێش خۆیداون، لە ترسا و دەهشەتدا وەحاڵ نوزەیان دێت، ئارەق بەربینی گرتوون، بەترسەوە ئالاون بۆ دادگایی کۆتایی و گۆڕینەوەی کردار بە پاداشت و سزاو تۆڵە و خەڵات و بەرات.

## ئاگاداری خەڵك

خودا بۆ خۆی زۆر بەتوانا ئەو بەندانەی دروستکردووە، کۆیلەن بۆ دەسەڵاتی بەتوانا، گیانیان لێوەرئەگیرێتەوە لەکاتی گیانەڵادا و دەیانخاتە ناو ترەکی زەوی و گۆڕ و ئەیانکات بە پێشە و پەڵاشی ڕزیوو، بەجیا زیندوویان دەکاتەوە و پاداشیان بە پێی کردارییان ئەداتەوە، هەر کەس بە گوێرەی خۆی پرسینەوەی لەگەڵ ئەکرێ، ماوەیان پێدراوە کە خۆیان دەرباز بکەن، بە گەڕانەوە و پەشیمانی، ڕێگەی ڕاست و پرۆگرامی چاکیان نیشاندراوە، ئەوەندە مۆڵەتیان دراوە کە ڕەزامەندی پەروەردگار بەجێ بهێنن، تاریکی گومان و دوو دڵیان لەسەر لابراوە، بەهۆی بورهان و بەڵگەی بیانووبڕ، ماوەیان پێدراوە لە گۆڕەپانی چاکە خوازی ئەسپی خۆیان تاوبدەن، ماوەی بیرکردنەوە و ڕامکردنیان پێدراوە، بە هێمنی چرای دەستیان نەکوژێتەوە، لەماوەی کۆتایی تەمەن و جوڵەی کاروکردارو ڕەفتارو چاکەی وەبیرهێنانەوە.

ئای چەند پەندو ئامۆژگاری بەنرخی تێدایە، چەند ڕێنومایی شیفابەخشی تێدایە، ئەگەر ڕێك ئاودامان بێت لەگەڵ دڵی زیرەك و گوێچکەی شارەزا و ڕای پتەو

و هێـزدار و ژیـری كـاراو كارامـه، كەواتـه لـەخودا بترسـن و خۆپـارێز بـن، وەك ئـەو كەسەی گوێ ئەگرێ و دڵی ئەلەرزێ، تاوان ئەكات و دانی پێدا ئەنێ، دەترسێ و كاری چاكه ئەكات، بیمی هەیه و پەلەی كار ئەكات و به بڕوای پتـەوی زۆر جـوان ڕەفتـار ئەكات، پەندی دادەدرێ و چاك ئەژنەوێ، ترس ئەخرێته بەری ئەوەی وەری ئەگرێ، فـەرمان جێبـەجێ ئـەكاو ئەگەڕێتـەوە، پەشـیمان ئەبێتـەوە و بەپەلـه ئەگەڕێتـەوە، شوێن كەوتووی پیاو چاك ئـەبێ و وەك ئـەو ئـەركی ئـەنجام ئـەدا، ڕای باشـی نیـشان ئـەدرێ و ئـەویش ئـەیبینێ، پەلەیـەتی وەك شـاگردی بـاش بـۆ فێربـوون، ژیرانـه لـه تاوان دوور ئەكەوێتەوە، پاشەكەوتی باش كۆئەكاتەوە، ناو و نهێنی زۆر پاك بۆ خۆی درووست ئەكات، ئەو دنیا ئاوەدان ئەكاتەوە، كۆڵ و باری زۆری كۆكردوەتەوە بۆ كاتی كۆچی و تێشووی ڕێگای و پێویستی حاڵی خۆی لەو شوێنەی كه پێویستی هەیه و له پێش خۆی داناوە، لەوێش هەمیشه نیشتەجێیه.

بەندەكانی خودا لەخودا بترسن و خۆپارێزبن، بزانن بۆچی دروستكراون، بترسن لـەناوەڕۆكی ئـەو ترسـەی خـودا، بـۆ خـۆی لێیترسـاندون بـۆ ئـەوەی شایـستەی ئـەو پاداشتەبن، كەبۆی دانـاون، چـونكه بـەڵێن و پـەیمانی ڕاسـت و دروسـته، بـشترسن لـه ناخۆشی پاش مردن.

## بیرخستنەوەی جۆرەكانی نازو نیعمەت

خــودا گــوێی درووســتكردووە بۆتــان، بــۆ وەرگــرتنی مەبەســت، چــاوی بــۆ دروستكردون بۆ بینینی باش و لادانی له ناباش، له هەردوو لاوە دەست و قاچی بـۆ درووسـتكردوون، كـه خزمـەتی هـەموو ئەندامـەكان بكـەن، بـۆ هـەموو لایـەك بـۆ خزمەتكردن، ئەو ئەندامانـه گونجاوە لـەو شـوێنەی بۆیـدانراوە و دیمـەن و وێنـەیان ڕێك و پێكه و تەمەنیان لەگەڵ كات و تەمەنی خاوەنیەتی، لكاوە بەلاشـەوە و سـودی خۆیان دەگەیەنن، عەقڵ و دڵی پێداون، كه ڕزق و ڕۆزیتان بۆپەیدا ئەكات، له شوێنه شاراوەكان.

لـەو جێگـەو شوێنانەی كـه خـودا دایـناوە بـه منـەت بەسـەرتانەوە و ڕێگـره لـه تووشبوونی ئـەرك و ئـازارو ئـێش، تەمـەنی بـۆ دیـاری كـردون و شـاراوەیه، لـه وێـوە پەنـدو ئامۆژگـاری لـه پێـشینانی پێگەیانـدوون، لـه ڕووی ڕەوشـتبەرزیی و هەناسـه

برکێی بەدرەوشتیتان، کۆتای تەمەن ڕێگەی ئومێدی بڕیووە، کورتی ئەجەلتان دووری کردوون لە ئاواتەکانتان، هەمیشە ماوەی لەشساغیان بۆ نەبووە و سودیان ومرنەگرتووە لە پشووی کات و ماوە، ئەوەی گەنج و ناسك و پڕو نەرم و نۆڵە چاوەڕوانی دەردەکانی پیری ئەکات، ئەوەی لە ئارامی و بێکێشەیی تەندروستیدا دەژی چاوەڕێی کارەساتی نەخۆشی ئەکات، تەمەندرێژەکان چاوەڕوانی تیاچوون ئەکەن، لەگەڵ نزیکبوونی نەمانی کوتوپڕو کاتی ئاڵوگۆڕی ژیان و خورپەی دڵەڕاوکێ و ئازاری ژان و خەفەت و هەناسەبڕکێی سەرەمەرگ و چاوەڕوانی بەدەمەوە چوون و فریاکەوتنی نەوە و خزم و دۆست و هاوەڵەوە.

ئاخر کەی خزم و کەس و کار سوودی هەیە بۆی؟ کەی گریان و شیوەن قازانجی بووە بۆی؟ ئەو کارەساتەی لەگەڕەکی مردوان بەتەنها بەندی ئەکەن، تەنها نەفەرێ لەتەنگەبەریدا جێی دەهێڵێ، مارو مێروو پێستی پچڕ پچڕ ئەکەن، گیاندارە ژەهراوییەکان لەشی تازەی دائەڕزێنن، باو بۆران شوێنەوارەکەی لەناو ئەبەن، هاتنی ڕۆژ و شەو نیشانەکانی ئەکوژێننەوە، ئەو لەش و باڵایە قرچۆڵ ئەبێ، کاتێ نەرم و شل بوو ئێسقانی ئەڕزێ، پاش ئەوەی بەهێز بوو ڕۆحەکەیان باری قورسە بە کۆڵی گرانەوە، بەچاو ئەبینێ ئەوەی لای شاراوە و نادیار بوو، یەك تۆز لەکرداری چاکەی زیاد نابێ و بیانووی خراپەکاری لێومرناگیرێ، ئەی باشە ئێوە ڕۆڵەی ئەو کەس و باوك و باپیرە نین؟ ئێوە براو نزیکی ئەوانە نین؟ نەتانکردووە بەنموونە لاسایی کردنەومیان و بەڕێگای ئەواندا ناڕۆن؟ شەقامەکانی ئەوان نابڕن؟ بەڕاستی ئەو دڵانە زۆر ڕەقن بەرامبەر بەشیان، بێپەروایە بۆ گرتنەبەری ڕێگەی ڕاست، بەڕێگەی دیاری و تەختدا ناڕۆن، پێ ئەچێ و گومان ئەبرێ ئەم هەموو پەندانە بۆ ئەوان نەبێ و شارەزایی تەنها بۆ دنیاویستیی بێت.

## هۆشیارکردنەوە لەنارەحەتی ( پرد )ەکە

زۆر باش بزانن ڕێڕەوتان لەسەر پردە، لەگەڵ ترسی کەوتن و نوچدان و خزان و ترازانی پێیان و نارەحەتی پاڵنان، کەواتە لە خودا بترسن وەك ترسی ژیرو بەفام کە هەمیشە لە بیری خۆیاندان و ترس دامانگیریان بووە، شەونوێژ خەوی لێ شوم کردوون، لە تینی گەرمادا خۆی تینوو کردووە، تەرکی دنیاکردنی ئارەزووی

پوکاندووەتـەوە، یـادی خـودا زمـانی بزوانـدووە، ترسـی بـۆ ڕۆژی بێخـەمی پـێش خستووە، خۆی پاراستووە لە ڕێگەی خوارو خێچ و بەڕێگەی ڕاستدا ئەڕوات، کام ڕێگە کورت و بێ کۆسپ و تەگەرەیە بەویدا ئەچێ، بۆ مەبەست هەرگیز لە خۆبایی و سەرکەشـی تووشـی لادانـی نـەکردوە و چـاوی کـوێر نـەبووە لـە ئاسـتی کـارە گوماناویەکانـدا، مـژدەی سـەرکەوتنی پێـدراوە و شـوێنی پێـشووی نیـشاندراوە، لـە خۆشـترین خـەوی و لـە هێمـنترین ڕۆژی، لـەم ڕێگـە پەلـەدا بەچاکی دەرباز بـووە و تێـشووی پێیـە، بـۆ ئـەو دنیـای بەختـەوەرە، کـاری کـردووە بـۆ ڕۆژی تـرس، پەلـەی کردووە بۆ کاتی هێواشی و ئارامی، ئەوەی چاکە حەزی لێیـەتی و ئـەوەی بـاش نییـە خۆی دەرباز کردووە لێی، لە ئەمڕۆدا چاودێری سبەی کردووە بۆ پێشەوەی نواڕیـوە، بە بەهەشت پاداشت دراوەتەوە، پاداشتی بەهەشت بەسە بۆ خـەڵات و بـەرات، ئـاگری دۆزەخ بەسە بۆ سزاو تۆڵە، خـودا بـۆ خـۆی بەسـە وەك تۆڵەسـتێنیی و یارمەتیـدەر، نامەی کردارەکانی بەسە بۆ پارێزەری یان دوژمنایەتی.

## ڕاسپاردەی خۆپارێزیی

داواتان لێدەکەم بەخۆپارێزی بۆ خودا، کە بیانووی نەهێشتووە بـۆ بیـانووگران، دادوەری بەنیـشاندانی ڕێگـەی ڕوونکـردووە، ئاگـاداری کـردون لـە دوژمـن کـە لـەناو هەناوتانـدایە و خۆی شـاردووەتەوە، بەچـوتەو نهێنی بەگوێتانـدا ئەچرپێنێ، لـە ڕێ لاتاندەدا و لەناوتاندەبات، بەڵێن ئەدا و ئەتانخەڵەتێنێ، کارە قەدەغەکان لاتان شیرین و جـوان دەکـات، تاوانـەکانی بڕسـتبڕتان لا ئاسـان ئـەکات، کـە هاودەمەکـەی پـەلکێش کـردو دەرگـای دیلەکـەی لەسـەر خـۆی داخـست، ئەوکاتـە پەشـیمانە و لـەکردەی شـیرینکردن و بەگـەورە زانینـی ئـەوەی بەسـووکی دانـابوو، تـرس نەخاتـە دڵییـەوە لەوکارەی، کەکاتی خۆی دڵنیایی و بێمنەتیی پێدابوو.

## سەرەتای درووستبوونی مرۆڤ *

بەڵام ئەم بوونەوەرەی، کە خودا درووستیکردووە لـەناو تاریکییـەکانی منداڵدان و لەناو پەردەی پێچاو پێچدا، لەدڵۆپێکی هەڵقوڵیو و زالویەکی گچکۆکە و کۆرپەلـەو شـیرەخۆر و پیرەوکـە و نـەوجوان، پـاش دڵێکـی وەرگـرو و زمـانێکی گویـاو چـاوێکی

تێبینەری پێداوە بۆ وەرگرتنی و تێگەیشتنی پەندو ئامۆژگاری و خۆگرتن و دووری لەتاوان، هەتا ئەو کاتەی ڕاست و بەرز وەستاو گەیشتە ئاستی وێنەی هاوچەشنی بە لوتبەرزی هەڵئەتورێنێ و سمکۆڵانی کوێرانە هەنگاو دەنێت، لەناو بیری قووڵی ئارەزووەکانی دەڕوێنێ، خۆی ماندوو و شەکەت ئەکات بۆ دنیا و ڕابواردن و کەیف و سەفای خۆی و لارێگرتن لەوەرگرتنی چێژەکانی، هیچ حسابێك ناکات بۆ گوناح و دڵی نالەرزێ لە ترسی خودا، ئەمرێ لەم بارە ناهەموارە پڕ ئاژاوەدا دیلی هەڵەو لادانی خۆیەتی، هیچ سوودێکی وەرنەگرتووە لە بریداو قەرزێکی نەداوەتەوە، ئێش و ژانی مەرگ پەلاماری ئەدا، لەگەرمەی سەرکەشیی و ملهوڕیداو لە پەیڕەوی سروشتیدا، ئەوکات سەرگەردان و سەرلێشێواو و بێخەو و خۆراك لە ئازاردا ئەتلێتەوە بەدەردو نەخۆشی و زامەوە، بێسودە برای دایك و باوکی و باوکی دڵگەرم و بەبەزەیی و خێزانی چاوبەفرمێسك و گریان و سنگکوتانیی و بێئارامی.

مرۆڤ لەسەر خۆشییەکی بێئاگاو توندو تیژییەکی نالەبارو ناڵەو هاواری بەئازارو و هەناسە بڕکێیەکی سەرەمەرگ و بەرەو پێشدانێکی ماندووکاردایە! ئەوجا ئەپێچرێتەوە بەکفنی دەرەدامان و ڕائەکێشرێ بێ پەلەقاژە و بەنەرم و نیانی ئەخرێتە سەر چەند ڕاژەیە بە ماندو و شەکەتی سەفەری دوورو لاواز و لاتی و نەخۆشی، تەرمەکەی هەڵدەگیرێ لەلایەن دۆست و خزم و کەس و کاری بۆ وڵاتی غەریبیی و دوور لە هاتوو چوون و سەردان و دیدەنی، کە بەڕێکران وگەڕانەوە و کۆسکەوتوو بڵاوەی کرد، لە چاڵێکی قووڵدا دایدەنێن بەهێواشی و نزمی و دەکەوێتە بەر سامی پرسیارو سەر لێشێوانی تاقیکردنەوە.

قورسترین بەڵای ناهەموار لەو شوێنە، زووری گەرمی توانابڕو هاوێشتنی بۆ ناو گڕی ئاگرو بڵێسەی دۆزەخ و نرکەی ئاگردانی گڕگرتووی سەعیرە، لەو شوێنە کاتی پشوودان نییە، مردنێکی ڕەحاتی نییە ڕزگاری بکات، وەنەوزو سەرخەوێکی ئارامکەرەوەی نییە، لە نێوان ئەم مردنانەو ئازاردانی گشت کاتەکان، (ئێمە هەموو بەندەی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە)، ئێمە بەخودا بۆ دواوە دەکشێینەوە، بەندەکانی خودا لە کوێن، بەتەمەنەکان ژیان و ڕایانبوارد، فێرکران و تێگەیشتن و ماوەیان پێدراو گوێیان پێنەدا، ڕۆژی خۆیان پێدراو سوپاسیان لە بیرکرد، ماوەیەکی درێژیان پێدراو چاکەیان لەگەڵ کراو ئاگادار کران بە توندیی و پەیمانیان پێدرا!.

بەترسەوە ئاگاداربن لەو گوناهانەی ئەتانخاتە چاڵەوەوە و ئەو عەیب و عارەی نالەباری ناشیرینکار خاوەن فام و چاوو گوێ و بێدەردو بەڵاو خاوەن کەل و پەل! ئایا ماوەی دەرباز بوون و رزگار بوون و پەناگەو شوێنی حەسانەوە و هەڵاتن و خۆشاردنەوە و دووبارە گەڕانەوە بۆ دواوە هەیە!؟، یان نییە، (دەسا ئێوە چۆن لەرێگەکە لادەکرێن)، یان بۆ کوێ بڵاوەی لێ ئەکەن؟ یان بەچی لەخۆبایی دەبن و فیز ئەکەن؟.

بەشی ئێوە لەم خاکە پان و بەرین و درێژە بەقەدەر باڵایە، خۆڵ ئەکرێ بەگۆنایا!، ئێستە بەندەکانی خودا پەتی خنکاندن ماوەی ماوە، رۆح بەرەڵایە لەکاتی رێ نیشاندان، لەش ئیسراحەتەو لەحەوشی کۆبونەوەدایەو ماوەی ماوە و پەشیمانی لەبەر لوتەو ماوە و مۆڵەتی پەشیمانی و گەڕانەوە، دیاری کردنی پێویست پێش ناخۆشی و تەنگەلانی ترس و توانەوە و پێش هاتنی نادیاری چاوەڕوانکراو گرتنی خودای بەرزو بەتوانا.

* ئەم وتارەی پێشەوا ناوی (چڵەپۆپەیە) کە لە وتارەکە بوەوە گوێگران لەشیان دەلەرزی و چاویان فرمێسکی دەباران و دڵیان خورپەی لێکەوت.

(٨٣)

## وتارێ باسی عەمری کوڕی عاس ئەکات

سەیرو سەمەرەی کوڕی (نابغە) ژنە دەرکەوتووەکە دەڵێ: گوایە من حەزم لەگاڵتەو گەپەو زۆر سوعبەت و یاریبازم و هەڵس و کەوتم لەگەڵ خەڵك بەگەمەو گاڵتەیە، لە راستیدا وتەیەکی ناڕاستی وتووە و ناماقوڵییەکی گوناهی وتووە، بەڵام ئەو بۆ خۆی (گەنترین وتن درۆیە) هەرچی ئەڵێ درۆ ئەکاو بەڵێن ئەداو سوێنی لەسەر ئەخواو بەجێی ناهێنێ، سواڵی لێئەکرێ و رەزیلی و تژی ئەکات، خۆی داوا بکات و سواڵ بکات ئەپارێتەوە، خیانەت ئەکات لەپەیمان، پەیوەندی و ئامۆشۆی خزمانی بڕیوە، ئەگەر کات وەختی شەڕ بێت ئاخۆ چ ئازا و چ فەرماندەیە بێت! کە هێشتا شیر جێگەی خۆی نەپێکاوە، هەر کات ئەوە هاتە کایەوە، بەرزترین فێڵی ئەوەیە پاشووی هەڵئەداتەوە بۆ ئەوەی لەسەریەتی، بەڵام من قەسەم بەخوا یادی

مردن ماوەی یاری و گەمەم نادات، ئەویش لە بیر چوونەوەی ڕۆژی دوایی گفتی حەقی نەهێڵاوە، ئەو ئەوکەسەیە پەیمانمان نەدا بەمەعاویە هەتا مەرجی بەخشینی حەلاڵی و بەراتی لێومرنەگرت و لاکی چەور نەخاتە بەردەمی لەپاداشتی وازهێنان لە ئایین و باوەڕ.

( ٨٤ )

## وتارێ لەبارەی سیفەتەکانی خودای بەرزو بەشکۆ

بەدڵ باوەڕم هەیەو بە زمان بڕیار ئەدەم، کە هیچ پەرستراوی بەحەق جگە لە (الله)م نییە، تەنهایە، هاوەڵی نییە، یەکەمە و کەس لە پێشی نییە، دواییە و دوای ئەو کەس نییە، گومان بۆ هیچ سیفەتێکی ناڕوات، عەقڵ ناتوانێ بۆ چۆنیەتی، بەشبەشی ڕووی تێناکات و پارچە پارچە نابێ، نەچاو و نەدڵ تێی ناگات و بە دەوریدا ناڕوات، ئێوەش بەندەکانی خودا، پەندو ئامۆژگاری وەرگرن لەپەندە بەسوودەکان، بەڵگە ڕوون و ئاشکراکان بژنەون، بترسن لەو ترسێنەرانەی بەڕوونی دیارن، سوود وەرگرن لەیادو ئامۆژگاریەکان، هاکا کەڵبەی مەرگ لە گەردنتان گیر بوو، هەموو ئاوات و ئامانجەکانتان پچڕا، کاری ناقۆڵا دامانگیرتان بووە، دەتان ئاژوون بۆ چەشمەی ئاودانن (هەر کەسێ دێ یەکێك وە پێش خۆی داوە، یەکێکیش شایەتیدەدا)، ئەوەی دەهاژوێ دەیانبا بۆ گردبوونەوە و ئەوەی شایەتی ئەدا هەموو کردارەکانی بە تۆمار نیشاندەدا.

## وەسفی بەهەشت

بەهەشت پلە پلەیە، یەك لەیەك چاکترە، میوانخانەکانی وەك یەك نین، نیعمەتەکانی بێکۆتاییە، دانیشتوانی کێشەیان نییە.

( ٨٥ )

## وتارێ لەبارەی سیفەتەکانی پەروەردگار و ئامۆژگاریی و ڕاوێژکاریی

ئەو خودایە هەموو شاراوەکان ئەزانێ و ئاگاداری هەموو دڵانە، لایەنی هەموو شتەکان ئەزانێ، توانای بەسەر هەموانەو دەسەڵاتدارە بە سەریانەوە.

## ئامۆژگاریی خەڵك

ئامۆژگاریم ئەوەیە بۆ خەڵك با هەرکەس لە ئاستی خۆی کاربکات، لە ڕۆژانی مۆڵەتپێدانی، پێش ئەوەی ئەجەل گیانی بکێشێ، لەکاتی بێکاریدا پێش وەختی کارکردن، کاتی هەناسەی ئاسایی هەیە بۆ ئەو کاتەی گەرووی ئەگیرێ و هەناسەی نایە. جێگە خۆشکا بۆ خۆی و پێکانی، با تێشوی پێبێ لە یانەی کۆچەوە بۆ شوێنی نیشتەجێ، خەڵکینە خواتان لەبیر بێ لە جێبە جێکردنی سپاردەی پەیامەکەی، خودا ئەو ئەرك و مافانەی بە ئەمانەت لاتان داناوە، خودای پاك و بێگەرد ئێوەی لە خوتوخۆڕایی دروست نەکردووە و بەئاسانی دەستتان لێبەرنادا، هەرگیز لە سەرلێشێواوی و نەفامی و کوێرایی بەجێتان ناهێڵێ، هەموو کارەکانی بۆ دیاری کردون و نیشانی داون، کۆتایی تەمەنتان دیاری کراوە، لە قورئاندا (هەموو شتێ ڕوون ئەکاتەوە) ماوەیەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی لەناو ئێوەدا ژیاند هەتا بۆ خۆی و بۆ ئێوە لە قورئاندا ئەو ئاینەی کە خۆی پێیڕازی بوو تەواوی کرد و بەزمانی خۆی هەموو کارە باش و پەسەندو ناپەسەندەکان و فەرمانەکانی بە ئێوە سپارد، بەهانەی داوەتە دەست خۆتان و بەڵگەتان لەسەر تۆمار ئەکات، هەموو هەڕەشەکانی پێوتوون و ئاگاداری کردون کە لەبەردەمتان ئاگری بڵێسەدار هەیە، فریای پاشماوەی کارەکانتان بن، خۆتان ڕابێنن لەسەری، چونکە زۆر کەمە لەچاو ڕۆژانی بێئاگایی و گوێنەدان بەپەندو ئامۆژگاری، دوای کارئاسانی مەکەون بۆ خۆتان، چونکە پەلکێشتان ئەکات بۆ ڕێبازی ستەمکاران، سستی مەکەن با پەلاماری تاوانتان پێنەدا، بەندەکانی خودا !

باشترین گوێگرو گوێڕایەڵ ئەو کەسەیە کە زیاتر فەرمانبەرداری خودا بێ، ساختەترین کەس ئەوەیە بە فەرمانی خودا نەکات، خەڵەتاو ئەوەیە خۆی

**نەخەڵەتێنێ، بەختەوەر ئەوەیە، کە ئاینەکەی بەپاکی ماوەتەوە، بەختیار ئەوەیە پەند لە خەڵك وەربگرێ، بەدبەخت ئەوەیە کە بکەوێتە داوی ئارەزوو و سەرکەشیی خۆی، زۆر هوشیاربن، کەمێ ڕووپامایی و ڕیابازیی هاوەڵدانانە بۆ خودا، دانیشتن لەگەڵ پیاوخراپان باوەڕتان لاوازو کزئەکا و ئەنجوومەنی شەیتانە لە هەمان کاتدا، خۆتان بپارێزن لەدرۆ چونکە دژی باوەڕە، ڕاستگۆ لە لێواری ڕزگاری و سەربەرزیدایە، درۆزن لەگوێسەبانەی کەوتن و نزمیدایە، ئیرەیی بەیەك مەبەن، چونکە ئیرەیی باوەڕ ئەخوا وەك ئاگر داری وشك ئەسوتێنێ، کینەو ڕق لەیەك هەڵمەگرن چونکە چاکە ئەکوژێنێتەوە، ئاگادار بن هیوا و ئومێدی بێجێ ئەقڵ تەمبەڵ ئەکات، یادی خودا لە بیر دەباتەوە، خەیاڵ بە درۆ بخەنەوە، چونکە خۆی گومڕایە و خاوەنەکەی گومڕا کراوە.**

**( ٨٦ )**

## وتارێك لەبارەی نیشانەی پارێزگار و لادەر و هێما بۆ ئال و بەیت و گومانی هەندێك لە بەندەکانی خودا

**باشترین و خۆشەویسترین بەندەی خودا لای خودا ئەو بەندەیە کە خودا یارمەتی داوە کە زاڵ بێت بەسەر خۆیدا و بەرگی ترس و بێدەسەڵاتی لەبەر بکات و بەکراسی ئاودامانی بێتوانایی خۆی داپۆشێ، چرای ڕێ دەرککردن داگیرسێنێ لە دڵیدا، نانی زیافەتی بۆ ڕۆژی دابەزینی ئامادە بکات، دوور لەخۆی نزیك بکاتەوە، بارە قورسەکە لەسەرشانی سووك بکات، بڕوانێ و ببینێ، یادی خودا بکات و کرداری چاکەی زۆر بکات، خۆی لە ئاوی شیرین و ڕەوان لەسەر چەشمەوە تێر بکات، بە ئارام بخواتەوە، ڕێگەی تەخت و پتەو بگرێتەبەر، بەرگی هەواو ئارەزوو لابات، خۆی لە هەموو خەمێ دامالێ، جگە لە خەمێ کە بۆی دروستکراوە، لە گوێی دەرچێ و هاوڕێی هەوەسبازەکان نەکات، کلیلی دەرگای ڕێگا وەرگرێ و کلۆمی دەرگای خراپە داخا، ئەوە ڕێگەی خۆی دۆزیوەتەوە، ڕێگای گرتووەتەبەر، بە ڕووناکی ناو دڵی دەریا دەبڕێ، دەستیگرتووە بەدەسکی قایم و پتەو، دەستی لە پەتی قایم و قوڵ گیربووە، یەقین لای وەك تیشکی ڕۆژ ڕووناکە، خۆی داوەتە دەست خودای خۆی لەبەرزترین**

كاردا، هەر ئیشێك هاتە بەردەمی بەڕەوانی وەڵامی ئەداتەوە و هەموو لقێك دەباتەوە بۆ ئەسڵی خۆی، چرای تاریكستانی پێیە، شارەزای كۆسپ و چاڵ و چۆڵە، كلیلی مەسەلە قورسەكانە، چارەسازی هەموو گیرو گرفتەكانە، شارەزای هەموو دەشت و بیابانەكانە، كە وتی تێیگەیەنێ، كە بێدەنگ بوو بێوەی ئەبێ، پوخت بۆ خودایەو خوداش بە پوختی وەریگرتووە، ئەم جۆرە مرۆڤە كانزای ئاینەكەیەتی و مێخی زەوییەكەیەتی، خۆی بەستووەتەوە بەدادەوە، یەكەم داوی هەواو هەوەسی لەخۆی لاداوە، باسی حەق ئەكات و كاری پێئەكات، هەر كارێكی چاكەی بۆ هەڵكەوێ ڕووی پێوە ئەنێ، لەهەر جێگەیە گومانی چاكە هەبێ بۆی دەڕوا، خۆی داوەتە دەست قورئان، بووەتە ڕابەرو پێشەوای، باری خۆی دائەگرێ لەهەر شوێنێ كە قورس بوو، لەهەر شوێنێ كە دانراوە بۆ حەوانەوە دائەبەزێ.

## نیشانەكانی پیاوخراپ

كەسێكی تر هەیە خۆی بەزانا داناوە و زانا نییە، هەندێ پڕو پوچیی وەرگرتووە لە نەفام و سەرلێشێواوەكان، داوی چەواشەكاریی بۆ خەڵك ناوەتەوە، لە پەتی لەخۆبایی و گفتی درۆ، قورئان بەبیری خۆی ڕافە ئەكات، ڕاستی بۆ ڕای خۆی ڕائەكێشێ، بێباكە لەكاری گەورە و تاوان، كەتنی گەورە سووك تەماشا ئەكا، بە قەولی خۆی ئەڵێ خۆم ئەپارێزم لەكاری گومانـاویی، كەچی خۆی تێدایە، ئەڵێ دوورم لە ڕەوشتی نەوباو، كەچی لەناویدا پاڵی داوەتەوە، وێنەی وەك مرۆڤە، بەڵام دەروونی وەك ئاژەڵە، ڕێگەی باش نازانێ، هەتا لەسەری بێ كوێرە ڕێگە شارەزا نییە، هەتا خۆی لادا لێی ئەوە مردووی ناو زیندانە!.

## ئال و بەیتی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم )

## ( ئەرێ ئێوە بۆ كوێ ئەڕۆن، بەرەو كاملا لائەدەن؟ )

ئاڵاو پەرچەمەكان بەپێوەن، بەڵگەو نیشانەكان دیارو ئاشكران، ڕوانگە دانراوە، ئیتر بۆ كوێتان وێڵ ئەكەن؟ نەك هەر ئەوە بەڵكو بۆچی سەرگەردانن، ئال و بەیتی پێغەمبەرەكەتان(صلى الله عليه وسلم) وان لەناوتان، جڵەوی ڕاستی لەدەستی ئەوانە، زمانی ڕاستگۆ بەوانە، لەو شوێنە جوانە جێگایان بۆ دیاری بكەن، كە قورئان بۆی

داناون، وەرن بۆ زانستەکانیان وەك ڕەوی تینوو بۆ سەری ئاو، خەڵکینە وەریگرن لە خەتمی هەموو پێغەمبەران کە دەفەرموێ:

(ئەوەی لە ئێمە بمرێ مردوو نییە، ئەوەی بڕزێ لە ئێمە نارزێ، دەم لە کارێك مەدەن کە نایزانن، زۆربەی ڕاستی لەوانەدایە کە ئێوە ئینکاری ئەکەن، داوای لێبوردن بکەن لەو کەسەی کە بەڵگەتان لەسەری نییە، (ئەویش منم)، من بە قورس و گرانبەها کە جولامەوە و قورسی بچووك لەپاش خۆم جێ دێڵم، ئالای باوەڕم بۆ هەڵکردوون، لەسەر حەرام و حەلاڵ ڕامگرتوون، دادپەروەریم لەبەر کردوون، لایەنی چاکەم بۆ ڕاخستوون لەکار و ڕەفتارو گوفتارم، جوانترین ڕەوشتی بەرزم لەخۆمەوە فێرکردوون، ئەوەندە دوای بۆچوونی خۆتان مەکەون لەو کارانە چاو قووڵی نابینێ و بیر تێی ناچێ.

## بۆچوونی هەڵە

کار گەیشتووەتە ئەو ڕادەیە کە گومانبەر گومان ئەبا کە ئەو دنیایە بەسراوەتەوە بۆ نەوەی ئومەییە، شیریان بۆ دابدا لە ئاوی سازگار ئاویان بدا، قەمچی و شمشێری ئەوانە لەسەر ئەم میللەتە لانابرێ، بەڵام ئەو گومانە درۆیە، بەڵکو تەنها وەك مژینی هەنگە لە شیلەی گوڵ و گیای بەتام، بۆ کەمێ تامی ئەکەن و بەکۆمەڵ دایئەنێن.

( ٨٧ )

## وتارێك لەبارەی ( خراپە ) کە خەڵك لەناو ئەبا

لەپاش ئەمە... خودای پاك و بێگەرد گەورە ستەمکارانی زەمان لەناو نابا هەتا ماوەیەك مۆڵەت و خۆشگوزەرانییان نەداتێ، ئێسقانی شکاوی نەتەوەیەك ناگرێتەوە هەتا ماوەیەك تووشی بەڵاو ناخۆشییان نەکات، لەکەمتر لەو بەڵا و کارەساتەی لە پێشتانە و ئەو ناخۆشیی و ناهەمواریییەی بەسەرتان هاتووە، دەبێ پەندو بەخۆدا چونەوەتان هەبێ، هەموو خاوەن دڵێك ژیر نییە، هەموو خاوەن گوێچکەیەك بیسەر نییە، هەموو خاوەن چاوێك چاو تیژ نییە. زۆر سەیرو سەمەرەیە! چۆن سەرم

سوڕنامێنێ لـە هەڵـەی ئـەم گروهانـە، لەگـەڵ زۆری جیـاوازی بەڵگـەو دەلیلیـان لـە ئاینەکـەیان، شـوێن ڕێبـازی پێغەمبـەر(صـلی اللە علیـە وسـلم) ناکـەون و لـە پـشتی بریکارییەوە ڕاناوەستن، بڕوایان بە نادیار نەماوە، خۆیان ناپارێزن لە عـەیب و عـار، کاریان لە کردەوە گوماناوییەکانە، هەنگاویان بۆ هـەواو هەوەسـە، چاکە لایـان تـەنها ئەوەیە خۆیان بە چاکی بزانن، ناپەسەند لایان ئەوەیە ئەوان پەسەندی نەکەن، هات و هاواریان لەناخۆشیدا تـەنها بـۆ لای خۆیانـە، پاڵپـشتیان لـەکارە تەمومژاوییەکانـدا تـەنها بـەڕای خۆیانـە، وا دەرئەکـەوێ هەریەکـەیان پێـشەوای خـۆی بـێ، وا ئـەزانێ دەستی بەدەستی باوەڕ پێکراو گرتووە و پەیوەندە بەهۆکاری قایم و پتەو!!.

( ٨٨ )

## وتـارێك لەبارەی پێغەمبەری مەزن( صلی اللە علیە وسلم ) ڕاگەیاندنی پێشەوا لە جەنابیانەوە

خودا پێغەمبەری ڕەوانە کرد لەو ماوەیەی کە پێغەمبـەری تێـدا نـەبوو، مـاوەی درێژی خەوی بێ ئاگایی نەتەوە و گەلان و لاساری و سەرکەشی ئاژاوە و پشێوییەکان و بڵاو بوونەوەی بێویڵییەکان و کاتی پەرەسەندنی بڵێسەو گڕی جەنگەکان، ڕووناکی لەدنیادا کزو لاواز بوو، دیاردەی لەخۆبایی بڵاوبوو، کاتی گەڵازەردیی و خـەزان بـوو، تەمابڕاو شارۆی بەرهەمەکان بـوو، ڕۆچـوون و کـزی ئاوەکـان بـوو، پەرچـەم و ئـاڵای نیـشانەدەر دزی بـوو، ئـاڵای کـەوتن و نوچـان بـەرز کراوەبـوو، بـە دیمـەنێکی مـۆن و ناشـیرین ڕووی نـاوە لـە پـەیڕەوانی، ڕووی گـرژو چـەتوونی داواکـارانی نـابوو، بـەروبوومی هەڕەشـەڕ و ئـاژاوە بـوو، خـۆراکی لاکـی بۆگـەن بـوو، دروشمـی تـرس و تۆقاندنی هەبوو، عەباو کەوڵی شێر بوو.

بەنـدەکانی خـودا پەنـدو ئامۆژگـاری وەرگـرن !، بـیر لـەو هـەموو نەهامـەتیی و نەفامیی و کارەساتانە بکەنەوە کە بەسەر باوك و براکانتاندا هاتووە و پێیەوەگیرۆدە بوون، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، (بەوخودایەی تەمـەنی منـی بەدەسـتە) چاخ و چەرخ و سـاڵانی زۆر لـە نێوانتانـدا نییـە، سـەدان سـاڵ و قـەڕن پـێش ئێـوە نـەبوون، نێوان ئێوە و ئەوان کە لە پشتیان بوون دوور نییە.

**قەسەم بەخودا، ئەوەی پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) بە گوێیدا داون ئەوە ئا ئەمڕۆ من بەگوێتان ئاشنای دەکەم، بیستنی ئەمڕۆتان لەگەڵ بیستنی ئەوێ ڕۆژێ جیاوازی نییە، هەر چاوێك و هەر دڵێك ئەوێ ڕۆژێ بۆتان ڕواوە ئەمڕۆ هەمان نموونەتان پێدراوە.**

**قەسەم بەخودا، شتێکتان نیشان نەدراوە پاش ئەوان، کە ئەوان لێی بێئاگا بووبن. قەسەم بەخودا، شتێکتان پێ نیشان نەدراوە پاش ئەوان کە نەیانزانیبێ و نەدراوە بە ئێوەش شتێك کە بەوان ڕەوا نەبینرابێت، ئەو ئاژاوە و بەڵاو فیتنەیە کە بەسەرتان هاتووە و جڵەوی شلکراوە و تەنگە و ژێرسك و قەیاسە بەرەڵا کراوە، لەخۆتان بایی مەبن بەوەی دراوە بە لە خۆباییەکان، شتێکی کەمماوەیە وەك سێبەری کشاو تاماوەیەك ئەمێنێ.**

**( ٨٩ )**

## وتارێك لەبارەی دروستکاریی و گەورەیی خودا

## ( باسی بوونەوەرەکان )

**ستایش تەنها بۆ خودا کە ناسراوە بێ بینین، دروستکارە بێ بیر کردنەوە، لە ئەزەل هەر بووە و هەر دەمێنێ، لەو کاتەی نە ئاسمانی خاوەن تاوەر، نەپەردەی دەرگاداری گەورەو نە شەوی تاریك و نەدەریای ئارام و نە چیای بەرزی خاوەن شیو و دۆڵ و نە ڕێگەی پێچاوپێچ و نە زەوی پان و تەخت و نە خەڵکانی پشت بەستوو بەم دامەزراوانە، تەنها ئەوە داهێنەری بونەوەر و هەرخۆی میراتگریەتی، خودای خەڵك و ڕۆژی دەریەتی، ڕۆژو مانگ هەمیشە لە ڕەزایەتی ئەودان، هەموو تازە دەرزێنن و هەموو دوورەکان نزیك دەکەنەوە.**

**هەر کەس بەشی ڕۆزی خۆی داوەتێ و کارو شوێنەواریان ئامار ئەکات و هەناسەیان ژمارە ئەکات و تەماشاکردنی بەتاوان و شاراوەی دەروونیان دەزانێ، شوێن و جێگە لە ئارامگای منداڵدان و پشتی باوکیان ئاگادارە، هەتا ئەیانبات بۆ کۆتایی، ئەو خودایە کە تۆڵەی بەزەبرە لەگەڵ فراوانی بەزەییدا، ئەوەندە بەخشندەیە بۆ دۆستەکانی ئەوەندەش سزادارە بۆ دوژمنەکانی، وێرانکاری نەیارانە و سەرشۆڕکاری**

**بەرهەڵستکارانە، سەرکەوتووە بەسەر دوژمنانیدا، ئەوەی پشتی پێببەستێ بەسیەتی، ئـەوەی داوای لێبکـات بێبەشـی ناکـات، ئـەوەی وامـی بـداتێ پێـی ئەداتـەوە، ئـەوەی سوپاسی بکات پاداشتی ئەداتەوە، بەندەکانی خودا خۆتان کێشانە بکەن، پێش ئەوەی کێشانەتان بکـرێ، لێپرسـینەوە لەگەڵ خۆتـان بکـەن، پـێش ئـەوەی لێپرسـینەوەتان لەگەڵ بکرێ، هەناسەی بەئارام هەڵکێشن، پێش ئەوەی دەست بخرێتـە بینتـان، ڕێگـە ببڕن بە هێمنیی ونارەزووی خۆتان، پێش توندو تیژیی کارواندار، بزانن ئەو کەسەی خۆی هاوکاری خۆی نەبێ بۆ خۆی کە ئامۆژگار بێت و ترسێنەر بـێ هـەرگیز کەسـی تر ناتوانێ ئامۆژگار و پەنددادەری بێ.**

**( ٩٠ )**

## وتارێك کە بەوتاری ( تارمایی ) ناونراوە

**مەسمەدەی کوڕی سەدەقە لـە جەعفـەری سـادقەوە دەگێڕێتـەوە: پێـشەوا وتـاری دەدا لەسەر دوانگەی کوفە، کابرایەك پرسـی لـە پێـشەوا: باسـی خودامـان بـۆ بکـە تـا زیاتر خۆشمان بوێت و زیاتر بیناسـین، پێـشەوا فـەرمووی: هەڵـسن بـۆ نوێـژ. خـەڵك کۆبوونـەوە هـەتا مزگـەوت پـڕ بـوو، پێـشەوا سـەرکەوتە سـەر دوانگـە زۆر تـوڕە و ڕەنگگۆڕاو سوپاسی خوای کرد و دروودی بۆ گیانی پێغەمبـەر(صـلی الله علیـە وسـلم) هەناردو فەرمووی:**

**ستایش بۆ خودا کە نەدان و ڕژدی ڕووی تێناکات و وشکی و ڕەزیلـی لەبارەگایـدا نییـە، هـەژاری و کەمدەسـتی بـە بەخـشین و دەستگوشـادی ڕووی تێناکـات، هـەموو بەخشندەیەك لە ئاستیدا کەم سامانە، هەموو خۆگرێـك لـە بەخـشینی لەچـاو ئـەودا عەیبدارە، بەخشندەو خەڵاتدەرە بە جۆرەها نیعمەت بەدەسـکەوتی زیـاتر و زیـاتر و بەشی زیاتر، خەڵك وەك ماڵ و عەیالی وایە کە بـەخێویان دەکـاتن، ڕۆزی بۆدانـاون و بژێوی بۆ دیاری کردون و برپویەتیەوە، ڕێگەی دیاری کردووە بـۆ چـوون بـۆ لای بـۆ داوای دەسکەوت، خودا ئەوەی داوای لێنـەکردوە بەخـشندەترە لـەوەی داوای لێکـراوە، ئەو یەکەمە، لە پێش ئەو کەس نـەبووە، دوایـی و کۆتاییـە و دوای ئـەو کـەس نییـە، بیلبیلەی چاو نایبینێ، کات و زەمان بەسەریا نەهاتووە، هەتا حاڵی بگۆڕێ و شوێن و**

جێگەی دیاری نییە و نەبووە، هەتا ئازوگوێز بكات، ئەگەر خودا ببەخشێ بە ئەندازەی هەناسەكان و چیاكان و كانزاكان و دەریا گەورەكان لەناو سەدەف و بەزێڕ و زیوو وردە مەرجان هەرگیز لە بەخشندەیی ئەو كەم ناكات، زۆری و فراوانی لای خودا كەم ناكات، ئەوەندەی لایە لەخەزنەی نیعمەتەكان بەداوا كردنی هەموو خەڵك نابڕێتەوە، چونكە خودا ئەو بەخشندەیەیە كە داوای داواكاران ڕقی لا دروست ناكات و پاڕانەوەی زۆر تووشی ڕەزیلی ناكات.

## سیفەتەكانی خودا لە قورئاندا

ئەی كابرای خاوەن پرسیار! تەماشاكە ئەوەی قورئان نیشانت ئەدا لەبارەی سیفەتی خودا بەدوایكەوە و پەیڕەوی بكەو بە تیشكی ڕووناكی و ڕێ نیشاندانی كاربكە، ئەوەی شەیتان داوات لێئەكاو لە قورئان فەرز نەكراوە و لە فەرموودەی پێغەمبەر و پێشەوایان(صلی الله علیه وسلم) ڕێگای ڕاست ئەوە بیسپێرە بە زانینی خودای پاك، چونكە ئەوە مافی كۆتایی خودایە لەسەرت.

ئاگاداربە زانایانی بەزانست و پایەدار ئەوانەن كە خۆیان ناخەنە ناو چوارچێوەی ماڵە نادیارەكان، چونكە دانیانناوە بەوەی كە نایزانن ئەو شتانەیە كە نادیارە لێیان شاراوەتەوە، خودا ستایشیان ئەكات بەوەی دانیانناوە بەبێ دەسەڵاتی زانینی ئەو شتەی لێینەگەیشتوون، بیرنەكردنەوەی قوڵیان كە لەسەریان فەرزنەكراوە ناوبردووە بە پایەداری لە زانیندا، ئەتۆش برای خاوەن پرسیار كار تەنها بەم ڕایە بكە توانایی خودای پاك بە پێوانەی ژیری خۆت هەڵمەسەنگێنە با نەفەوتێیت!.

خودا بەتوانایە بەو ئەندازەی خەیاڵ و وەهم كۆتایی نازانێ و ئەگەر هەوڵی زانینی بدات و بیری دوور لە دڵە ڕاوكێ هەوڵ بدات بنج و بنەوانی بزانێ و ژیری و فام شێت و دێوانە بێت بۆ زانینی چۆنیەتی سیفەتەكانی و دەرگای عەقڵ خۆی بهاوێتە ئەو سیفەتانە بۆ تێگەیشتن لێیان لەم هەموو حاڵەدا دەست دەنرێت بە ڕووی ئەو هەوڵانەوە، لەناو پەردەكانی نادیاردا ون ئەبێ و تێدا ئەچێ، هەمووی بەپوختی ئەداتە پاڵ زاتی خاوەن شكۆی بەتوانا.

ئەوكاتە پاشەوپاش گەڕایەوە كەدرا لەناوچاوانی ( دانایە و دانا) كە ناتوانێ

بەزۆرو ستەم کرۆکی زاتی پەروەردگار تێبگات، هەرگیز هوشیار و زانایان ناتوانن دەسەڵات و شکۆی خودا بەدڵی خۆیاندا بهێنن، خودا ئەو خودایەیە کە بوونەوەری داهێناوە بێ نیشانەو نموونەی پێشین و ئەندازە لاسایی و پەیڕەوی پێش خۆی لە خوایەکی پەرستراو، خودا گەورەیی و توانای خۆی پیشانی ئێمە داوە بە شێوەیەك کە دیاردەی حیکمەتەکانی گۆیایە پێی، پێویستی دانپێنانی خەڵك کە ڕاگرتنی ئەو هەموو بونەوەرە تەنها لە توانای ئەودایە، ئێمەی وابەستەکردووە کە بە بەڵگەی خۆ بیناسین.

بونەوەرە نوێ داهاتووەکان شوێنەواری دەسەڵات و نیشانەی حیکمەتی خۆیەتی، لەبەر ئەوە هەموو دروستکراوێك خۆی بەڵگەی بوونی خودایەو دەسەڵاتی ئەو دیاری ئەکاتن، ئەگەر بێڕەنگە بیرکردنەوە گۆیایەو دەلیلی خودای داهێنەرە.

من شایەتی ئەدەم ئەوەی تۆ بچوێنێ بە ئەندامە جیاوازەکانی دروستکراوی تۆ و هێنانی گۆشت و پێست بەسەرنووکی جمگەکان کە داپۆشراون بە لێکدانەوەی حیکمەتی تۆ بە یەقینی دڵی خۆی هەوڵی ناسینی تۆی نەداوە و دڵیشی هەرگیز بەلای یەقیندا نەچووە، کە تۆ نە دژ نە هاوشانت نییە، لەوانەیە نەیبیستبێ کە شوێن کەوتوان خۆیان بێبەری ئەکەن لە پێشەوا و پێشینەی خۆیان کە دەڵێن: (سوێند بەخودا ئێمە لە ڕێ لادەربووین کە ئێوەمان دەگەڵ داهێنەری جیهان بەرانبەر کرد).

درۆزنن ئەوانەی هاوتات ئەکەن لەگەڵ غەیری خۆت، ئەتچوێنن بە بتەکانیان و دیاردەکانی دروستکراوەکانی خۆت، بەوەهمی بەتاڵی خۆیان بۆ تۆ نیشان دەدەن، لق و پۆپت بۆ دادەنێن بەخەیاڵی خۆیان، هاوتات ئەکەن بەتەن و لەشی خاوەن هێزە جۆربەجۆرەکان بە ترازووی زەینەکانی خۆیان.

من شایەتی ئەدەم ئەوەی تۆ هاوشان ئەکات بە هەر شتێك لەدەستکردەکانی خۆت ئەوە تۆ ئەچوێنێت بە غەیری خۆت، ئەوەی کاری چواندن بکات بێباوەڕە بە بەڵگە پتەوەکانت و شایەت و بەڵگە ڕوونەکانت، تۆ تەنها تۆ خودایت کە عەقڵ و فام ناتوانێ ڕاستییەکان بدۆزێتەوە و جۆرو چۆن و شێوازەکانی شەن وکەو بکات و بیرو بۆچوونی خۆی تێدا بەکاربێنێ، هەتا سنوورو چوارچێوە و شوێنت دیاری بکات، ئەوەی دروستی کردوە خۆی کێش و بڕی بۆ داناوە، زۆر ڕێك و پێك دیاری کردوە،

بەرنامەی بۆ داناوە و زۆر ناسك و ورد دایناوە، ڕێ و شوێنی بۆ دیاری کردوە و هیچ شتێك لە سنووری خۆی تێناپەڕێ، کەمتەرخەم نابێ لە گەیشتن بەمەبەست، هیچ دەسکردێکی سەرپێچی بۆ نییە، لەو بارەی بۆی دانراوە، چۆن سەرپێچی پێئەکرێ کە هەموو کارەکانی بە ئارەزوو ویستی ئەو دانراوە؟ ئەو هەموو بونەوەرە جیاوازانەی درووستکردووە بە بێ ماندووکردنی بیرو لێکدانەوەی پێش وەخت، هیچ سروشتێك و ئارەزوویەك بەپەنهانی و شاردنەوەی دروست نەکردوە لە تاقیکردنەوە و ئەزموونی پێش خۆی و لە هاتن و چوونی چەرخ و زەمان سوودی وەرنەگرتووە، هاوکاری و هاوبەشێك نەبووە کەیارمەتی دابێت لەداهێنانی ئەو هەموو کارو کردارە سەرسوڕهێنەرەدا، درووستکردنی بێکەموکوڕیی و فەرمانبەرداریی بێ چەندو چون، بەپیرەوە چوونی بانگەشەی و ڕێبازی گشت سنورەکانی، لە نێوان هاودژەکانی ناو دروستکراوەکانی تەبایی و گونجان هەیە، بۆ پەیوەستی جیهانی، گیان بە جیهانی لەش و دابەشکردنی بەسەر هەموو جۆرەکاندا بەپێی سنوور و کێش و قورساییەکان و سروشت و دیمەن و شێوازەکاندا، هەموویان بە پتەوی دروستکراون بە خواست و داهێنانی خودا.

## سیفەتی ئاسمان

سەربانە بەرزەکانی بێ ستون ڕاگرتووە و بۆ شاییەکانی نێوانیانی داناوە، هەموو کون و کەلەبەرەکانی هەر تەنێکی درووستکراوی پێکەوە جۆشداوە، پاش لێك ترازانیان، هەموو تەنێکی درووستکراوی بەداوی بەهێز جیا کردووەتەوە و پێکەوەی بەستوونەتەوە، هەموو نارەحەتیی و ماندوو بوونێکی بۆ دابەزیوە و هەڵبەزیوەکانی سووك و ئاسانکردووە، یەك بەیەك بانگی کردوون بەناوی خۆیان، پاش ئەوەی کە دووکەڵێکی چڕو دیار بوون، دەسکی هەر کامیان نووساوە بە شوێنی خۆیەوە، یەك بەیەکەوە نووساوە، پاش ئەوەی بەیەکەوە نووسابوون لەیەك جیا کرایەوە و دەرگای هەرکامیان بۆشایی و کەلێنی تێدا نەما، ڕەسەدی دانا لە ئەستێرە کشاوەکان بۆ پڕکردنەوەی هەموو ترەك و درزەکان، بەتوندی ڕایگرتوون بۆ نەجوڵانی بە هۆی (با) وە بەتوانای خۆی، مانگی بەڵگە کزکراوەکە ڕەتی لەشەو داو پلەو برجی بۆ دیاریکردو خۆری ڕووناکیدەری داناوە بۆ ڕۆژ و هەریەکە ڕێڕەوی بۆ دیاری کردووە و دیاریکردنی شەو و ڕۆژ و زانینی ساڵ و کەش و هەوا هەر یەکەو بەئەندازەی

خۆی لەو فەلەکەدا چراو ئەستێرەگەلێکی بۆ جوانیی هەڵواسیوە، کە نهێنیگەلێك لەمانگ و ئەستێرەکان شاراوەتەوە، ئەوانەی بەدزییەوە گوێ ئەگرن لە نهێنی ئاسمانەکان بە بزوسکی تەنبڕ رازاندووەتەوە و هەموویانی کردووە بە نیشانەپێکانی ئەوەی بۆی دیاریکراوە و ڕێڕەوی ڕێبوارانی بۆ خوارەوە و بۆ سەرەوە، بۆ ڕەشبین و بۆ گەشبین لە ڕێگەیان.

## وەسفی فریشتە

پاکیی هەر بۆ خودایە، بۆ جێنشینی ئاسمانەکانی و ئاوەدانیی بانی بەرزی ولآتەکەی خەڵکێکی نەوباوی فریشتەی دروستکرد، هەموو کون و بۆشایی و کەلەبەری پێپڕکردنەوە، لەناو ئەو بۆشایی و ڕێگەو بانەدا دەنگی سەناخوانانی ناو کەپری پیرۆزی خۆی و ناوپەردەی داپۆشراوی و بەری حەوشەو بەرماڵی پڕ کرد لێیان، لە پشت ئەو دەنگ و بومەلەرزەوە گوێ کەڕ ئەبێ، سەناو ستایشی ڕووناکی و تیشکێك کە چاوکاری تێدا ناکات و بەشەرمەزراییەوە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، لەوێنەگەلی زۆرو جیاواز و شکڵ و شێوازی بەیەك نەچوو (فریشتانی دووباڵ و سێ باڵ و چوار باڵی کردووە بە ڕاسپاردە)، بەندایەتیی پاکیی و بێگەردیی بەرزیی و شکۆی دەکەن، ئەوەی لە هەندێ بەندەی دروستکراوی بەدیار ئەکەوێ داوای ناکەن و هەرگیز ناڵێن ئێمە دروستکاری شتێکین کە تەنها بۆ خودایە و (نەخێر ئەوانە عەبدانی ڕێز لێگیراون لە قسە پێشی ناکەون، هەر بە پێی فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە)، هەندێ لەوانە لەو جێگایە خودا کردوونی بەشایستەی ڕاسپاردەی سروشی خۆی و پەیامی بەواندا هەناردوە بۆ پەیامبەران(درودی خوایان لە سەر بێت)، کە جێگای حەشارگەی ئەمرو نەهی ئەون، پاراستوونی لە گومانی کاری گوماناویی، هیچ کام لەوانە لای نەداوە لە ڕەزامەندی خودا، سوودگەلێکی پێداون بۆیارمەتیان، دڵەکانیانی فێری بێفیزیی و بە ئارام ڕەفتارکردن کردووە، هەموو دەرگایەکی ئاسانی بۆ کردوونەتەوە بۆ سەناو ستایشی خۆی، ڕووگەی ڕووناکی بۆداناون و نیشانگەلێکی بۆ ڕێکخستوون بۆ یەکخواپەرستیی، ئەو هەرگیز شانیانی قورس نەکردووە بەگوناح و کەتن و تاوان، گەڕانی شەو و ڕۆژ ماندووی نەکردوون،

هەرگیز شك و گومان بەلای توانستی پتەویان نەڕۆیشتووە، خەیاڵ و وەهم بە جاڕی باوەڕیاندا گوزەری نەکردووە، تانەو تەشەری ڕق و کینە لە نێویاندا بوونی نەبووە، هەرگیز دوو دڵیی و دڵەڕاوکێ لە زانیاری دڵیان نزیك نەبوومەتەوە، دڵیان ئاوەدانە لە گەورەیی و سام و شکۆیی پڕ لە دەروون و سنگیان، هەرگیز وەسوەسە توانای نەبووە بنیشێ لە دڵیان و پەردەو تەم دروستبکات لە بیروڕایان، هەیانە کاری لە کۆکردنەوەی هەوری بەبارانی قورسە، یان لە قەبارە و گەورەیی چیای بەرزو بڵند و ناو شەوی تاریکی نووتەکەچاو، هەیانە پێی لەناو سکی خوارەوەی زەوی داناوە، وەك ئاڵای سپی لە جێیان لە(با)دا چەقیوە، لە ژێریدا بایەکی بزوێنەر ئەی شەکێنێتەوە و بەندی ئەکات هەتا سنووری بێسنوور، بەندایەتی خودا هەموو شتێکی لا چۆڵکردوون و تەنها بەبەندەییەوە سەرگەرمن، ڕاستی و دروستی باوەڕیان پەیوەندە بە ناسینی خوداوە، تا بەڕادەی ئەڤین و خۆشەویستی بۆ خودا بە تەواوی پەیوەستبوون بەخواوە، هەرگیز ئارەزوویان لەوەی خودا پێیداون نەچووە بۆ لایەکیتر.

بەڕاستی شیرینی ناسینی خودایان چەشتووە، لەجامی خۆشەویستی تێرئاو بوون، لەناو بەنۆکەی دڵیاندا ڕەگی ترس لە خودا جێگیر بووە، دڵبەندن بە درێژی فەرمانبەرداریی خودا و پشتیان ڕاستکردووەتەوە، حەزیان لە نزیکبوونەوەیەو کەرەسەی ترسیان کەم نەبووەتەوە، هەرگیز بەرزی جێگایان بە پاڕانەوەیان ڕەها و بەرەڵا نەکردووە، لە خۆبایی نەبوون هەتا بەندایەتیی پێشینەیان بە زۆر بزانن، دانەواندنی سەری نەوازشی لەبیرنەبردونەتەوە و بەشی گەورەیی چاکەیانی کەم نەکردووەتەوە، هەرگیز درێژیی خوداپەرستیی سستیی پێنەداون، حەزیان لە خوداپەرستیدا ڕۆنەچووە، هەتا ئومێدیان بە خودای خۆیان تەیار بێ، بەزۆری پاڕانەوەیان زمانیان وشکنەبووە، هەتا بەدەنگی نزم هەواڵی بەندایەتیی بەخودا بگەیەنن، هەرگیز شانیان لەبەندایەتیی خودا لەڕیزەکان جیا نەبوومەتەوە، گەردنیان لە فەرمانی خودا بە کەمتەرخەمیی شۆڕ نەبوومەتەوە بۆ خوارەوە، هەرگیز جوامێرییان خەم نەکردووە بۆ تەمبەڵیی بێئاگایی لە خودا، لە خشتەبردنی ئارەزوویان هەنگاوی پەلەی پێنەناون، خاوەن عەرشیان کردووەتە زەخیرەی ڕۆژی هەژاریی و نەدارییان، لەو کاتە هەندێ خەڵك داوا لە خەڵك دەکەن، ئەوان تەنها بۆ

لای خودا چوون، کاتیان دانەناوە بۆ بەندایەتیی خودا، ئارەزووی خۆیان نەکردووەتە هۆی لادان لە خودا پەرستیی، مەگەر زیاتر شێرگیربوون لە سەر پەرستنی خودا بە ئومێدو ترسەوە، هەرگیز ترسیان لێنەبڕاوە هەتا سستی بکەن، تەماع و دڵخوازییان نەیکردوون بە دیلی خۆی، هەتا تێکۆشانی بەندایەتیی کەمبکەنەوە، کاری پێشبینی خۆیان بەگەورەو زۆر نەزانیوە، ئەگەر ئەوەیان بەگەورە زانیبا ئومێد هەموو ترسەکانی دەشۆردەوە، هەرگیز شەیتان توانای نەبووە کە زاڵ بێت بەسەریاندا و لەخودا دایانبڕێ، خراپیی و دووبەرەکیی توانای نەبووە لە یەکیان جیابکاتەوە، هەرگیز کینەو ئێرەیی ناو خۆیان بەسەر نەهاتووە، شك و گومان هەرگیز بڕبڕی نەکردوون، دارمانی هەیبەتیان نەیکردوون بە بەش بەش، ئەوانە دیلی باوەڕن، هەرگیز لە گەردەنی دانەماڵیون، دوو دڵیی و لادان و سستیی و کەمتەرخەمیی، لەهەموو ئاسمانەکاندا جێگەی چەرمێك نییە کە فریشتەی بەسوژدەی تێدا نەبێ، یان ڕێبواری زۆر پەلە و درێژخایەن، خوداپەرستییان زانیارییان بەخودا فراوان کردووە، بەرزیی و گەورەیی و شکۆی پەروەردگاریان زیاترو زیاتر بە بەرزیی ڕاگرتووە.

## باسی سیفەتی زەوی و ڕاخستنی لەسەر ئاو

زەوی داپۆشیوە لەسەر شەپۆلی بەهێزی هاروهاج و بێ بوار و قوڵایی دەریای پڕی زریانایی، سەری بڵندی شەپۆلەکان بەیەکدا دەدەن، گەردەلولی بابەهێزەکان لەیەك ئاڵاون و بەشان و باڵ و پشتی یەکدیدا دەدەن، دەریا کەفچەرێنە وەك نێرەحوشتری یاخی و بەرەڵا، سەرکێشی ئاوەکە نیشتەوە لەبەر قورسی بارەکەی، یاخی بوونەکەی نیشتەوە کە سنگی قورسی نرایە بان، سەری بێ توانایی شۆڕکرد، کاتێ کە تێیدا شانی داداو خۆی تێدا گەوزاند، بە شان وملی هێور بووە، پاش ئەو دەنگ و ئاوازە بەرزەی بێدەنگ و بێجوڵە کرا، بە لغاوی بێدەسەڵاتیی و دیلی شانی دانەواند، زەوی ئارام بووەوە بە تەختیی و ڕاخراویی لە ناو ڕەوتی شەپۆلەکاندا، لە خۆبایی و شانازیی و پایە بڵندیی خۆی دایە دواوە و ئەو لوت بەرزیی و چالاکیی و جموجوڵەی جارانی نەما، دەم وقەپۆزی توند بەستەوە بۆ ئەوەی قرقێنەی ڕۆشتنی

نەمێنێ، خاو بووەوە پاش ئەو هەموو هەڵچوون و یاخیگەرییە شەقاوی لە خۆبایی بوونی نیشتەوە، پاش ئەوەی هەڵچوونی ئاو لەملاو ئەولای زەوی نیشتەوە، باری شاخە بەرزو قورس و گەورەکان لە مل و شانەکانی دانرا، ئەو کات چەشمەو کانیاوەکان لە برناخ و کونەلووتی شاخەکانەوە تەقییەوە، دابەشیکردن بەسەر پێدەشت و چیا و ڕۆخی بیابانەکان و چۆمی ڕوبارەکاندا، جوڵەو هاتوو چوونی زەوی بەستەوە بەگابەردە ڕەق و گەورەکانەوە و لوتکەی بەرزو گەردەنە چیاکانەوە، زەوی جوڵەی لێبڕا بە داکوتانی شاخ لەناوەڕاستی زەویدا، ئەو چیا و شاخانە ڕەگیان داکوتا لەناو برناخ و کەپوی زەویدا و سواری ملی دەشتەکان بوون و ڕۆچوون بۆ کرۆکی ناو زەوی، کەش و هەواو وەرزەکانی بڵاوە پێکرد لەناو زەویدا، بای ڕاهێنا بۆ هەڵمژین و هەناسەدان بۆ دانیشتوانەکانی، خەڵکی پەیداکرد بۆ وەرگرتنی سوود لەشان و قوڵی زەوی، پاش ئەو زەوییە بەراوەکانی کە ئاوی چەشمەی چیاکان و بەرزاییەکانی بێ ئاو نەهێڵاوە، بەڵکو هۆکاری گەیشتنی ئاوی بۆ دابین کردن، بەدرووستکردنی هەوری بارانـاوی بۆ زینـدوو ڕاگـرتنی ئەوانیش و دەرهاتنی ڕووەکەکان، هەوری ڕامکرد بۆ ڕزگارکردنی ئەو زەوی و ڕووەکە لە وشکبوون، هەتا ئەوکاتەی شەپۆلی ناو هەورەکە دەکەوێتە ژمندن، لەناو خۆیدا بزیزکی ناوی ڕووناکی دایە ئەملاو ئەولای، تیشك و پرشنگی هێواش نەبووە لەناو سکی هەورە زەبەلاحەکە و دووتوێی هەورکە، بەشێوەی خوڕیی و بەسەر یەکەوە دایدەبارێنێ بەشێوەی شاندادان و شۆڕ بوونەوە و نزیکبوونەوە لە زەوی، بای باشور وەك چڕی شیر لە گوانەوە دایدەدۆشی بۆ ناو قوڵایی خاك و بەخوڕیی و دڵۆپە دێتە خوارەوە، ئەو کاتەی کە هەورەکە سنگی داداوە و لە پەراسوەکانییەوە بارانەکە دادەچۆڕێنێ و پڕیی و قورسیی ناو سکی خۆی هەڵئەڕێژێ و باری قورس لەکۆڵ خۆی لائەبا، زەوییە بۆرو بێڕووەکەکان لەناو سکی زەوی سەردەر دێنن و لەناو زەوییە ڕەقەکەی چیاکان گژوگیا دەڕوێن، ئەویش شادان و خەندان بە جوانی ڕەزو باخەکان و سەری سوڕ دادەمێنێ کە جۆرە بەرگێکی ناسکی کردووە بە بەریدا، بەگوڵ و غونچەکانی و خشڵ و ملوانکە دەهۆنێتەوە لەگوڵە تازە پشکوتووەکان، ئەوەش ئەکاتە گوتاری کۆتا بۆ خەڵك بۆ ژیواریان و ڕۆزی مەڕو ماڵاتیان، شەقام و کۆڵانی لەهەموو سوچ و قوژبنێکەوە دروستکرد بۆ نیشاندانی ڕێبوار لەسەر ئەسپی هەموو ڕێگەکان، پاش

ئـەوەی کـە زەوی ئامـادە کـراو فـەرمانی خـودا جێبـەجێ بـوو، ئـادەم(صـلی الله علیـە وسلم) دەست نیشانکرا لە پوختەی بونەوەرەکان، کرا بەیەکەم درووستکراوی و لەناو بەهەشتدا دایناو ژیانی خواردن و خواردنـەوەی بـۆ هـەرزانکردو ئـەوەی قەدەغـەبوو نیـشانیدراو ئاگـادارکرا کـە نزیکبوونـەوە لێـی تووشـی سـەر پێـچی ئـەکات، شـوێنی حەوانەوەی دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەویش پـەلاماری قەدەغـە کراوەکەیـدا چـونکە (زانست)ی خودا بـە وکـارە هـەبوو، خـودا دایبـەزان بـۆ زەوی بـۆ ئـەوەی بەنـدەکانی ئاوەدانی بکاتـەوە و بەڵگـە لەسـەر بەنـدەکانی تۆمـار بکـات، پـاش بردنـەوەی بـۆ لای خودا ئەوەی بێبەڵگەو بورهان لەسەر خودایەتی خودا نەهێشتەوە کـە پەیوەنـدی لـە نێوان ئەوان و ناسینی خوادا هەبێ، بـەڵکو پـەیتا پـەیتا بەسـەری ئەکردنـەوە لەسـەر زمـانی پیاوچاکانی لـە پێغەمـەران( درودی خوایـان لەسـەر بێـت) و شـوێنی متمانـە سـپاردەی پەیامـەکانی چـەرخ بەچـەرخ هـەتا بـەکامڵیی و بـە کۆتـایی هـات بـە پێغەمەرمان محەممەد( صلی الله علیە وسلم)، بیانو و ئاگادارکردنەوە بە کۆتـا هـات، بژی ڕۆزی دیاریکرد، زۆر بۆ هەندێ و لەکەم بۆ هەنـدێ، بـازێ بـەفراوانی، بـازێ بـە تەنگی، خودا دادی بەخەرجداوە بۆ تاقیکردنەوە، بزانێ کـام کـەس بـە سـامان و کـام کـەس بـێ سـامان بەتاقیکردنـەوە دەرئەکـەوێ؟ کـێ شـوکرانە بـژێرەو ئـارامگرە؟ لـە دەوڵەمەندیی و لە هەژاریدا؟ ئەوجا خودا لەگەڵ فراوانـی سـامان بـەڵاو ناخۆشـیی و لەشبیماریی هاوتا دەکات، یان ساغیی و تەندروسـتیی لەگـەڵ قـات و قڕیـی و گرانـی یـان بەخـەم و پـەژارەو ناخۆشـیی و داخ و خەفـەتخواردن، خـودا ئـەوجا ئەجـەل و کۆتـایی تەمـەنی دیـاریکرد، هەنـدێ درێژخایـەن و هەنـدێ کـورت، هەنـدێ پـێش و هەندێ پاش و پەیوەستیکرد بـە مـەرگ و مردنـەوە و بەسـتییەوە بـە پـەتی درێـژ و گوریسی پتەوی قایم و مەحکەم.

خودا دانایە بە نهێنی دەروونی شاراوە و چووتەی ئـاخ و توانـای نـزم و سـووك و خەیاڵ و ختورەی گومان و یەقینی تۆکمەی خاوەن عەزیمە، دزە ڕوانینی تیلەی چاو و بـرۆ و بـرژانـگ و لـەناو دووتـوێی دڵان و قـوڵایی گـشت نادیارەکـان و گوێبیـستی خـشەی پـەردەی گوێـچکەی گوێـدا، هاوینـە هـەواری مێـروو لـە زسـتانەهەواری جرۆجانـەوەر و مێرووەکـان، لەرانـەوەی دەنگـی نزمـی کۆسـکەوتوان و خـشەی پێـی گیانلەبـەران، شـوێنی پـشکوتنی خونـچەو گـوڵی دارەکـان لەکاسـەی گوڵـەکان، شـوێنی

حەوانــەوەی درنــدەکان لــە بــن ئەشــکەت و ڕەمــەن و ناوچــیاو شــیوەکان، شــوێنی خۆشاردنەوەی مێش و مێشولە لەناو قرۆڵیی و لـەناو ڕیشك و لاسکی درەختـەکان، شوێن سەوز بوونی گەلا لەسەر خەڵفی تـازەو، شـوێن حەشارگەی تێکەڵەی ئاوەکـان لــە پلوزگــەی پــشتی زینــدەوەرەکان، هــەورە وردەو تێکــەڵاوی کــانی و دڵۆپــە مرواریــیەکانی هـەورەکان و بـە زریـان و گەردەلوولـەکان و بـاو بۆرانـەکان کـە ئـاو بەشینی پێئەکات و، بە لـەناو بردنـی لافاوەکـان لـە ئـەنجامی بـارانی زۆر و بـە مەلـە کردنی کچە تەپۆڵکـە گـەردەکان لـەناو زەوی تـۆزو خۆڵـدار و بەهێلانـەی باڵـدارەکان لەسەر لوتکەی چیا بەرزو لێوارەکـان و خوێنـدنی باڵنـدە و دەنـگ و ئـاوازی دارەکـان لەناو دەروونی هێلانـەکانیان، بـەمرواری نـاو قەواخـە سـەدەفیەکان، کـە لـەناو سـکی دەریا پەروەردە کراوە، بەو شتە شاراوانە کە لەناو تاریکی شـەودا هەیـە، یـان تیـشکی ڕۆژ بەری کەوتووە، ئەو شتانەی لەناو چین چینی تاریکستان بوونیـان هەیـە، شـوێن نیشتنەوەی ڕووناکیی و جێگەپێ و هەستی هـەموو خـاوەن جوڵەیـەك بەدەنگـەوەرە دەنگدانــەوەی هــەموو وشــەیەك و بەلــەرەو جوڵانــەوەی هــەر لێوێــك و شــوێن حەوانـەوەی گیانلەبـەرێك و بەقورسایی و کێشی هـەموو گـەردێك و گەردیلەیـەك و بــەرگ و یــان بــەری هــەموو دارێــك و وەریــنی هەمووگەڵایــەك و جێگــەی هــەموو نوتفەیـە (تنۆکـە) و پەڵـە خوێنێـك و لـە پارچـە گۆشـتێك و پارچـە زیندوویـەك و ڕەگەزێك.

خـودا لــە دروسـتکردنی ئــەم هــەموو زینــدەوەرە و بوونــەوەرەکان تووشــی بێتاقەتیی و سستیی و شەکەتیی و ماندوو بوون و بارگرانیی نەبووە و هیچ ڕێگرێك لە دروستکردن و داهێنان بەر پەرچی نەداوەتەوە، لـە دروسـتکردن و دانـانی ڕێ و شوێنی بۆ بونـەوەرەکان تووشـی بـێ تاقـەتیی و سـستیی و شـەکەتیی نـەبووە، بـەڵکو هەموو بەزانین جێبەجێ کراوە و ژمارەیان ئامار کراوە و دادی خودا بۆ هەموو بووە و بەخشندەیی بۆ هـەموو هەمەلایـەن بـووە، لەگـەڵ کەمتـەرخـەمیی و بێدەسـەڵاتیی ئەوان لەئەرکی خۆیان بەرامبەر پەروەردگاری خۆیان.

## نزاو پاڕانەوە

خودایە... تۆشایستەی هەموو سیفەتە جوانەکانی، هەموو کەماڵ و جەلال و جەمال تەنها لای تۆیە، ئەگەر ئومێدت لێبخوازرێ جێگەی ئومێدی، ئەگەر تکاکار هەبێ، تەنها تۆ دەستگوشادیترین داوا لێکراوی، خودایە کە تۆ بۆ منت دابینکردووە چاکەگەلێك کە ناتوانم سەنای غەیری تۆی پێبکەم، هەرگیز ستایشی غەیری تۆ ناکەم، پێویستی خۆم نابەمە لای کانزای نائومێدیی و شوێنەواری شك و گومان.

زمانی منت پاراستووە لە مەدح و سەنای ئادەمیی و ستایشی بەندەو کۆیلە و درووستکراوەکان، خودایە... بۆ هەموو مەدح و سەناکارێك لەسەر شایستە سەنا بۆ کراو کرێ و پاداشتی هەیە بەخەلات و بەرات و منیش تۆم کردووە بە دەلیلی خەزنەکانی بەزەیی و (کوورە) زێڕەکانی لێخۆشبوونت.

خودایە، ئەوە جێگە و شوێنی ئەو کەسەیە، کە تۆی بەتەنها و تاك ناسیووە، جگە لە تۆ کەسی بەشایان و شایستە نەزانیووە بۆ مەدح و سەنا و ستایش، من هەژاریم لایە بۆ لای تۆم هێناوە و جگە لە تۆ، کەس ناتوانێ بۆم قەرەبوو بکاتەوە، لە تەنگانەو ناخۆشی، کەس ناتوانێ هێوری بکاتەوە، لەم شوێن و جێیەدا ڕەزامەندی خۆتمان پێببەخشەو دەوڵەمەندمان بکە لای خۆت و ڕەوانەی دەستی غەیری خۆتمان مەکە و (تۆ هەموو شتێکت پێدەکرێ).

(٩١)

## وتارێکی لەو کاتەی خەڵك ویستیان پەیمانی پێبدەن پاش کوشتنی عوسمان

تکا ئەکەم وازم لێبێنن، بۆ کەسێکی تر بگەڕێن، چونکە ئێمە ڕوو لە کارگەلێکین ڕەگ و ڕووی زۆری هەیە، هەموو دڵەکان لەسەری کۆك نین و هەموو عەقڵەکان لە بارەیەوە خۆگرو تەبا نین، هەموو ئاسۆگەلەکان تەم و مژاوییە، ڕێگەکان کوژاوەتەوە! ئەوەش بزانن ئەگەر من بەدەنگتەوە بێم بەو شێوە کار ئەکەم، کە خۆم ئەزانم و گوێ ناگرم بۆ قەولی هیچ خاوەن گوتارێك و گلەوگازندەی هیچ کەسێکی بەگلەیی و تورە، بەلام ئەگەر وازم لێبێنن وەك هەر یەکێك لە ئێوە دەبم،

زۆریـش پێدەچـێ گوێڕایـەڵترو و فەرمانبـەردارتر بم، ئەگـەر کـاری خۆتـانی پـێ بسپێرن، من بەوەزیریی باشترم بۆ ئێوە لە ئەمیریی.

**( ٩٢ )**

## وتاری لەبارەی بەرزیی و زانایەتیی خۆی و ئاژاوەی ئەوەی ئومەییە

لەپاش ئەوە... خەڵکینە! مـن چاوی ژاوەژاو و ئـاژاوەم دەرهێنـاوە، لـەو بـاوەڕەدا نـیم، جگـە لـە مـن کەسـیتر بتـوانێ بـە ئازاییانـەو وردەوە، بـەو شـێوەیە زاڵ بێـت بەسـەریدا، بـەو گـشتگیریی و درێژییـە، تـاریکی هێنـا بەسـەریاو بـەهارو هـاجیی و شێتۆکەیی باڵی ڕاکێشا.

## هەموو پرس و پرسیارەکانتانم لێبکەن پێش ئەوە لە دەستان دەرچم

قەسەم بەوەی گیانی منی بەدەستە، هەر پرسـیارێك لـە هـەر شـتێك لـە ئێـوەوە هەتا ئاخر زەمان، لەهەر کۆمەڵێك کەسەد کەس ڕێگە نیشانبدا و سـەد کـەس گومڕا و ڕێ ونکـا، مـن ئـەزانم فیتنەگێڕەکـەی و ڕابەرەکـەی و جڵـەو کێـشەکەی و شوێنخوسـدانی کاروانەکـەی و جێگـەی بارخـستنەکەی و کـێ ئـەکوژرێ لەوانـە و کـێ خۆی ئەمرێ، کێ ڕوو لە کوێیە و چۆنەو چ کەسە؟.

ئـەو کاتـەی کـە منتـان لـە کـیس ئەچـێ و ڕووداوە ناهـەموارو ناخۆشـەکانتان بەسەردادێ و بەڵاو کارەساتە جەرگبڕەکانتان تووش ئەبێ، زۆر لەخاوەن پرسـیارەکان سەرشۆڕ ئەکەنەوە و زۆر لەبەرپرسـەکان ئەکـەون و شکـست دەهێـنن، ئەوکاتـەی کـە جەنـگ و شەڕەکان درێژە ئەکێشن و هێرش دەهێنن، پاو پـوزی لێهـەڵ ئەکـەن و ئـەو دنیایە لە سەرتان تـەنگ دەبێـت، بـەڵاکان درێـژ خایـەن دەبـێ لەسـەرتان، هـەتا ئـەو کاتەی خودا دەرووی خەێر و چاکە لەسەر پیاوباشان ئەکاتەوە.

ئاژاوە و گەندەڵیی، کە ڕووی تێکـردن ڕاسـت و ناڕاسـت تێکـەڵ دەبـێ، کـە پـشتی هەڵکرد ئاگاداری ئەدات، لەکاتی هـاتن و ڕوودانیـان نـەزانراو و نەناسـراون، لـە پـشت تێکـردن خۆیـان دەناسـێنن، وەك ڕەشـەبا هەڵئـەکا، گێژەڵوکەیـە هەنـدێ ئـەپێکێ و

لەهەندێ لائەدا، هۆشیارو ئاگاداربی ترسناکترین ئاژاوە لای من لەسەر ئێوە ئاژاوەی (ئەمەوییەکان)ە، چونکە ئاژاوەیەکی مژمۆڵ و کوێرو تاریکە، بەرنامەکەی گشتگیرە، بەڵاو کارەساتەکەی تایبەتە، ئەوەی دەیبینێ بەڵای تووش ئەبێ و ئەوەی کوێرە لە ئاستی نایپێکێ، سوێندم بەزاتی خودا ئەمەوییەکان کۆمەڵە سەرکردەیەکی زۆر خراپ بۆ ئێوە پەیدا ئەکەن، پاش من وەك حوشتر شێت و تورەو کۆن، بەدەم گاز ئەگرێ و بەدەست کوێرانە هەنگاو ئەنێ و بەقاچی پاش لەقە ئەدا و بەنارەحەت شیر ئەدا، ئەوانە بەسەرتانەوە فەرمانڕەوان، هەتا وایلێدێت تەنها پیاوی بەسوودی ئەوان ئەمێنێ، یان بێزیان بۆ ئەوان، بەڕادەیەك بەڵا دەبن بۆتان، زاڵبوونی یەکێك لە ئێوە بەسەریان، وەك زاڵبوونی کۆیلەیە بەسەر خاوەنەکەی خۆیدا، یان سەرکەوتنی داماو بەسەر ستەمکارەکەیدا، بەسەرتانەوە زۆر بەناشیرینیی و بەدفەسالیی و ترس و تۆقاندن و پارچەیەك لە چاخی نەفامی جێگای چرایەك ڕێ نیشاندەری تێدا نییە و زانست و زانیاریی تێدا نییە.

ئێمەی بنەماڵەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) و ئال و بەیت، بەشداری ناکەین و بانگەشەیان بۆ ناکەین، پاش ئەوە خودا ئەو ناخۆشیەتان لەسەر لائەبا وەك پێسەداماڵیی لە لەش، بەکەسانێك کە سەرشۆڕیی و داماوییان پێدەچێژن و توندو تیژییان لەگەڵ ئەکەن، تاڵاوێ دەدەن پێیان، لێوان لێو و تەنها بەشمشێر خەڵاتیان دەکەن، لە ناو ترس و بێ ئارامیی نۆقرە ئەگرن، جل و ژێرجلیان تەنها ترس لەبەر ئەکەن.

ئەو کاتە قورەیش ئەوەندە دڵی داوەتە دنیا و خۆشیەکانی ئەگەر لە جێگایەك بمبینن با بەقەدەر شوێن مەڕ سەربڕێك بێت بۆ ئەوەی لێیان وەرگرم، ئەوەی ئەمڕۆ داوای بەشێکی ئەکەم نامدەنێ و بێبەشم ئەکەن.

(٩٣)

# وتارێك ستايشى خودايه و
# گەورەيى پێغەمبەر و ئال و بەيت (صلى الله عليه وسلم)

## (خوداى بەرزوبالاّ)

ئاى لە گەورەيى و شكۆى ئەو خودايە كە تواناى تواناداران تێيناگاو پێيناگا، زيرەكيى و ژيريى نايگاتێ، يەكەمى بێكۆتايى و دوايىى بێ مەرزو سنووره.

## ستايشى پێغەمبەران
## (درودى خوايان لەسەر بێت)

خودا بۆ خۆى لەپاكترين شوێن دايناون و لەباشترين قەرارگە جێگەى كردوونەتەوە، پشت بە پشت لە پاكترين پشت بۆ خاوێنترين ڕەحم هێناونى، پێشينەكە ڕۆيشتووە و پاشينە بە ئاينى خودا هەستاوە بە ئەركى خۆى.

## پێغەمبەرى خودا و ئال و بەيت
## (صلى الله عليه وسلم)

هەتا بەخشندەيى و دەهەندەيى خوداى پاك و بێگەرد گەيشتە محەممەد(صلى الله عليه وسلم) خودا لەپاكترين و چاكترينەكان و بەرێزترين بنەچەو لەو دارەى، كە پێغەمبەرانى لێ لق و پۆپى جيا بووەتەوە و ڕازگرەكانى لێهەڵبژاردو پەيدا كرد، ئال و بەيت و خێزان و خانەوادەى چاكترين ئال و بەيتن، خێزانەكەى باشترين خێزانە، درەختەكەى باشترين و بەپيتترين درەختە، كە شين لەناو حەرەمدا بەرزبووە بالاّى كردوە لەسەخاوەت و دەروون گوشاديدا، لق و چڵى بەرزو بەرى دەست كەم دەيگاتێ، پێشەواى خۆ پارێزان و چاوساغى شارەزايان، چرايەكە ڕووناكى شەوقى داوەتەوە، ئەستێرەيەكە ڕووناكيى و تيشكى گشتگيرە، باسكى تيشكهاوێژە بۆ دەوروبەر، ڕێبازى ڕاست و تەخت و ڕەوانە، پەيڕەوى ڕون و ئاشكرايە، فەرمايشى كۆتا بەخشە، فەرمانى هەميشە داوە، خودا لەكاتى نەمانى پەيام و سروشى پێغەمبەران(درودى

خوايان لەسەر بێت) ڕەوانەی کردووە، لەکاتی لادان و نوچدانی ڕێگە ڕاستەکان و داگیربوونی گەلان بەگێلیی و گەمژەیی.

## ئامۆژگاریی بۆ خەڵك

ئاگادار بن و بزانن! خودا لێتان خۆش بێ، کار بکەن و کردار بکەن، خودا بەزەیی پێتاندا بێتەوە بە نیشانەداریی دیارو ڕوون، ڕێباز ڕاست و ڕوونە، خەڵك بانگ دەکات بۆ ماڵی ئاشتیی و هێمنیی و ئێوەش لەماڵێکی پڕ گلەیی و گازندەن و خوازیاری ڕەزامەندی خودان، بەهێواش و ئارام و لەسەرخۆ، نامەی ڕۆژنامەتان بڵاو کراوە و پێنوسی لەسەرەو لەش و بارتان تەندروستەو زمانتان بەرەڵا کراوە، پەشیمانیی بیستراوە و کردارتان وەرئەگیرێ.

( ٩٤ )

## وتارێ دەربارەی گەورەیی پێغەمبەر
## ( صلى الله عليه وسلم )

خودا پێغەمبەری ڕەوانەکرد لەوکاتەی، خەڵك سەر لێشێواوو سەرگەردان و ڕێگاونبوون، هەڵە و داپاچ بوون لەناو ئاژاوەدا، ئارەزووی پەست بۆ لای خۆی ڕاکێشا بوون، فیزو دەمارگیریی تەپوڕەپ دەیتلاندن، نەفامیی و گێژیی یاری بە عەقڵ و ژیری دەکردن، سەر لێشێواو و سەرگەردان لەناو بومەلەرزەی فەرمانڕەوایی، بەڵای نەزانین، لەبەر ئەوە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زۆر گرنگی دەدا بە ئامۆژگاریی و پەندو لەسەر ڕێگەی دادەنان و بانگی دەکردن بەکارزانیی و ئامۆژگاریی پەسەند.

(٩٥)

## وتارێك لەبارەی ستایشی خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

سوپاس و ستایش بۆ خودایە، کە یەکەمە و لەپێشە، ئەو کەس نەبووە و دواینەو پاش ئەو کەس نییە، دیارەو کەس لەسەرییەوە نییە و نادیارەو کەس لەبەردەمی نییە، محەممەد(صلى الله عليه وسلم) شوێن ئارامگەی چاکترین ئارامگەیە، بنج و بێنجی لە چاکترین (کان)ی ڕەسەنە، لەپاکترین توخم و ڕەگ سەوزبووە، خودا دڵی پیاو چاکانی بۆ لای بردووە، جڵەوی ڕوانین و بینین بۆ لای ئەو گەڕاوەتەوە، خودا هەموو کینەو ڕق و تۆڵەی بەهۆیەوە ژێر گڵ ناوە، ئاگری تۆڵەسەندنەوە و تۆڵەی بەرامبەری کوژانەوە، خەڵکی کردە برا و بت و بتپەرستی تەفروتوناکرد، مرۆڤە خوارەکانی بەرز کردو خۆ بەزلزانەکانی سەر شۆڕ کرد، فەرمایشی گۆیایەو بێدەنگی زمانە.

(٩٦)

## وتاری لەسەر یارانی پێغەمبەر و یاوەرانی عەلی

ئەگەر خودا ماوەی ستەمکاریدا، ماوەی سەختگرتنی و بردنەوەی نادا، لەپەناگەدا ئامادەیە لەبەردەرواز گەی ڕێگەیدا و لە نێوان لیکی دەمی و گەرویدا، قەسەم بەو خوایە کە گیانی منی بەدەستە، ئەو گروپە سەر ئەکەون بەسەرتاندا نەك لەبەر ئەوەی ئەوان لەسەر حەقن، لە ێوە زیاتر بەڵکو ئەوان زۆر بەپەلەن بۆ ناڕاستیی گەورەکەیان و سستیی و دوو دڵیی ئێوە لە حەق و مافی من.

وا باوە هەموو گەلان و نەتەوەکان لە ستەمی سەرکردە و شوانەکانیان دەترسن، بەڵام من وام لێهاتووە لە زۆر و ستەمی ڕەعیەتی خۆم دەترسم، هەڵمنان و هانمدان بۆجیهاد، بەڵام ئێوە نەهاتن بەدەممەوە و گوێ بیستمکردن، ئێوە گوێتان نەگرت، بە نهێنیی و ئاشکرا هاوارم لێکردن ئێوە هەر وەڵامتان نەبوو، ئامۆژگاریم کردن ئێوە

**وەرتان نەگرت، ئێوە هەم ئامادە، هەم بزر، هەم كۆیلە هەم خاوەن، جوامێریتان بۆ باس ئەكەم ئێوە لێی ڕائەكەن، پەندی چاكتان بۆ دەبێژم ئێوە بڵاوەی لێ ئەكەن، هەڵتان ئەنێم و هانتان ئەدەم بۆ دژایەتیی تاقمی لادەرو یاخیی ئاخر وشەم تەواو نابێ و نەبێ ئەبینم بەملاو ئەولادا بڵاوەتان لێكردووە، وەكو دەستەكانی كورگەلی (سەبا) دەگەڕێنەوە بۆ هەمان كۆڕەكانی پێشوتان و خۆتان دەدزنەوە لە پەندو ئامۆژگارییەكان، بەیانیی ڕاستان ئەكەمەوە، ئێوارە دێنەوە بۆ لام، وەك پشتی مار خۆتان هەڵئەگێڕنەوە، ئەوەی هەڵتان ئەنێ و نرختان بۆ دائەنێ داماوە و ئێوەش كە ڕاستكراونەتەوە بێگوێ و نافەرمانن، ئەرێ ئەوانەی بە لەش ئامادەن و عەقڵتان بزرەو بۆچوونی زۆر جیاوازو ناتەباتان هەیە، سەركردەكانیان گیریان خواردووە بەدەستیانەوە، هاوەڵتان فەرمانبەرداری خودایەو ئێوە بێگوێن، هاوڕێی شام نافەرمانی خودایەو دەست و دائیرەكەی گوێڕایەڵن، حەز ئەكەم بە ناوی خودا مەعاوییە لەگەڵم بگۆڕێتەوە دنیار بە درهەم، دە لە من وەرگرێ لە ئێوە مانان و یەك كەسم لەوانە پێبا، ئەی دانیشتووی كوفە! بەڵای ئێوە بەسەر منە، سیانەو دوان: گوێكپ و گوێدار، لاڵ و خاوەن گوتار، كوێر و چاودار، نە ئازادو ڕاست و ڕەوان كاتی شەڕ و نە برای جێگەی باوەڕ كاتی بەڵاو كارەسات، دەستتان بە قوڕا چێ هەر وەكو حوشتری بێشوان، لە هەر لایەك كۆیان ئەكەیتەوە لەلایەكی ترەوە مەشە ئەكەن و هەڵئەتۆڕێنن، قەسەم بەخوا، لام وایە و وای بۆ ئەچم كە مەرهەڵە(جەنگ)گەرم بوو و كوشتن و لێدان گەرم بوو هەموتان بڵاوەتان لە كوڕی ئەبو تالیب كردووە، هەر وەك ژنی زەیسان قاچی بڵاو ئەكاتەوە، من دنیام لە خودای خۆم و پەیڕەوی پێغەمبەرەكەم(صلی الله علیە وسلم) و لەسەر ڕێگاكەم دانە دانە ئەیچنمەوە.**

## ئال و بەیت و یارانی پێغەمبەر

**تەماشای ئال و بەیتی پێغەمبەرەكەتان(صلی الله علیە وسلم) بكەن و ڕێبازی ئەوان بگرن، شوێنی ئەوان بكەون، چونكە لە ڕێتان لانادەن و ناتانخەنەوە ناو چاڵەوە، كە دانیشتن ئێوەش دانیشن، ئەگەر ڕاپەڕین ئێوەش ڕاپەڕن، پێشیان مەكەون ون ئەبن، دوا مەكەون تێیدا دەچن، من خۆم یارانی محەممەدم(صلی الله**

عليه وسلم) بينيووه، هيچ كامتـان لـەوان ناكـەن، بـە ڕۆژ ونـوو سـەرگژو تـۆزاويی و بەشەو لە سوژدەو ڕكوعدا بـوون، تـاویٚ ناوچاويان و تـاویٚ ڕوومـەتيان لەزەويـدابوو، وەك پشكۆی گەش بوون، لەيادی پاشـەڕۆژيان نـاو تـەويٚليان وەك ئـەژنۆی بزنـی لیٚ هاتبوو، لە ئەنجامی زۆری سوژدە كە يادی خودا بكرايە فرمیٚسكی چاويان سنگی تەڕ ئەكردن، ئەهەشۆكانەوە وەك داری ڕۆژی باوزريان لـە ترسـی سـزاو تۆڵـەو بـە هيـوای پاداشت.

( ٩٧ )

## وتـاری دەربـارەی ستەمكاری خێڵی ئومەيیە

سـوێندم بـەخودا لەسـەر ئـەم بـارە ئـەبن، هـەتا هەرچـی خـوا حـەرامی كـردووە حەلاڵی ئەكـەن، هـەر گرێبەسـتێك كرابـێ ئـەوان خـاوی ئەكەنـەوە، وای لێـدێت مـاڵ نامێنێ لە قوڕو بەرد، يان (كوڵك و موو) كەستەمی ئەوانی تێدا نـەبێ و تێيـدا سـتار بكەن و دەبێ كۆچ و بار بكەن، خەڵك دەبـێ بـە دوو بەشـەوە، بەشـێك بـۆ ئاينەكـەی ئەگری و بەشێك بۆ دنياكەی ئەگری، زاڵبوونی نەفـەرێك لـە ئێـوە بەسـەر نەفـەرێك لەوان وەك سەركەوتنی كۆيلەيەك بەسەيدەكەی و هەتا لە ڕوو بێ بـەگوێی ئـەكات و كـە پـشتی هـەڵكرد لـە پاشملـە جـوێنی پێئـەدا، ئـەو كاتـە وای لێـدێت گـەورەترين دەوڵەمەندی ئێوە ئەوەيـە بـڕوای بـەخوا مـابێ، ئەگـەر خـودا بێـوەيی و سـەلامەتيی پێدان وەريگرن، ئەگەريش تووش بوون ئارام بگرن، چونكە (بەڕاستی دوا ڕۆژ بۆ لە خودا ترسانە).

( ٩٨ )

## وتـارێك لەبارەی دنيا نەويستيی

سوپاسـی خـوا ئەكـەين لەسـەر ئـەوەی كـە لەمـەوپێش، بـۆ كـارو بارمـان داوای يارمەتی تەنها لەو دەكەين بـۆ لەمـەولا، داوای لێدەكـەين لـە بێـدەردیی ئاينەكـەمان، هــەر وەك داوای لێدەكــەين لــەشمان لــە دەردو بــەلا دووربــێ، بەنــدەكانی خــودا ئامۆژگاريتـان ئەكـەم ئـەو دنيايـەی ئێـوەی نـاویٚ ئێـوەش ئـەوتان نـەویٚ، هەرچـەند

حەزتان نییە وازى لێبێنن، ئەو دنیایە کە لەشى دارِزاندوون و ئێوە نیازتانە نوژەنى بکەنەوە، شێوەى ئێوە و شێوەى ئەو وەك هەندێ رِێبوارە کە رِێگەیەکیان لەبەرە و زۆریان نەماوە تەواوى بکەن و نیشانەیەکیان لەبەردەمە بۆى دەرِۆن و نزیکە پێى بگەن، سوارێك بەتاو ئەسپى دەهاژوێ چەندى پێویستە بە غاردان، ئاى چەند نزیکە مانەوەى کەسێك کە تەنها یەك رِۆژى لەبەردەم و پیادەیە بە رِاکردن، دواى دنیا ئەکەوێ و ئەویش جێیدێڵێ.

هەرگیز کێبەرکێ لەگەورەیى دنیاو شانازییەکەى مەکەن، سەرتان سورِ نەمێنێ لە جوانیى و نازو نیعمەتى، زۆر نارِەحەت مەبن لە بەڵاو ناخۆشیەکانى، چونکە گەورەیى و شانازییەکەى برِاوە و جوانیى و نیعمەتەکانى کۆتایى دێ و ئازارەکەى زوو لەناو ئەچێ، هەر ماوەیەك هەبێ کۆتایە، هەموو زیندەوەرى بەرەو نەمانە، لەپاشماوە کۆنەکان پەند وەرناگرن، لەباو باپیرانتان چاوکراوە و پەند وەرگربن، ئەگەر ژیرن، نازانن ئەوەى رِۆیشتووە نەگەرِاوەتەوە و ئەوەش کە ماوە ئەرِوا، ئەوە بۆ تەماشاى دنیاویستەکان ناکەن رِۆژ ئەکەنەوە و شەو ئەکەنەوە بەهەموو جۆرێك، مردووە و بۆیدەگرین، زیندووە و سەرەخۆشى لێئەکەن، لە پەل و پۆ کەوتووە و داماوە، لەسەفەر دەگرِێنەوە و یەکیتر خەریکە گیان ئەدا بە شوێنى دنیاداو هەڵپەیەتیى و مردن لەدوایەوە پێیئەگا، بێئاگایەو چاو دێریى لەسەر دانراوە، یەك بە دواى یەکدا دەرِۆن!

کەواتە تکا ئەکەم یادى کاولکەریى خۆشییەکان بکەن، تێکدەرى ئارەزووەکان، ئومێدو رِوخێنەرەکان، یادى ئەو هەموو وەبیرهاتنەوە بکەن کاتێ پەلامارى کارى گەن و ناپەسەند ئەدەن، داواى یارمەتى لەخودا بکەن، کە هاوکارتانە بۆ ئەنجامدانى حەقەکانى و ئەو هەموو نیعمەتە لەهەژمار نەهاتووە.

(٩٩)

## وتارێك لەبارەی پێغەمبەرو ئال و بەیتەوە

ستایش بۆ خودایە كە لەناو خەڵكدا گەورەیی خۆی بڵاوكردەوە، دەستی گەورە وكەرەمی بۆیان ڕاكێشاوە، سوپاسی ئەكەین لە هەموو كارەكانیدا، داواشی لێئەكەین یارمەتیمان بدات بۆ ئەنجامدانی مافەكانی، شایەتی ئەدەین كە خوای بەحەق جگە لەو كەس نییە، شایەتی ئەدەین محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بەندەو ڕەوانەكراوی خۆیەتی، ماندووە بە گەیاندنی فەرمانەكان و بەیادی ئەو گۆیایە، بەپاكیی و بێفێڵ گەیاندویەتیی و بەسەربەرزیی ڕۆیشتووە، لەناو ئێمەدا ئاڵای حەقی بەرز ڕاگرتووە، ئەوەی پێشی كەوێ و لێی زیاد كات لێی دەرچووە و ئەوەی لێی دواكەوێ و كەموكورتی بكات پوكاوەتەوە و تیاچووە، ئەوەی دەستی پێوە بگرێ گەیشتووە، شارەزای ڕێبازەكەی دامەزراوە و لەسەر ڕێیە لە گوتاردا، بەئارام هەنگاوی ناوە، لە ڕێڕەویدا بەپەلەیە ئەگەر ئێوە گەردنی بۆنەرم بكەن و دەستی بۆ بەرز بكەنەوە، مەرگ دێت و ئەیبات بۆ خۆی، هەتا ماوەیەك كە خودا ئارەزوو بكات ئێوە دەمێننەوە، ئەوجا خودا كەسێكتان بۆ دەردێنێ كە كۆتان بكاتەوە و بڵاویبتان خڕبكاتەوە، زۆر بەتەمای ئەوانە مەبن ڕوویان لە ئێوە نییە و بێئومێدیش مەبن لەوانە پشتیان لە ئێوە كردووە، ئەوەی پشتی تێكردوون نزیكە قاچێكی هەڵكەوێ و قاچێكی بمێنێ و هەردوو كۆكاتەوە و لەسەر هەردوو ڕاوەستێ.

ئاگادارو هۆشیاربن نموونەی ئالی محەممەد(صلی الله علیه وسلم) وەك ئەستێرەی ئاسمانە كە یەكێك ئاوا بوو یەكێك هەڵبێتن، وا دەزانم خودا لە ئێوەدا كارەكانی بەئەنجام دەگەیەنێ و فریادڕەسمان بۆ دەنێرێ.

(١٠٠)

## وتارێ كە باسی داستانەكان ئەكات

سوپاس بۆ خودا كە یەكی پێش هەموو یەكە، دوایی هەموو دواییە، بە یەكەمی ئەو كەس یەكەم نییە، بەدوایی ئەو كەس دوایی نییە، شایەتی ئەدەم كە جگە لەو كەس خودا نییە، شایەتی وەها كە نهێنیی و ئاشكرای هاوتایە و دڵ و زمان وەك

یەكە.

ئەی خەڵكینە! تاوانی دووبەرەكیی و جیابوونەوە لە من تووشی زیانتـان نـەكات و بێ فەرمانیی من لە ڕێ لاتـان نـەدا و بـۆ ئـەملاولا چـاو مەخـەن كە گوێ لـە مـن ئەگرن و بە چاو لە یەكتر داگـرتن، قەسـەم بـەو كەسـەی دانـەی ترەكانـدوە و گیـانی وەبەرهێناوە ئەوەی من لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) هەواڵتان پێئەدەم، كە بەنـدە درۆزن نییە و گوێگریش گێل و نـەفام نـەبووە، هـەر ئەومنـەتان زانـی كـابرای لادەر وەك بایـەقوش لـە شـام خوێنـدی و پەرچـەم و ئاڵاكـانی لـەزەوی دەوروبـەری هەموو كوفەكاندا بەزەویدا داچەقاند، كە دەمی بڵاوكردەوە بەفڕكەو هاوارو لـەغاوی لەدەمی وڵاخەكانی توندكرد و پێی توند كوتا بەزەویدا، ئاژاوە كەڵبەی لـە ڕۆڵـەكانی گرت، شەپۆلی شەڕ هێرشی هێنا، برین و زامی ڕۆژەكان دەركەوت و شەوی گرژو نامۆ ڕوویداو ئەوكاتە كشتەكەی پێگەیی و لەسەر ساقی خۆی ڕاوەستاو گەڵاكانی خونـچە گەشـایەوە، بریـسكەی هـەورەكانی تیـشكی دایـەوە، ئـەوكات ئـیتر ئـاڵای ئـاژاوە و ژاوەژاوەكان هەڵئەكرێن وەك شەوی تاریك و دەریای بەشەپۆل هێرش دێنن.

ئـەومتان لابـێ ! كوفـە بەهـەورە تریـشقەی زۆر ئەكـەوێ و گـەردەلوولی وێرانیـی ڕووی تێئـەكات و لەسـاتەوەختێكی كەمـدا شـەڕە قـۆچ و سـاحەكان دەسـتپێئەكات، ئەوەی بە پێوەیە دروێنە دەكرێ و ئەوەی دروێنەكراوە گێرە ئەكرێ و ئەكوترێ.

(١٠١)

## وتـارێك لەسەر هەمان مەبەست

## (باسی ڕۆژی دوایی و حاڵی خەڵك)

ئەم ڕۆژە ڕۆژێكە، كە خـودا لـەو ڕۆژەدا بـەر و دوای خەڵكەكە كۆئەكاتـەوە بـۆ پرسینەوە و پاداشتی كارەكانیان، بە ترس و لەرزو هەموو بەپێوە و جڵەو كێشەكەی پـاڵی پێـوە ئـەنێ، هـەتا لەبـەر لێویـان لەئارەقـەی خۆیانـدا نقـوم بـوون و قاچـیان لەزەویدا ڕۆچووە، باشترین حاڵیان ئەو كەسەیە، كە جێپێی هەبێ و شوێنفراوان بێ.

## ئەو ڕوداوانەی ڕووی لە خەڵکە

چەند ئاژاوەیـەك بەڕێوەیـە وەك شـەوی تاریـك و نوتـەك، کـەس خـۆی لـە سـەر پێراناگرێ، کەس ناتوانێ ئاڵاکـەی بـۆ دواوە بگێڕێتـەوە، بـە کـاروان و کـۆچ و بـارەوە ڕووتان تێئەکات، سـەرکردەکەیان هانیـان ئـەدات و سـوارەکانیان پاڵیـان پێـوە ئـەنێن، نەتەوەیەکن زۆر هارییان پێوە دیارە، کەلوپەلیان زۆر نییە، بۆ تەمایی تـاڵانی، تـەنها کۆمەڵێکی زۆر بێدەسەڵات بەریان پێئەگرن، کە لەبەرچاوی ئەو ملهوڕانە زۆر پەست دیارن و نەناسراون، لەزەوی و لە ئاسمان ناسراون.

دۆزەخ بـۆ تۆیـە (بەسـرە)، لـەو ڕۆژەدا لەبـەردەم ئـەو سـوپایە کـە خـەشمی خودایە، بۆتان بێتۆزو هەراو هـەڵا دەدەن بەسـەرتا، دانیـشتوانەکەت تووشـی مـەرگی خوێناویی و برسیەتیی و قاتوقڕیی دەبن.

( ١٠٢ )

## وتـارێك لەبـارەی لەبەرچاوخستنی دنیا

ئـەی خەڵکینـە! بـاش تەماشـای دنیـا بکـەن، وەك ئەوانـە کـەوازیان لێهێنـاوە و ئەوانەی ڕوویان لێوەرگێڕاوە، چونکە ئەو دنیایە قەسەم بەخودا لەکات و ماوەیـەکی زۆر کەمدا ئەوانەی دڵیان داوەتێ بـە جێیـان دێڵـێ، ئـەوەی زۆر لـە کـەیف و سـەنایە دەیخاتە شیوەن و گریان، ئەوەی لە دەستچوو گەڕانەوەی نییە، ئەوەی مایـەوە نـازانێ چـی بەسـەر دێ، هـەتا چـاوەڕوانیی بـۆ بکـات، خۆشـیەکان بەخەفـەت تێکـەڵاوە، ئازایەتیی و توانای پیاوانی بەرەو لاوازی و سستییە، بـا نەتانخەڵەتێنێ ئـەو شـتانەی دڵتان پێیخۆشە، چونکە زۆری لانامێننـەوە، خـودا بـەزەیی بـەو کەسـەدا دێتـەوە کـە بیرکاتـەوە و پەنـد وەرگـرێ، کەپەنـدی وەرگـرت بەرچـاوی ڕوونـە، وا بـیر ئەکاتـەوە ئـەوەی هەیـە لـەو دنیایـە وەك نـەبووە لای ئـەو، ئـەوەی دایـنـاوە بـۆ ئـەو دنیـا بـە نزیکانێك پێیئەگا، ئەوەی لە ژمارە بێت کەمە، ئەوەی چاوەڕوانە هـەر دێـت، ئـەوەی لە هاتنە، نزیکەو لەبەردەستە.

## باسی شێوەی زانا

زانا ئەو کەسەیە کێشی خۆی بزانێ، بەسە بۆ نەفامێ کە توانای خۆی نەزانێ، بەدفەسالترین مرۆڤ لای خودا بەندەیەکە کە خودا کاری داوەتە دەستی خۆی و ئەویش لە رێگەی راست لایداوە، بێ شارەزا هەنگاو دەنێ، کە بانگی بکەی بۆ دنیا کار ئەکا یان بۆ ئەو دنیا تەمەڵی ئەکات، وا ئەزانێ کاری دنیایی واجبە و کاری ئەو دنیاکە، تەمەڵ لەسەری لا براوە.

## باسی کۆتایی کات

ئەو رۆژە رۆژێکە کەس تێیدا سەرکەوتوو نییە، جگە لە باوەرداریێك وا دێتە بەرچاو کە خەوالوو گێژە، لە کۆرو کۆمەڵدا نەناسراوە و لەدەرەوەی کۆمەڵ کەس هەوالی ناپرسێ، لە راستیدا ئەوانەی چرای رێنیشاندەرن و پێشەنگی شەوی کێشەو تاریکین، ئەوانە کەسانی هات و هاوارو دوو زمان نین، بلاوکاری دەنگۆی پرو پوچ و هیچ و پوچ نین، خودا بۆ ئەوانە قاپی بەزەیی خۆی ئەکاتەوە و ناخۆشیی و گرفت لەسەریان لائەبا.

خەڵکینە... هۆشیار بن رۆژێ دێت بەسەرتانا ئیسلام قلپ ئەبێتەوە وەك جامێ ئاوەکەی ناوی لار بکرێتەوە، خەڵکینە، خودا بۆ خۆی پەنایداوە کە ستەمتان لێبکات، بەلام نەیپاراستوون لەدەردو بەلا کە تووشتان نەبێ، ئەوەتا دەفەرمووێ: (لەمەشدا چەند نیشانە بوون، دیارە ئێمەش ویستمان بەتاقیکردنەوە)

(١٠٣)

## وتارێك

پاش ئەوە... خودای پاك و بێوێنە، محەممەد (صلى الله عليه وسلم)ی رەوانە کردووە، لە کاتێکدا لە ناو عەرەبدا کەسێك نەبوو نامەیەك بخوێنێتەوە و کەسێ نەبوو داوای پێغەمبەریی و سروش بکات، بەوانەی شوێنی کەوتن جەنگیکرد لەگەڵ ئەوانەی بێگوێ بوون، دابوونییە پێش خۆ بۆ رزگاریی و بەختەوەرییان، بۆ ئەوەی کە رۆژی رەش بەسەریاندا نەیەت، بێباوەر و کەمبارە، روو لاواز، باوەری چارەسەر

ئەکرد، هەتا دەیگەیاندە مەنزڵ، مەگەر کەسێ کە خۆی حەزی لە فەوتان و تێدا چوون بوایە و ئومێدی چاکەی لێنەکرابێ، ڕێگەی ڕاستی نیشاندەدان، هەتا ئەو ڕادەیە ژیانی بەرزکردنەوە و ڕزق و ڕۆزی زۆری بەسەردا دابارانـدن، ئاشیان کەوتە هاڕین و گەڕان و بازوویان ڕاست و بەهێز بوو، ڕمیان ڕێك ڕاوەستا، سوێندم بەخودا من یەکێك بووم لە پێشەنگەکان هەتا هەموویانم بەڕێکرد و سەرکردەکانیانم بێ خەمکرد، بۆ تاکە ساتێ لاوازو بێهێز نەبووم و ترسەنۆك نەبوم و پیلانگێڕ نەبووم و پەککەوتە نەبووم، دووبارە سوێندم بەخودا نەبێ ورگی باتڵ بدڕم هەتا حەق لەکەلەکەی دەردێنم!

(١٠٤)

## وتاری لەسەر پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) و هەڕەشە لە ئەمەوییەکان و ئامۆژگاریی خەڵك

خودا محەممەدی ڕەوانە کرد، بۆ ئەوەی شایەت بێت لەسەرتان، بە پەیامی مژدەو نامەی ترساندن، بە منداڵیی لەخەڵکیتر جیاوازو باشترو لە هەموو نەجیبتر، بە پیریی و بە پاکیی هەموو پاکان و چاکان لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوە دەستگر و شادترین هەوری بارانی هێمن بۆ ئەوانەی داوای بارانی ڕەحمەت و یارمەتیی و هاوکاری ئەکەن.

## خێڵی ئەمەویی

ئەوەتان زانیوە کە ئەو دنیایە شیرین نەبووە بۆ خۆشیی ئێوە و گوانی نەهاتووەتە شیر بۆتان، مەگەر پاش ئەوەی جڵەوی بۆ شلکرا و تەنگەو قەیاسەی بۆ خاوکرایەوە و حەرام و قەدەغە کراوەکانی وەك داری (تاوگ) دڕکی لێکرابێتەوە، لای خەڵکیتر حەڵاڵ و بەردەستەکەی دوورە دەست نەکەوتووە، ئێوە پێڕاگەیشتن، قەسەم بەخودا ئەوە ئێوە لە سێبەرێکی (سەهەن)دان تا ماوەیەکی کورت، دنیا لە ئێوە بێخاوەن و چۆڵە و دەستی ئێوەش کراوە و ئاوەڵایە و دەست و دەسەڵاتی ڕابەری ئێوە بەسراوە و شمشێرەکانتان لەسەر ملیانە و شمشێری ئەوانیش لەکێلانەو

هەڵگیراوە، ئەوە بزانن هەموو خوێنێك تۆڵە سێنی هەیەو هەموو حەقێك داواكاری خۆی هەیە، ئەوەی تۆڵەی خوێنی ئێمە ئەسێنێ وەك دادوەر بڕیاری مافی خۆی بدات، ئەویش خودایە كە كەس توانای كەمكردنەوەی دەسەڵاتی نییە بۆ داوای خۆی و كەس ناتوانێ لەبەردەمی هەڵێ.

سوێندم بەخودا ئەوەی ئومەییە، پاش كەمێ دەستی غەیری ئێوەیە و لە ماڵی دوژمنی ئێوەیە، لەوەش ئاگادار بن ژیرترین چاو ئەوەیە كە چاكە ببینێ، چاكترین گوێ ئەوەیە بیرەوەری پێدرا وەریبگرێ.

## ئامۆژگاریی خەڵك

هۆ خەڵكینە! ئامۆژگاریی ڕووناكی وەرگرن، لە شۆڵەیی چرای ئامۆژگارێك كە خۆی بەگفتەكانی خۆی پەندی وەرگرتبێ، تینوێتی خۆتان دەركەن لەكانیاوێكی ڕۆشن كە پاككرابێتەوە لە لێڵیی و پۆخڵیی.

بەندەكانی خودا ! پشت مەبەستن بەنەفامیی و نەزانیی خۆتان و جڵەو شل مەكەن بۆ حەزو ئارەزووەكانتان، ئەوەی باری خستبێ لەم شوێنەدا پاڵی داوەتەوە، لێواری كەنێكی ئاودڕی داڕوخاو لە ئان و ساتدا دەڕمێ، مەرگ و تیاچوونی گرتووە بە كۆڵەوە ئازوگوێزی پێئەكات، بەبیرو ڕایەك كە خۆی دایناوە و هەموو جارێك ئەیگۆڕێ، ئەیەوێ پینەی پەڕۆ ئەكات و بە لكاندن بەشتێكەوە كە ئالكێ و نزیكی دەكاتەوە لە ڕایەك كە قەبووڵی نزیكبوونەوە ناكات.

پەنا بەخودا ئێوە سكاڵاتان بردووەتە لای كەسێك كە سكاڵاتان لانابات و هەرگیز ئەوە ناكات ئەو ڕایە كە بۆتان دانراوە بە بیروڕای خۆی هەڵیوەشێنێتەوە، چونكە ڕابەر تەنها ئەوەی لەسەرە چی لە خوداوە پێسپێراوە بیگەیەنێ، بە ئامۆژگاری، بەهەوڵ و پەند و عیبرەت، بەزیندووكردنەوە و شتی بەرز، جێبەجێ كردنی یاساكانی خودا، لەسەر ئەوانە كە ئەیانگرێتەوە، بەشی بەشدار بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەكانیان، پەلە بكەن بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری پێش ئەوەی ڕووەكەی وشك بێت و پێش ئەوەی خۆتان ماندوو بكەن، وەریبگرن لەو شوێنەی كە زانست بەڕوونی خۆی دیاریكردووە، نەهی بكەن لەخراپەو لەناوخۆتان قەدەغەی بكەن، چونكە فەرمانتان بە نەكردنی خراپە وەختێ پێدراوە كە لەناو خۆتانا نەیكەن.

( ١٠٥ )

## وتارێك باسی ئیسلام و یادی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) و سەرزەنشتی یاوەرانی دەكات

ستایش بۆ خودا كە ئیسلامی داناوە و یاساكانی ئاسانكردووە بۆ ئەوانەی كە پەیڕەوی ئەكەن، پایەكانی بەرزكردووەتەوە بەسەر ئەوانەی دەیانەوێ بەسەریا بەرزببنەوە، هێمنیداوە بەوانەی كە پابەندن بە فەرمانەكانی و ئاینیداوە بەوانەی كە دێنە ناوییەوە، هێزو توانای داوە بەوانەی كە پێی ئەدوێن و نیشانەیە بۆ ئەوانەی كە پەیوەست دەبن پێیەوە، چاوڕوونییە بۆ ئەوانەی جوامێرن پێیەوە، ئامۆژگارییە بۆ ئەوانەی پەندی لێوەردەگرن، دەربازكاری ئەوانەیە كە باوەڕیان پێیەتی، ڕێبازەكانی ڕوون و دیارن، ڕوانگەكان تیشكئاوێژو بەرزن، شەقامەكانی پرشنگدارن، چراكانی داگیرساون، گۆڕەپانی تەخت و ئامادەیە بۆ ڕامیاری ئامانج، بەرزە كۆی هەموو ئەسپە ڕەسەنەكانە، جێگەی خەڵاتی سەركەوتوانە، سوارەكانی ڕەسەن و وەجاغزادەن.

بەدڵ وەرگرتنی پەیڕەویەتی، چاكە منارەیەتی، ئارەزوەكانی مەبەستییەتی، دنیاش گۆڕەپانی سوار چاكییە، ڕۆژی دوایی مەیدانی ڕەبازییە و شوێنی خەڵات و بەراتی سەركەوتوانە.

## یادی پێغەمبەر
## ( صلی الله علیه وسلم )

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مەشخەڵی داوەتە دەست ئەوانەی بۆ دەستەدار دەگەڕێن، ئاڵای بەرزی هەڵكردووە بۆ ئەو ڕێبوارانەی نەشارەزای ڕێگان، ڕاگری نهێنیی و ڕاسپاردەی تۆیە، شایەتی ڕاستگۆیی تۆیە بۆ ڕۆژی پاداشت، ڕەوانەكراوی خودایەو نیعمەتەو پەیامبەری بەڕاستی خودایە.

خودایە بەشی ئەم پێغەمبەرە لەسەر بەشان زیاتر بێت، بەدادی خۆت، پاداشتی چاكەی بەچەندان جار بدەرەوە، بەگەورەیی خۆت خودایە ماڵی لەسەر هەموو ماڵان

بێت، بەرێزترین جێگەی بۆ دیاری بکە، شوێنی حەوانەوەی لای خۆت بەرزبێت، خودایە (وەسیلە)ی بەرزو مەدح و سەناو گەورەیی پێببەخشە، لەگەڵ ئەودا کۆمانکەرەوە نەك بەسەر نزمیی و پەشیمانیی و پەیمانشکێنیی و لەرێلادەرو سەرلێشێواوو خەڵەتاو و خەڵەتاوەکان.

## وتارێك بۆ یارانی

ئێوەی یارانی من کەوتوونەتە جێگایەك کە هاوسێ و دراوسێتان بە هۆی ئێوەوە رێزی لێئەگیرێ، کەنیزەکانتان جێگایان لەبەرزەو ئەوانە کە ئێوە هیچ چاکەتان بەسەریانەوە نییە، بەگەورە تەماشاتان ئەکەن و ئێوە هیچ جۆرێ دەستی دەهەندەتان بەسەریانەوە نییە، ئەوانە ترسیان لە ئێوەیە کە ئێوە چ جۆرە دەسەڵاتان نییە بەسەریانەوە، ئێوە بەچاوی خۆتان دەبینن پەیمانی خودا دەشکێنن، قەت تورە نابن کە چی بێزتان لە شکاندنی پەیمانی باو باپیرانتان دەبێتەوە، فەرمانەکانی خودا بۆ ئێوە دێت و لە ئێوەوە دەرئەچێت و بۆ ئێوە دەگەرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش دەسەڵاتی ستەمکارانەتان لەناوماڵتان راگرتووە و جڵەوی خۆتان داوەتە دەستیان و کارو فەرمانەکانی خوداتان بەوان سپاردووە، ئەوانیش بەو کارانەوە سەرگەرمن کە جێگەی گومانەو لەسەر رێگای هەواو نەفس دەرۆن، بەخودا ئەگەر دابەشتان بکەن بە ناو هەسارەکاندا خودا کۆتان ئەکاتەوە بۆیان بۆ زیاتر ئازاردانتان!

(١٠٦)

## وتارێك لە رۆژانی سیفین

بەچاوی خۆم پەلاماری نەبەردیی ئێوەم دی، لادان و تێکدانی ریزەکانتان، کێ لاتان ئەدا هەرچی و پەرچی و عەرەبە دەشتەکییەکانی شام، ئێوە خۆتان بەسوارچاکی عەرەب دەزانن و خۆتان لە تەوقەسەری شەرەف دائەنێن، لوتبەرزو سەرپشتی قایم و مەحکەم، دڵم ئۆخەی کرد لە ئێش و ئازار کە ئێوەم بینی بلاوەتان پێکردن لەو جێگەی بلاوەیان پێکردن و شوێنەکانتان پێچۆڵ کردن لەو

شوێنەی پێیـان چۆڵكردن، بـەنووكی ڕم و تـیری كـەوان پێـشیان دەكـەوتن بەسـەر ئەوانـەی دواوە وەك حوشـتری تینـووی سـەر ئـاو كـە بـەزۆر لەسـەر ئاویـان لابـەرن و ماوەیان نەدرێ تێرئاو ببن.

( ١٠٧ )

## وتارێكی لە داستانی جەنگدا

سوپاس و سـتایش تـەنها بـۆ خـودا كـە خـۆی بەخـەڵك بـۆ خـەڵك دەرخـستووە، نمایانــە بــۆ دڵیــان بــە بورهــان و بەڵگەیــە، خــەڵكی دروســتكردووە بێمانــدوبوونی بیركردنەوە، چونكە بیركردنەوە بۆ ئەوانەیە بە پارچە گۆشـتی دڵ بـیر ئەكەنـەوە و خۆی خاوەنی دڵی خۆی نییە، زانستی ئـەو خودایـە چـووەتە نـاو پـەردەی نهێنیـی و نادیارەكانەوە، تەواو ئاگاداری هەموو شاراوەكانی بیرو باوەڕەكانە.

## یادێ لە پێغەمبەر

## ( صلى الله علیە وسلم )

خودا ئەو پێغەمبەرەی پـاڵاوتووە لـەداری پێغەمبـەران( درودی خوایـان لـە سـەر بێت)، لە تـاق و پەنجـەرەی سەرچاوەی ڕووناكیی و لـە نێوچـاوانی بـەرزو بەشـكۆ و لـەناو قـەدی چـۆمی (بگحـاو) و مەشـخەڵگەلی تـاریكیی و سەرچـاوەی حیكمـەت و زۆرزانیی، پزیشكی گەڕۆكـە و مـاڵ بـە مـاڵ دەگـەڕێ بـۆ چارەسـەریی، مەڵهەمـەكانی جوان گرتووەتەوە، وتراوەكانی بەچاكیی ئامـادەكردووە، ئـەزانێ لـە كوێـی زامـەكانی دائەنێت، لەسەر دڵی كوێر و نەبین و گوێچكەی كـەڕو نـەبیس و زمـانی لاڵ و نـەگۆ، دەرمـان لەسـەر بـرینی بێئاگـایی دائـەنێ و شـوێنی حەوانـەوەی دوو دڵـی، ئەوانـە هــەرگیز میوانــداری جــوامێریی و جوانزانینیــان نــەكردووە، هــەرگیز پیــوە و چــەخماخیان نــەیتوانیوە ڕوونــاكی لەســەر نهێنییــەكان دابــینێ و بــچێتە نــاو زانــستەكانەوە، ئەوانــە وەك ئــاژەڵی بــەرەڵڵا وان وەك گابــەردی ســەخت و ڕەق وان، چونكە پەی بردن بە نهێنییەكان تەنها بۆ ئەوانەیە كە بـیری تیـژیان هەیـە، ڕێگـەی ڕاست تەنها بۆ ئەوانەیە كە شارەزای ڕێگەی پیادەن، دوا ڕۆژیان بۆ ڕووناك بووەتەوە

و نیشانه دانـراوه بـۆ ڕێـوانی کارامـه، ئـەوه بۆچـی وەك تارمـایی بێگیـان یـان گیـانی بێلـەش و مـەیوی بێـشارەزا و بازرگـانی بـێ قـازانج و خـەوتووی بەخەبـەر و حـازرو بـزرن، تەماشـاکەری کـوێر و گـوێگری کـەڕ و گۆیـای بێزمـان، ئـەوه نـازانن ئـەوه پەرچـەمی گومراییـه لەسـەر پایـه دانـراوه و لقـەکانی بـڵاو بوونەتـەوه، پێوانـەتان ئەکەن بەمەن و تەغارو به بازوی درێژ و بەهێز گەلاّ ڕێزانتان دەکـەن، ڕابەرەکـەیان لادەرە له ڕێگەی میللەت و لەسەر ڕێگەی چەوته، ئەوێ ڕۆژێ کەس له ئێوه نـامێنێ، جگـه لـه خلّتـەو خـاڵی نـاو گـۆزەو دێـزەو تیانـچه، یـان وەك کوڵـك و مـووی دوای تەشیرِستن ئەتان تاشن وەك تاشین بۆ پێسته، پێشێلتان ئەکەن وەك گێرەی خەرمان، بـاوەڕداران هەڵدەبـژێرێن وەك باڵنـده دانەوێڵـەی قەڵـەو هەڵدەبـژێرێ لـەناو دەنکـه لەرەکاندا، ڕێگەکان بۆ کوێتان ئەبەن و شەوی تاریـك و نوتەکەچاو بـۆ کوێتـان وێـڵ ئەکات، درۆزنەکان بـۆ خەڵەتانـدنتان دەبـەن، لـەکام لاوە پـەلامارتان دەدەن بـۆ کـوێ ئـاوارەو شـەواره دەبـن، هـەموو کاتێـك وەختـی دیـاری هەیـه، هـەموو دووره ولاّت و ڕێبوار گەڕانەوەی بۆ هەیه، دەکەواته به وردیی گوێ بگرن له زانایان و خوداپەرست و لـەناو سـنگتان جێگـەیان بکەنـەوه، بەپەلـەوه ئاگاتـان بێـت ئەگـەر بـانگکران، بـا پێـشرەوتان ڕاسـتگۆ بێـت، هەمیـشه ئامـاده بێـت و وریـا بێـت، ئـیش و کارتـان بـۆ ڕوونکراوەتەوه، وەك مووروو هۆنراوەتەوه، پاککراوه، وەك بنێشت پاڵفتـەکراوه، ئـەو کاته باتـڵ ڕێگـەی خـۆی گرتـووه و نـەفامیی سواری ولاّخـی خـۆی بـووه، ستەمکاری ملهوڕ زۆر گـەوره بـووه و بانگـەوازخواز کـەم بوومتـەوه، زەمانـه پـەلاماری داوه وەك دڕندەی نهێنیگر کەڵەگای باتـڵ نەڕانـدی پـاش ئـەوەی ماوەیـەك بێـدەنگبوو، خـەڵك یـــەکیان گـــرت بـــۆ داوێنپیـــسیی و تـــاوان و لەیەکجیابوونـــەوه لەســـەر ئـــاین و خۆشەویستیان بۆ یەك هەبوو لەسەر درۆ و دوژمن بوون به یـەکتری لەسـەر ڕاسـتی، که ئەم باره بەم شێوەی لێهات، منالّ هەڵئەگەڕێتەوه لەباوکی، باران لەهاوین دەبارێ، نانەجیب و تازەپیاکەوتوو بەخشنده دەبن، بەخـشندەو پیـاو چاکەکان ڕۆ دەچـن بـه ئەرزدا، خەڵکی ئەم چەرخه وەك گورگ دەبن و دۆستایەتی تەنها به زەمانـه، پاشـایان دڕنـدەن و برسـیانه، خەڵکەکـه زۆرخـۆرو هـەژاران مـردوون، ڕاسـتی نـامێنێ و درۆ هەڵئـەقولێ و بـەدڵ لـه یـەك دوور ئەکەونـەوه، پیـاوخراپیی دەبێتـه نەسـەب و داوێنپاکیی کاری عەجەب، ئیسلام به پێچەوانەوه وەك (کوڵەباڵ) لەبەر ئەکرێ.

(١٠٨)

## وتارێك لەبارەی تواناو گەورەیی خودا و زیندوو بوونەوە

**هەموو شتێك سەرنەوییە بۆ خودا، مانەوەی هەر شتێك بەهۆی ئەوە ساماندەرە بۆ هەموو هەژارێك، گەورەیی بەخشە بۆ هەموو دونێك، هێزی هەموو بێدەسەلاتێکە، فریادرەسی هەموو داماوێکە، هەرکەس گفتبدات ئەو گفتی دەبیستێ، هەرکەس بێدەنگ و سەنگ بێت ئەو بە نهێنی دەزانێ، ئەوەی زیندووبێت ڕۆزیی لەسەر ئەوە، هەرکەس مرد بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە، کەس چاوی تۆی نەدیوە هەتا پێناسەت بکات، بەڵکو تۆ لە پێش ئەوانەی کە وەسفکارن لە دروستکراویی تۆ هەبووی، لەبەر بێ هاودەمیی خەڵکت درووست نەکردووە، بۆ سوود و قازانج کارت پێ نەکردون، ئەوەی داوای بکەیت ناتوانێ تەکوجم بکات، ئەوەی گرتت دەرباز بوونی نییە، دەسەلاتت بەبێ ئەمریت کەم ناکات، موڵك و دەوڵەتت بە بەگوێکردنت زیاد ناکات، ئەوەی تورە بێت لە دادوەریت ناتوانێ فەرمانت بەدواوە بدات، ئەوەی کاری تۆی بەدەستە، بێ پێویستی تۆ ناڵێ هەرچی نهێنییە لای تۆ ئاشکرایە، هەموو نادیارێك لات حازرە، تۆ هەتا هەتاییت، کات بۆ تۆ نییە، هەموو شت بۆ لای تۆیە، لادان لە تۆ نییە، کاتی دیاری لای تۆیە، دەرباز بۆ کەس نییە، مەگەر بۆ لای تۆ، هەموو زیندەوەرێ ناوچاوانی بەدەستی خۆتەو گەڕانەوەی هەموو گیانلەبەرێك بۆ لای تۆیە، ئای چەند پاکی! ئای چەند گەورەی! پاکیی تەنها بۆ تۆیە، خەڵکی درووستکراوی گەورەت هەیە، بەلام هەموو گەورەیەك بچووکە لەپاڵ توانای تۆدا، جیهانی تواناو دەوڵەتی تۆ چەند بەسامە! ئەوەی لە ئێمەوە دیارە زۆر کەم و بێبایەخە، لەچاو ئەوەی لە ئێمەوە ونە، کەرەم و بەخشندەیت چەندە زۆرە! چەندەش کەم و بێنرخە لەچاو نیعمەتی ڕۆژی دوایی.**

## باسی فریشتە بەرێزەکان

**فریشتەی ئێوەیە کە لە ئاسمانەکاندا داتناون، لەسەر زەوی بەرزتکردوونەتەوە، لە هەموو کەس زیاتر تۆ دەناسن و لە هەموو کەس زیاتر ترسیان هەیە، لە هەموو کەس نزیکترن لە تۆوە، لە پشتی باوك نەبوون و لەناو منداڵدانی دایك نەژیاون و**

(له چۆره ئاوێكی كەم بایەخ) درووست نەبوون و (ترسی مەرگ) بڵاومیان پێناكا، ئەوانە لەگەڵ ئەو قەدرو حورمەتەی هەیانە لای تۆ، هەموو خۆشیان بۆ تۆیە و زۆر بەڕاستی بەندایەتیت ئەكەن و هەرگیز لە تۆ نابوێرێن، ئەگەر یەك گەرد لە نهێنی تۆیان بۆ دەركەوێ خۆیان زیاتر بەكەم ئەزانن و سەر زەنشتی خۆیان ئەكەن و بۆیان دەرئەكەوێ بە ڕاستی تۆیان نەناسیووە و بەباشیی گوێڕایەڵ نەبوون.

## یاخیبوونی خەڵك

پاك و بێگەردی خودایە!، تۆ بەدیهێنەری، تۆ پەرستراوی، لەبەر جوانیی و شیرینیی نازو بەخشندەییت لای دروستكراوەكانت، ماڵت درووستكردووە و سفرەی ڕازاوەت ڕاخستووە، ئاوەدان بەخواردن و خواردنەوە، بەهاوسەر و كارگوزار، بە كۆشك و ڕووبارو باخ و باخات و میوە و بەروبووم، ئەوجا بانگدەرت ناردووە خەڵك بانگێش بكەن بۆ ئەوێ، بەڵام ئەو خەڵكە سپڵەیە بەدەنگ بانگەكەوە نەهاتن، ئەوەی تۆ پێت باش بوو ئەوان پێیان باش نەبوو، حەزیان لەو هەموو نازو نیعمەتەی تۆ ئامادەتكردووە بێمەیل بوون، پەلاماری لاك ئەدەن بەخواردنی شەرمەزارییەوە و یەك دەنگن لەسەر خۆشەویستیی بۆی، ئەوەی حەزی لە شتێ بوو كوێرە لە ئاستی كەم و كوڕیی و دڵی بۆی نەخۆشە، بە چاوێكی بیمار تەماشای ئەكات و بەگوێیەكی ناساق گوێ بیستە، هەواو ئارەزوو ژیریی كونكون كردووە، ئەو دنیایە دڵی مراندووە و شێت و شەیدای بووە، بووەتە بەندەو كۆیلەی خۆی و ئەوانەش كە كەمێك و شتێكیان لایە، لەهەر كوێ بن بۆ ئەوێ ئەڕۆن، ڕوویان لە كوێ بێت ڕوویان تێئەكرێ، گوێنادەن بەو كەسەی دەیانترسێنێ و پەندو ئامۆژگاریی وەرناگرن، بە بەرچاویانەوە یەكە یەكە ملیان دەگرن و لە بێئاگاییدان، ماوەی پەشیمانی و بەهانەو گەڕانەوە نەماوە، ئەوەیان بەسەرهاتووە كە نەزانبوون لەئاستیدا، لەكاتی دڵنیاییدا لە دنیا جیا كرانەوە و گەیشتن بەو شوێنەی كە پێیان زانرابوو، لە تواناادا نییە وەسفی ئەوەی باریان لێخستووە، لەسەریان كۆبووەتەوە سەرخۆشی مەرگ و داخ و غەمی لە دەست چوو، دەست و پێیان سارد بووەتەوە و ڕەنگیان گۆڕاوە، كە مردن زیاتر و چاكتر چووەتە ناویانەوە، توانای گفت و گۆیان نامێنێ، لەناو كەس و ماڵ و وەچەكانیدا بەچاوی خۆی ئەبینێ و بەگوێ ی خۆی

ئەبیستێ و باش ئاگای لە خۆیە و دڵی بەخەبەرە، بیر لەوە ئەکاتەوە تەمەنی لە چیدا تەواوکرد، کاتی لە کوێدا بە فیڕۆداوە، ئەو هەموو سامان و داراییەی چۆن کۆکردەوە و چۆن چاوی نوقاندبوو لە شێوەی وەدەستهێنانی، لە شوێنی دیارو گوماناوییەوە بە دەستی هێنابوو، ئۆباڵی کۆکردنەوەی لە گەردنی ئەمەو ئەوا نزیکە بەجێی دێڵێ، میراتی پاش خۆیەتی پێی ڕائەبوێرن، خۆی بێبەری و خەڵك لە خۆشیدا دەژین و ئەرك و قورسایی و تاوان لە سەر پشتی ئەمە، گەردنی قورسایی هەلگرتووە، دەستی پەشیمانی ئەگەزێ کە لەدەشتی چۆڵدا سەرگەردانەو بێدەرامەتە لەسامانەکەی، بێبەشە و بێبەشە لەو هەموو ماڵەی لەتەمەنیدا خەمی بۆ ئەخوارد، ئەو کاتە خۆزگە ئەخوازێ ئەوەی بەشەوق و زەوقەوە کۆی ئەکردەوە و خەڵك ئیرەییان پێئەبرد دەستی ئەم نەکەوتایەو بۆ خەڵکی تر بوایە، ئەوجا مەرگ بەر ئەبێتە لاشەی زمان و گوێی تێکەڵ و پێکەڵە لەناو کەس و کاریدا، زمانی ئەشکێ و گوێی نابیستێ، بەچاو تەماشای دەم و چاویان ئەکات و نازانێ چی ئەڵێن، ئەوجا مەرگ زیاتر خۆی پێوە ئەنووسێنێ، چاویشی لە بینین ئەکەوێ وەك گوێی و ڕۆح لە لاشەی دەرئەچێ و کەلاکی لەناو خزمەکانیدا ئەکەوێ و سامی لێئەکەن و لێی دوورئەکەونەوە، نە بەگریانیان کەیف خۆشەو نە وەڵامی کەس ئەداتەوە، ئەوجا هەڵیئەگرن بۆ ناو چاڵێك لە زەوی و ئەیسپێرن بەکردەوەکانی و سەردانی ناکەن.

## ڕۆژی ئەو دنیا

کە نامەی تەمەن گەیشتە ساتەوەختی خۆی، فەرمان گەیشتە ئەندازەکانی پاش و پێشی، خەڵك یەکانگیربوون، فەرمانی خودا دەرچوو بەو جۆرەی خۆی ویستی کە ئەو خەڵکە تازە بکاتەوە، ئاسمانەکان دەجوڵێنێ و لەیەکیان جیا ئەکاتەوە و زەوی ئەلەرزێنێ و ئەهەژێنێ و چیاکان لەبن دەردێنێ و پرش و بڵاویان دەکات، یەك بەسەر یەکدا لە ترسی خوداو دەسەڵاتی دەکەون، ئەوەی لەناو سکی زەوییە دێتەدەر پاش ڕزین و پوکانەوە تازەیان دەکاتەوە، لە پرش و بڵاوی کۆیان ئەکاتەوە، خۆی چۆنی دەوێ جیایان دەکاتەوە بە پرسین و توێژینەوەی کارەکان پرسیاریان لێدەکرێ، ئەیانکات بە دوو بەش، ئەومیان لە بەش و خەڵات و ئەمەیان لە تۆڵە و

سزا، ئەوانەی فەرمانبەردار بوون لە نزیك خۆی پاداش وەردەگرن و دەحەوێنەوە و بەنەمریی لە ماڵ و حاڵی خۆشدا دەژین، کە کۆچ و باری نییە، هەرگیز گۆڕانی ناخۆش و ترس بەسەریاندا نایە، دەردو نەخۆشیی و بەلاّ نابیّ و ترسی کارەسات نامێنیّ و سەفەر و ماندوو بوون نامێنیّ.

بێگوێ و نافەرمان و یاخیی لە خراپترین ماڵدا دادەنریّ، دەستیان بەسراوە بەگەردنەوە، ملیان لکاوە بە قاچیانەوە، کراسی قیر و زەفتیان لەبەر ئەکریّ، کراس و دەرپیّ و پۆشاکی ئاگریان لەبەر ئەکریّ، گەرمیی ئازاریان سات بەسات زیاد دەبیّ، دەرگایان لەسەر دائەخریّ و ئاگر لەسەریان کڵپە وناڵەیە، گڕی هەستیان شۆڵەی بەرزو دەنگی ترسناکی هەیە، ئەمانیش بارو کۆچیان نەماوە و دیلیان کڕینەوەی نییە، کۆت و زنجیریان شکان و پسانی بۆ نییە، کاتی دیاری بۆ تەواو بوونی نییە و ڕۆژی دادگایی نییە هەتا کۆتایی بێت.

## یادی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم )

ئەو ڕابەرە دنیای بە سووك داناوە و بچووکی کردووەتەوە، بەکەمی زانی و بەکەمی ڕاگرت، بەباشی زانی کە خودا دنیای لێگرتووەتەوە بۆ تاقیکردنەوەیەتی، کەرای خستووە بۆ غەیری ئەو لەبەر سووکیی و بێنرخیی بووە، ئەویش بەدڵ ڕووی وەرگێڕا لە دنیاو باسکردنی لەدەروونی خۆیدا مراند و زۆری پێخۆش بوو کە ئالاّو والاّی لەبەر چاوی ون بێت، بۆ ئەوەی بەرگی لێدروست نەکات، یان دڵبەند بێت بەمانەوە تێیدا، لە خوداوە ئەوەی پێیی سپێرا گەیاندی بۆ لابردنی بیانووی بیانوگران و ئامۆژگاری دا بە میللەت وەك هەڕەشەکارێك، مژدەی دا بە بەهەشت و ترسی دایە بەری خەڵك لە ئاگر.

## ئەهلی بەیت

ئێمەی درەختی پەیام و سروش مەڵبەندی نامەی خودا و شوێنی هامۆشۆ و گوزەری فریشتەکان کانی زانست و کانیاوی حیکمەت و ژیریین، هاوکار و خۆشەویستانمان چاوەڕێی بەزەیی خودان و دوژمنانمان و کینە لە دڵمان چاوەڕێی تۆڵەی بەزەبری خودان.

(١٠٩)

## وتارێك لەبارەی پایەکانی ئاینی ئیسلام

چاکترین دەستگیر کە داواکار بەدەستییەوە بگرێ بۆ لای خودای پاك، باوەڕە بە خودا و پێغەمبەرەکەی(صلی الله علیه وسلم) و خەبات لە ڕێگەی ئەودا، چونکە ئەوە چڵەپۆپەی ئیسلامەو وشەی دڵسۆزییە، چونکە گونجاوە لەگەڵ سروشت، پیادەکردنی نوێژە چونکە نیشانەی نەتەوەی ئیسلامە و دەرکردنی زەکاتە چونکە ئەرکی پێویستە و ڕۆژی ڕەمەزانە چونکە چەترو پەرژینی دۆزەخە و دیدەنی ماڵی خودا لە حەج و عومرەدا چونکە قەڵاچۆی هەژاریی ئەکەن و گوناهەکان دەشارنەوە، بەسەر کردنەوەی خزم و دۆست چونکە ساماندەری ماڵ و دەوڵەتە و دوورخستنەوەی ئەجەلە، بەخشینی پەنهانە چونکە لابەری تاوانەو بەخشندەی ئاشکرایە، مەرگی نالەبار لائەباو بڵاوکردنەوەی پیشەی چاکەخوازییە چونکە لەناو چوونی پەستیی و خواریی لائەبا.

هەمیشە یادی خودا بکەنە ویردی زمان، چونکە جوانترین یادە، هەمیشە ڕووتان لە پەیمان و بەڵێنەکانی خۆپارێزان بێ، چونکە بەڵێن ڕاستگۆیە، پەیوەندبن بەڕێبازی پێغەمبەرەکەتان(صلی الله علیه وسلم)، چونکە چاکترین ڕێبازە پەیڕەوی کردارو ڕەفتاری بکەن، چونکە ڕوونترین پەیڕەوە.

## گەورەیی قورئان

زۆر بەجوانی فێری قورئان ببن، چونکە جوانترین فەرموودەیە و شارەزای بەندەکانی بن، چونکە هەمیشە بەهاری دڵانە، بەکاری بێنن بۆ چارەسەریی، چونکە باشترین دەرمانی دەروونە، زۆر بە ڕەوانیی و جوانیی دەوری بکەنەوە چونکە بەسودترین داستانە، چاك بزانن زانای بێکردە بەزانستی خۆی، نەفامێکی سەرگەردانە هەرگیز بە ئاگا نایەت لە نەفامیی و گێلیی بەڵکو باشترین بەڵگەی تاوانە لە سەری و خەم و پەژارەی زیاتری هەیە بۆی و لای خواش سەرزەنشتکراوە.

(١١٠)

## وتارێك لەبارەی زەمی دنیاوە

پاش ئەوە... من ئاگادارتان ئەکەم لە خراپیی دنیا، چونکە شیرین و سەوزەو پەرژینکراوە بە ئارەزووەکان، ئەوینداری خۆشییە نزیکەکانە و دڵی بە شتە کەمەکان ڕاهاتووە، خۆی پێچاوە بە ئومێدو هیواوە و خۆی جوان نیشاندەدا بە خۆبایی بوونەوە، کەچی دڵخۆشییەکان کەمدەوامەو لە کۆسکەوتنی دڵنیا نییە، خەڵەتێنەرە، زیان بەخشە، کەمدەوام و کەمخایەن و کەمتەمەن و زووپەڕە، زۆرخۆرێکی ماڵوێرانکەرو ئابڕوبەرە، ئەگەر ڕووی نازی کردە لایەك و پێی دڵخۆش بوو لە فەرمایشتی خودا تێناپەڕێ، کە دەفەرمووێ: (نەزیلەیەکیان لە ژینی سەر دنیا بۆ بێننەوە، وەك ئاوێکە لە حەواوە دامانباراند هەموو تەرزە ڕوەکێکی تەڤ لە هەڤی بەرهەم هێنا، سەرئەنجامیش بوو بە پووش و با پڕاندی، خودا بەسەر هەموو شتاندا توانای هەیە).

کەس نەبووە تاسەر تیا لە خۆشیدا بێت و لەپاش وی فرمێسکی بەخوڕی نەڕژاندبێ، کەس نەبووە خۆشیی بگاتە ناو سکی و لە پشتیەوە بەئازار دەری نەهێنابێ، بارانی زۆر و هێمنی نەباراندووە کە دوای ئەوە بارانێکی کارەسات و ماڵوێرانی نەناردبێ بۆی، هەمیشە خۆی وابووە ئەگەر بەیانی خۆشیی و سەرکەوتنی هێنابێ لە ئێوارەدا گۆڕیویەتی بە ناخۆشیی، ئەگەر لە لایەك شیرینیی و خۆشخۆریی هێنابێ لە لاکەی ترەوە تاڵیی و دەرمی هێناوە، هەرگیز مرۆڤێك لەنەرمیی و ناسکیی تێرناکات، هەتا لە دوایدا تووشی ماندوو بوون و سەختیی نەکات، ئەگەر بەیانی لەژێر پەری نەرمی دابنێ بۆ ئێوارە لەسەر باڵی پێشەوەی بۆ کەوتنی دادەنێ، خەڵەتێنەرە، هەمووی بایی هەوایە، کەمدەوامە، ئەوەی تێیدایە تیاچووە لە تێشووەکانی باشی تێدا نییە، جگە لە خۆپارێزیی ئەوەی کەم بار بکات لێی زۆری پێیە بۆ دوارۆژی، ئەوەی زۆری داواکرد زۆر هۆکاری لەناوچوونی خۆی پەیدا کردو زووش لەدەستی دەچێ، زۆر کەس دڵی داوەتێ بەگورجیی کۆستی گەورەمیداوە بەسەریا، ئەوەش کە خۆی داوەتە دەستی بۆ حەوانەوە بەسەختیی لە ئەرزی کوتاوە، زۆر گەورەو خونکار بووە بەسووکیی داناوە، زۆرکەس شانازی پێوەکردووە، بەسەر

شۆڕیی دەستی بەڕوویەوە ناوە، دەسەڵاتەکانی زەمانە دەیگۆڕێ، ژیان تێیدا شێواو لێڵە، ئاوی شیرینی زۆر سوێرە، شیرینیی تاڵە، خۆراکیی ژەهراوییە، پەت و گوریسەکانی پتورکاوە، زیندووی ئامادەی مردنە، لەشساغی ئامادەی بیمارییە، دەسەڵاتی بەتاڵانی براوە، ڕێزداری ژێرکەوتووە، دەوڵەتداریی قڕان کردووە، هاوسێی هەیە ڕووتکراوەیە، باشە ئێوە لە شوێنی ئەوانە لە ئێوە تەمەندار تر بوون جێگەتان نەگرتووە، لە ئێوە زیاتر ئاسەواریان ماوە و ئاواتیان لە ئێوە زیاترو ژمارەیان لە ئێوە زیاتر بوو، سەربازیان لە ئێوە چڕتر بوو، هەموو کۆیلەی دنیا بوون و زۆر بەهەند وەریانگرتبوو، بەبێ تێشوو کۆچیانکرد، ڕێبواری بێولاخ بوون، بۆتان دەرکەوتووە کە ئەو دنیایە کەسێکیتر بێتەوە بە سەخاوەتی خۆی؟ یان هاوکاریی و یارمەتیی دابێت؟ یان هاوەڵێکی باش بووبێت؟ نەخێر.. بەڵکو کرم و مارو مێرووی ناوە بەلەشیەوە پارچە پارچەی بکەنو، بەکاری ناهەموار سووك و تڕۆی کردوون، سەرشۆڕی کردوون بەجۆرەها کارەسات، بەدەما خستوونی و دەمیان لە خۆڵە و پێشێلکراون بە پێلەقە، (مەرگی ترسناکی) بەسەردا زاڵکردوون، بینیتان چۆن پشتی هەڵکردو سەریان بۆ شۆڕکرد، بردیەوە و گۆڕی گومکردن کاتێ چوونەوە بۆ لای هەتا هەتایە، جگە لە تەنگی کام تێشوو باری پێدان، لە برسیی و تینوویی دایناون، جگە لەتاریکیی کام ڕووناکیی بۆ داناوە، جگە لە پەشیمانیی چیان بۆ جێماوە، دەی باشە ئێوە ئەمەتان هەڵبژاردووە، دڵتان بەوە ئارامە، لەسەر ئەوە هەڵپەتانە، بەڕاستیماڵێکی زۆر خراپە بۆ ئەوانەی گومانیان لێی نییە و ترسیان لێی نییە، زۆر چاك بزانن (ئێوەش ئەزانن)! کە بەجێیدێڵن و بار ئەکەن، پەند وەربگرن لەوانەی (وتیان کێ لە ئێمە بەهێز ترە؟) بران بۆ گۆڕو پێیان ناڵێن سوار، خرانە ناو گۆڕو بە میوان دانانرێن، گۆڕیان لەسەر تەختە و باڵا پۆشییان گڵە، هاوسێکانیان پێشەو پەڵایە، وەڵامی کەس نادەنەوە، ناتوانن زۆر و ستەم لەسەر کەس لابدەن، گوێیان لەشین و شەپۆڕ نییە، باران بباریێ کەیفدار نابن، بەقاتوقڕیی گوێ نادەن، ڕاستە کۆمەڵن بەلام تەنیان، هاوسێن بەلام زۆر دوورن، لەلای یەکن و هاتوو چوونیان نییە، نزیکن و لەیەك نزیك نابنەوە، زۆر هێمن و ئارام و بێ ڕق و کینەن، ناحاڵین و ڕقیان نەماوە، زیانیان نییە و یارمەتیشیان نییە، لەسەر زەوی بۆ ناو زەوی و لە شوێنی پانوبەرین بۆ تەسك و لەناو ئال و عەیال بۆ غەریبیی و لە ڕووناکیی بۆ

تاريكيى، چۆن هاتوون لە ئەرزەوە هەروا ڕۆشتنەوە بە ڕووتيى و پێخاوسيى باريانكرد، تەنها كرداريان پێيە لە مالّى وێرانەوە بۆ مالّى هەميشە، وەك خودا ئەفەرموێ: ( هەر وەك پێشوو درووستمان كرد، ديسان سازى دەكەينەوە بەلّێنەكە لە ئێمەوەيە و هەر دەشيكەين ).

( ١١١ )

## وتارێك باسى فريشتەى مەرگ و مردن ئەكات

هەستى پێئەكەى ئەگەر بێتە شوێنێكەوە؟ ئەيبينى ئەگەر يەكێكى مراند؟ بەلّكو كۆرپەلە لە ناوسكى دايكيا چۆن گيان ئەكێشێ؟ ئايا دەچێتە ناوەوە بۆى؟ لە هەندێ ئەندامى دايكييەوە، يان ئەوەتا گيان خۆى دێت بە پيريەوە، بەداواكردنى پەروەردگارى؟ يان ئەوەتا لەناو هەناويدا خۆى حەشارداوە؟ چۆن ئەتوانێ وەسفى بەديهێنەرى خۆى بكات، كە نەتوانێ وەسفى بونەوەرێكى ئەو بكات!؟.

( ١١٢ )

## وتارێك لە خراپ باسكردنى دنيا

من ئاگادارتان ئەكەم لە خراپى دنيا، چونكە شوێنى لەرزۆكە و شوێنى پاكژ نييە، زۆر بە لەخۆباييەوە خۆى جوان ئەكات، بەو جوانييە خەلّكى پێ لە خشتە ئەبا، مالّێك لاى خاوەنەكەى بێنرخە، ئەوەتا حەرام و حەلالّى تێكەلّە، خەيرو شەڕ و ژيان و مردن و تالّيى و شيرينيى پێكەوەيە، خودا مەدحى نەكردووە بۆ دۆستەكانى و قەدەغەيشى نەكردووە لە دوژمنەكانى، باشەى كەمە، خراپە حازرە، كۆى زوو تەواو نەبێ، سامانى تالأنيى ئەكرێ، ئاوەدانيى وێران نەبێ، ئەبێ باشيى مالّێك چى بێت وەك خانوو تێكدرێت؟ تەمەنێك بەتەواو بوونى زەخيرەكەى تەواو بێ، ماوەكەى بە كۆتايى ڕێگەكەى تەواو بێ، ئەوەى خودا لەسەرى داناون بيكەنە مەبەستى خۆتان، داواى لێبكەن يارمەتيتان بدات لەو كارەى داواى لێكردوون، بانگى مردن بدەن بە گوێتانا پێش ئەوەى خۆى بانگتان بكات، ئەوە ڕاستە ئەوانەى لە دنيا

بێزارن بەدڵ ئەگرین و بە دەم پێئەکەنن، خەفەتبارن ئەگەر لە خۆشیدابن، ئەوکاتە زۆر ڕقیان لە خۆیان دەبێتەوە کە بەهۆی ڕزق و سامانەوە خەڵك خۆزگەیان پێئەخوازێ، بەڵام ئێوە یادی مردن لەناودڵتان ونبووە، هەمیشە درۆکانی ئاوات لاتان ئامادەیە، زیاتر لە ژێر دەسەڵاتی دنیادان نەوەك قیامەت، ئەوەی ئێستە زیاترتان دەبات بۆ لای خۆی هەتا ئەوەی دوایی، بەدیمەن لەسەر ئاینی خودان، بەڵام پیسی دەروونتان هۆی جیاوازی تیایە، دڵتان لە ئاستی یەك خراپە، هاتووچۆی یەکتر ناکەن، ئامۆژگاریی یەکدی ناکەن، بەخشندەیی لە نێوتاندا نییە و یەکترتان خۆشناوێ، بۆچی بەکەم دڵخۆشن لە دنیا دەستان کەوێ، نارەحەتتان ناکات ئەو هەموو دەستکەوتە لەو دنیا لە دەستان دەچێ، کەمێ شتی دنیایی کە لە کیستان دەچێ خەفەتبارتان دەکات بەشێوەیەك لەدەم و چاوتان دیارە، زۆر بێئارامن ئەگەر شتێکتان لێوەشارنەوە، وەك ئێرە ماڵی هەمیشەتان بێت و خۆشیی و شادییەکانی هەمیشە پێبێت، لەڕووی براکانتان شتێ دەرئەبڕن لە پاشملە ئەوە نییە، لە ترسی ئەوەی ئەوانیش وەك تۆ نەکەن، دڵتان دامەزراوە لە سەر خۆشەویستی دنیا و بێخەمیی ئەولا، ئاینی هەر یەك لە ئێوە زارەکییە و بەس ئەوەش کاری بەندەیە کە لەکاری خۆی بوەتەوە و گەورەکەی ڕازییە.

(١١٣)

## وتاری ئامۆژگاریی

ستایش بۆ خودا کە سوپاسی پەیوەندە بە نیعمەت و نیعمەت بە سوپاس ستایش ئەکەین، لەسەر هەموو بەخشندەیی و دەهەندەکانی، هەر وەك سوپاسی ئەکەین لە سەر بەڵاو داوەکانی، داوای کۆمەك و یارمەتیی لێئەکەین لەسەر ئەم خەڵکە سست و کەمتەرخەمە بۆ فەرمانەکانی، زۆر بەلەزو پەلەکارن بۆ قەدەغەکراوەکان، داوای لێبوردنی لێئەکەین لەهەرچی کە پێی زانیوە و بە نامە ئاماری گرتووە، زانینی کەسێکی بێدەسەڵات و نوسراوی بەکەم و کورپی نییە، باوەڕمان بە ئەندازەی باوەڕی ئەوەی کە نادیارەکانی دیوە و لەسەر بەڵێن ڕاوەستاوە، ئەو باوەڕەی کە دڵسۆزیی هاوەڵی وەلا ناوە و یەقینی گومانی لابردووە، بەدڵ

باوەڕمـان هەیـە و بـەزمان بڕیـار ئـەدەین كـە خـودا تاكـەو هـاوەڵی نییـە و محەممـەد(صلی الله علیـە وسلم) بەنـدەو ڕەوانـەكراوی ئـەوە، ئـەم دوو شـایەتومانە گوتـار بـەرز ئەكاتـەوە و ڕەفتـار بـۆ سـەرەوە ئـەبا، ئـەوەی تـەرازوی ئەمـەی تێـدابێ هەرگیز سووك نابێ، هیچ تەرازوویەك كە ئەوەی تێدا نەبێ قورس نابێ.

بەندەكانی خودا ! ئامۆژگاریتان ئەكەم بە خۆپارێزیی، چونكە تێشووی ڕێگەیـە و تـەنها بـەو پـەنا ئـەدرێ، تێـشویەكە دەمانگەیـەنێ بـە مـەنزڵ و پەناگەیـەك كـە بێخەمین تێیدا، بەدەنگی بەرزترین بانگەوازخواز هاتووە و بەگوێی باشـترین گـوێگر ئاشنا بووە، بانگەوازخواز گەیاندی و گوێبیستیش سەركەوتوو بوو.

بەندەكانی خودا خۆپـارێزیی خـودا بـە دۆسـتەكانی پاراسـتووە لـە گوناهـەكان و دڵیـانی هەمیـشە لـە ترسـدایە، حـەزیان بـە نزیكبوونـەوەی ئەجەلـە، لەبـەر ئـەوە دەستیان داوەتە كارو خەیاڵیان بەدرۆ خستووەتەوە و چاویان لـە ئەجەلـە، ئـەم دنیـا مـاڵێكی فـەوتاوە و ڕوخـاوە و بەنـەرك و ئـازارەو گـۆڕاوە و ئابڕووبـەرە، فەوتانەكـەی ئەوەیە كە تیری لە كەوانە بۆ دانیشتووەكانی، هەرگیز و هەرگیز هەڵە نـاڕوات و زام و برینەكانی تیمار ناكرێن، كاری تێدەكات زیندوو ئەمرێنێ و ساغ نـەخۆش ئـەخات، ڕزگاربوو بەكەمیی ئەندامەوە بخۆرێكە هەرگیز تێر نابێ و ئاوخۆرێكە قـەت تێرئـاو نابێ، ئەوە مانـدوو بـوون و شـەكەتییە كـە مـرۆڤ هـەر كۆیكاتـەوە و لێـی نـەخوات و دروستی بكات و تێیدا دانەنیشێ، كە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار نـەماڵی پێیـەو نـە بینای بەكۆڵەوەیە، هەر لە سەقامنەگیریی دنیایە، ئەوەی جێگەی بەزەییە ئاواتی بۆ دەخوازرێ و ئەوەی ئاواتی بۆ دەخوازرێ جێگەی بەزەییە، چـونكە ئـەوە نیعمەتێكـە زوو هات و زوو ڕۆیی و ناخۆشیی بەسەردا هات، لەپەندو ئامۆژگارییـەكانی ئـەوە كـە ئینسان نزیكە لە ئاواتەكەی، كەچی ئەجەل پـەلی ئـەگرێ و نـاهێڵێ بەدەسـتی بێنێ، هیچ ئاواتێك ناگاتە ئەنجام و ئاواتەخوازیش ماوەی پێنادرێ.

پاكیی و بێگەردیی هەر بۆ خودایە، خۆشیی ئـەم دنیایـە چـەند كەمـە و چـەند تینووی بێئاوە و سێبەری بەیانی چەند كەمخایەنە، ئـەوەی بەڕێوەیـە ناگەڕێتـەوە و ئەوەی ڕۆیشتووە نایەتەوە، پاكی هەر بۆ خوایە، زیندوو چەند نزیكە بگاتـە مـردوو، مردوو چـەند دوورە لـە زینـدوو، چونكە لەیـەك دابـڕاون، هـیچ خراپەیـەك خـراپتر نییە لە خراپە، جگە لە تۆڵەكەی و هیچ چاكەیەك لـە چاكە چاكتر نییـە، جگـە لـە

پاداشەكەی، هەموو شتێكی ئەم دنیایە بیستنی گەورەترە لە بینینی و هەموو شتێكی ئەم دنیا بینینی گەورەترە لە بیستنی، كەواتە بۆ بینینەكە گوێبگرن و بۆ نادیارەكە هەواڵەكەتان بەسە، ئەوەش بزانن لە دنیاتان كەم بێت و لە قیامەتتان زیاد، كات چاكترە لەوە لە قیامەتتان كەم بكات و لە دنیاتان زیاد بكات، زۆرجار كەمپێدراو قازانجییەتی و زیادپێدراو زیانییەتی، ئەوەی فەرمانتان پێكراوە فراوانترە لەوەی لەسەرتان قەدەغە كراوە، ئەوەی بۆتان حەڵاڵكراوە زۆرترە لەوەی كە حەرامكراوە، كەواتە واز لە كەمەكە بێنن بۆ زۆرەكە و تەنگەبەرییەكە لابەن بۆ فراوانییەكە.

ئێوە ڕۆزیتان مسۆگەرە و فەرمانتان بەكاركردن پێدراوە، ئیتر بۆچی هەوڵتان بۆ مسۆگەرەكە زۆرترە لە داوا كراوەكە، لەگەڵ ئەوەش قەسەم بەخودا گومان ڕێگەی گرتووە و یەقین وەهمی تێكەڵ بووە، وای لێهاتووە ئەوەی بۆتان دانراوە وەك ئەوەیە لەسەرتان دانرابێ و ئەوەی لەسەرتان دانراوە وەك ئەوەیە لەسەرتان لابراوە، كار بكەن، هەوڵ بدەن، بترسن لەمەرگی كتوپڕ، چونكە تەمەنی ڕابوردوو ناگەڕێتەوە، بەڵام ڕۆزی فەوتاو دێتەوە، ئەو ڕزقەی ئەمڕۆ لێتان گیراوە بەیانی دێتەوە، بەڵام ئەو عومرەی دوێنێ ڕۆیشت ئەمڕۆ نایەتەوە، باش وایە بەتەمای داهاتووبن و بەتەمای ڕۆیشتوو نەبن، كەواتە (ئەی گەلی خاوەن باوەڕان چۆن پێویستە ئاوا لە خودا بترسن و هەر بە موسڵمانی بمرن).

## (١١٤)

## وتارێك لە نوێژەبارانەدا

خودایە... سەرشاخەكان گیای پێوە نەماوە، زەویمان هەموو بووەتە تەپوتۆز، مەڕو ماڵاتمان هەموو سەرگەردانە، سەری لێشێواوە لە پەچەو گەوڕەكانیاندا، شیوەنی بەرزبووەتەوە بە وێنەی دایكانی كۆرپەمردوو، سوڕانەوە بە ناو پاكژو نخوردی بێپوشدا ماندووی كردووە، سۆزی بۆ شوێنی ئاوخواردنەوەی زۆر بووە، خودایە بەزەییت بێتەوە بە ناڵەی بیمارانـدا، بەسۆزی سۆزدارانـدا، خودایە... پاش ئەوەش بەزەییت بێتەوە بەسەر لێشێواویی لە ڕێگەكانی لەوەڕگاكانیاندا، ناڵەو نوزەیان لەسەر ڕێگای شەواژۆیان، خودایە، ئێمە بۆ لای تۆ لەو كاتەی كە حوشترە

مانـدوو و برسـیی و تینووەکـان دەوری ئێمەیانـداوە، هـەوری بێبـاران و بارانـاویی دواکەوتوون لە وادەی خۆی، تەنها ئومێدی بێنەوایان و فریادڕەسی بەهاوارانی، لێت ئەپاڕێمەوە لەوکاتەی کە خەڵك بێئومێدن و باران نابارێ و ئاژەڵ هەموو قڕانیکرد، بەکردەی خۆمان لەگەڵ مەکە، بـەگوناحی ئێمـە سزامان مـەدە، بیڕژێنـە بەسـەرمانا بـارانی بـەخوڕی بـەزەیی خـۆت، بەهـەوری پـڕ لـە ئـاوو بـەهاری تـەڕی بارانـاویی و بـەگیاو ڕووەکـی شـەنگ و تێرئـاو، بیڕژێنـە بـارانی دڵۆپەگـەورە، زینـدووی بکـەرەوە ئەوەی وشکبووە و ئەوەی فەوتاوە بۆمان بگەڕێنەوە.

خودایـە، ئاوداشـتمان بکـە بـە ئـاوێکی زیندووکـەرەوە و ئـاودێری تێـرو تـەواو و گشتگیر، پاك و جوان و بۆندار، بێزییان و بێئـازارو بێئافـات و داهێنـەری هـەرزانیی، گیای بکەوێتە بالاوگەشە، بە لق و پۆپی بەردار و گەڵاو گوڵی سەوزوجوان، بۆ ئەوەی بەندە هەژارەکانت بگەشێنەوە و وڵاتە مردووەکانت زیندووکەرەوە.

خودایـە، بارانێـك گـردو دۆڵـەکان بڕوێنێتـەوە و چـۆم و شـیوەکان ئـاوی تێـدا سەروازکات، دەروماڵ و حەوش و حەسارمان بـە پیـت بێتـەوە، دووبـارە بـەروو بـووم ڕوومان تێکاتەوە، ئاژەڵ و حەیوانەکانمان بەچاکی بژین، دەرودەشـت و دەوروبـەرمان شەونمی لێبارێ و مەڕو ماڵاتمان لە چێشتەنگاوەکاندا بەرین بۆ ئاو و لەوەڕ، ئـەوەش بەرەکـەتی فراوانیـی تۆیـە و خـەڵات و بـەراتی بـە نرخـی تۆیـە لەسـەر دەسـتکردە هەژارەکانی خـۆت و لەسـەر گیانلەبـەرە کێوییـە بێدەرەتانـەکان، بیڕژێنـە بەسـەرمانا ئاسمـانێکی تـەڕو فێنـك، بـەردەوام، بـەخوڕ، دڵۆپـە بەسـەر دڵۆپـە دابکـەوێ و بـاران لەسەر باران ببارێ، بێ بزیسکەی بێ بارین و بێ هەوری تاڵی بێ باران و بێ هـەوری تەنکی بێ ئاو و بێ بارانی ڕنەو کەمخایەن، هـەتا نەوانـەی وشـکە سـاڵیی و گرانییـت بەسەردا هێناون ببوژێنەوە و بەبەرەکەتی ژیانلێکەوتوان زیندوو ببنەوە، چونکە تـۆ بـاران ئـەبارێنی پـاش نائومێـدیی و بـەزەیی خـۆت بـڵاو ئەکەیتـەوە، تـەنها تـۆی بـۆ مەزنایەتیی ئەشێ پەسەندی بدرێ.

(١١٥)

## وتارێك ئامۆژگاریی یارانی ئەكات

خودا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی ناردووه بانگەوازی حەق و ڕاستیی بكات و شایەت بێت بە سەرخەڵكەوە، ئەویش پەیامەكانی خودای گەیاند بێ سستیی و بێ كەمتەرخەمیی و لەبەر خودا تێكۆشاو دژی دوژمنانی خودا بەبێ ئەوەی لاوازیی و بەهانەجۆیی بكات، پێشڕەوی پیاوچاكان و چاوساغی شاگردانی ڕێگەی ڕاست، ئەگەر ئەتانزانی بەو زانیارییانە لای منەو لە ئێوە شاراوەیە زۆر بەپەلە ملی ڕێگەتان دەگرت و لەشەرمی كردارەكانتان دەگریان و سنگی خۆتان دەكوتا و ماڵ و سامانتان بێپاسەوان و بێجێگەدارو بێنشینیی جێدەهێڵا و هەموو كەسێك نەفسی نەفسی خۆی ئەبوو و چاوەڕوانی كەسی تری نەدەكرد، بەڵام لەبیرتان چوو ئەوەی هێنرایە یادەوەریتان، دڵنیابوون لەو شتانەی ترسیان وەرهێنان، ڕای خۆتان لێونبوو، كارو بارتان لێ پرش و بڵاو بوو.

حەز ئەكەم خودا لە ئێوەم جیا كاتەوە، پەیوەستم بكات بەو كەسانەی لە ئێوە باشترن بۆ من، بەوەڵڵاهی ئەوانە بە حیلم و سەبرو ئارام و خاوەن عەقڵ و ڕاستگۆ و دوور لە یاخیبوون و لادان بوون، ئۆغریانكرد لە پێشەوە لەسەر ڕێگەو زۆریش بەپەلەبوون لە ڕێبازە ڕاست و پەسەندەكە، ئەوان بەپاشەڕۆژی چاكی خۆیان گەشتن و تووشی ژیانێكی فێنك و بەڕێز بوون، دووبارە بەوەڵڵاهی، ئەبێ خودا زاڵی بكات بەسەرتانا هەرزەی خێڵی (سەقیف) و درێژداهۆڵی بەفیزو لەخۆبایی، هەر بەسەوزیی نۆشتان بكات و چەوریی و بەزی لەشتان بتوێنێتەوە، ئێی باوكی قۆلانچە!.

(١١٦)

## وتارێك ڕەخنە لە ڕەزیل بەگیان و سامان دەگرێت

ئێوە ئەو سامانەی كەسێك پێیداون لێیدەشارنەوە و ئەو گیانەی كە زاتێك بە ئێوەیداوە بۆی بەكار ناهێنن، بەهۆی خوداوە خۆتان بەرز دانێن بەسەر بەندەكانی خوداوە، كەچی ڕێزی بەنەكانی خودا ناگرن، پەند وەربگرن، ئێوە لەو شوێنەدان كە پێش ئێوە تێیدا بوون و لەسەر ڕێوشوێنی ئەوان دوور كەوتوونەتەوە.

(١١٧)

## وتارێك باسی پیاوە باشەکانی یارانی ئەکات

ئێوە یاریدەدەری حەق و ڕاستین، برایانی ئاینیین، قەڵغانی ڕۆژی تەنگانەن، باوەڕپێکراوی دەوروبەرن نەوەك خەڵك، بە ئێوە تەمێی ڕاکردوو ئەکەم و ئومێدەواری تازە هاتووم، هاوکاریم بکەن بە بۆچونی دوور لەساختە و چەواشەکاری، دوور لە گومان و دوودڵیی، قەسەم بەخودا من بۆ خەڵك لە هەموو خەڵك باشترم، یان باشترین خەڵکم بۆ خەڵك.

(١١٨)

## وتاری ئەو کاتەی خەڵك کۆبوون بۆ جیهاد و پاش وتار خەڵك بێدەنگ بوون

ئەرێ باوەڕم پێبکەن ئێوە کەڕولاڵن؟ ئەوجا هەندێ وتیان: فەرموو بڕۆ ئێمە لەگەڵت دەڕۆین، ئەوجا فەرمووی: ئەی خودا نەتانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ڕێگەتان نەدات بۆ مەبەستی چاکە! ئەبێ لەکاتی ئاوەهادا من بچمە دەرەوە؟ ئەبێ کەسێ بڕواتە دەرەوە من لێی ڕازی بم، پیاوێك بێت لە پیاوە ئازاو جەنگاوەرەکانی ئێوە، هەرگیز ڕەوا نییە سوپا بەجێبێڵم و شار چۆڵکەم و سامانی بەیتولمال و کۆکردنەوەی (خەراج و باج) و دادوەریی ناو موسڵمانان و کۆڵینەوە لە داوای داواکاران بهێنم، ئەوجا دەرچم لەناو تیپێك و بەدوایدا تیپێك وەك تیرێکی دانەتاشراو هەر تەقەو ڕەقەم بێت لەناو تیردانێکی بەتاڵدا، نا! وانییە! من کرۆکی ئاشم و بەرداشی ژێرەوەم و بەرداش لەسەر من دەسوڕێ و دەبێ من لەجێگەی خۆم نەجوڵێم، ئەگەر جیابوومەوە بەرداشی سەرەوە لە تەوەرەی خۆی دەردەچێ و بەم لاو ئەولادا پەرت ئەبێ، بەردی خوارەوەش لەکار دەکەوێ، دەی قەسەم بەخودا ئەمە ڕایەکی زۆر بەدە، قەسەم بەخودا ئەگەر ئومێدی شەهیدبوون نەبوایە لەکاتی بەرامبەری دوژمن، ( کە زۆر جار ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەم تووش بووە) هەر ئێستە ئاوزەنگم لە ولاخەکەم نزیك ئەکردەوە و لە ئێوە دوور ئەکەوتمەوە و هەرگیز داوام لە ئێوە نەبوو هەتا

باکورو باشور جیابن، ئێوە هەر خەریکی تانەو تەشەرو عەیب و عارگرتن بن، ئێوە هەر خەریکی لادان و پەرتەوازەیی و فێڵ و ساختەکاریی بن، زۆری ژمارەتان بێسوودە، چونکە کەم دڵتان لەگەڵ یەکە، من ئێوەم بەڕێگەیەکی ڕەواندا بردووە، ئەو ڕێگەیە کەس لەسەری تێدا ناچێ، مەگەر دڵ و دەروون پیس بێ، هەرکەس لەسەر ئەو ڕاستەڕێیە بێت بۆ بەهەشت و هەرکەس کەوت بۆ ئاگر.

( ١١٩ )

## وتارێك باسی خۆی ئەکات و ئامۆژگاریی خەڵکی تێدایە

بەخودا قەسەم من فێرکراوم پەیامەکانی خودا بگەیەنم، گفت و بەڵێنەکان بە ئەنجام بگەیەنم، هەموو وشەکان تەواو بکەم، لای ئێمەیە (ئال و بەیت)، دەرگاکانی حیکمەت و و ژیریی و ڕۆشنی کارەکان، باش ئاگاداربن یاساکانی ئایین هەموو یەکە، ڕێبازەکانیان تەختە، ئەوەی پەیڕەوی بکات دەگاتە مەنزڵ بە بەردەوامیی، ئەوەی لادا لێی ون ئەبێ  بە پەشیمانییەوە، کار بۆ ئەوێ بکەن کە ڕۆژێ زەخیرەی بۆ هەڵئەگیرێ، هەموو نهێنییەکان ئاشکرا دەبن، ئەوەی ئەمڕۆ ژیری ئێستەی نەگاتە فریای دوورەولاتیی بێدەسەلاتترە لێی، کارێ بکەن پارێزراوبن لەو ئاگرەی گەرمیەکەی زۆر زۆرەو بنکەی زۆر قووڵەو شیشەکانی تیژن و ئاوەکەی کێم و زووخە، ئاگادارین کە زمانی پاراوی چاکبێژ لە ناو خەڵکدا زۆر باشترە لەو سامانەی کە بەجێی دێڵێ بۆ کەسانێ کە سوپاست ناکەن.

( ١٢٠ )

## وتاری لەشەوی ( هەریر ) دا

پیاوێك لەناو یارانیدا وتی: جارێ ڕێکەوتن قەدەغە دەکەی و جارێ فەرمانی پێدەدەی، ئێمە زانا نین کامیان باشە بۆمان؟ میری موسڵمانان دەستێکی کێشا بە دەستەکەی تریداو فەرمووی: ئەوە پاداشتی ئەوەیە کە پەیمانی نەبردە سەر! قەسەم بەخودا ئەگەر من کاتێ فەرمانم پێدان بەو فەرمانەی کە فەرمانم پێدان کارێکی ناخۆشم لەسەرشان دادەنا و خودا خێری زۆری بۆ دەهێنا، کە ڕاستم کردنەوە ڕێگەم

نیشاندان، ئەگەر بەلاڕێدا بمبردنایە ڕاستم ئەکردنەوە و ئەگەر ئێوە نەتان کردایە ماوەم پێنەدەدان لە ڕێگە دەرچن، ئەوکات دەستتان بەدەستگیری بەهێزو پتەوەوە دەگرت. بەڵام بەکێ؟ و بۆ کوێ؟ من ئەمەوێ بە ئێوە تیماری دەرد بکەم و ئێوە خۆتان دەردن، وەك ئەوەیە کە بەدڕك دڕك لەدەست دەربێنی و بزانی کە نووکی دڕکەکە بەدڕکەکەوەیە، خودا، حەکیمی ئەم دەردە بێدەرمانە ماندوو بووە و دەستی ئاو هەڵکێشانمان سست بووە بە پەتی ناو بیرەقوڵەکەوە، لە کوێن ئەو کەسانە کە بانگکران بۆ ئیسلام و وەریانگرت؟ قورئانیان خوێندو بەفەرمانەکانی هەڵسان و بانگکران بۆ جیهاد، ئەوانیش وشترە شیردەرەکان لە بێچووەکانیان جیاکردەوە و شمشێرەکانیان بێ کێلان کرد و بەملاو ئەولای زەویدا هێرش دوای هێرشیان برد، هەندێك نەمان و هەندێ ماون، ئەوان مانیان بە مژدە نازانن و مردنیان پرسەی ناوێ، چاویان تیلە لەبەر گریان، سکیان چووە بە ناوا لەبەر ڕۆژووگرتن و لێویان وشکە لەزۆریی پاڕانەوە، ڕەنگیان زەردە لەبەر نەخەوتن، ڕوویان نیشانەی ترس لە خوایان پێوە دیارە، ئەوانە برایانی من بوون و ڕۆیشتن، ئەبێ ئێمە تینوو بین بۆ لایان و دەستی خۆمان بگەزین بۆ جیابوونەوەیان.

لە ڕاستیدا شەیتان ڕێبازەکانی خۆی بۆ ئاسان کردوون و ئەیەوێ ئەڵقەی دینەکەتان یەکەیەکە خاو بکاتەوە، کۆمەڵتان بڵاوە پێبکات، بەناکۆکیی ئاژاوەتان لەناودا درووست بکات، تکایە ئێوە دەست هەڵگرن لەدوو دڵیی و ڕاڕایی، ئامۆژگاریی ئەوەی بە دیاری بۆ ئێوەی داناوە وەریگرن و باش پابەندبن پێیەوە.

(١٢١)

## وتاری بۆ دەرچوان کە ڕۆیشت بۆ لایان و دژی ناوبژیی بوون

ئەرێ ئێوە لەگەڵمان بوون لە سیفیندا؟، وتیان: هەمانە ئامادە بوون هەمانە ئامادە نەبوون، وتی: ببن بەدوو بەش، ئەوەی ئامادە بوو تاقمێك و ئەوەی ئامادە نەبووە تاقمێك، هەتا هەر تاقمە قسەی لەگەڵ بکەم، ئەوجا بانگی خەڵکی کردو فەرمووی: بێدەنگبن و قسە مەکەن و گوێ لە قسەی من بگرن و بەدڵ لای من بن،

**ئەوەی داوامان لێکرد کەشایەتیی بدات با بەپێی زانیاریی شایەتیی بدات، ئەوجا قسەیەکی زۆری بۆ کردن و ئەمەش بارێکییەتی:**

**ئەرێ ئێوە نەبوون ئەوکاتەی کە قورئانیان بەرزکردەوە (بە فێڵ و غافڵگیریی و پیلان و خەڵەتاندن)، ئەوانە برای ئێمەن و هاوبانگین و پەشیمان بوونەتەوە و پشوویانداوە و ڕوویان لە قورئان کردووە، کە کتێبی خودای پاکە، باش وایە بەدەمیانەوە بڕۆین و ئەوەیان لێوەرگرین و هەناسەی پشوویان پێبدەین، ئەوکات منیش پێموتن کە ئەوە بەڕواڵەت ئیمانە و ناوەڕۆکی دوژمنکارییە، سەرەتا ڕەحمەتە و لەپاشان پەشیمانییە، ئێوە لەسەر کاری خۆتان بوەستن و دەستبگرن بەڕێبازی خۆتانەوە، بەهەموو هێزتان لەسەر جیهاد سووربن، گوێ مەگرن لە (قیڕەی قەلە ڕەشە)، ئەگەر بەگوێی بکەی لە ڕێت لائەدا و ئەگەر وازی لێبێنی ئەو ملی خوار ئەبێ، ئەو کارە جێبەجێکرا من باشم لە بیرە ئێوە ڕاتان لەسەربوو و قەولتان پێدا، قەسەم بە خودا ئەگەر ئەو کارەم نەکردایە هەرگیز لەسەرم فەرز نەدەکراو خودا گوناهی لە ئەستۆم نەدەگرت، خۆ ئەگەر بمکردایە حەق لای من بوو دەبوو شوێنمکەون، قورئان لەگەڵمە لەوەتەی هاوڕێمە لەوکاتەی بوومەتە یاوەری، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بووین، کوشتار لە نێوان باوك و کوڕدا بوو لەگەڵ براو خزمدا بوو، لە هەموو بەسەرهات و ڕوداوێکی ناخۆشدا باوەڕمان زیادی ئەکردو لەسەر ڕێگەی خۆمان بەردەوام بووین و خۆمان دابووە دەست حەق و ڕاستیی و سەبرمان هەبوو لە سەر ئێش و برین، بەڵام ئەمڕۆ کەشەڕی براکان ئەکەین لە ئیسلامدا لەسەر ئەوەیە کە لاریی و دوو دڵیی و دڵکرین هاتووەتە ناو ئیسلامەوە، بە گومان و تەفسیری هەڵە، ئێستەش ئەگەر لەسەر ئەم ڕەوتەی خۆمان بەردەوامبین خودا پرش و بڵاویمان کۆ ئەکاتەوە و لەیەك نزیك ئەبینەوە و ئەوە باوەڕمان سودمان پێ ئەگەیەنێ، پەیرەوی بکەین و دەست هەڵگرین لە شتی تر.**

(١٢٢)

## وتارێك لەگەڵ یارانی لەكاتی جەنگدا

هەر كەستان كە زانی خۆی ورەی بەرزەو وزەی بەهێزە لەوەختی جەنگدا، ڕوانی یەكێ لە براكانی بەرەو ڕووخان ئەڕواو خەریكە بشكێ، با پەلامار بدات و بەدەمیەوە بڕوات و بەرگری لێبكات، وەك بەرگری لەخۆی بكات، خودا ئەتوانێ ئەو برایە وەك ئەم لێبكات، مەرگ داواكارێكە بەدواوەیە، نە ئەوەی دانیشتووە لێی ڕزگار ئەبێ و نە ئەوەش ڕائەكات لەدەستی دەرباز ئەبێ، مردن بە كوشتن لە ڕێگەی حەق زۆر سەر بەرزییە، قەسەم بەو كەسەی گەردنی كوڕی ئەبو تالیبی بەدەستە هەزار زامی شمشێر لای من ئاسان ترە لە مردنی سەرجێگەو بێ ئەمریی خودا.

(١٢٣)

## وتارێك

وا بزانن چاوم لێتانە، ئەكشێن وەك كشانی ڕەوی كەمتیار، ئەكەون بەسەر یەكدا، ڕاستیی ڕاناگرن و بەرپەرچی ستەم نادەنەوە، ڕێگەتان بۆ چۆڵكراوە، ئەوەی پەلامار ئەدا ڕزگاری بووە و ئەوەی سستیی بكا تیا چووە.

(١٢٤)

## وتارێك بۆ هەڵنانی یارانی لە جەنگدا

ئێوە دەبێ ئەوەی زرێی لەبەرە پێشكەوێ، ئەوەی ڕووتە لە دواوە بێ، بە توندیی دان بگرن بە خۆتانا، چونكە شمشێر كەمتر كاریگەریی دەبێ لەسەر مێشك و خۆتان بدەنە ئەملاو ئەولادا لە تیرەكان، چونكە زیاتر لە ئێوە دەرباز ئەبێ و چاوتان كەمێ دابخەن، چونكە بۆ زات و زۆر و ئارامیی دڵ باشترە، دەنگ خەفە بكەن، چونكە لە ڕووخان و بەزین دەربازتان ئەكات، پەرچەمەكەتان مەدەن بەملاو ئەولادا و دەستی لێبەرمەدەن و با لەدەستی پیاوە ئازاكانەوە بێت و لەناو پاسەوان و پارێزەرانیدا بێت، چونكە ئەوانە كە سەبریان بۆ گواستنەوەی هەنگاوەكانیان هەیە ئەوانەن كە

له دەوری ئاڵاكەیان كۆبوونەتەوە و لەناوەندی خۆیان پاراستوویانە لەملاوئەولا و بەرو پشتییەوە، بەجێی ناهێڵن و نایدەن بە دەستەوە و پێشی ناكەون و بە تەنها جێی ناهێڵن، پێویستە هەموو چاری دوژمنە بەرامبەرەكەی بكات و یارمەتی براكەشی بدات، هاوتا بەرامبەرەكەی نەسپێرێ بە براكەی ئەوكات بەدووكەس براكە لەناو دەبەن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەم، سوێندم بەخودا ئەگەر ڕاكەن لە شمشێری ئێستە، لە شمشێری ڕۆژی دوایی ڕزگار نابن، ئێوە لای خۆتان سوار چاكی عەرەبن و لەسەر پشتی بەرزن، ڕاكردن تووڕەیی خودای بەدواوەیە و سەر شۆڕیی هەمیشە و شورەیی هەتاهەتایی، ڕاكردوو تەمەن بۆ خۆی زیاد ناكات و ناكەوێتە بەینی خۆی و ڕۆژی كۆتایی، ئەوەی بەرەو خودا بڕوات وەك تینوو بۆ سەری ئاوە، بەهەشت لە ژێر ڕمی بەرزدایە، ئەمڕۆ ڕۆژی دەركەوتنی دەنگ و باس و ئازایەتییە، قەسەم بەخودا من بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیان وەك ئارەزووی ئەوانە بۆ چوونەوە بۆ ماڵ، خودایە، ئەگەر ئەوانە حەق نەگێڕنەوە بۆ خاوەنەكەی كۆمەڵیان تێكبدەو قسەیان پرش و بڵاو بكە، بەتاوانی خۆیان لەناویان بەرە.

ئەوانە هەرگیز لە هەڵوێستی خۆیان پاشگەز نابنەوە، بەبێ تێسرەوانی یەك لە دوای یەك و زامی دێواندەركە هەوای پێدا بڕوا و گورزی سەرشكێن و ئیسقان وردكار و دەست و قاچ پەڕاندن، هەتا سوپا پێش لە لوتی نەدرێ و یەك بەیەك لێیان بدرێ و تیپ دوای تیپ شوێنیان كەوێ لە بچووكەوە بۆ سەدیی و لە سەدییەوە بۆ هەزاریی و لە هەزارییەوە بۆ سوپای گەورەو سوپای سوارە لە خاكیاندا سمیان بە ئەرزاداو لەدەوروبەری پاكژیان و لەوەڕگەیان جلەویان ڕاگرن.

**( ١٢٥ )**

## وتاری لەبارەی لەڕێ دەرچوان كە ناڕازیی بوون بە حەكەم

ئێمە پیاومان نەكردووە بەحەكەم، حەكەمی ئێمە قورئان بوو، ئەو قورئانەش خەتی شاراوەیە لە دووتوێی بەرگەكەیدا، خۆی قسە ناكات دەبێ بخوێنرێت و مانا بكرێ و پیاو ڕاڤەی بكات. ئەو كاتە ئەو كۆمەڵە ئێمەیان بانگكرد كە قورئان بكەینە حەكەم، ئێمە لەوانە بووین قورئانمان پشتگوێ خستبێ، خودا ئەفەرموا: (هەر

**کاتێکیش لەسەر شتێ لە نێوخۆدا پێك نەهاتن ئەگەر بڕواتان بە خودا هەیەو بە ڕۆژی قیامەت کێشەی خۆتان حەواڵەی خوداو پێغەمبەر بکەن ئەم کارە بۆتان باشترە و ئاکامی چاکتری هەیە)، ئەوجا گەڕانەوەی ئەو کێشەیە بۆ لای خودا ئەوەیە بە گوێی قورئان بکەین و گەڕانەوەی بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە پەیڕەوی کردارو گوفتاری بکەین، ئەگەر بە ڕاستیی بە گوێی قورئان بکرێ ئێمە لە هەموو کەس زیاتر شایستەی ئەم کارەین، ئەگەر پەیڕەوی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بکرێ ئێمە نزیکترین، بەڵام ئەو قسەیەتان کە دەڵێن بۆچی ماوەت دانا بۆ حەکەمەکان؟ ئەوەم بۆیە کرد بۆ ئەوەی نەزان بزانێ و زانا دڵنیا بێت، بەڵکو خودا لەم شەڕوەستانەدا کاری ئەم میللەتە چاك بکات و لەکاتی هەناسەبڕکێدا پەلاماریان نەدرێ، پەلە بکرێ لە دیاریکردنی ڕاستیدا، سەر نەوی بکرێ بۆ یەکەم یاخی بوون، چاکترین کەس ئەوەیە لای خودا کە بەجهێنانی حەقی لا خۆشەویستتر بێ لە باتڵ زیاتر، هەر چەندە خۆشەویستی بۆ حەق خەفەتی بداتێ و باتڵەکە سوودی زیادی هەبێ، ئیتر ئێوە لە کوێ چەواشە کراون؟، لە کوێوە بۆتان هاتووە، دەوەرن با بڕۆین بۆ شەڕی کۆمەڵێك کە سەرلێشێواون و حەق نابینن و بەستەم خەڵەتاون، هەرگیز دەستبەرداری نابن، دوورن لە قورئان، لادەرن لە ڕێگای ڕاست، ئێوە ئەوە نین پشتان پێ ببەسترێ و هاوکارو دۆست نین کە دەست گیربن، ئێوە لەو خراپانەن ئاگری شەڕتان هەڵگیرساندووە، (ئۆف و ئاخ و داخ) لە دەستی ئێوە !، تووشی ناڕەحەتیی و ناخۆشیی بووم لەدەستان، ڕۆژێ بەدەنگی بەرز هاوارتان لێئەکەم و ڕۆژێ بە نزمیی قسەتان بۆ ئەکەم، لە کاتی بانگکردنی بەرزدا ڕاستگۆ نین، لەکاتی نزمیی و چپەدا برا نین و جێگەی متمانەش نین.**

**(١٢٦)**

## وتارێك ئەوکاتە گلەیی لێکرا بۆچی موچەی وەکو یەکدا

**بۆچی ئەتانەوێ فەرمان بکەن بە سەرما کە سەرکەوتن بەستەم لە خەڵك بسێنم لەوکارەی پێم سپێراوە؟ قەسەم بەخوا لەو ستەمە نزیك نابمەوە هەتا لەو سەرزەمینە زیندوویەك هەبێ، هەتا ئەستێرەی دوای ئەستێرە کەوێ، ئەو ماڵە ماڵی خوایە بۆ ئەوانە! ئەوجا وتی: ئاگادار بن بەخشینی مووچە بەناحەق دەست بڵاوییە**

و سەرەڕۆییە، لە دنیا بەرزی ئەکاتەوە و لە قیامەتدا نزمی ئەکاتەوە، لای خەڵك ڕێزدار ئەبێ و لای خودا سووك و ترۆ، هەرکەس ماڵی خودا لە ناحەق و بۆ ناحەق سەرف بکات خودا بێوەری ئەکات لە ستایش و هەمیشە دڵیان بۆ لایەکی ترە، ئەگەر نووکی (سۆل)ەکەی هەڵکەوت و پێویستی بەیارمەتیی بوو لەوانەوە، ئەوانە خراپترین دۆست و بەدترین هاوڕێن.

( ١٢٧ )

## وتارێك لەبارەی دەرچوانەوە

باشە ئەگەر ئێوە سوورن لەسەر ئەوە کە من هەڵەمکردووە و لامداوە، ئەی باشە ئێوە بۆچی سەرجەم ئۆمەتی محەممەد(صلی الله علیە وسلم) لە ڕێ لائەدەن بە لەڕێ لادانی من و سزایان ئەدەن بە هەڵەی من، بە کافریان دادەنێن بەگوناهی من، شمشێرەکانتان لەسەر شانتان داناوە و لەسەر بێتاوان و تاوانبارتان داناوە، گوناهبارو بێگوناهتان تێکەڵاوکردووە، خۆ ئەوەتان زانیوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) سەنگبارانی داوێن پیسی خێزانداری کردووە، لەگەڵ ئەوەش نوێژی لەسەر کردووە و میراتی داوە بەخاوەن میراتەکانی، پیاوکوژی کوشتوەتەوە و میراتی داوە بەسەر میراتبەران، دەستی دزی بڕیوە و داری حەدی داوە لە داوێنپیس، ئەوەی ژنی نەهێنابێ یان شووی نەکردبێ لە (بەیتولمال) بەشی داوە و ژنی موسڵمانی لێمارەکردوون، پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) سزای داون بە گوێرەی گوناهەکەیان و حەقی خودای لەسەر جێبەجێ کردوون و بەشی ئیسلامی لێنەبڕیون و لە بازنەی ئیسلام دەری نەهاویشتوون، ئەوجا ئێوە پیاو خراپ و بەدی خەڵکن، ئێوە لەوانەن شەیتان کارەکانی خۆیتان پێ جێبەجێ ئەکات و لەبیابانی گومرایی بەرەڵڵای کردوون، بەڵام لەبارەی منەوە دووتاقم تێدا دەچن: یەك خۆشەویستی زیاد لە پێویست و بێسنوور کە ئەیبات بۆ ناحەقیی و یەکێکیتر زۆر ڕقی ئەستووری لە منە، ئەو ڕقەش ڕاینەکێشێ بۆ ناحەقیی، باشترین خەڵك ئەوەیە (میانەڕەو) بێت دەربارەی من، ئەو ڕێگەیە بگرێت و هەمیشە لەگەڵ زۆربەی خەڵك بن، هێزی خودا لەگەڵ کۆمەڵە، نەکەن دووبەرەکیی، ئەوەی لەناو کۆمەڵ دەرچێ دەبێتە ماڵی شەیتان، هەروەك مەڕی دوورەڕان ماڵی گورگە، هۆشیاربن هەر کەس ئەم دروشمەی

ئێوەی هەڵگرت لەناوی بەرن، ئەگەر لە ژێر ئەم مێزەرەی من خۆی حەشار دابێ، ئەو دوو حەکەمە بۆیە دانراوە بۆ ئەوەی بە قورئان بمانژێنن و بە شێوەی قورئان بمانمرێنن، ئەوە قورئان بە مردووی داناوە، زیندوو ڕاگرتنی قورئان ئەوەیە لەسەری کۆببینەوە و کاری پێبکەین و مراندنی قورئان ئەوەیە دەستی لێهەڵگیرێ، ئەگەر قورئان ئێمەی ڕاکێشا بۆ لایان ئەوە بێگومان دوایان ئەکەوین، ئەگەر قورئان ئەوانی بۆ لای ئێمە کێشکرد ئەوە دوامان ئەکەون، من نەهاتووم (یاخوا بێ باوك بن)! بۆ زۆر لێکردنتان و خەڵەتاندنتان لە ڕاوبۆچوونەکانتان و چەواشەکاریی و گۆڕینتان لەسەر بکەم، ئێوە خۆتان ڕای هەمووتان ئەوە بوو دوو کەس دیاری بکرێن کە بەڵێنمان لێوەرگرتن لە قورئان لانەدەن، بەڵام ئەوان ڕێگای قورئانیان ونکرد، پشتیانکردە قورئان و حەق و بەچاوی خۆیان حەقیان ئەبینی، ستەم و زۆرداریی ئارەزوویان بوو و لەسەری ڕۆیشتن، لە پێشەوە من ئەو دووکەسەم لابرد لە بوون بەحەکەم و ناوبژیی بەدادپەروەرانە و ڕاوەستان لەسەر ڕاستیی و حەق،(چونکە ئەمزانی بیروڕای ناپەسەندیان هەیە) و بە ناڕاست و بێداد حوکم ئەدەن.

**( ١٢٨ )**

## وتارێك كە پێشبینی داستانی ( بەسرە ) ئەكات

ئەحنەف! وا ئەبینم کە ئەوان (ڕەش پێستەکان)، سوپایان بەڕێکردووە بێ ئەوەی تۆز لە ژێرپێیان بەرز بێتەوە، بێدەنگ و هەراو هاوار، بێ تەقەی لەغاو لەدەمی ئەسپەکان، بێ پرمەی غاردانی وڵاخەکان، بە هێواش بەپێ ڕێ ئەبڕن وەك پێی نەعامە، کاولیی و ویرانەیی بۆ ئەو ڕێگەی ئێوە کە ئەوان بەسەریدا دەڕۆن و بۆ ماڵ و خانووە ڕازاوەکانتان کە لەم لاولایەوە باڵی بۆ کراوە، وەك باڵی هەڵۆ و پلوزگی بۆ دانراوە، وەك (خەرتومی فیل) لە کەسانێکەوە کە بۆ کوژراوو شیوەن ناکەن و بۆ بزر ناگەڕێن، من ئەو دنیایەم داوەتەوە بەڕووی خۆیدا، زاڵ بووم بەسەریدا بە ئەندازەی خۆی و بەچاوی خۆیی بۆی دەڕوانم.

## هەر لەو وتارەیدا وەسفی ( تورك ) ئەکات

لە بەرچاومەو ئەیانبینم نەتەوەیەکن دەموچاو و ڕوویان وەك قەڵغانی چەرم تێگیراوە، بەرگی ئاوریشمی ساف لەبەر ئەکەن، هەمیشە بە شوێن ئەسپ و وڵاخی ڕەسەن و نەجیبدا دەگەڕێن، لەوکاتەدا کوشتارگە گەرم دەبێ، زامدار هەنگاو بەسەر کوژراودا دەنێ، دەربازبوو کەمتر لە دیل.

لەم کاتەدا یەکێ لەیاران وتی: میری باوەڕداران تۆ زانستی شاراوە بەڵەدی!؟ میر زەردەخەنە گرتی و فەرمووی بە کابراکە کە لە خێڵی کەلیب بوو: برای کەلیبی ئەوە زانستی شاراوە و نادیار نییە، ئەوە زانستێکە لە خاوەن زانستەوە وەرمگرتووە، زانستی نادیار ڕۆژی دواییە و ئەوانەیە کە خودا بۆ خۆی هەژماری کردوون، (زانستی ڕۆژی سەڵای خودایە) بارانیش ئەو دەیبارێنێ و دەشزانێ تۆوی زگپڕان چی تێدایە، کەس نازانێ سبەی ڕۆژێ چییە و کەس نازانێ لەکامە سەرزەوی دەمرێ، خودا زاناو ئاگادارە، خودای پاك و بێگەرد ئەزانێ لە منداڵداندا چی هەیە، نێرە، یان مێیە، جوانە، یان ناشیرینە، دەستگوشادە یان ڕژدە، بەهەشتییە یان دۆزەخییە، کێ دەبێتە داری تەڕی ئاگرو کێ لەبەهەشت هاوەڵی پێغەمبەرانە(درودی خوایان لەسەر بێت)، ئەوە زانستی نادیارە کە جگە لە خودا کەس نازانێ، ئەو زانستەیە کە خودا داویەتی بە پێغەمبەر و پێغەمبەریش(صلی الله علیە وسلم) منی فێرکردووە و دوعای بۆ کردووم کە لە سنگمدا جێگیر بێت و بیزانم و لە چوارچێوەی دەفەی پەراسوو و سنگمدا جێگەی بکەمەوە.

( ١٢٩ )

## وتارێك باسی ئامێری پێوانەو کێشانە ئەکات لەکردار

بەندەکانی خودا، ئێوە و ئەوەش کە بەتەمای دەبن لە دنیادا میوانی بە مۆڵەتن، قەرزارن و لەبەردەم دادگادا بەرپرسن، ئەجەل هەمیشە کەم دەکات و کردار هەموو پارێزراوە، زۆر کەس کە هەمیشە لەکارەو دۆڕاوە، زۆر ماندووی کار هەیە زەرەرمەندە، ئێوە ئەو ڕۆژە کەوتوون کە چاکە پشتی هەڵکردووە و خراپە بەرەو ڕوو دێت، شەیتان چاوی بریوەتە تیاچوونتان، ئەم زەمانە ئەوکاتەیە کە شەیتان

هەموو کاتێ ئامادەیە، فێڵ و خەڵەتاندنی گشتگیر بووە و دەستی ڕاگەیشتووە بە نێچیرەکەی، هەتا چاوت بڕ ئەکات بنوارە بۆ خەڵك بزانە جگە لە هەژارێك کە زۆرانبازی لەگەڵ هەژاریدا ئەکات، یان ساماندارێك لە نیعمەتی خودای گۆڕیوەتەوە بە بێباوەڕیی یان ڕەزیلەو دەست قوچاندنی و نەدانی، حەقی خودا نیازی پاشەکەوتی هەیە یان یاخی و بەرەڵایە کەوا ئەزانێ گوێی خۆی ئاخنیوە لە بیستنی ئامۆژگاریدا.

کوا پیاو چاك و چاکە خوازانتان، کوا پیاوە ئازادو دەست گوشادەکانتان؟ کوا خۆپارێزان لە کاسپی و لە حەرام، کوا ئەوانە لە هەڵبژاردنی ڕێبازدا هوشیارانە کاریان ئەکرد؟ ئەرێ ئەوانە هەموو نەڕیشتوون لەم دنیا پەست و بێنرخە، لەو بەلەنگازە خنکێنەرە، ئێوە پاشماوەخۆری پۆخڵەن کە لێو نایەتەوە بەیەکدا لە زەمیدا، لەبەر بێبەهایی، کەواتە ( ئێمەش هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە)، (گەندەکاری ئەم مەردمە لە بەرژەوەندیدا خۆی نواند)، وای لێهاتووە خراپە لا نابرێ و کەس لە خراپە گەڕانەوەی نییە، بەم کردارەتان دەتانەوێ نزیکی بارەگای پیرۆزی خودا بن؟ ئەتانەوێ دۆستی بەڕێزی خودا بن؟.

نەخێر... زۆر دوورە خودا فێڵی لێ ناکرێ لە بەخشینی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا، تەنها بە ئەنجامدانی فەرمان ئەبێ، خودا نەفرەتیکردووە لەوانەی فەرمان بە چاکە دەدەن و خۆیان ئەنجامی نادەن و ئەوانەی (نا) لە خراپە ئەکەن و خۆیان کاری پێئەکەن.

( ١٣٠ )

## وتاری لەگەڵ ( ئەبو زەڕ ) کە دەرکرا بۆ ڕەبزە

ئەی ئەبوزەڕ ! تۆ هەمیشە ڕقت لەبەر خودا بووە، هەر لە خودا داوای پاداشی ڕقی خۆت بکەرەوە، ئەم خەڵکە تۆیان بەمەترسیی داناوە لەسەر دنیاکەیان، تۆش لە دینی خۆت ترساوی لەوان، ئەوەی ئەوان مەترسی لێئەکەن با لەدەستی خۆیاندا بێت، بڕۆ ئەوەی ترست لەوان هەیە دەربازی بکە، ئەوان پێویستیان بەوەی تۆ هەیە، تۆ پێویستت بەوان نییە، بۆت دەرئەکەوێ سبەی کێ قازانج ئەکات و کێ زیاتر

خۆزگەی لێ ئەخوازێ، ئەگەر ئەرزو ئاسمان بکەونە سەر بەندەیەکی بە تەقوا، خودا ڕێگەی دەربازبوونی بۆ دەکاتەوە، تۆ هەمیشە تەنها بە حەق هاوڕێ و هاودەمبە و نەیارو دوژمنی ناحەق، ئەگەر تۆ دنیای ئەوانت بویستایە خۆشیان دەویستی، ئەگەر داوای بەشت بکردایە بێبەش نەدەبووی.

( ١٣١ )

## وتارێك كە بۆچی فەرمانی وەرگرت و باسی پێشەوای ڕاستی ئەكات

ئەی ئەوانەی کە دەروونتان بەیەك نەیارەو دڵتان پرش و بڵاو و بە لەش ئامادەن و بەعەقڵ و ژیریی بزرن، من ئێوەم داوەتە بەر بۆ حەق و ڕاستیی و ئێوە لێی ڕائەکەن بە شێوەی ڕاکردنی بزن لە نەڕەی شێر، زۆر دوورە من بتوانم بە ئێوە دادی شاراوە دەربێنم و کەموکوڕیی و لارو وێریی حەق ڕاست بکەمەوە.

خودایە... تۆ خۆت ئەزانی ئەوەی ئێمە کێبەرکێی دەسەڵات نەبوو بۆ دەسکەوتی زیادەی ماڵی دنیا، بەڵام تەنها بۆ گەڕانەوەی خەڵك بۆ سەر ڕێگەی تۆ بوو، بۆ چاکسازیی لە وڵاتی تۆ بوو، بۆ ئەوە بوو ستەم لێکراوان دڵنیا بن کە ستەم نەبێ و یاسا و دەستورە ڕاگیراوەکان جێبەجێ بکرێ، خودا تۆ ئاگاداری، من یەکەم کەس بووم کە گەڕامەوە و گوێڕایەڵ بووم و وەڵامم دایەوە، تەنها پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە پێشی منەوە بوو بە نوێژ دەستپێکردن.

ئێوە باش ئەزانن نابێ پارێزەری شەرەف و خوێن و دەسکەوت و فەرمانەکان و پێشەوایی باوەڕداران کابرایەکی ڕەزیل و دەست قوچاو بێ و چاو چنۆکیی لەماڵی ئەواندا بکات و نەفام و نەزان بێ و بەڕێگەی گومڕایی بیانبات، لوت بەرزو بەفیز بێ و خۆی دوور بگرێ لەوان، ستەمکار نەبێ لە دابەشکردنی سامان، بۆ هەندێ هەبێ و بۆ هەندێ نەبێ، بەرتیل خۆر نەبێ لە فەرمانددا، حەقی حەقدار نەدات و مافی بەشدار ببڕێ، دەستبەرداری ڕەوشتە بەرزەکان بێت و میللەت بەرەو نەمان ببات.

(١٣٢)

## وتارێك بۆ ئامۆژگاریی و تەركی دنیا

### (ستایشی خودا)

ستایش و سوپاس بۆ خودا کە خۆی ئەیبات و ئەیدات، خۆی ئەیبەخشێ و تاقیش ئەکاتەوە، شارەزای هەموو پەنهانێکە، ئامادەی هەموو نهێنییەکە کە زانایە بە شاراوەی ناو دڵ و ئاگادارە لە چاوی بەد و تاوانبار، بەدڵ باوەڕ و بەزمان گۆیا، کە هیچ خودایەك نییە جگە لە خۆی، محەممەد(صلی الله علیه وسلم) پاڵێوراو و نێرراوی ئەوە بەو بڕیارو شایەتییە نهێنی و ئاشکرایە، وەك یەك دڵ و زمان و هاوراز.

## ئامۆژگاریی

ئەوە بزانن قەسەم بەخوا، ئەوە، تەنها (الله)یە و جددییە و یاری و گەمە نییە!، ئەوە ڕاستەو درۆ نییە، هاکا مەرگ هات و دەنگی دەگاتە هەموو زیندوویەك و عەتابە(گۆرانی) دەڵێ بۆ مردن، نەتخەڵەتێنێ زۆریی و قەرەباڵغیی دەوروبەرت، زۆرت دیووە، پێش خۆت سامان كۆ بکاتەوە و لە کەمیی بترسێ و دڵنیا بێت لەپاشە ڕۆژ بەهۆی درێژیی دڵ بە دنیا بەستنیی و بەدور زانینی ئەجەل، کە چۆن وا باری بەسەریا، مەرگ لە نیشتمان جیای کردەوە و لە شوێنی حەشارگەی بەتوندیی بردی، لەسەرداری مردن ئەم تاقم دەیدەن بەو تاقم بە سەرشان و پەنجە هەڵیدەگرن، ئەوە نابینن ئەوانەی زۆر دوورن هیوا خوازبوون و کۆشك و سەرایان دروستدەکردو زۆریان کۆ ئەکردەوە، ماڵەکانیان بوومتە گۆڕیان و ئەوەی کۆیانکردەوە بێبەربوو، سامانەکەیان بەشی میراتگربوو، ژنەکانیان بووە ماڵی خەڵکیکە، نە چاکەیان بۆ زیاد دەبێ و نە لە خراپە بیانوویان وەردەگیرێ، ئەوەی پارێزگاری دروشمییەتی سەرکەوتووە، دڵی خۆشە و شەوگاری پەسەندە، مۆڵەتی بەهەل بزانن و بۆ بەهەشت کاربکەن، دنیا ماڵی هەمیشە و نیشتەجێ نییە، بەڵکو بۆ گواستنەوە و سەفەرە و لەبەرەو توێشووە بۆ دنیای هەمیشە، زۆر پەلەبکەن بۆ کۆچ و بارەکەتان هۆی گواستنەوەی بۆ ئامادە بکەن.

(١٣٣)

## وتارێك لەگەورەیی خودا و باسی قورئان و پێغەمبەر و ئامۆژگاریی

هەموو دنیاو قیامەت گەردنکەچ و ڕەشۆی خۆیان داوەتە دەست خودا، زەمین و ئاسمان کلیل و کلۆمی خۆیان ناردووەتە لای ئەو، بە ئێوارەو بەیانی داری گەش و لاو سوژدە دەبەنە بەری، ئاگری داگیرساو لەبەریدا زمانەی کێشاوە لەبەر بارەگایدا، بەری تازەپێگەیشتوو لەبەریدا ئامادەی کارگوزارییە، کتێبەکەی خوا لەناو ئێوەدا گۆیاو وتاربێژێکە کە هەرگیز زمانی ماندووبوونی بۆ نییە، ماڵێکە پایەکانی هەرگیز ڕوخانی بۆ نییە، خاوەن شکۆیە کە خزمەتکارەکان و سەربازەکانی زەمین و وشکانییان بۆ نییە، محەممەدی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکراوە لەو کات و ساتانەدا کە ماوەیەك پێغەمبەری بەخۆیەوە نەدیووە، شەڕە زمان و ناکۆکیی گوتارەکان لە پۆپەدا بووە، خودا کردی بە ڕێبواری ڕێبازی گشت پێغەمبەران و خەتمی پەیام و سروشی پێکردو بەکۆتای هێنا، زۆر ماندوو بوو لە پێناوی خودا، بۆ دژایەتیی ئەوانەی پشتیان تێکردو ئەوانەی ڕوویان وەرگێڕا، ئەو دنیایە بە قەدەری توانای چاوێکی کوێرە، لەمدیوی دنیاوە هیچ نابینێ، چاوساغ و چاوتیژ ئەتوانێ لەودیویەوە شت ببینێ، تێئەگا کە لە پشت ئەو دنیایە ماڵێکیکە هەیە، چاوساغ ئەتوانێ بۆی بنوارێ و مژمۆڵ تەنها لێی ورد ئەبێتەوە و بەرچاوی گرتووە، چاوتیژ سەرقاڵی کۆکردنەوەی تێشووی ڕێگەیەو چاوکز شت بۆ دنیا کۆئەکاتەوە، خەڵکینە باش ئاگاداربن، هیچ شتێك نییە کە مرۆڤ تێری لێ نەخواو ماندو و بێزار نەبێ، جگە لەژیان، تەنها ژیانە کە لەمردندا پشوو نادات، خۆ نازانی مردن ئەو جوامێرەیە کە فرەزانیی ئەبەخشێ بەدڵی مردوو، ئەو چاوەگەشەیە بۆ کوێر، ئەو گوێ بیسەرەیە بۆ کەڕ، ئەو ئاوە ساردەیە بۆ تینوو، تەنها سامان لە دوایەو بێوەیی و سەلامەتیی لای ئەوە، کتێبی خودا ڕووناکی چاوتانەو ڕێی پێدەرئەکەن، زمانتان بە ئەو پاراو و گۆیایە و بە ئەو گوێبیستن، خۆی بۆ خۆی ئەدوێ و ڕاڤەی یەکتر ئەکات، بازێکی شایەتیی بۆ بازێکی دەدات، لەزاتی خودا ناکۆکیی ناکات و خاوەن و خوێنەرەکەی لە خودا دوور ناکاتەوە، ئێوە کۆکن لەسەر فێڵ و چەواشەکاریی لە نێوان خۆتاندا، گژوگیا سەوز بووە لەسەر سەنێرگەو پەچەتان و خۆتان تەرخان

کردووە بۆ خەیاڵبازیی و دوژمنکاریی ئەکەن لەپەلاماری ساماندا، شەیتانی بۆگەن بووەتە ئەڤیندارتان و سەرکەشیی و ملهوڕیی ڕێگەی لێونکردوون، تەنها مەگەر خودا هاوکارم بێ لەسەرخۆم و ئێوە.

(١٣٤)

## وتارێك ئەوکاتەی عومەری کوڕی خەتتاب ڕاوێژی پێکرد بۆ هێرشی ڕۆم

خودا پاراستن و بەرزیی ئەم ئاینەی سپاردووە بە ئایندارەکان، بەرز ڕاگرتنی دەسەڵات و پەنادانی شەرمگەی بەوان سپاردوە، ئەوەی یارمەتیدان ئەوکاتەی زۆر کەمبوون و توانای سەرکەوتنیان نەبوو و توانای خۆپاراستنیان نەبوو، ئەو زاتە زیندووە و هەرگیز نامرێ، تۆ! عومەر... ئەگەر بڕۆیتە سەری ئەم دوژمنە بەخۆت لەگەڵ سوپا کەمت و ڕوو بەڕوو بیت لەگەڵیان و شکست بێنی موسڵمانان پایتەختی نابێ، کە لە دووریی وڵاتەکەیان خۆیانی تێدا حەشاردەن، لەپاش تۆش دەزگایەکی ناوەندیی نامێنێ خەڵك پرس و ڕای پێبکەن، کەواتە خۆت مەڕۆ، سەرکردەیەکی بە ئەزموون بینێرە و کۆمەڵە کەسێکی بەتواناو ڕاوێژکار و کارکردەی لەگەڵ بنێرە، ئەگەر خودا سەرکەوتنی بەخشی ئەوە ئەو مەبەستەیە، کە تۆدەتەوێ و داخوازی ئەکەی، خۆ ئەگەر جۆرێ تر بوو، تۆ ئەبیتە پشتیوان و سەنگەری پشتەوەی خەڵك و پاشەکشەو کشانەوەی موسڵمانان.

(١٣٥)

## وتارێکی کاتێ کە لە نێوان ئەم و عوسماندا دەمەقاڵە ڕوویدا

موغەیرەی کوڕی ئەخنەس وتی بە عوسمان: وازی لێ بێنە بۆ من، پێشەوا فەرمووی: (هەتوی نەفرەت لێکراو و بێ وەجاخ)*، داری بێڕەنگ و بن و لق و پۆپ، تۆ بۆ من بەسی و چارم ئەکەی؟ دەی قەسەم بە خوا، هەرگیز خودا یارمەتی کەسێ نادات تۆ هاوکاریی بیت، ئەوەی تۆ ڕاستی دەکەیتەوە هەرگیز بە پێوە ناوەستێ،

پەرکەوە بۆ دەرەوە، یاخوا هەمیشە ماڵ و فەساڵت دوور بکات، بڕۆ هەوڵی خۆت بدە، خودا لە ناوتبەرێ و هەرگیز خوا ماوەت نادات.

★ هەرچەندە پێغەمبەری پێشەوا دەفەرموێ:( لیس المؤمن بگعان و لالعان) بەلاّم ئێمە وتەکەی خۆیمان کردووە بەکوردی.

( ١٣٦ )

## وتارێك لەبارەی پەیمان پێدانەوە

پەیماندانتان بەمن لە دەستدەرچوون نەبوو، کاری من و کاری ئێوە یەك نییە، من ئێوەم بۆیە ئەوێ بۆ خوداو ئێوە منتان ئەوێ بۆ خۆتان، کەواتە خەڵکینە هاوکاریم بکەن لەبارەی خۆتانەوە، سوێندم بەخودا، ئەچم بۆ یارمەتیی زۆرلێکراو، ستەمکاریش لەغاو ئەکەمە کونەلوتی و ڕایدەکێشم، هەتا دەیبەمە سەرکانیی حەق و هەرچەندە پێی ناخۆش بێت.

( ١٣٧ )

## وتارێك لەبارەی تەڵحە و زوبەیرەوە

قەسەم بەخودا، لەسەر من بەدیی و خراپەیان بەدی نەکردووە، لە نێوان من و خۆیان بە ئینساف و دادپەروەر نەبوون، بەلای خۆیانەوە داوای حەقێك ئەکەن کە خۆیان دەستیان لێگرتووە و داوای خوێنێك ئەکەن کە خۆیان ڕژاندوویانە، ئەگەر من گریمان هاوبەشبم ئەوان پشکی گەورەیان لەسەرە، کە ئەوان کردیانە خەلیفە لە دژی من، ئەوە حەق وایە داوای تۆڵە و خوێنەکەی لەوان بکرێ، پاداشی یەکەم دایان لەو حوکمە ئەبێ لەسەر ئەوان بێ، من خۆم بەرچاو ڕوونم، نەگزیی و فێڵم کردووە و نەگزیی و فیڵم لێئەکرێ، ئۆباڵی لە ئەستۆی ئەو تاقمە یاخیبوومیە کە لەناویاندا خزم و خەسوو و چزی ئەوانە و گومانێکی بێ بن و بێ سەروبەرە، ئەو کارە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، باتڵ و ناحەق پەردەی داداوە بەسەر بناغەکەیدا و زمانی ئاژاوەی بڕاوە و لەبن دەرهاتووە، قەسەم بەخودا، گۆمەکەیان بۆ پڕ ئەکەم لەئاو و خۆم لەو گۆمەدا ئاویان ئەدەم، دەبێ ماوە نەدەم بە تێرئاویی لەوگۆمە بترازێن، دەبێ قومێ ئاوی چاڵاو نەخۆنەوە بە ئیسراحەت.

## دووبارە لە بارەی پەیمانپێدان

ئێوە هەمووتان ڕووتان لە من کردووە، ئاسك و وشتری تازەزاو لەسەر بێچوەکەی، هاوارتان ئەکرد، دەی پەلەکە لەوەرگرتنی پەیمان، من دەستم نەدا بەزۆر دەستی منتان کردەوە، من دەستم نەدا ئێوە بەزۆر دەستمتان درێژکرد، خودایە، خۆت ئاگاداری، ئەم دوو کەسەیە لە من تۆراون و ستەم لە من ئەکەن و پەیمانشکێن بوون و هانی خەڵك دەدەن لە دژی من، کەواتە خودا، ئەو پەیمانەیان خاو بکەرەوە و ئەو بڕیارە کە داویانە بە تاڵی بکەرەوە، چی ناخۆشە نیشانیان بدە و بە ئاوات نەگەن، کاتی خۆی زۆرم هەوڵدا پێش کوشتار کە پەشیمانیان بکەمەوە و خاوەخاوم کرد پێش شەڕ، بەڵکو پاشەکشە بکەن، بەڵام ئەوان سپڵە بوون بەرامبەر بە نیعمەت و دەستیاننا بە بێوەیی و سەلامەتییەوە.

( ١٣٨ )

## وتارێك کە ئاماژە ئەکات بەداستانی جەنگ

ڕۆژێ دێت کەسێ پەیدا ئەبێ کە ڕێگەی ڕاست سەرئەخا بەسەر ڕێگەی هەواو نەفسدا، ئەو ڕۆژەی کە خەڵك هەواو ئارەزووی زاڵبووە بەسەر ڕێگەی ڕاستدا هەموو ڕایەك ئەگەڕێتەوە بۆ قورئان، لە کاتێکدا ئەوان ڕایان زاڵکردووە بەسەر قورئاندا.

جەنگ و شەڕ لەسەر لاقی ڕادەوەستێ، کەڵبەکانی دەرئەخا، گوانەکانی پڕکردووە لە شیری شەڕ، زۆر شیرین و بەتامە لەسەرەتاوە، بەڵام گوژاڵکەو تاڵە لەکۆتاییدا، ئاگادار بن سبەی، سبەی دێت، بێ ئەوەی ئێوە بزانن، ئەوێ ڕۆژێ سەرکردە سزای هەموو شەڕکەرەکان دەدات، لەسەر کارە خراپەکانیان، ئەوێ ڕۆژێ زەوی لەهەناویدا هەموو زێڕو زیوی بۆ دەخاتە دەرەوە، زۆر بە ئاسانیی جڵەوی خۆ دەداتە دەستی، ئەوکاتە بۆتان دەرئەکەوێ ڕێگەی دادپەروەریی چ جۆرە، ئەبینم ئەوەی ئاژاوەگێڕە وەك قەلەڕەشە قیراندی لە شامدا، ئاڵاکانی لەدەوروبەری کوفەدا داکوتا، بەوێنەی حوشتری بەدخو و شیرنەدەر، لای کردەوە بەلاتانا و زەوی بەکەللەسەر ڕاخست، قەپۆزی بڵاوکردووەتەوە، زۆرو ستەمی لەسەر زەوی قورس

بووە، گەرانی درێژ خایەن و پەلاماری زۆر سەخت و گەورە، سوێندم بەخودا، ئاوارەتان ئەکات بەملاو ئەو لای زەویدا، بە رادەیەك کە کەمتان دەمێنن وەك کلی ناوچاو، ئەم حاڵەتە بەردەوامە هەتا عەرەب زیریی و عەقڵی لە غەریبیی دەگرێتەوە، ئێوەش دەست بگرن بەرەو شتە باشەکان و دیاردە روونەکان و ئەو بەڵێن و پەیمانانەی کە ئاسەواری پێغەمبەرایەتیی(صلی الله علیە وسلم) پێومیە، ئەوەش بزانن کە شەیتان بۆیە رێگەتان بۆ تەخت ئەکات بۆ ئەوەی دوای بکەون.

( ١٣٩ )

## وتارێك لەکاتی راوێژدا

کەس لە پێش منەوە نەچووە بەدەم حەقەوە، بۆ پەیوەندیی بە خزمەوە، بۆ دەست گوشادیی و بەخشندەیی، گوێ بگرن لە وتارەکانم، باش تێبگەن لە راو بۆچوونەکانم، زۆر نزیکە ئەم کارە، دوای ئەمرۆ ببینن کە شمشێر لە کێلان دەربێت و پەیمانشکێنیی دەست پێبکات و بازێکتان ببنە رابەری گومرایی و لادان و ببنە یاری نەفامیی.

( ١٤٠ )

## وتارێك کە نەهیی لە هەڵدانەوەی عەیبی خەڵك دەکات

زۆر پێویستە لەسەر خەڵکی گوناهبار و ئەوانەی پارێزراون لە گوناه کە بەزەییان بێتەوە بە خەڵکی گوناهباردا، هەمیشە سوپاس و ستایشی خودا بکەن کە پەردە لە نێوان ئەمان و ئەواندا هەیە، چۆن ئەبێ عەیب و عار لە براکەت بگری و تانەو تەشەری لێبدەی، ئەوە بۆ باسی شاردنەوەی خودا ناکات لەسەر گوناهی گەورەتر کە کردوویەتی و لە گوناهی ئەم کەسەی کەسەرزەنشتی ئەکات گەورەتر بووە، بۆچی عەیب و عاری گوناهێ ئەگرێ کە خۆی نموونەی کردووە، خۆ ئەگەر لە شێوەی گوناهی ئەوی نەکردووە گوناهی گەورەتری کردووە، قەسەم بەخوا، ئەگەر گوناهی گەورە و گوناهی گچکەی نەکردبێ، هەڵدانەوەی عەیبی خەڵك زۆر لەوە گەورەترە.

بەندەی خودا !، پەلە مەکە لە عەیبدارکردنی کەس بە گوناح، چونکە بەڵکو لێی بوراو بێت و ئاگاداری خۆتبە لەگوناهی بچووك، چونکە پێدەچێت لەسەری سزا بدرێیت، بەسە با وازبێنێ لە عەیب و عاری خەڵك، کە عەیب و عاری خۆی شارەزایە، با سوپاسی خودا بکات کە پارێزراوە لەم جۆرە گوناهە.

( ١٤١ )

## وتاری گوێگرتن لە پاشملە

خەڵکینە.. ئەگەر شارەزا بوون لە پتەویی ئایین و گرتنی ڕێگەی ڕاست لە براکەتان، ئیترگوێڕایەڵ مەبن لەقسەو قسەلۆکی خەڵك، ئەوە بزانن زۆر تیردەهاوێژن و نیشانە ناپێکێ و قسە هەڵدەبەستێ و لە ڕاستیدا درۆیە، خودا شنەواو ئاگادارە، نێوان ڕاست و ناڕاست چوار پەنجەیە، پرسیارکرا لە پێشەوا: مانای چییە ئەم چوار پەنجەیە؟ پەنجەکانی نا بەسەر گوێی و چاوی و فەرمووی: باتڵ ئەوەیە کە دەڵێت بیستم و حەق و ڕاستیی ئەوەیە دەڵێ بینیم.

( ١٤٢ )

## وتارێك لەبارەی چاکە لەگەڵ نائەهلدا

ئەو کەسەی چاکە ئەکات لەگەڵ نائەهلدا بە ناحەق هیچ پاداشتی نییە لەو کردارەی مەگەر سوپاسی ناپیاوان و ناکەسان و وشەی نەفامان، هەتا ئەوکاتەی بەردەوامە لە چاکەکە، تەماشا بکەن چەند سەخییە و دەستگوشاوە و لای خودا بەرەزیل و ڕژد ناسراوە، هەرکەس خودا سامانێکی پێ ببەخشێ با خزم و نزیکانی پێ بەسەر بکاتەوە، با میوانداریی پێ بکات، با دیلی پێ ڕزگار بکات، قەرزاریی پێ سەرفراز بکات، بەشی هەژارو زیان لێکەوتوان بدات، خۆی ڕاگرێ لەبەردەم ڕووداوی ناخۆشداو مافی کەس پێشێل نەکات، ئەم جۆرە ڕەوشتە بۆ هەرکەس بێت گەورەیی ئەم دنیاوگەیشتنی بەچاکەی ئەو دنیایە، خودا یار بێ و بیکات.

(١٤٣)

## وتارێك بۆ داوا كردنی باران

ئاگادار بن ! زەوی كە هەڵیگرتوون و ئاسمان كە سێبەری بۆ كردوون، دوو بەندەی گوێڕایەڵی پەروەردگاری خۆیانن، وە نەبێ كە سەخاوەت ئەنوێنن بۆ ئێوە و خێروبێرتان بەسەردا دەبارێنن، شیوەنی ئێوە بكەن و بۆ خۆنزیككردنەوە لە ئێوە كار بكەن، بەتەمای پاداش و خەڵاتی ئێوە نین، بەڵام فەرمانیان پێدراوە بۆ سوودو قازانجی ئێوە و ئەوانیش فەرمان بەجێ دێنن و پێیان ڕاگەیانراوە كە بەرژەوەندبی ئێوە جێبەجێ بكەن، ئەوانیش پێی ڕابوون، خودا بەندەكانی خۆی لەكاتی كاری نابەجێدا تووش دەكات بە جۆرە دەرد و كەمیی بەروبووم و گرتنەوەی خێروبێرو داخستنی دەرگای گەنجینەكانی، تەنها لەبەر ئەوەی خەڵك بگەڕێتەوە و دەستبەرداری ناپاكیی بێت و بیرو هۆشی بكاتەوە و كۆ لە خراپە بكات و بگەڕێتەوە بۆ چاكە.

خودای پاك و بێگەرد پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونی كردووەتە هۆكاری ڕژاندنی بەزەیی و ڕۆزی بەسەر خەڵكدا، فەرمویەتی: (هەر پێم گوتن داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، ئەو بێ گومان زۆر لێبوردەیە، تا لە حەواوە بارانێكی پەڵەدەرتان بۆ بنێرێ) دەسا خودا بەزەیی بێتەوە بەو بەندەی كە پەشیمانیی و گەڕانەوە پێش خۆی ئەخات و دەستهەڵگرە لە تاوان و چاوەڕوانی مەرگە.

دەی سا خودایە... ئێمە بۆلای تۆ هاتوین، لە ژێركەپرو كولانەو هێلانە و لەگەڵ قۆڕەو بارەی بێ زمانەكان و كۆرپە شیرەخۆرەكان داوای ڕەحمەتی تۆ ئەكەین و بەتەمای زیادە نیعمەتی تۆین و ترساوین لە ئێش و ئازارو ڕقی تۆ.

خودایە، كەواتە تێر ئاومان بكە بە بارانی فریادرەسی خۆت و هەرگیز لە نائومێدانمان حیساب مەكە و بەگرانیی و قاتیی و قڕیی لەناومان مەبە، بە كردەوەی نەفام و بێ ئەقڵەكانمان سزا مەدە، تۆ لە لەهەموو خاوەن بەزەییەك بە بەزەیی تری، خودایە داوا دەكەین بە نائومێدیی نەگەڕێینەوە، بۆ لای تۆ هاتوین و سكاڵامان بۆ لای تۆ هێناوە و هیچ شتێك لە تۆ پەنهان نییە، ئەو كاتەی شیوو دۆڵە تەنگەبەرەكان و سەختەكان ئێمەیان پاڵناوە، گرانیی و وشكەساڵیی و بێ بارانیی

ئێمەی نارەحەت کردووە و داواکارییەکانمان بەسەختیی دورە لە جێبەجێ کردنـەوە، ئاژاوە و ژاوەژاوەکان چنگیان بەسەختیی لەسەرمان گیرکردووە.

خودایە، دەست بەڕوومانـەوە مـەنێ، بەدڵشکاویی و خەفەتـەوە بـەڕێمان مەکـە، بـەتاوان و گونـاحی خۆمـان قـسەمان لەگـەڵ مەکـە و بەکێـشانەی کردەوەکانمـان مامەڵەمان لەگەڵ مەکە، خوایە بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنـە، بەرەکـەت و ڕۆزیـی و بـەزەیی لەگـەڵ بێـت، ئـەو بارانــە سـوودبەخش و ئـاودێرو گیاشـینکەربێ، ئـەوەی وشکبووە زینـدووی بکاتەوە، ئەوەی لەناو چووە بیبوژێنێتەوە، هـەرزانیی و گوشـادیی پێبێت، پڕ لەبەروبووم بێت، شیوو چەم و دۆڵەکان ئـاو بـدات و لافاوی بەسوود لـە نزمیـی و نـشێوەکان سـەراو بکـات، درەختـەکان گـەڵا پێبکـات، هـەرزانیی بـدات بـە نرخەکان، تەنها تۆ خودایە لەسەر هەموو شت بەتوانای.

**( ١٤٤ )**

## وتـارێك لەبـارەی ڕەوانە كردنی پێغەمبەران

## ( درودو سلاوی خوایان لەسەر بێت )

خـودا پێغەمبــەرانی ڕەوانــە کــردووە بەتایبەتمەنــدیی پــەیام و ســروش بـۆ دیاریکردنی بەڵگەو شایەتیی بەسەر خەڵکەوە، بۆ ئـەوەی نـەتوانن بیـانوو بهێننـەوە بە نەبوونی بەڵگە، بانگی کردوون بە زمانی ڕاستگۆیان بۆ ڕێگای ڕاست و حـەق، زۆر هوشیار بن خوا ئاگاداری دروستکراوی خۆیەتی لە هەموو ڕوویەکەوە، هەرگیز نائاگا نییە لە شاراوەی نهێنیەکانیان و پەنهانیی ناو سنگیان، تـەنها بـۆ تاقیکردنەوەیـە کـە بزانـێ کامیـان کـرداری جوانـەو پاداشـی بەچاکە بداتـەوە و کامیـان کـرداری خراپـە بەتۆڵە سزای بداتەوە.

ئەوانە لە کوێن کە گومانیان هەبوو لە ئێمە زیاتر شارەزان ئەوەش بەدرۆ یاخی بوون لەسەر ئێمـە، کـە خـوا ئێمـەی بـەرز کردووەتـەوە و ئـەوانی نـزم کردووەتـەوە، ئێمــەی بەشــدار کــردووە و ئــەوانی بێبــەش و ئێمــەی لــەناوەوە دانــاوە و ئــەوانی لـەدەرەوە، بـەهۆی ئێمـەوە ڕێگـە ڕووندەکرێتـەوە، ئێمـە دەسـتی کوێرەکـان دەگـرین، پێشەوایان لە قورەیشەو لەناو ئەم لقەی هاشمدا نێژراوە، شایستەی کەسی تـر نییـە و ڕابەر لە غەیری ئەوان نابێ.

پیاوخراپ و گومڕاكان پەلاماری نزیكەكانیان داوە، وازیان هێنـاوە لـە دوورەكـان، ئاوی پاك و ڕوون ناخۆن، ئاوی شلێو دەخۆنەوە، مـن چـاوم لـە پیاوخـراپەكەیانـە كـە خۆی كردووە بە هاوڕێی نادروست و هۆگری بووە، خـوی گرتـووە بـە ناپەسـەندیی و لەگەڵی هاولفە هەتا لاجاینگی سپی بووە، لەسەر خراپە بەڕەنگی ناپەسەندیی خـۆی گۆڕیوە، ئەوەی كە پەلامار ئەدا وەك شەپۆل كێ ئـەخنكێ مەبەسـتی نییـە، یـان وەك ئاگر چی ئەسوتێنێ ناپرسێ، كوا ئەو عاقڵ و ژیرانە كە چرای ڕووناكیان بەدەستەوە بوو، كوا ئەو چاوساغانە كە هەمیشە چاویان لـە تیـشكی خۆپـارێزیی بـوو؟ كـوا ئـەو دڵانە كە خۆیان بەخودا بەخشیبوو پەیمان و بەڵێنیان بەخودا دابوو بۆ ئەنجامـدانی فەرمانەكانی؟ كۆبوونەتەوە لە سـەركەلاكی دنیـا و كێبـەركێ ئەكـەن لەسـەر حـەرام، خـوا بانگیـان دەكـات و ئـاڵای بەهەشـت و دۆزەخیـان نیـشان دراوە و ڕوو لەبەهەشـت وەردەگێـڕن و ڕوو دەكەنـە دۆزەخ و ئـاگر، بـانگ دەكـرێن لـە لایـەن پـەروەردگارەوە پشتی تێئەكەن و شەیتان گازیان دەكات بەدەنگییەوە دەچن و بەگوێی دەكەن.

( ١٤٥ )

## وتـارێك لەبـارەی تیـاچوونی ئەم دنیایەوە

خەڵكینە.. ئەزانن ئێوە كراون بە نیشانە لـەم دنیایـە بـۆ تـیری مـەرگ و مـردن، لەگـەڵ هـەموو مـژەنایێك، لێهەڵكـەوتن هەیـە و لەگـەڵ هـەموو پارووییـەك گەرووگیرانێك هەیە، لەگەڵ هەر خۆشیی و نازێك، نـازو نیعمـەتێك لەدەست دەدەن، لەگەڵ هەر درێژیی تەمەنێك، تەمەنێك دەڕوخێ و لار دەبێتەوە هـەر زیادەیـەك لـە ڕزق و ڕۆزیـی ئـەوەی پێـشووی لەدەسـت دەردەچـێ، ئاسـەوارێك پەیـدا ناكـات هـەتا ئاسەوارێكی لەكیس نەچێ، تازەیەكی بۆ پەیدا نابێ هەتا تازەیەك كۆن نـەكات، هـەر بنجە گیایەكی بۆ شین نـابێ هـەتا شـارایەكی لەدەسـت نـەڕوا، پێـشینەكان ڕۆیـشتن و ئێمە لق و پۆپین، كـە ڕیـشك و سـاقی درەخـت نـەما لـق چـۆن دەمـێنێ؟ هـەركارێكی نەوباو دادێت سـوننەتێكی پـێ لـەناو دەبـرێ، كەواتـە خـۆ بپـارێزن لـەكاری نـەوباوی خراپ، ڕێگەی ڕوون و ڕاست بگرن، ڕەوشـتە ڕەسـەنە پێشینەكان زۆر چاكترەو كـارە نەوباوەكان زۆر گەن و خراپن.

( ١٤٦ )

## وتارێك كه عومەری كوڕی خەتتاب ڕاوێژی پێكرد كه خۆی بڕوات بۆ جەنگی فارس

ئەم كارو فەرمانە نەسەركەوتنی و نە ژێركەوتنی بەزۆریی و كەمیی نەبووە، ئەوە ئاینی خودایە كە خۆی ئاشكرای كردووە، خۆی سەربازی بۆ درووست كردووە و ئامادەی كردووە، فریادی كەوتووە هەتا گەیشتووەتە ئەو جێگەی پێی گەیشتووە، پێشڕەویی كردووە بۆ ئەو جێگەی پێشڕەویی بۆ كردووە، ئێمە چاوەڕێی بەڵێنی خوادایین، خوا خۆی بەڵێنی خۆی جێبەجێ دەكات و یارمەتیی سەربازانی خۆی ئەدات، جێگەو شوێنی ڕابەرو سەركردە وەك شوێنی بەن و كشتەكی مووروووە كە بەیەكەوەیان دەبەستێتەوە و نایەڵێ پرش و بڵاو بن، ئەگەر پەتەكە پچڕا هەموو دانە موورووەكان بڵاو دەبنەوە، هەتا هەتایە كۆنابنەوە، عەرەب ئەمڕۆ هەرچەند زۆر كەمن بەڵام بەهۆی ئیسلامەوە زۆرن بە یەكگرتوویی سەربەرزن، كەواتە جەنابت دەبێ تەوەری كورەگە بیت و ئاشی عەرەب بەهۆی تۆوە دەگەڕێ، بە بۆچوونی خۆت ڕەوانەی جەنگیان بكە، ئەگەر خۆت بڕۆیت و لەم مەرزوبوومە دەرچیت، عەرەبە بەدووەكان پەیمان دەشكێنن لە دەوروبەرت، هەتا وای لێدێت ئەوەی لەدەستت دەچێ زۆرترە لەوەی وەدەستی دەهێنی، عەرەبەكان ئەگەر تۆیان بینی سبەی دەڵێن: ئەوە ڕەگی عەرەبە، ئەگەر بڕیتان ئەكەونە ئیسراحەتەوە، ئەوێ كاتێ زۆر هاروهاج دەبن و پەلاماریان خەست و چڕ ئەكەنەوە، دەربارەی ئەوەی كە دەڵێت ئەوانە دەرچون بۆ شەڕی موسڵمانان، بێگومان بە خوا زیاتر لەبەری گرانە بۆ هاتنیان و خوا خۆی بە تواناترە بۆ بەرپەرچدانەوەیان، وە دەربارەی ژمارەیان، خۆ ئێمە كاتی خۆی شەڕمان بە زۆری ژمارە نەكردووە، ئێمە هەمیشە جەنگمان بەیارمەتیدان و هاوكاریی بردووەتەوە.

( ١٤٧ )

## وتـارێك لەبـارەی مەبەستی ناردنی پێغەمبەران
## ( درودو سلاوی خوایان لەسەر بێت )

خوا محەممەد (صلی الله علیه وسلم)ی ناردووە بەحەق و بەڕاستیی، بۆ ئەوەی بەنـدەکانی لـە بەندایـەتیی بتەکانـەوە بـۆ بەندایـەتیی خـۆی و لـە فەرمانبـەرداریی شەیتانەوە بۆ فەرمانبەراریی خۆی، ئەوەش بەو قورئانە کە بـەڕوونیی و جوانیی و پتەویی ناردوویەتی بۆ ئـەوەی خـەڵك خـودا بناسـن و لەنـەفامیی ڕزگـاربن، بـاوەڕی پێبێنن، پاش ئەوەی بێباوەڕ بوون، دانـی پێـدا بنـێن، پـاش ئـەوە لارییـان هـەبوو لـە هـەبوونیی، خوایـان بـۆ دەرکـەوت لـە قورئانـدا بـەبێ ئـەوەی ببیـنن، چـونکە خـوا دەسەڵاتی خۆی بۆ دەرخستن و ترسی لەبەرنان لە توانـاو هێزی خۆی کە چۆن تۆڵەو سزای بێبـاوەڕانی داوە و چـۆن دروێنـەی ئەوانـەی دژایـەتی کـردووە ئەنجامـدا، حـەز ئەکەم ئەوەش بـزانن دوای مـن ڕۆژێ دێـت هـیچ شـتێ لـە ڕاسـتیی شـاراوەتر نییـە و هیچ شتێ لە ناڕاست دەرکەوتووتر نییـە، ئـەوێ ڕۆژێ درۆ بـەدەمی پێغەمبـەر(صلی الله علیه وسلم) و خـوداوە زۆرە، لای خـەڵکی ئـەو زەمانـە هـیچ ماوەیـەك ئەوەنـدەی خوێندنی قورئان بەڕاستیی و پاکیی بێبازاڕ نییە، بەڵام ئەگەر دەستکاری کراو گۆڕا، ئـەوە زۆر لەبرەودایـە و بـازاڕی گەرمـە، لـە وڵاتـدا چاکە نامۆیـە و نـامۆ پەسـەندە، هـەڵگرانی قورئـان وازی لێـدێنن و ئەوانـەی لەبەریانـە لـە بـیری خۆیـانی دەبەنـەوە، قورئـان لـە ڕۆژی وادا هـەوادارانی هەمیـشە دەرکـراو ڕاکـراون، ئـەم دوو هاوڕێیـە لـە ڕێگەیانـدا بێجێگـەو بێـشوێنن، کـەس لـە گـەڵیان نییـە و ئـەوانیش لەناویانـدا نـین، چونکە گومڕا و شـارەزای ڕێگا پێکەوە نـازین، خـەڵك حـەزیان لـە ناکۆکییـە و دژی تەبایی و هاودەمیی و هاوڕایین، خۆیان کردووە بە ڕابەری قورئان، وەك ئەوە قورئان ڕابەری ئەوان نەبێ، قورئان تەنها ناوی ماوە، تـەنها خـەت و نوسـینەکەی شـارەزان و ئاگـاداری ئـەو هـەموو پەنـدو ئامۆژگارییانـە نـابن کـە بەسـەر پیاوچـاکاندا هـاتووە، ڕاستیان بەدرۆ دەزانن و چاکەیان بەخراپە، ئـەو خەڵکەی کـە تیاداچوون لـە پـێش ئێوە بە هـۆی خـەیاڵی بـەتاڵ و ئـاواتی دورو درێـژو لـە بیرچوونەوەی ئەجـەلیان تـا ئەوکاتـەی بەڵێنەکـە دەگاتـە سـەریان و بیانویـان ئـەبڕێ و پەشـیمانیی لادەبـرێ،

كارەساتی دەمشكێن و بەئازار دەبێتە میوانیان.

## ئامۆژگاریی

خەڵكینە.. هەر كەس دڵسۆزیی بۆ خودا هەبوو سەركەوتووە، هەركەس فەرمایشی ئەوی كردە رابەرو رێنیشاندەر كە بێگومان ئەم قورئانە رێگایەك نیشان دەدات لەگشت رێیان سەرراستترە، هاوسێی خودا بێخەمە، دوژمنی، دەروونی پڕ لە ترسە، ئەوەی گەورەیی خودا بزانێ نابێ خۆی بەگەورە دانێ، گەورەیی ئەوانەی گەورەیی خوا دەزانن لەوەدایە كە كەمنەفس و بێفیزن و هێمن و ئارامن، ئەوانەی كە توانای خودا دەزانن ئەوانەن كە گەردنكەچ بن بۆ خودا، رامەكەن لە حەق وەك راكردنی ساغ لە گەڕۆڵ و سالم لە دەردەدار، ئەمە بزانن ئێوە شارەزای رێگە نابن هەتا نەزانن كێ لایداوە و ناتوانن دەست بگرن بە پەیمانی خوا و قورئانەوە هەتا ئەوە نەناسن كە هەڵیوەشاندووەتەوە، ناتوانن بەدەستی بێنن هەتا ئەوەی وازی لێهێناوە نەیناسن، ئەوەش لای خاوەنی خۆی هەیە، ئەوانە بەزانست دەژین و بۆ نەمانی نەفامیی كار ئەكەن، ئەوان لەو گفتەیان زانستیانتان بۆ دەرئەكەوێ، لەبێدەنگی ئەوان بلیمەتیی و داناییتان بۆ دەرئەكەوێ و بەكاری ئاشكرایان كاری شاراوەتان بۆ دەرئەكەوێ، هەرگیز پێچەوانەی ئاین نابن و ناكۆكیی ناكەن تێیدا، ئەو قورئانە شایەتێكی راستگۆو بێدەنگێكی گۆیایە.

( ١٤٨ )

## وتارێك لەبارەی بەسرە و تەڵحە و زوبەیرەوە

ئەم دوانە هەر یەكەیان بەتەمایە ئەم كارە بۆ خۆی بێ و سۆزی تەنها بۆ خۆیەتی، نەوەك بۆ هاوەڵەكەی، بە هیچ پەت و گوریسێك نەبەستراوە بەخوداوە و پەلیان بۆ لای خودا رانەكێشاوە، هەر یەكەیان پینەو كینەی هەڵگرتووە بۆ هاورێكەی، پاش ماوەیەكی زۆر كەم پەردە لەسەر روویان لادەبرێ، هەرخۆیان بەخۆیان بن، سوێندم بەخودا ئەگەر ئەم كارەیان دەست بەسەراگرت هەریەكەیان هەوڵ ئەدا گیانی ئەوی كەیان دەربهێنێ، ئەم پەلاماری ئەو ئەدات و بەگژ یەكدا

**ئەچن.★**

**ئەوەتا تاقمە یاخیی و لە ڕێ دەرچووەکە پەیدا بووە و لەسەر پێی ڕاوەستاوە، لە کوێن جیهادگەران و بۆ خوا خۆبەختکەران؟ بەرنامەیان بۆ دانراوە و ڕاوێژیان بۆ ڕاگیراوە، هەموو ونبوون و لە ڕێ لادانێك هۆکاری هەیە و هەموو پەیمانشکێنێك بەڵگەو دەلیلی خۆی هەیە، منیش قەسەم بەخوا، گوێبیستی سنگکوتان و رووڕنین و شیوەنی بالۆرەبێژان نابم، کە تەنها گوێ لە شیوەن و زاری بگرم و ئامادەی گریان بم و پەندو ئامۆژگاریی وەرنەگرم.**

**★ پێشەوا لە جەنگدا بووە لەگەڵ ئەم دوو کەسەی کە لە بارەیانەوە ئەم وتارەی وتووە، لەبەر ئەوە پەسەندە هەرچییان پێ بلێ چونکە بە بۆچوونی پێشەوا ئەمانە بەعەتیان شکاندووە.**

**(١٤٩)**

## وتاریٚ پیٚش شەهید بوونی

**خەڵکینە.. هەموو مرۆڤێك ئەبێ بگا بەو شتەی لێی هەڵهاتووە، ئەجەل ڕێگەی هەموو هەناسەدەرێکە، ڕاکردن لێی بە پیرەوە چونیەتی، زۆر ڕۆژم دەست پێوەناوە، دەگەڕام کە شاراوەی ئەم کارەم بۆ دەرکەوێ، بەڵام خودا ویستی وابوو هەر شاراوە بێت، ئای کە دوورە! زانستێکی ناوگەنجینەیەو پەنهانە!.**

**ڕاسپاردەم بۆ ئێوە ئەوەیە هاوشان و هاوبەش بۆ خودا دانەنێن، ڕەفتار و گوفتارەکانی محەممەد(صلی الله علیه وسلم) ون مەکەن، تەنها ئەم دووپایە ڕاست ڕاگرن، ئەم دوو چرایە داگیرسێنن، بێ زەم و عەیب و عار دەبن ئەگەر لەحەق لانەدەن، دەبا هەر کەس بەتوانای خۆی کار بکات، بار لەسەر نەفام سووك بکەن، خودایەکی بەزەیی، ئاینێکی درووست، پێشەوایەکی زانا ! من ڕۆژێ ڕابردوو خاوەنی ئێوە بووم، ئەمڕۆ کەوتووم و پەندم بۆ ئێوە و بەیانی جیا دەبمەوە لێتان، خودا لە من و لە ئێوە خۆش بێ! ئەگەر لەم کەوتن و نوچدانە ڕزگار بووم ئەوە باشە! خۆ ئەگەر قاچم هەڵکەوت و خزام ئەوە بزانن ئێمە لە سێبەری تووڵی تەڕو ناسکدا بوین، پووشبووین لەبەردەم ڕەشەبادا و لە ژێر سێبەری هەوردا بووین، کە لە ئاسمان**

کەم کەم پووکایەوە و لەناو چوو لەزەویدا، هێڵەکانی کوژایەوە، من هاومالّی ئێوە بووم و بە لەش ماوەیەك لەگەڵتان بووم، پاش کەمێك لاشەیەکی بێگیان دەبینن، بێجولّەی پاش جولّە، بێڕەنگی پاش گۆیاو وتاربێژ، بێدەنگێکە ئامۆژگاریتان دەکات، لەگەلّ لە پەلوپۆکەوتنی دەست و پێم و نەویی بوونی سەر لە لاشەم، چونکە ئەوە گەورەترین ئامۆژگاریی و پەندیارە بۆ ئەوانەی پەند وەردەگرن لە گفتی ڕەوان و وتاری بەرزی بیسراو، مالّئاواییتان لێئەکەم وەك مرۆڤێك بەتەمای دیدارە، بەیانی ڕۆژەکانی منتان دێتەوە یاد و نهێنیی و شاراوەکان دەرئەکەوێ، ئەوکاتە من دەناسن کە جێگەی چۆلّ بێ و کەسیتر لە جێگام دانیشێ.

( ١٥٠ )

## وتارێك لەبارەی داستانەکانی جەنگەوە

ئەوانە بەڕاست و بەچەپدا کۆچ و باریان دەخەنە سەر ڕێگەی چەوت و یاخیی و سەرەڕۆیی، بەتەواویی وازیان هێناوە لە ڕێبازی ڕاست و درووست، پەلە مەکەن لەو کارەی لە داوگەوە چاودێریی بۆ دانراوە، بەدرەنگی مەزانن ئەو هەوالّەی لە سبەیدایە، زۆر وا ڕێك ئەکەوێ ئەوەی پەلەی بۆ ئەکرێ خۆزگە بەوەیە کە نەهاتایە، ئەمڕۆ زۆر نزیکە لەسەرەتای سبەی، قەومینە..! ئێستە کاتی هاتنی هەموو بەلّێنەکانە، نزیکە ڕووی ئەوە ببینن کە نەتانناسیوە، ئاگاداربن ئەوەی پێی بگا لە ئێمە چرایەکی بەشەوقی پێیەو لەسەر ڕێبازی پیاوچاکان هەنگاو دەنێ، هەموو پەتی جلّەی بێزمانەکان دەکرێتەوە، گەردنی کۆیلە ئازاد دەبێ، بلاّو کۆ ئەکاتەوە، کۆ بلاّوە پێئەکات، لەناو خەلّکدا گومناوە، سەرناسی زۆر ژیر ئاسەواری نابینێ، ئەگەر بەوردیی بۆی بنوارێ، ئەو خەلّکە تیژ ئەکاتەوە چۆن ئاسنگەر دەمی تیغ تیژ ئەکات، چاویان بەپەیام ڕووناك دەبێتەوە و گوێیان ئاشنا دەبێ بەڕاڤەی سروش، شەرابی پاکی ئێوارانیان دەرخوارد ئەدرێ، پاش ئەوەی لە ڕۆژدا جامی فرمزانیی و جوامێرییان پێدراوە.

## گومانی گومڕایی

چـەرخی نـەفامیی درێـژەی کێـشاو زۆری خایانـد هـەتا زیـاتر لـە سـزادابن و نەگبەتیی باشتر بچێژن، هەر کە کاتی خۆی هات و خەڵك زیاتر ڕاهاتن شـەڕ و تـاڵان و ئـاژاوە و کلکیـان بـەرزکردەوە بـۆ پێـوەنکردنی شـەڕەکانیان لەسـەر خـەڵکانی تـر، باوەڕداران منەتیان لەسەر خوای خۆیان نەکرد بـە خـۆگرتن و بـەختکردنی گیانیـان بەزۆر نـەزانی لـە ڕێگـەی خـودا، بەرێکـەوت قـەدەر وایهێنـا لەگـەڵ نـەمانی ئـاژاوە و شەڕوشۆڕ، چاویان لەسەر دەمی شمشێرەکانیان ڕاگرت، سەریان نەوی کـرد بـۆ خـودا، بە فەرمانی ئامۆژگارەکەیان، ئەوێ کاتێ کە خودا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی بـردەوە بـۆ بارەگـای خـۆی، هەنـدێ خێـڵ پەشـیمانبوونەوە و هەڵگەڕانـەوە، کـوێرە ڕێگەکان خەڵەتاندنی و کەوتنە فێڵ و ساختەکاریی و پەیوەست بـوون بـە نـاخزم و کەس و کارو دەست بـەرداری ئـەوکارە بـوون کـە دەبـوو خۆشەویـستیان بـۆی هـەبێ، بناغەی خانووەکەیان گواسـتەوە بـۆ لایـەکی تـرو لەسـەر ئـەوێ درووسـتیان کـردەوە، ئەوانە کانی هەموو ئاژاوەیەکن و دەرگای هەموو فیتنەکارو شەڕئەنگێزێکن، کەوتنـە جموجوڵ بـە هـەموو لایەکدا و سەرسام بـوون بـەبێ هۆشـیی لەسـەر ڕەویـەی ئـالی فیرعەون کە هەندێك خۆی تەرخان کرد بۆ دنیاو هەندێك بۆ دوژمنکاریی ئایین.

( ١٥١ )

## وتـارێك بـاس لە هەڕەشەی بەرپابوونی ئاژاوە دەکات

### ( خوداو پێغەمبەر )

من سوپاس و ستایشی خودا دەکەم و داواکاری یارمەتی لێئەکـەم بـۆ دەرکـردن و ڕاونـانی شـەیتان و بـۆ پـەنادانم لـە تەڵـەو فێـڵ و خەڵـەتانی، شـایەتی ئـەدەم کـە محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە و پاڵێوراو و پوختـەکاری خۆیـەتی، کـە گـەورەیی ئـەو هاوشـانی نییـە، شوێن و جێگـەی بـە نـەمانی هـەرگیز پڕنابێتەوە، وڵات بە هۆیەوە چراخان بوو، لەگومڕایی و تاریکی دەرباز بوو، نەفامیی و گێلبـاویی لـەناو بـرد، زبریـی و بێـوێڵیی و وشـکیی و بێمانـایی کوژانـەوە، ئەوکاتـە حەرامیان حەڵاڵ کـرد و جوامێرییـان سـەرنەوی کـرد، لـەکاتی بێپەیامیـدا دەژیـان و

بەکافریی دەمردن.

## بێداریی و ترسان لە ئاژاوە

لەپاش ئەوە... عەرەبەکان! ئێوە نزیك دەبنەوە لەوەی کە ببنە نیشانەی بەڵاو کارەسات، زۆر هۆشیاری سەرخۆشیی ماڵ و سامان بن، زۆر وریاو ئاگاداری بەڵای ناهەمواربن و باش خۆتان ڕاگرن لە تۆزو گێژەڵووکەی شەوارەبوون، لاریی و خواریی فیتنە لەکاتی سەردەرهێنانیداو لە مەتۆڵکەیداو لەوەختی دانانی کەمینیداو لەکاتی ڕاستبوونەوەی کۆڵەکەی ناو کرۆکی ئاشەکەیدا، لە پێشەوە پلەکانی بەنادیار دەردەکەوێ، لەپاشەڕۆژدا کاری جەرگبڕی لێپەیدا ئەبێ، هێزو توانای لە هێزو توانای لاوی تازەباو ئەچێ و ئاسەواری وەك کوتانی بەرد ئەبێ، ستەمکاران بەمیراتیی بڵاوی دەکەنەوە، بە بەڵێن و پەیمان، یەکەمیان ڕابەری ئاخریانە و ئاخریان پەیڕەوی یەکەمە، کێبەرکێ ئەکەن بۆ دنیای پەست و بێنرخ، هەڵپەیانە لەسەر لاکێکی بۆگەن، پاش کەمێك شوێنکەوت خۆی بێوەریی ئەکات لە شوێنکەوتوو و ڕابەریش لە دەستکێشراو، هەمیشە بەکینە و ڕقەوە بڵاوەی لێئەکەن و لەوەختی کۆبوونەوە نەفرەت لە یەکدیی ئەکەن کە ئەوە تەواو بوو چێرەی فیتنەیەکی بومەلەرزە ئاسا دێت.

وەك زریانی کەمەرشکێن دڵان لە خشتە ئەبات، پاش ئەوەی ڕاستکرایەوە و پیاوان گومڕاو لادەر ئەکات، پاش ئەوەی لەسەر ڕێگەی ڕاست بوون، هەواو ئارەزووەکان لەکاتی هێرشیدا ناجۆرو ناکۆکن و ڕاو بۆچوونەکان سەرگەردان دەبن، لەکاتی دەرکەوتنیاندا هەرکەس بەتەمای بێت و ملی بۆ درێژ بکات ئەشکێ، هەر کەس تێیدا چالاك بێت وردو خاشی ئەکات، دەکەونە جووتە وەشاندن بە وێنەی ڕەوی کەری وێڵی ناو دارستان، ڕەشمەی گرێدراوی سەریان تێکدەچێ، دیمەنی کار کوێر ئەبێتەوە، جوامێریی و چاکیی تێدا ڕۆدەچێ و ستەمکار دەکەوێتە تاودان، دەشتەکیی و بیابانشین هەڵئەکۆڵێ و بە قورسایی سنگی وردی ئەکات، تاکە تاکەیان لەناو تۆزو گێژەڵوکەدا ون ئەبێ، لەناو ڕێگەدا سوارەیان لەناو دەچێ، دادوەریی تاڵ و خوێنگەش و ڕۆناگەی ئاین شەبەقی تدەکەوێ، گرێبەستی یەقین هەڵئەوەشێتەوە، عاقڵ و ژیر لەدەستی ڕائەکات، سەرسەریی و هیچ و پوچ بەڕێوەی دەبەن، بەگرمەو

و پزیسکەن، چاکیان لێهەڵکردووە، ڕەحم و خزم نامێنێ و ئیسلام تێیدا جیا دەبێتەوە، ساغ نەخۆشە و ڕەوەند نیشتەجێیە، هەموو خەڵك یان کوژراوە و خوێنی بەلاشە یان ترساوە و خۆی حەشارداوە، بەسوێنی درۆ ستەمکاران هەڵیان دەخەڵەتێنن و بە باوەڕداریی چەواشەیان دەکەن، هەرچۆن بووە ئێوە مەبنە پەیکەری ئاژاوە و مەبنە پەرچەم و ئالای نەوباوی بەد، هەمیشە لەگەڵ ئەهلی سوننەو جەماعەدابن و دەستبگرن بە پەیمانی کۆمەڵەوە، کە کۆڵەکەی ئاینیی و گوێڕایەڵیی لەسەر دانراوە، بڕۆن بۆ لای پەروەردگار، بەداماویی و ستەم لێکراویی، بەڵام بەستەمکاریی مەڕۆن، خۆتان لای پەیژەی شەیتان و شوێنپاڵدانەوە و چەتوونیی گەدە و سکتان بپارێزن لە تیکەی ناوکەوچکی حەرام، چونکە ئێوە لەبەرچاوی کەسێکن کە گوناهی قەدەغەکردووە و گوێڕایەڵیی ئاسان کردووە.

(١٥٢)

## وتارێك لە سیفەتەکانی خودا و نیشانەی پێشەوایانی ئاین

ستایش تەنها بۆ خودا، کە بوونەوەری کردووە بە بورهانی بوونی، بەتازە درووستکراوەکانی بەڵگەی هەمیشەبوونی، بە لەیەکچوونی درووستکراوەکانی دەلیلی ئەوەیە کە کەس لە شێوەی نییە، ئامێری هەستیار پەی پێ نابا و هیچ کۆسپ و پەرژینێك نایشارێتەوە، چونکە هەمیشە جیاوازیی بەرچاو هەیە لە نێوان بەدیهێنەرو بونەوەر، سنووری سنووردار، درووستکارو درووستکراو، یەکە بەڵام نەك بەلێکدانەوەی ژمارە، دروستکارە نەك بە جوڵە و ماندوو بوون، گوێبیستە نەك بە ئامێر، بینایە نەك بە جوڵاندنی چاو و برژانگ، ئامادەیە نەك بە دەستبەرکەوتن، جیایە نەك بەدووریی و ماوە، دیارو ئاشکرایە نەك بە چاوپێکەوتن، شاراوەیە نەك لە بەر نازکیی، لە خەڵك جیایە بەدەسەڵات بەسەریان و بەتوانا لە بانی، لەهەموو شت جیایە بە کڕنووش بردن بۆی و گەڕانەوە بۆلای، هەرکەس وەسفی کرد بە چەند و چۆن و کەی و کام، مەرزی بۆ داناوە، ئەوەی مەرزی بۆدانا هەژماری کردووە و ئەوەی هەژماری کرد لە بوونی ئەزەلدا بەتاڵی کردەوە، هەر کەس وتی: چۆنە؟ ئەوە سیفەتی تازەی بۆ داناوە و هەرکەس وتی: لە کوێیە؟ ئەوە لە جێگەی

داناوه، زانایه بەڵام پێش زانراوەکە، پەروەردگارە پێش پەروەردەکراوەکەی، بەتوانایە پێش توانا لەسەرەکە.

## پێشەوایانی ئاین

بەڕاستی ئەوە کەسێك دەرکەوت، کەوتە ڕووناکییەوە، تیشکدەرێ پەیدا بوو، تارماییەك دەرکەوت، چەماوەیەك ڕاست بووەوە، خودا گەلێکی گۆڕی بە گەلێکیتر، ڕۆژێکی گۆڕی بەڕۆژێکی دیکە، چاوەڕێی گۆڕان و هەلگەڕانەوە بوین وەك کەشی وشکە ساڵ بۆ باران، ئەوە ڕاستە کە ڕابەران و پێشەوایانی کاربەدەست سەرکاری خودان لە سەر خەڵك و چاو ساغ و دەلیلن بۆ بەندەکانی، کەس ناچێتە بەهەشت هەتا ئەوان نەناسێ و ئەوان نەیناسن، کەس ناچێتە ئاگر ئەوان ڕەد نەکەنەوە و ئەمانیش ئەوان ڕەد نەکەنەوە!

خودا ئەوەشی تایبەت کردووە بە ئیسلامەوە و ئێوەشی پاڵفتە کردووە بۆ ئیسلام، چونکە وەرگیراوە کە ئاشتیی و ئارامیی پوختەی هەموو جوامێرییەکە، خودا بۆ خۆی پەیڕەوی بۆ دیاریکردووە، دەلیل و بەلگەکانی ڕوونکردووەتەوە، زانیاریی ئاشکراو حیکمەتی شاراوە و زانستە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتایی نییە، توانا عەنتیکەکانی بێکۆتاییە، هەمیشە بەهاری نیعمەتەکانە و چرا بەشەوقەکانی تاریکستانە، دەرگای خێرو بێر بەکلیلی ئەو نەبێ ناکرێتەوە، ڕێگای تارکیتان بە چرای ئەو نەبێ ڕۆشن نابێتەوە، پاکژ و نخوردەکانی پارێزراوە بۆ خاوەنی و قەدەغەیە لە غەیری ئەوان، چارەی نەخۆشی بیمارستانە، زەخیرەی ئەوەیە کە ئەوی بەس بێ.

(١٥٣)

## وتارێك لەبارەی گومڕاو ڕێ لێونبوانەوە

گومڕای سەرلێشێواو لە مۆڵەتی خودا دایە، هەر خەریکی ئارەزوو بازییە لەگەڵ دنیا پەرستانی بێئاگا، هاوڕێ و شەونشینی تاوانبارانە، نە ڕێگەی مەبەستی هەیەو نە پێشەوای ڕابەر.

## دیاردەی بێئاگایان

ئەوان بێئاگاو بێخەبەرن هەتا ئەوکاتەی تۆڵەی تاوانیان دەردەکەوێ و لە عەبای بێخەمیدا دەردەچن، بەرەو دوا دەگەڕێنەوە و بەرەو پێشەوە ڕوو وەردەگێڕن، بۆیان دەردەکەوێ هیچ دەستکەوت و هیچ تاوانیان جێبەجێ نەبووە و بەحەز و ئارەزوویان نەگەیشتن، بەڕاستی من خۆم و ئێوەش لەم پلەیە دەترسێنم، با هەموو کەس خۆی سوودی بۆ خۆی هەبێ، چاوساغ ئەوەیە گوێبیست بوو بیرکاتەوە و ورد بنواڕێ و چاوبکاتەوە، پەندو ئامۆژگاریی وەربگرێ و ڕێگەیەکی تەخت و بێگرێ بگرێ و وریا بێت نەکەوێتە چاڵەوە، بەگومڕایی نەکەوێتە شوێنی پۆخڵ و پیسەوە، داوای هاوکاریی لە بێ بەندوو باوەکان نەکات و بەخۆیانی فێرنەکات، نەوەك بەزۆر لە ڕاستیی لایدەن و وتاری ساختەی پێبدەن و لە ڕاستیی و دروستیی دوریخەنەوە.

## ئامۆژگاریی

گوێگری ئامادە بەخۆتدا بێرەوە و هوشیاربەرەوە، لە بەد مەستیی دەست هەڵگرە، لەخەوی غەفڵەت وەئاگا بێ، پەلەکردنت بۆ دنیا کورتکەرەوە، بەوردیی بیرکەرەوە لەو فەرموودەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆت هاتووە، لەو ئەرك و کارانە کە پێویستە و خۆلێلادانی نییە، دژی ئەوەیە کە دژی ئەم پێغەمبەرەیە(صلى الله عليه وسلم)، لێگەڕێ با بەوەی خۆی ڕازی بێ، شان و شەوکەتی خۆ نەوی بکە، فیزو هەوات لابە، یادی گۆڕت بکە، چونکە سەری ڕێگەتە، چۆن کار بکەیت بەو شێوەیە پاداشتت هەیە، چی کشت بکەی ئەوە دروێنە ئەکەیت، ئەوەی ئەمڕۆ ڕەوانەی ئەکەیت سبەی دێتەوە بۆ لات، جێگەی پێت با تەخت بێ، کار بۆ ڕۆژی ئەوێ بکە.

وریابە، وریابە، ئەی گوێگرە، بەئاگابە، بە ئاگابە، ئەی بێئاگا، (غەیرەز خودا کە هەموو شتێك دەزانێ کەس ناتوانێ لەوانە ئاگادارتکا) ئەمە لەکارە ئازاو بوێرو جوامێرەکانی خودایە، لە قورئانی پڕ لە زانایدا، کە پاداش و تۆڵەی تێدا باس کراوە و ڕەزامەندیی و ڕقی تێدا جیا کراوەتەوە، بۆ بەندە سوودی نییە، هەر چەندە خۆی

**ماندوو بکات و دڵسۆزیی بنوێنێ و لە دنیا دەرچێ و بگاتە بارەگای پەروەردگار، بەهەر ڕەوشتێ کە لێی پەشیمان نەبێ، ئەوەیە کە هاوەڵ بۆ خوا دابنێ لە بەندایەتیی و پەرستنی ئەو خودایە، یان چارەی ڕقی خۆی بە لەناو بردنی خۆی بکات، یان بەکاری خەڵکی تر ڕازی بێ، یان ئەنجامی پێویستی خۆی لای خەڵك بەداهێنانی کارێکی نەوباوی بەد، یان دوو ڕووی هەبێ، یان خاوەنی دووزمانیی بێ، باش ئەمە یاد بکە، چونکە نموونە هاوتای شێوەی خۆیەتی.**

**ئاژەڵە بێزمانەکان هەمیشە لە خەمی ورگیانن و دڕندەکان هەمیشە لە پەلاماری نێچیردان و ژنان هەمیشە لە خەمی جوانیی و ڕازاندنەوەی خۆیان و خراپەن لە دنیادا، باوەڕدار هەمیشە سەرنەوییە بۆ خودا و باوەڕدار دڵئارام و دڵناسکە و هەمیشە لە ترس و بیمدا دەژی.**

**( ١٥٤ )**

## وتارێك لەبارەی چاکەی ئال و بەیت

**بیلبیلەی چاوی ژیرو دانا، کە بەردەمی خۆی ئەبینێ پێی و چاڵ و چۆڵ و نەویی و بەرزیی پێجیادەکاتەوە، ئەو بانگدەرەی کە یەکەم جار بانگیدا ئەو شوانە بوو کە بەپاکیی شوانیی خۆی کرد، کەوابێ دەبێ ئێوە بەدەنگی بانگەوازخوانەوە بچن و بە شوێن شوانی خۆتانەوە بڕۆن، نەیارانی ئەوانەی پێشەوە لەناو شەپۆلی دەریای ئاژاوەدا بوون و دەرباز بوون و خۆیان دەستووری نەوباویان بۆ خۆیان داناو بە گوێی فەرمودەیان نەکرد، باوەڕدارانی ڕاستیی خۆڕاگرو ڕاوەستاو بوون و بێدەنگ، درۆزنان و لادەران گۆیا بوون، ئێمە بەرگی ناوەوەین و یارو یاوەرین، ئێمە گەنجینەو قاپیی خەزنەین، نابێ هاتووچۆ لەدەرگاوە نەبێ، هەر کەس لە غەیری دەرگاوە هاتە ژوورەوە ئەوە دزە، لە بارەی ئەوانەوە قورئان هاتووە، بەوەسف و سەنایان، ئەوانە غەزنەی خودان، کە قسە بکەن ڕاست دەڵێن، ئەگەر بێدەنگ بوون کەس لە پێشیانەوە نادوێ، کەواتە با سەرۆك هۆز لەگەڵ هۆزەکەی ڕاستگۆ بێت و عەقڵ و هۆشی ئامادە بێت، کوڕی ئەو دنیا بێت، چونکە لەو دنیاوە هاتووە و بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە، ئەوەی چاوی هەیە و دەبینێ و ئەوەی کارایە بەفام، دەبێ**

سەرەتای کارەکەی بزانێ، ئەم کارە لە زیانیەتی یا قازانج، ئەگەر قازانجی بوو لە سەری بڕوا و ئەگەر زیانی بوو خۆی ڕاگرێ و بووەستێ، چونکە کارایی بێ زانا وەك ڕێبواری بێ ڕێگەیە، هەتا دوورتر بڕوات زیاتر لە مەبەستی دوور ئەکەوێتەوە، بەڵام کارایی زانا وەك ڕێبواری ڕێگەی ڕوون و تەختە، با باش تەماشاکا، بزانێ لە ڕێگەیە یان بەدەوری خۆی خول ئەخوا، ئەوەش بزانن هەموو شتێ دیوی ناو دیوی دەری هەیە، دەبێ ئەوەی دیوی دەری باشبوو ئەبێ دیوی ناویشی باش بێ و ئەوەی دیوی ناوی گەن بوو دیوی دەریشی گەنە، ئەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەفەرمووێ:( خودا بەندەی باوەڕداری خۆش ئەوێ و ڕقی دەبێتەوە لە کرداری بۆ کافرکارپی، باشی خۆش ئەوێ و ڕقی لەناوەومیەتی).

ئەوەش بزانە هەموو کارێك وێنەی ڕووەکەو هەموو ڕووەکێ پێویستی بە ئاوە و هەرگیز بێ ئاو ناژی، خۆ چەند جۆرێکیشی هەیە، ئەوەی ئاوی شیرین و پاك بێ، جوان شین ئەبێ و بەری شیرینە، ئەوەی ئاوی پیس بێ، ڕەگی ئەڕزێ و بەری خراپی ئەبێ.

( ١٥٥ )

## وتارێك لەسەر شێوازی سەیری شەمشەمەکوێرە

سوپاس و ستایش بۆ خودا، کە هیچ پێناسەیەك ناتوانێ ناوەرۆکی ناسین و زانینی ئەو بناسێنێ، گەورەیی و شکۆیی پاڵی ناوە بە هەموو عەقڵ و ژیرییەکەوە، کە نەتوانن بگەنە سەرەتای دەسەڵاتی ئەو.

خودایەکی حەق و ڕاست و ڕوون و ڕوونتر لە بینینی چاو، فام و ژیر نەگەیشتووە بەسنووری، هەتا بتوانێ بیچوێنێ بەشتێ، کە وەهم و خەیاڵ بەلایدا ناڕوا هەتا پەیکەری بۆ دیاری بکات، ئەوەی درووستی کردبێ نموونەی پێشینەی نەبووە و بێ هاوکاریی و یارمەتیی ڕاوێژکار بووە و کەس یارمەتی دەری نەبووە، تەنها بە فەرمان بوونەوەری درووستکردووە، سەری نەوی کردووە بۆ فەرمانی بەدەمفەرمانەوە چوو، هیچ بەرگری نەکردووە و فەرمانبەردار بووە بێ چەند و چون.

## دروستکردنی شەمشەمەکوێرە

لە شتە وردو نازکەکانی دەستکردی و لە سەرسوڕهێنەری داهێنانی ئەو شتە شاراوە و پەنهانەی حیکمەتی لە شەمشەمەکوێرەدا کە ڕووناکی نارەحەتی ئەکات، کە بۆ هەموو شت پەلی ڕاخستووە، تاریکیی دەیکاتەوە و دڵخۆشی ئەکات، کە هەموو شت ڕائەگرێ و ئەوەستێنێ، چۆن چاوەکانی شەوارە ئەکات، کە خۆری پرشنگدار دەرکەوێ ناتوانێ بەو ڕووناکیە ڕێبازی خۆی بگرێ و بەدەرکەوتنی شۆڵەی ڕۆژ پەیوەست بێت بەزانیاریەکانی، پاشەکشە ئەکات، بە وریجەی تیشکی لە گزنگی هەڵهاتنی، بە توندیی لە هێلانەکەی دایدەنێ، کاتی زۆر بوونی تینی تیشکی، بە ڕۆژ پێڵوی هێناوە بەسەر گلێنەی چاویدا و شەوی تاریکی کردووە بە چرای بۆ پەیدا کردنی خواردنی، پەردەی ئەستوری تاریکیی ناتوانێ لە بینینی کەمکاتەوە، هەرگیز تاریکیی و ڕەشیی شەوەزەنگ ڕێگەی پێ هەڵە ناکات، بەڵام کە خۆر سەرپۆشی لەڕووی لاداو سپێدەی بەیانی دەرکەوت و گزنگی ڕووناکیی کەوتە ناو کونی کەمتیارەوە، ئەو کاتە پێڵوەکانی دەهێنێ بەسەرچاویدا، بەو کەمە خۆراکەی لە تاریکیی شەودا وەدەستی هێناوە، قنیات ئەکا.

پاکی تەنها بۆ ئەو خودایەیە کە شەوی کردووە بە ڕۆژو مووچەی ئەم گیاندارە، ڕۆژی بۆ کردووە بە پشوو و مانەوە لە شوێن خۆیدا، لە گۆشتی لەشی باڵی بۆ دروستکردووە، لەکاتی پێویست بەرز ئەبێتەوە و ئەفڕێ، وەك نەرمە و کورۆچەنەی گوێچکەیە، نە پەڕی هەیەو نە وردە تووك، بەڵام هێڵی ڕەگەکانی باڵی بەڕوونی دیارە، ئەو دوو باڵە زۆر ناسك نین، هەتا درزبەرێ و زۆر تۆکمە نین هەتا قورس بێ، بێچووەکەی لکاوە بە سنگیەوە و ئەویش هەڵواسراوە بە لەشیەوە، لە نیشتنەوەدا ئەویش دەنیشێتەوە و لەبەرز بوونەوەدا بەرز دەبێتەوە، لە دایکی جیا نابێتەوە، هەتا دەست و مەچەك و باڵی بەهێز نەبێ و ڕێگای پەیدا کردنی خواردن فێربێ و بزانێ سوودی لە چیدایە، پاکیی تەنها بۆ ئەو خودایەیە کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە بێ نموونەو وێنەی پێشەوە و لە کەسی ترەوە.

(١٥٦)

## وتارێك لەگەڵ ئەهلی بەسرەدا ئەدوێ

ئەوكاتەی كە ئەم ڕووداوە دێتە پێشەوە هەر كەس ئەتوانێ خۆی بەند بكات بۆ خودا ئەوە با بیكات، ئەگەر بە گوێم بكەن و لە ژێر فەرمانمدا بن ئەوە خودا بیەوێ هەڵتان ئەگەرم بۆ بەهەشت، هەر چەندە ئەوەش زۆر سەخت و دژوارو تامی تاڵە.

دەربارەی (فلانە كەس) ئەوە دوای ڕای ژنانە كەوتووە و ڕق و كینەی لە سنگیدا جۆشی خواردووە و كوڵاوە وەك كورەی ئاسنگەر، ئەگەر داوای لێبكرێ ئەوەی بەمنی ئەكات بە غەیری منی بكات، هەرگیز ئامادە نییە بیكات، لەگەڵ ئەمەش هەر ڕێزی خۆی هەیە وەك سەرەتاو پرسینەوە لای خودایە.

## پەسەندی باوەڕ

ئەم ڕێگەیە تەخت و ڕۆشن و بێگرێیە، چرای ڕووناكیی لەسەرە، بەهۆی باوەڕو ڕێگەی چاكەوە دەدۆزرێتەوە، بەهەمان شێوە لە ڕێگەی چاكەخوازیی و چاكەكرداریی باوەڕەوە دەرئەكەوێ، بە باوەڕ زانست تینی زۆر ئەبێ، بە باوەڕ ترس لە مردن پەیدا ئەبێ، بە مردن دنیا كۆتایی دێ و بە دنیا قیامەت دەست دەكەوێ، خەڵك ماوەی پێنەدراوە لە قیامەت خۆی ببوێرێ، زۆر بە پەلەو بەلەز لە گۆڕەپانی دنیا غار دەدەن بەرەو ئەو سەری مەیدانی ڕمبازیی.

## ژیان لە ناو گۆڕ

ئەوە خەڵكە لە گۆڕو ئارامگەكاندا ڕاگیراوە، بەرەو سەرنویشتی كۆتایی دەڕۆن، هەر تاقمێك بۆ یانەیەك دانراوە و جێگۆڕكێ بۆ هیچ لایە نییە و گواستنەوە نەماوە، كە فەرمان بەچاكەو نا لە خراپە دوو ڕەو شتی خودای پاك و بێگەردە، كە نە ئەجل نزیك دەكەنەو و نە ڕۆزیی كەم ئەكەنەوە.

بە توندی دەست بگرن بە كتێبی خوداوە، چونكە دەستگیری پتەوە و ڕووناكیی ڕۆشنە و چارەسەری بەسوودە، ئاوی تینوو شكێنە، ئەوەی توند بیگرێ دەیپارێزێ، ئەوەی خۆی پێدا هەڵواسێ ڕزگاری دەبێ، هەرگیز ناچەمێتەوە تا ڕاست كرێتەوە، لە

ڕێ لا نادات هەتا پێویست بە گەڕانەوە بکات، بە زۆر وتن و زۆر بێژیی هەرگیز کۆن نابێ و نارزێ، گوێ ماندوو نابێ لە بیستنی، ئەوەی بەو وتار بدات درۆ ناکاو ڕاست ئەکا، ئەوەی کاری پێبکات پێش ئەکەوێ، لەم کاتەدا پیاوێك هەستاو پرسی: حەز ئەکەین لەو فیتنەو گێژاوە باسمان بۆ بکەی و پرسترکردووە بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە؟ فەرمووی: ئەوێ ساتێ کە خودای پاك ئەم ئایەتەی هەنارد: ( ئەلف، لام، میم، ئاخۆ مەردم لایان وایە هەر کە بێژن ئێمە باوەڕمان هێناوە ئیتر وازیان لێدەهێنرێ و تووشی هیچ ئەزموونێ نابن)، من زانیم کە فیتنە نایەت هەتا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە ناومانا بێت گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) ئەم ئەزموون و تاقیکردنەوەیە کە خودا بە تۆی فەرمووە چۆنە؟ فەرمووی: عەلی ! ئوممەتی من دوای من تووشی ئەزموون و فیتنە دەبن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوە نەبوو کە ڕۆژی (غەزای ئوحود) ئەوەی شەهید بوو ڕۆیشت لە موسڵمانان و شەهیدیی بە بەختی من نەبوو و زۆرم پێگران بوو و تۆ فەرمووت مژدە بێت شەهیدیی لە دواتەوەیە، فەرمووی: بە من ئاڕاستە هەروا دەبێ، ئەبێ ئارامت هەبێ، ئەوجا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوە ماوەی ئارامیی لێنەبڕیوم و بەڵکو بەتەمای مژدەو سوپاسم، فەرمووی: عەلی ئەو خەڵکە تووشی ئەزموون و ئاژاوە دەبن بە دارایی و سامانەوە شانازی بە سەر خوداوە دەکەن، بە باوەڕهێنان و داوای بەزەیی لێئەکەن و بێخەمن لە دەسەڵاتی خودا، حەرامی خودا حەڵاڵ ئەکەن، بە بیانوو و بەڵگەی درۆو بەئارەزووخوازیی و خۆخەڵەفاندن مەی حەڵاڵ ئەکەن و بە ناوی دەبە (سرکە) وە بەرتیل دەخۆن و ناوی دەبەن بە دیاری، سوو ئەخۆن ناوی دەبەن کڕین و فرۆشتن. گوتم ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوکات من ئەو خەڵکە لە کوێ دابنێم؟ بڵێم پاشگەزە؟ یان ئەزموونە؟ فەرمووی: (بەناوی ئەزموون و تاقیکردنەوەی دابنێ).

(١٥٧)

# وتارێك داوا لە خەڵك دەكات بۆ خۆپارێزیی

ستایش بۆ خودا كە سوپاس و ستایشی كردووە بە كلیلی یاد كردنەوەی و هۆكاری زیادە بەخشندەیی و چاوساغ و دەسكێش بۆ گەورە نیعمەتەكان و گەورە بەخشینەكانی، بەندەكانی خودا..! كات و زەمان ئەوەی ماوە دەیباتەوە بۆ لای ئەوانەی ڕۆیشتوون، ئەوەی ڕۆیشتووە ناگەڕێتەوە و ئەوەی كە ئێستە هەیە هەتاهەتا نییە، كاری دوایی وەك كاری پێشینە وایە، كاروبارەكان كێبەركێ ئەكەن، هەر یەكەی ئاڵای خۆی بەرز كردووەتەوە، ئێوە وادێنە بەرچاوم وەك شوانی حوشتر كە جڵەوی حوشترەكان ئەكێشێ بەدوای خۆیدا، لەوێدا هەر دڵ بداتە غەیری خۆی لە تاریكیدا جێ دەمێنێ و سەر گەردانە و لە فەوتان نزیكە، شەیتانەكان ڕەشۆیان بە دەستەوەیە بۆ سەركەشیی و لە خۆبایی، لەناو كرداره بەدەكانیان ڕائەبوێرن، ئەوە لە ئەنجاا بەهەشت ئامانجی ئەوانەیە، پێشبڕكێی چاكەیانەو ئاگرو دۆزەخ كۆتایی كەمتەرخەمانە، ئاگاداربن بەندە گەلی خوا.. خۆپاراستن دەرگای قەڵای قایمە و بەدكرداریش قاپی كەیلێكی پەست و نزمە، نەكەس ئەگێڕێتەوە و نەكەس ئەشارێتەوە كە پەنای تێ بەرێ، هۆشیاربن تەنها بە خۆپارێزیی چزی تاوانەكان ئەفرتێ، بە باوەڕی پتەو بە ئامانجی بەرز دەگات بەندەكانی خوا ! ئامان سەد ئامان، تەنها خودا تەنها خودا...!! بەرزترو بەشكۆتربێت لاتان و خۆشەویسترین بێت بۆتان، ئەو خودایە كە ڕێگەی حەق و ڕاستیی بۆ دیاری كردوون، بە جوانیی ڕوونی كردووەتەوە، كە یان بەدبەختیی هەمیشە، یان بەختەوەری هەمیشە، لە ڕۆژی بەرەو نەمان بۆ ڕۆژی نەمریی و هەتاهەتا، كەرەستەی تێشووتان پێدراوە و فەرمانی كۆچ و بارتان پێكراوە و پەلەتان لێكراوە بۆ ڕێبڕین و ڕۆیشتن، ئێوە وەك كاروانێك وان كە بۆ ماوەیەك پشووتان دابێ!، نازانن كەی فەرمانی ڕۆیشتنی دێت، ئەرێ كاری كاورا بەو دنیا چییە كە بۆ ئەو دنیا دروستكرابێ؟ چ پێویستی بە سامان هەیە، ئەو زەلامەی كە بەتەمایە ڕووتی بكەنەوە و تالانی بكەن و لەپاشان لێ پرسینەوە و بژاردنی لەسەر بێ؟ بەندەكانی خودا! ئەوەی كە خودا بەڵێنی پێداوە نەهاتنی نییە، ئەوەی قەدەغەی كردووە داخوازیی نییە، بەندەكای خودا ! ئاگاداری ئەو ڕۆژەبن كە

پشكنين ئەكرێ لە كردارەكان، گەردەلوول و بومەلەرزە پەيدا ئەبێ، بەزۆریی و بە زوویی منداڵ بە منداڵی پیر ئەبێ.

باش بزانن چاودێرتان بەدیارەوەیە هەر لە ناو خۆتاندا، هەوالگر هەیە لە ئەندامەكانی لەشتان، نووسەری ڕاستگۆ هەیە بۆ نوسینی كردەوەكانتان و ئاماری هەناسەتان، شەوی تاریك ناتوانێ كردارتانی لێ بشارێتەوە و حەشارتان نادات دەرگای كلۆمداری قورس، سبەی نزیكی ئەمڕۆیە، ئەمڕۆ بە هەموو ڕووداوەكانییەوە دەڕواو سبەی زوو پەیوەست دەبێ پێوە، هەر ئەوەندەت زانی هەموو كەسێك لە ئێوە لەناو خاكدا گەشتووەتە شوێنی حەوانەوەی بەتەنها، چووەتە ناو چاڵی خۆیەوە، هاوار بە ماڵم لەو ماڵە تەنیایەو لەو مەنزڵە چۆڵ و ترسناكە!!، لەو تەنیا ژووریی و نامۆیە، هەر ئەوەندەتان زانی بەدەنگی بەرز بانگكران، چركەژمێر ئێوەی گرتەوە، ڕاپێچران بۆ دادگاو دادوەریی، هەموو شتە پڕوپوچەكان لە ڕووتان لاچوون و نەمان، هیچ ئازارو ئەڵەفتان تێدا نەما، ڕاستیی و درووستەكان جێگەی خۆیان كردەوە، هەرچی چاوگ و سەرچاوە هەبوو ڕەوانەكرایەوە بۆ لاتان، كەواتە ئیتر پەندو ئامۆژگاریی وەربگرن، لە ڕابوردوو عیبرەت وەرگرن، سوود وەربگرن لە ترسێنەرەكان.

( ١٥٨ )

## وتارێك لە پەسەندیی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم )

## ( قورئان و باسی دەسەلآتی ئەمەویی )

خودا، محەممەد (صلى الله عليه وسلم)ی ڕەوانە كردووە لەكاتی برانەوەی سروش و پەیام بۆ پێغەمبەران( درودو سلآوی خوایان لە سەر بێت) لە خەوی درێژخایەنی گەلان و هەڵوەشانەوە و دەستكاریكردنی فەرمانە بڕیار لەسەر دراوەكانی پێشتر، ئەو پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاتنی بڕوای تەواوی هەبوو بە پێشینە نێردراوەكان و چراكانی دەستیان و هەموویان كۆبوونەتەوە لەم قورئانەدا، داوای گفت و گۆی لێبكەن، هەر چەند ئەو بێ دەنگە، بەلآم من لە جیاتی ئەو وەلآم دەدەمەوە، ئەوەش بزانن ئەم قورئانە زانستی لەمەوپاش و گوتاری لەمەوپێش و دەرمانی دەردەكان و یاساو دەستوری ئێوەی تێدایە.

## دەوڵەتی ئەمەویی

لەو کاتەی ئەمانە فەرمانڕەوا دەبن ماڵێك لەدەوار یان لەدارو بەرد نامێنێ، کە ئەم ستەمکارانە بە کەیفەوە سەری پێدا نەکەن و ژان و ئازاریان بۆ نەبەن، ئەو کاتە نە لە ئاسمان پاساویان هەیەو نە لە زەوی هاوار، چونکە ئێوە بە پاڵفتەیی ئەو کارەتان پێسپاردووە و لە غەیری شوێنی خۆیتان داناوە، خواش تۆڵە وەردەگرێ لە ستەمکار نانێك بە نانێك و ئاوێك بە ئاوێك لە چێشتخانەی کوژاڵکە و شلێوی تاڵ و ژەهرو ژێرکراسی ترس و عەبای شمشێر، ئەوانە ولاخی کاروانی تاوان و خورج و هۆڕی گوناهەکانن، سوێند ئەخۆم، دوبارە سوێند ئەخۆم.. ئەبێ خێڵی (ئومەییە) ئەمە هەڵبهێننەوە و ڕۆیکەنەوە وەك بەڵغەم و فڕەی بدەنە زەوی و جارێتر بۆیان هەڵنەگیرێتەوە و چێژی نەکەن هەتا شەو و ڕۆژ ماوە.

(١٥٩)

## وتارێك باسی مامەڵەجوانیی خۆی ئەکات لەگەڵ ڕەعیەتی

ئەوەی ڕاستی بێت من زۆر هاودەم و هاوسێیەکی چاکبووم بۆ ئێوە، هەموو توانای خۆم داناوە بە دوای ئێوەدا، لە ملکەچیی و سەرشۆڕیی ڕزگارمکردوون، لە هەموو بەندێکی زۆرداریی ئازادم کردوون، هەمیشە لەسەر کەم سوپاسم کردوون و چاوم داخستووە لەو خراپە زۆرەی کردووتانە و لەشم شایەتە و چاوم پێکەوتووە.

(١٦٠)

## وتارێك

کاری خودا هەمووی دوو حیکمەتە، ڕەزامەندیی ئارامیی و بەزەییە، دادوەر بە زانست و بوردەیە بە هێمنیی، ستایش بۆ تۆ خودا، بە بردنەوە و بەخشینت و لەسەر بەخشینی ساغیی و لەسەر بەلایشت، سوپاسێك کە تۆی پێڕازیی بێ و جوانترین ستایش و بەرزترین ستایشی لای خۆت، سوپاسێك پڕبە دروستکراوەکانت هەتا ئەو جێگەی خۆت ئەتەوێ، ستایشێك لە تۆ پەنهان نەبێ و کەمتر لە تۆ نەبێ،

ستایشێك لە ژمارە نەیەت و ئەندازەی تەواو نەبێ، ئێمە کاکڵەی گەورەیی تۆ نازانین، تەنها ئەوە نەبێ تۆ زیندووی بەدەسەڵاتی، نە وەنەوز و نە خەو ناتباتەوە، بینایی پێت ناگات و چاو توانای ڕوانینی تۆی نییە، تۆ هەموو چاو ئەبینی و هەموو کردار هەژمار ئەکەی، (سەرەوێ و تەوێڵ) تۆ ئەیبەیتەوە، ئێمە چیمان بینیووە لە بونەوەری تۆ، کە سەرمان سوڕ دەمێنێ لە توانات، هەتا پێناسەی گەورەیی تۆی پێبکەین، بەڵام ئەوە ئەزانین ئەوەی نادیارە لە ئێمەو چاومان کورتە لە ئاستی و عەقڵمان بڕی ناکات و پەردەی نادیار شاردویەتیەوە زۆر زۆر گەورەترە، ئەوەی دڵی لە هەموو شتێ خاڵی بکاتەوە و بیربکاتەوە هەتا بزانێ چۆن عەرشی خۆت داناوە و چۆن خەڵقت درووستکردووە و چۆن بێ (کۆڵەکەو دیلەك) ئاسمانت ڕاگرتووە و چۆن زەویت لەسەر شەپۆلی ئاو ڕاگرتووە، بە چاو شۆڕیی و بەعەقڵ سەرسام و بەگوێی بێئاگاو بیری سەرگەردان دەگەڕێتەوە.

## چۆن ئاوات بخوازی

کەسی وا هەیە بە خەیاڵی خۆی داوا لە خوا ئەکات، درۆ ئەکات بە گەورەیی خوا، ئەی باشە بەتەمای خوایەو ڕەجای وایە، بۆچی تەماشای کردارەکانی ناکات؟ هەر کەس بەتەمای شتێك بێت ئەبێ تەماکەی لە پێی کارەکەی بێت، هەر داخوازیی و تەمایەك (جگە لە تەمای خوا) تەمایەکی عەیارتەواو نییە، هەموو ترسێك ڕاستییە (جگە لە ترسی خودا) کە بیمارە و ناتەواوە بە تەمای شتی گەورەیە لە خودا و بە تەمای بچووك لە خەڵك، کەچی بۆ خەڵکی ئەنجام ئەدا بۆ خودای ناکات، دەی باشە بۆچی بەرامبەر بە خودا کەمتەرخەمە، لەوە ئەچێ بترسی کە لە داخوازییەکەت درۆ بکەیت یان بەتەمای جێبەجێ کردنی نەبیت، ورد بەرەوە ئەگەر لە بەندە بترسێت، ئەوەی بۆ بەندە ئەنجامی ئەدا بۆ خوای ناکات، ئەوە ترسی بەندەکان لەبەندەکان حازرییە و ترس لە خودا بە قەرز و پەنهانییە، لەبەر ئەوەیە ئەوەی دنیا گەورەبێ لەبەر چاوی و کار نەکات لەسەر دڵ و دەروونیی و زاڵی ئەکات بەسەر ترس لە خوا و تەواو خۆی تەرخان ئەکات و دەبێ بە بەندەی.

## پێغەمبەری خوا
## ( صلى الله عليه وسلم )

له پێغەمبەری خودا( صلى الله عليه وسلم) پەیڕەوی بکەیت بەسته، هەر ئەوه دەبێتە بەڵگە و عەیب و عاری دنیا و نەویستنی، کە دارژاوه لە کەموکوڕیی و خراپەدا، چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی دنیای پێنەگەیشت و دوورکەوتەوه لێی لەکاتێکدا شانی شلکردبوو بۆ غەیری ئەو و لە شیر بڕابووەوه و جواییەکانی لەو پەنهان کرابوو.

## موسا پێغەمبەر
## ( سڵاوی خوای لەسەر بێت )

ئەگەر حەز دەکەی دووەم نموونەت بۆ دێنم !، به پێغەمبەر موسا(درودو سلاوی خوای له سەر بێت) کە گفتوگۆی لەگەڵ خوا بووه، کە پێی ئەڵێ: (خودایە ! من ئاتاجی ئەو خەیرەم کە بۆم دەنێری)، قەسەم بەخوا، داوای لە خوا تەنها بۆ نانێك بوو بیخوات، چونکە لەو کاتەدا ڕایکردبوو، تەنها بەسەلکی ڕووەك خۆی دەژیاند، چونکە سەوزەگیا لە لۆچی سکیدا دەبینراو بە ناواچوونی سکی و لاوازییەکەی.

## داود پێغەمبەر
## ( سڵاوی خوای لەسەر بێت )

حەز ئەکەی نموونەی سێیەم بە داودپێغەمبەر دێنمەوه کە خاوەن ئازارو دەنگ بوو، خوێنەری ئەهلی بەهەشته، بە دەستی خۆی حەسیری پەلی خورمای درووست ئەکردو بە هاوڕێیانی ئەفەرموو: ئەوه کێ بۆم ئەفرۆشێ؟پاشان کولێرەی جۆی پێ ئەکڕی و ئەیخوارد.

## عیسا پێغەمبەر
## ( سلاوی خوای لەسەر بێت )

ئەگەر ئەتەوێ لەبارەی عیسای کوڕی مەریەم( سلاوی خوای لەسەر بێت)، دەڵێم: بەردی ئەکرد بە سەرین و پشتیی و بەرگی زبری لەبەر ئەکرد و پێخۆری برسیەتیی بوو و چرای مانگ بوو بەشەو و سێبەری لە زستاندا خۆرهەڵات و خۆرنشینی بوو لەزەویدا، میوە و بۆنی خۆشی ئەو گیایە بوو کە بێزمان ئەیخوارد، نە ژنی هەبوو ئەڤینداری بێ و نە منالی هەبوو خەفەتی بداتێ و نە مالی هەبوو رووی تێ بکات و نە تەماى هەبوو سەری پێ نەوی بکا، ولاخی سواریی هەردوو قاچی و خزمەتکاری دەستی بوو.

## پێغەمبەری سەرداری گەورە
## ( صلی الله علیه وسلم )

کەواتە لاسایی ئەم پێغەمبەرە نازدارە پاکە بکەرەوە، چونکە بەڕاستیی هەر ئەوە شایستەی شوێنکەوتن و لاساییکردنەوە بێت، ئەوە پرسە و دڵدانەوەیە بۆ ئەوەی کە بییەوێ پرسەی لێ بکرێ و دڵی بدرێتەوە.

لە لای خوادا ئەوە خۆشەویستە کە پەیڕەویی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بکات و شوێنکەوتووی ئەو بێت، دنیای ئەقرتان بە نەرمیی، چاوی لە شوێنی نەبوو، سك و کەلەکەی توند ئەکرد لە ئەهلی دنیا و لە هەموو کەس زیاتر سکی خالی بوو، دنیای بۆ دانراو خرایە بەردەستی نەیوویست، هەرچی خوا ڕقی لێبوایە ئەمیش ڕقی لێ بوو، هەرچی خودا بەکەمی دانابوو ئەمیش بەکەمی دەزانی، هەرچی خودا بە بچووکی دانایە ئەمیش لای بچووك بوو، لە ئێمەدا ئەگەر تەنها خۆشەویستییمان بۆ ئەوەی خودا ڕقی لێیەو بەگەورە دانانی ئەوەی کە خودا بە سووکی داناوە، ئەوە بەسە بۆ دوورییمان لە خودا و لادان لە فەرمانی خودا، ئەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسەر خاك و خۆڵ نانی ئەخوارد و وەك کۆیلەی هەمیشەئاوارە دادەنیشت، پێلاوی خۆی پینە ئەکرد، جلی دڕاوی خۆی ئەدوورییەوە، سواری گوێدرێژی بێکورتان ئەبوو، کەسی خۆی لە دواوە سوار ئەکرد، ئەگەر لە ڕووی

پـــەردەی ماڵەكـــەی وێنەیـــەكی چـــاو پێبكەوتایـــە ئـــەی فـــەرموو: فـــلان (یـــەكێ لەحەرەمسەكانی) ئەو وێنە لە بەرچاوم لابە، چونكە كە ئەیبینم، دنیاو جوانییەكانی دێتە فیكرو خەیاڵم

رووی وەرچـەرخاندبوو لـە دنیـا بـە دڵ و هـەرگیز بـە بیریـدا نـەدەهات، بۆیـە حەزی نەبوو جوانییەكانی لەبەرچاوی بێ، حـەزی لـە بـەرگی ناسـك و نـەرم نـەبوو، بڕوای بەمانەوەی دنیا نەبوو، حەزی لە دانیشتن نەبوو، لە دڵی خۆی دەری كردبوو، حەزی لەچارەی نەبوو، ونیكردبوو لە بەرچاوی، ئەوەی ڕقی لە شتێ بـوو حـەزناكات تەماشای بكات و باس بكرێت، لەم كردارانەی پێغەمبـەر(صلى الله عليـه وسـلم) بـۆت دەرئەكەوێ خراپەی دنیاو عەیب و شورەییەكانی.

بەبرسـیەتیی دەژیـا لەگـەڵ ئـەوەی تایبەتمەنـدیی دنیـا و جوانییـەكانی لـەخۆ شاردبووەوە، لەگەڵ ئەو هەموو گەورەیی و ڕێزەوە كە هەیبوو، دەبا بـاش وردبێتـەوە ئەوەی بە عەقڵ و فام بیر ئەكاتـەوە، خـودا بـەم جۆرە ڕێـزی (محەممـەد)ی گرتـووە (صلى الله عليه وسلم)، یان بەكەمی داناوە، ئەگەر بڵێ بـە كـەمی دانـاوە درۆ ئـەكات، (قەسەم بە خوای گەورە) ئەگەر بڵێ ڕێزی گرتووە دەبێ بزانێ ڕژاندنی دنیا بەسـەر خەڵكی تـردا پژانـدنی بـۆ بەكـەم زانینـی دنیایـە دەنـا چـۆن لـە خۆشەویـستی خـۆی دەشارێتەوە و دەیداتە خەڵكی تر، دەبێ خەڵك پـەیڕەوی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـە وسـلم)ی خـۆی بـێ و شـوێنی ئـەو بكـەوێ و ڕەوشـتەكانی جێبـەجێ بكـات، ئەگـەر وانەكات نابێ دڵنیابێ لە نەفەوتان، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نیشانەی ئاخر زەمانەو مژدەدەری بەهەشت و ترسێنەری ئاگرە.

دەرچوونی لەدنیا بـە برسـیەتیی و گەیـشتن بـە قیامـەت بـە سـەلامەتی بـەردی لەسـەر بـەرد دانـا هـەتا بـاریكرد بـە ڕێگـەی خـۆی و بـە دەنگـی بانگـەوازی خـوداوە ئۆغری كرد، ئای چەند مەینەتی خوا لە سەرمان گەورەیە !، كە پێشینەیەكی وەهای پێـداوین دوایبكـەوین و ڕابـەرێكی وەهـای پێـداوین كـە لـە شـوێن پێـی ئـەو بـڕۆین، قەسەم بەخوا، ئەم كەڕەكە خورییەم لە پێ نەئەكرد و ڕووم نەدەهات لـە پینەكـەی، كە خەڵك هەبوو ئەیووت ئەوە بۆ فڕەی نـادەی، ئـەموت لەبـەر چاوم ونبـە، كـە ڕۆژ بووەوە ئەو كاتە سوپاسی ڕێبوارانی شەوڕەویی دەكرێ.

(١٦١)

## وتارێك له پەسەندی پێغەمبەرو ئال و بەیت و شوێنكەوتوان

خـودا ئـەو پێغەمبـەرەی(صـلی الله علیـە وسـلم) هـەناردووە بـەڕووناكیی تیشكبەخش، بـە بورهـان و دەلیلـی ڕوون، بـە پـەیڕەوی دیـارو ئاشكراو بەرچاو، بـە كتێبی شارەزاو دەسكێش، خانەوادەی لەچاكترین خانەوادەیـە، درەختـی بەفـەڕترین درەختە، لق و چڵی میانەیە، بەری نزم و دەسرەسە، بوونی لە مەككە بـووە و كۆچـی بۆ (تەیبە) بوو، كە بەڕۆیشتنی بۆ ئەوێ ناوبانگی بەرز بووە و دەنگی بـڵاو بـووەوە، خـودا بـە بەڵگـەی پێویـست ڕەوانـەی كـردووە بـە ئامۆژگاریی و پـەروەردەكاریی و بانگـەوازی فریـادڕەس و فریاكـەوتوو، هـەموو یاسـا و بـاس و دەسـتوورە چـاكە شاراوەكانی ئاشكرا كرد، هەموو بیرە بەد و پەست و نەوباوە ساختەكانی هەرەگـەورە هەڵكەند، فەرمانەكانی بەڕوونیی بۆ خەڵك بـاس دەكـرد كـە (هـەر كەسـێ بـەدەر لـە ئیسلام هەر دینێكی دیكەی هەبێ) ئەوە بە ڕاستیی لە داماویی و كلۆڵیدایە، دەست و دەسگیری لێبووەتەوە، كەوتن و سەرسمی زۆر زەحمەتە، پاشـەڕۆژی خـەم و خەفـەتی درێژخایەن و ئازاری سەخت و جەرگبڕی هەیـە، مـن پـشت بـە خـودا ئەبەسـتم و بـۆ لای ئـەو دەگەڕێمـەوە و داوای ڕێنمـایی تـەنها لـەو ئەكـەم، كـە ڕێگـەی بەهەشـتم پێنیشاندا و بەرەو لای خواستی خۆیم بەرێ.

## ئامۆژگاریی بۆ تەقواو پارێزگاریی

من بە توندیی ئامۆژگاریتان ئەكەم بەندەكانی خودا !، بۆ فەرمان بەجێهێنانی، چونكە سەرفرازیی سبەی تێدایەو تەنها ئەوە كە بگاتە فریاتان، خـودا بـە جـوانترین شێوە ترساندوونیی و ئاگاداری كردوون و بە شیرینترین شێواز مـژدەی داوە بـە كـۆی ڕسـتە ڕەوانبێـژەكان، بەچـاكی وەسـفی دنیـا و بڕانـەوەی بـۆ كـردوون، كـە دەڕواو لەناودەچێ، تكا ئەكەم ڕووتان وەرچـەرخێنن لـەو شـتانە كـە سـەرتان سوڕدادەمێنێ، چونكە لە دنیا ئەو جۆرە زۆر كەمە، ئەو ماڵی دنیا زۆر نزیكە لە ڕقـی خـودا و زۆرە لەڕەزایەتسی خوا، بەندەكانی خوا ! چاوتان داخەن لە ئاستی خـەم و خەفـەتی دنیـا، چـونكە بـە ڕاسـتی ئـەزانن كـە لێـی جیـا دەبنـەوە و ئـەویش بـە چـەندباردا خـۆی

ئەگۆڕێ، هۆشیاربن لە مەترسیی دنیا وەك کەسێکی هۆشیار و کارا، وەك فەردێکی زەحمەتکێش و بەئەرك و ئازا، پەندو ئامۆژگاریی وەرگرن لەچەرخە ڕابوردووەکانی پێش خۆتان، هەموو جمگەکانیان پوترکاون و بلاو بوونەتەوە، نەگوێ و چاویان ماوە و نە شکۆو شەرەف و مەزنایەتیان، خۆشیی و کامەرانیی و بەختەوەرییان تیاچووە، لە جیاتی نزیکبوونەوە لە وەچەکانیان جیا بوونەوە و لەباتی هاوسەریی، خێزانەکانیان دوورکەوتنەوە، شانازییان نەما، هاوکاریی و یارمەتییان نەما، منداڵبوون و وەچەخستنەوەیان بڕا، دیدەنیی و هاتووچۆیان نەما، بەیەکەوە بوون و نزیکییان نەما.

کەواتە ئەی بەندەی خودا !! ترست هەبێ وەك ئەو کەسەی توانای بەسەر خۆیدا ماوە، ئەتوانێ جڵەوی خۆی ڕاگرێ لە ئارەزووی ناپەسەند، بەچاوی عەقڵ ئیش بکات، ئەو کارە ئاشکرایە، ئاڵای دیارییە، ڕێگە تەختە، ڕۆشتن مەبەستە.

## (١٦٢)

## وتارێك بۆ یارێکی کە پرسی: ئەوە چۆن خزمان تۆیان وەلاناوە و تۆش شایستەی؟

فەرمووی، برای خێڵی کوڕانی ئەسەد ! تۆش تەنگە و قەیاسەی، لەخۆتەوە قسە تورئەدەی، هێشتا ئاسەواری ژن و ژنخوازیی لەسەرت ماوە و مافی پرسیار بەخۆت ئەدەی و ئەو حەقەت جێبەجێکرد، کەواتە بزانە ئەو ستەم و بێدادییە لە سەرمانە لەم جێگەدارییەدا کە ئێمەش لە هەموو کەس بەرزترین بە پشتداو نزیکترین کەسین پەیوەست بە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە داگیرکردنێك بوو کە هەندێ کەس ڕەزیلیی تێدا کرد و هەندێکیش دەستگوشاد بوون تێیدا، دادوەر خودا و پەناش هەر ئەوە لە قیامەتدا، (وازبێنە لەو تاڵانییە کە بەهات و هاوار دەستت کەوتووە لەو ناوچەیە، بەڵام وڵاخی سواریی قەیدی نییە گەڕانەوەی بۆتان) !، بەڵام باس لەوە بکە بەڵا و کارەساتی کوڕی (ئەبو سوفیان) کردی چەرخ و زەمان منی هێنایە پێکەنین، پاش بەگریانهێنانی ئەو، ئەوەش قەسەم بەخوا، سەیر نییە، ئەوە کارەساتە کە سەرسوڕیی ناهێڵێ و لاریی و خواریی فراوان ئەکات، ئەو خزمانە

ويستيان شۆڵەی چرای خودا بکوژێننەوە، سەری چەشمەی کانییەکە بگرن، جامێ ئاوی تێکەڵاو بە ژەهریان کردە نێوان من و ئەوان، ئەگەر ئێش و ئازاری ئاژاوەی نێوان من و ئەوان کۆتایی هات، ئەوە مافی پاك و پاڵفتەی خۆمیان بەسەردا دەسەپێنم، خۆ ئەگەر جۆرێکی کەبوو، ئەوە (نەکا لەبەرخەمی ئەوان تێدا بچی، خودا ئەزانێ ئەوانە چ کارێك ئەکەن).

(١٦٣)

## وتارێك لەبارەی خودای بەدیهێنەری بەرز و بەتوانا

ستایش بۆ خودا بەدیهێنەری گشت بەندەکان، تەختکاری دەشت و نەوییەکان و درووستکاری شەتاوی شیو و دۆڵەکان و بەپیتکردنی بەرزاییەکانی خاك و زەمین، نە یەکەی سەرەتای هەیە و نە تەواوبوونی کۆتایی هەیە، یەکەمەو هەر بووە و ماوە و بێ تەواوبوونە، ناوچاوان بۆ ئەو کڕوش دەباو دەم و لێو یەکتاپەرستیی ئەو دەکەن، سنووری هەموو بوونەوەری جیاکردووەتەوە و هەریەکە لەویتر جیاوازە، وەهم و خەیاڵ ناتوانێ چەند و چۆنی بۆ بکات، نە بە دەست و ئەندام و نە بە ئامێر، هەرگیز ناوترێ (کەی) و هەرگیز کاتی بۆ دیاری ناکرێ بە (هەتا) ئەوەندە دیارە، (لەچی) بۆ نابێژرێ، ئەوەندە پەنهانە ( لەکوێ)ی بۆ ناگوترێ.

تارمایی نییە هەتا بۆی بگەڕێی، نادیار نییە هەتا شاراوە بێت، نزیك نەبووەتەوە لە شتەکان بە پێوەلکان و دووریش لێیان بە جیابوونەوەی تەواو، هیچ کارێکی بەندەکانی لێشاراوە نییە، بەقەدەر چاوتروکانێك یان بێژاندنی وشەیەك یان دەرکەوتنی گردێك، بە یەکەم ڕوانین یان هەنگاوێك لەشەوێکی تاریك و نووتەك و لەشەوێکی کش و مات کە سێبەری مانگەشەوێکی زۆر ڕووناك لەسەری نەماڵێ، کە خۆری بەشۆڵە لە هەڵهاتن و ئاوابووندا بەدواوەیەتی، نەگۆڕانی کات و سات بەسەریا دێ، نە بەهاتنی شەوی و بەڕۆشتنی ڕۆژ، پێش کۆتایی و ماوەی لێشاراوە نییە، دوورە لە ئامار و ژمارە، خودا لەوە بەرزترە کە سنووردانەران بۆی دادەنێن، لە نیشانەکانی چەندو چۆن و ئەندازەی درێژیی و پانیی و قووڵیی و کێش و کۆتاییەکانی گشت ڕەهەندەکان، نیشانەو تایبەتمەندییەکانی شوێن و جێگەی و وێنە

و شکڵی گشت بوونەوەران، ئەو سنووردانانە تەنها بۆ دروستکراوەکانی ئەوە، بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە و لەخوداوە دوورە.

## دروستکردنی خەڵك بێ نموونەی پێشین

خودا ئەو هەموو بوونەوەرەی دروستکردووە، لە پێش و ئەزەلدا بوونی نەبووە، دروستیکردووە و سنووری بۆ هەر یەکێك داناوە و وێنەی کێشاوە و بەجوانیی ڕەنگی داڕشتووە، هیچ کام توانای نەکردنی نەبووە و هیچ کام لەوانە بۆ سوودی ئەو نەبووە، زانستی بەمردووە کۆنەکان وەك زانستی بەزیندووەکانە، زانستی بەئاسمانە بەرزەکان وەك زانستی بەناوی هەموو زەوییەکانی خوارەوە وایە.

ئەی ئەو کەسەی کە بەڕێك و پێك و بە پارێزراو و دروستکراویی لە ناو تاریکییەکانی منداڵدان و پێچ و لۆچی پەردەکان !، ئەزانی دروستکراوی لە (قوڕێکی خۆشەکراو) و بە ئاسانیی دانراوی لە (بنکەیەکی پتەودا)، (هەتا کات و ساتی دیاریکراو) و تەمەنێکی دابەشکراو، لە جوڵەو بزاوت لەناو سکی دایکدا، توانای بانگ و هاوارت نییە و بانگ نابیستی، لەو شوێنە دەرکراوی بۆ جێگایەك کە لە پێشەوە نەتدیوە و سودوقازانجی لات نەزانرا بوو، ئەوە کێ فێری کردی خواردن لە مەمکی دایکت بمژی؟ کێ فێری کردی کاتی پێویست و بەئارەزووی خۆت ئەندامەکانت بەکار بێنی؟ زۆر دوورە ئەو کەسەی نەتوانێ پێناسەی دەزگاو ئامێرەکانی خۆی بکات، توانای ناسینی سیفەتەکانی دروستکاری خۆی بکات، بە پێوانەو کێشانەی دروستکراوەکان زۆر دوورترە.

(١٦٤)

## وتارێك لەوکاتەی خەڵك سکاڵایان کرد لە عوسمان و داوایانکرد کە قسەی لەگەڵ بکات و گلەیی لێ بکات

ئەو خەڵکەی لەدەرەوەیە، منیان کردووە بە نوێنەر لە نێوان تۆو ئەوان، قەسەم بەخوا، نازانم چیت پێبڵێم، شتێ نییە من بزانم و لە تۆ پەنهان بێ، شارەزات ناکەم لەسەر کارێ کە تۆ نەیزانی، ئەوەی من ئەیزانم تۆش ئەیزانی، پێشبینیی ناکەین لە

شتێ و هاتبين ئاگادارت بکەين، بە نهێنيـی لەسـەر شـتێ ڕێکنەکەوتووين و بمانـەوێ ئاگـادارت بکـەين، تـۆ خـۆت ئـەوەی ئێمـە ئـەبينی، ئـەوەی ئێمـە بيـستومانە تـۆش بيستوتە، تۆ ياری پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم)، وەك ئێمە ياری بووين، هەرگيز کوڕی (ئەبی قوحافە و کوڕی خـەتتاب) لـەتۆ شايـستەترنين بـۆ ئەنجامـدانی حـەق و ڕاسـتيی، تـۆ نـزيکترِی لـە پێغەمبـەرەوە(صـلى الله عليـە وسـلم) لـە ڕووی تێکـەڵيی و نزيکيی، تۆ بويتە زاوا کـە ئـەوان نەبوونەتـە زاواو، خـەزوربوون، حەواڵـەی لای خـوا بيت بگەرە فريای خـۆت، چـونکە تـۆ قەسـەم بـەخوا شـتی ناڕوونـت نيـشان نـادرێ و فێری شتی نەزانراو ناکرێی، هەموو ڕێگە چارەيەك ڕوونە، نيعمەتەکانی ئـايين وەك خۆی ماوە، کەواتە جـەناب ئاگادارِبـە چاکترين بەنـدەی خـوا لای خـودا پێـشەوايەکی دادپەروەرە !، ڕێگەی نيـشان درابـێ و لەسـەری بـڕوا و ڕەوشـتە بـەرزەکان دياريـيە و پەيڕەوی بکات، هەموو نەوبـاوێکی بەدو خوار بەرپـەرچ بداتەوە، ڕەوشتەکان ڕۆشن و ڕوونن، نيشانەيان ديارە، نـەوباوە خراپـەکان ئاشـکرايەو نيـشانەی هەيـە، لـە هـەموو کـەس بـەد و خـراپتر ڕابـەرێکی ستەمکارە خـۆی ڕێـی ونکردبـێ و خـەڵکيش گـومڕا بکـات، سـوننەتی وەرگـيراو بفـەوتێنێ و بيدعەيـەکی بينـراو زينـدوو بکاتـەوە، لـە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم)بيستووە ئەی فەرموو: لـە ڕۆژی قيامەتـدا پێـشەوای ستەمکار دەهێنن کەسی هاوکار و هـاوڕازی لەگـەڵ نيـيە، کـەس پاسـاوی بـۆ بـدات و عوزرخـوايی بـۆ بکـات، دەخرێتـە نـاو ئـاگری دۆزەخ، دەسـوڕێتەوە وەك بـەرداش و لەپاشان فڕێ دەدرێتە بنی دۆزەخ، بـە پێوەنـدکراويی... لـە بـەر ئـەوە مـن داوات لـێ ئەکـەم کـە نەبيتـە پێـشەوای ئـەم ميللەتـە، چـونکە نەبێـژرێ کـە لـەم ئۆممەتـەدا پێشەوايەك ئەکوژرێ دەبێتە هۆکاری کوشت و کوشتار، هەتا ڕۆژی قيامەت بـەردەوام دەبێ و کاريان لێ دەشێوێ و ئـاژاوە لـەناويان بـڵاو ئەبێتـەوە، ئـەوکات حـەق و باتـڵ لەيەك جيا نابێتەوە، لە گێژاويدا دێن و دەچن و بەيەکدا دێن و دەڕۆن.

کەواتە نابێ تۆ خۆت بکەيتە بارەبەری (مەروان)، بـۆ هـەرکوێ ئـارەزووی هـەبێ بتبا، پاش ئەو تەمەنە بەرزە و ئەو کاتە زۆرەی بەسەرت بردووە، ئـەوجا (عوسمـان) پێيوت قسە لەگەڵ خەڵك بکە، ماوەم بدەن هەتا هەموو سکاڵا و داخوازييەکانيان بـۆ جێبەجێ ئەکەم، ئەوجا (عەلی) فەرمووی: ئـەوەی لەشـاری مەدينەيـە ئـەوە مۆڵـەتی نييە و ئەوەی ديار نييە و دوورە هەتا فەرمانی تۆی پێ ئەگات مۆڵەتە.

(١٦٥)

## وتارێك كە باسی جوانیی تاوس ئەكات لەگەڵ باسی باڵندە

## (دروستكردنی باڵندەكان)

**خودا ئەوانەی بەبێ نموونە و نیشانەی پێشین داهێناوە، بە شێوەیەكی سەیر و عەجیب لە مادەی گیانلەبەر و بێگیان، بێ جووڵە و بە جووڵەن، ئەوانەی كردووە بە شایەت لە سەر ناسكیی دەسكردیی و توانای بەرزی، كە هەموو عەقڵ و ژیریی سەری نەوی كردووە بۆی و دانی پێداناوە و خۆیداوە بەدەستەوە، دەلیل و بورهانەكانی لەگوێماندا ئەزرنگێتەوە، كە خوا تاكە و تەنیایە، ئەوەش لە نموونەی وێنە زۆرەكانی باڵدار، كە لەناو درزی زەویدا و لە ناو ڕەگ و ڕێچكەی زەوی و سەری بەرزی چیاكاندا درووستی كردوون، بەزۆر شێوەی باڵ و پەڕو شێواز و ئاماژەی جیاجیا، كە بە ئارەزووی خۆیان بەكاری دێنن بۆ ئیش و كاری خۆیان و پێی ئەفڕن و دەیشەكێننەوە لە بۆشایی و دەشتی ئاسماندا و لە چۆڵایی پان و بەرین و بەربلاودا، خودا ئەوانەی درووستكردووە بەبێ وێنەیەكی پێشینی كە وێنەی بگیرێت، پێكەوەی گرێداون لە جمگەو دایپۆشیوون بە گۆشت و پەڕو ڕەگ و پێست، هەندێك لەبەر قورسیی توانای فڕین و بەرزبوونەوەیان نییە لە هەوادا و بەشێوەی باڵەتەپە و قونەی سەر زەوی دەڕۆن بەڕێوە، ڕەنگەكانی بە هەموو جیاواز بە یەكەوە ڕێكخستووە، زۆر بە جوانیی و ناسكیی و وردیی كارسازیی بۆ كردووە، لەوانەدا هەیانە وەك لە بۆتەیەكدا داڕێژرابن هەموو وەك یەك ڕەنگ درووستكراون و هەندێكیش بەشێك لە لەشیان بە ڕەنگی جیا نەخشی كراوە.**

## تاوس

لەناو ئەو باڵدارە جوان و سەرسوڕهێنەرانەدا تاوس درووستكراوە، كە بەژن و قەد و باڵی زۆر جوان ڕێكخراوە و گشت ڕەنگەكان داڕێژراون، لە جوانترین شێوازدا **هۆنراوەتەوە، لە باڵێكی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕیزكراوی كورت و درێژ و لە ژێر دەسەڵاتی**

خاوەنەکەی، کلکی درێژی داوەتێ، کە ئەتوانێ بڵاویکاتەوە و بەرزی بکاتەوە، ئەگەر بڕوات بۆ لای (مێ)یەکەی دەفقی پێچراوەی بڵاو ئەکاتەوە و بەرزی ئەکاتەوە بۆ سەر پۆپەی، وەك چەتر سێبەری بۆ ئەکات، وەك کەشتیی چارۆکەدار بەرزکردنەوە و نزمکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەئارەزووی خۆیەتی، فیزو شانازی بەو ڕەنگە جوانانەوە ئەکات و پەڕەکانی کلکی هاتووچۆ پێئەکات و نازو عیشوەی پێئەکات، بۆ (مێ)یەکەی هەر وەك کەڵەشێر کە ئەپەڕێ لەگەڵ (مێ)ینەکەی درووست ئەبێ، وەك حوشتری تازەپێگەیشتوو ئەپەڕێ، حەز ئەکەم ئەگەر تەماشای بکەیت بەچاوی خۆت کاتی ئەنجامدانی پەیوەندیی (نێر) و (مێ) ببینیت، ئەوەی من بۆت باس ئەکەم ڕاستە، نەوەك ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە دەڵێ بە بەڵگەی لاوازەوە، خۆ ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە پەیوەندیی (نێرو مێ) بە (دڵۆپە)یەکە لە چاوی دێتە دەرەوە و لە هەردوو کەناری پێڵوی ئەوەستێ و (مێ) کەی دەیخواتەوە و ئەوجا هێلکە ئەکا و هەرگیز لەیەك پەڕینی نییە، بەڵکو تەنها ئەو فرمێسکەیە، ئەگەر ئەم بۆچوونە ڕاست بێ لە پەڕینی قەلەڕەشە سەیرترە، لاسکی پەڕەکانی وەك دانەی زێڕو زیوە، وەك هاڵەی ناو مانگ، وەك زێڕی پوخت و ساغ و دانەی گەوهەر و مرواریی، لەسەر نەیجولی باڵەکانی نەخشکراوە، ئەگەر بتەوێ بیچوێنی بە گوڵاڵەی سەر زەوی، دەڵێی تاجەگوڵینەیە و دەسکێ گوڵی هەمەڕەنگەی بەهارە، یان ئەگەر هاوتای بکەی بە بەرگ و کاڵای ڕەنگاوڕەنگ، ئەڵێی شاڵی نەخش و نیگارە بەگەوهەر و یاقوت و لەعلی یەمەن، خۆ ئەگەر بتەوێ لەگەڵ خشڵدا بەراوردی بکەی ئەوە وەك نقێمی ڕەنگاو ڕەنگە لە سەر پێستی زیوین، زۆر بە کەشخەو لە خۆبایی و کەیف و خۆشیەوە دەڕوات بەڕێوە، زۆر بەفیزەوە تەماشای کلك و باڵی ئەکات، زەردەخەنە دەکات بۆ جوانیی کەواو کراسی ڕازاوەی بەری و سوخمەو بەرمورو ملەوەنی مرواریی و گەوهەری پێوە دوراوە و لەسەر سنگ و باڵی هەتا کەمەربەندی.

بەڵام کە چاوی شۆڕ ئەکاتەوە بۆ قاچەکانی بانگی بێ شەرمی و لەخۆ بوونەوەی بەرز ئەبێتەوە وا ئەزانی شیوەن ئەکات و لاوانەوەی خەم و شەرم ئەکات، کە بەڵگەی ئێش و ئازاری شاراوەیەتی، چونکە قاچەکانی باریك و ڕووت و درێژە وەك مریشکی شامی، کە لە پاژنەکەی دڕکێك سەوز بووە، پێی وەك مریشك دێتە بەرچاو، لەسەر پۆپکەی گودلەیەك بەرز بووەتەوە، سەوز دەنوێنێ و نەخشکراوە، ملی وەك دەمی

مەسینە درێژ بووە، دوراوە بە ناو سکیەوە، وەك ڕەنگی وسمە ڕەشە، یان وەك پارچە ئاوریشمێك کە ئاوێنەی پێ پاك کرابێتەوە، یان وەك سەرپۆشێکی ڕەش کە سەرو مل و هەندێ لە سنگی بەکارهێنەری داپۆشیبێ، بەڵام لەبەر زۆریی ئاوی و بریسکەی بەهێزی وا ئەزانی سەوزە کاڵەکەی بەو ئاوە تێکەڵە، لە ناو کونی گوێیدا هێڵێك وەك باریکیی قەڵەم لە ڕەنگی گوڵە بەیبوون سپی زۆر سپی، کە لەبەر سافیی و بریسکەیی لەگەڵ ڕەشیی تیشك ئەپڕژێنێ، کەم ڕەنگێ هەیە کە بەشی تێدا نەبێ و سەری ساف و بە پرشنگ و جوان و ڕەونەقی نەدابێتەوە، بە ڕاستیی وەك چەپکێك گوڵە کە بڵاوکرابێتەوە و بارانی بەهار بەخێوی نەکردبێ و خۆری گەرمی تاوسان سیسی نەکردبێ، زۆر جار پەڕەکانی دەرئەخات و بەرگ و کاڵای دائەکەنێ و لەسەر یەك ئەوەرێ و زۆر زوو شین دەبێتەوە، لە پەڕە نەیجولییەکەی دائەماڵێ، وەك گەڵای پەلکدار پاش کەمێك سەوز دەبێتەوە، وەك پێش وەرینەکەی بە بێ ئەوەی ڕەنگی تازەپەڕەکان جیاواز بێت لە پەڕە وەریووەکان، هیچ ڕەنگێك لە شوێنی ڕەنگیکە دەرنایەت، ئەگەر ورد تەماشای یەك پەڕی بکەی لە شاپەڕەکانی سوورێکی گوڵباخیی ئەبینی و هەندێ جار سەوزێکی پیرۆزەیی، هەندێ جار زەردێکی ئاڵتونیی، باشە چۆن زیرەکیی و بیرتیژیی دەچێتە ناو ناسینی ئەم شێوەیە، یان بیرتیژیی عەقڵ چۆن بڕی ئەکات، یان چۆن هۆنەر دەتوانێ بەڕستە بیهۆنێتەوە، کە بچووکترین پەڕی وەهم و خەیاڵ نەتوانێ وەسفی بکات و زمان نەتوانێ پێیدا هەڵدا.

کەواتە پاکیی و بێگەردیی بۆ ئەو خودایە کە عەقڵی دەستەوسان کردووە، لە وەسفی درووستکراوێکی کە لەبەر دیدی خەڵك داناوە، هەر ئەوەندە ئەزانێ شتێکی سنووردارە، پێکهاتەیەو بەیەکەوە ڕێکخراوە و پاڵی لێداوەتەوە، ڕەنگاو ڕەنگەو زمان کۆڵە، لە پوختەو کورتکراوەی وەسفی و پاڵی لێداوەتەوە و دانیناوە بە نەتوانین.

## هەندێ بوونەوەری تر

پاکیی و بێگەردیی بۆ ئەو زاتەی کە گشت قاچ و پێی مێروولە و مێشوولەی لەناو پەیکەریدا داناوە و بۆ لەم دوانە گەورەتریش وەك نەهەنگ و فیلەکان و بەڵێنیداوە بۆ هەر تەنێك، تارماییەك، کە گیانی تێدا بێت، مردنی بۆ داناوە و تیاچوون کۆتایی پێ دێنێ!.

## باسی بەهەشت

ئەگەر بەچاوی دڵت ورد تەماشای ئەو باسەی بۆت ئەکرێ لە وەسف و مەدحی بەهەشت، ئەوە قێزو بێزت دێتەوە لە نەوجەوانترین بەرهەمی زەوی لە دنیا و ئارەزوو و چێژی لێنابینی، ڕەنگ و ڕوخساری جوانت لە بەرچاو ئەکەوێ، ئەو کاتە نەفست بیرت لائەدا لە مەیلی دنیا، ڕیزی دارەکان کە ڕەگیان لەناو گردی میسکداو سەریان ناوەتە ناو یەکتریی و شنەی سروەی فێنك بەناویدا تێ ئەپەڕێ، لە کەنار جۆبارەکان و ڕۆخی ڕوبارەکان کە چۆن هێشوو و بۆشکی خورما شۆڕبوونەتەوە، وەك دانە مرواریی لەناو پەلك و خەڵفە ناسکەکانیدا، دەرچوونی ئەو بەروبوومە کە جۆرەها و ڕەنگاو ڕەنگە، لەناو کاسەی گوڵەکاندا بەنازکیی دەرچوون و بێ ئازارو ماندوو بوون دەچنرێن و لەسەر خواست و ئارەزووی باخەوانەکەی و بە سەر دانیشتواندا دابەش دەکرێ لەناو هەیوان و حەوشی کۆشکەکاندا، لەگەڵ جامی پڕ لە هەنگوینی پاڵفتە و شەرابی ئەقیقی گەش، کەسانی وا هەیە کە ڕێز لێنانیان باڵی کێشاوە بەسەریانا لەو کاتەدا لە هەواری هەمیشەدا جێگیر بوون و دڵنیا بوون لە ئازوگوێزی سەفەرکردن.

برای گوێگر...! ئەگەر دڵت بدەیتە ئەو دیمەنە جوانانە کە بۆی دەچی لە خۆشیدا ڕۆحت دەردەچێ و پەرواز ئەکات بۆ ئەو شوێنە دڵفرینە، پەلەی پێئەکا، خودا ئێمە و ئێوەش لەو کەسانە هەوڵیان بۆ شوێنی چاکانە دابنێ.

(١٦٦)

## وتارێك بۆ هاندانی هاوڕازیی

داواتان لێ ئەکەم بچووك پەیڕەوی گەورە بکا، با گەورە بەزەیی و خۆشەویستیی بۆ بچووك هەبێ، وەك دەشتەکییە وشکەکانی چاخی نەفامیی مەبن، نە لە ئاینداریی تێ گەیشتبوون و نە لە خودا پەرستییدا زیربوون، وەك توێکڵی هێلکەی نەعامە کە لەناو لدا دەیشارێتەوە و خەڵك وا ئەزانن هێلکەی قەتێیە، شکاندنی تاوانەو مانەوەشی خراپەیە، چونکە لەوانەیە هێلکەی مار بێ.

## لەبارەی خێڵی ئومەییە

ئەمانە ناكۆك بوون پاش ئەوەی یەك دەنگ بوون، جیا بوونەتەوە لە ڕەگ و ڕیشەی خۆیان، هەندێكیان خۆی هەڵواسیوە بە تولێكی تەڕا بۆ هەر لایەكی بەری لەگەڵی ئەڕوا، بەڵام خودای بەرزو گەورە كۆیان ئەكاتەوە بۆ خراپترین ڕۆژی خێڵی ئومەییەو، وەك پەڵەی هەوری پایز خودا كۆیان ئەكاتەوە و ئەیانكاتە هەورێكی چڕوپڕ، ئەوجا دەرگایان لێئەكاتەوە وەك لافاوی وێرانكار لە حەشارگەیان ئەكشێن وەك لافاوەكەی بەنداوی سەبا كە دوو وڵاتی وەك بەهەشت وێرانكرد، تەنها خاكێكی تەخت نەما وێرانی نەكات، هیچ گردو دۆڵێك ڕزگاری نەبوو لە دەستی لە پەلامار، چیاش نەیتوانی بەری بگرێ هەتا زەویی سەخت و ڕەقی ڕامالێ، خوا بڵاویان ئەكاتەوە لە ناو شیوەكانی زەویدا و سەرچاوەكانیان لێپەیا ئەكا، بەهۆیانەوە مافی لایەنێك ئەدرێ بەلایەنێكی دیكە، خەڵك لە جێگەی خەڵكیكە نیشتەجێ ئەكەن، لە سەر ماڵ و خاكیان، سوێندم بە خوا، ئەوەی بەدەستیانەوە هەیە ئەتوێتەوە وەك چەوریی دوگ ئەتوێتەوە لە سەر ئاگر.

## خەڵكی ئاخر زەمان

خەڵكینە..! ئەگەر ئێوە سستیی و تەمەڵیتان نەكردایە لەیارمەتیی حەق و بێپەروا و بێخەم نەبوونایە لە پەستیی و لابردنی ناحەق و ناڕەوا، ئەوە تەماعی نەئەكردە ئێوە كەسانێ كە وەك ئێوە نین، نەیان ئەتوانی زاڵبن كەسانێ كە وەك ئێوە بەهێز نیین، بەڵام ئێوە سەرلێشواو بوون وەك كوڕانی ئیسرائیل لە جێگەی خۆیان ونبوون، (بەوخودایەی كە تەمەنی منی بەدەستە) پاش من زیاتر سەر لێشێواو و ڕێونكەر دەبن، چونكە ئێوە حەق و ڕاستیتان پشتگوێ خستووە و وازتان لە خزمی نزیك هێناوە و چوون بۆ لای دوور، ئەوەش بزانن ئەگەر بە گوێی داواكاریی خۆتانەوە بچن ئەوە بە ڕێگەی پێغەمبەرتان(صلی الله علیه وسلم) ئەبا ئەوكات ئۆباڵی ستەم و بێفەرمانیتان نابێ، ئەو قورسیی و تەمەڵییە لەسەر شانتان نەدەبوو.

(١٦٧)

## وتارێك لەسەرەتای بوونی بە خەلیفە

خودای پاك و بێگەرد کتێبی ناردووە و خێرو شەڕی جیا کردووەتەوە، ئێوە دەست بگرن بە خێرەوە دەرباز ئەبن لە ڕێ، خۆتان لادەن لەشەڕ دەگەونە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەرکەکانی خودا پێویستە ئەنجامی بدەن ئەتانبات بۆ بەهەشت، خودا هەندێ شتی قەدەغە کردووە کە نەناسراو نییە، هەندێ شتی حەڵاڵ کردووە کەشتی تری تێکەڵاو نەبووە، ڕێزی موسڵمانی لەسەرووی هەموو ڕێزەکانەوە داناوە، دڵسۆزیی و یەکتاپەرستیی بەستووە بەمافی موسڵمانانەوە و گرێیداوە بە ئەستۆتانەوە، موسڵمان ئەوەیە موسڵمانان لە دەم و دەستی بێزیان بن، مەگەر بە حەقی خۆی، درووست نییە ئازاری موسڵمان مەگەر واجب بێت، پەلە بکەن لە ئەنجامدانی ئەرکی گشتیی و تایبەتی خۆتان کە مردنە، چونکە خەڵك لە پێشتانەو دەمـژمێر لە دواتانەوەیە، هەوڵ بدەن بارتان سووك بێ، زوو ئەگەنە جێ، بەرودواتان چاوەڕوانییە، لە خوا بترسن لە خەڵك و خاك، ئێوە بەرپرسن لە خاك و بێزمانیش، بە فەرمانی خودا بکەن و بێ فەرمانیی مەکەن، چاکەتان دەستکەوت بیکەن، شەڕتان بینی، خۆتانی لێلادەن.

(١٦٨)

## وتارێ کە پەیمانی خەلافەی بۆ درا

هەندێ کەس وتیان ئەوانەی بوونە هۆی ئازاری عوسمان سزای بدەو وتی: براکانم من بێئاگا نیم لەوەی ئێوە ئەزانن، بەڵام هێزم لە کوێ بوو؟ ئەوانەی ئەو بەڵایان ئەنجامدا ئێستەش بەدەسەڵاتن، ئەوان زاڵن بەسەر ئێمەدا، توانایان هەیە و ئێمە نیمانە، ئەوەتا بەندەو کۆیلەکانتان لەگەڵ ئەوانن، عەرەبە دەشتەکییەکانیش لەدەوریان خڕبوونەتەوە، ئەوانە تێکەڵاون بە ئێوە، هەرچی ستەمێ بیانەوێ لە ئێوەی ئەکەن، ئێوە تواناتان هەیە بۆ ئەوەی داوای ئەکەن، ئەمە کاری نەفامییە و ئەمانە یارمەتیدەریان هەیە و بە پشت و پەنا کارئەکەن.

ئـەو خەڵکـە لـەم بـارەوە ئەگـەر بیجـوڵێنی چـەند جـۆرە، هەنـدێك وەك ئێـوە بیرئەکەنـەوە، هەنـدیَ دژی ئـەوەی ئێـوە بیرئەکەنـەوە، هەنـدێك نـە ئەولایـە و نـە ئەملایـە، تامـڵ بکـەن هـەتا خـەڵك هێـور ئەبێتـەوە و دڵـەکان دائـەمرکێن و دێنەسەرخۆ، حەق و ڕاستییەکان خۆیان دەرئەخەن، ئێوە کەمێ هێور ببنەوە، لە کۆڵی من ببنەوە، ماوەم بدەن بەوەی بزانن چی ئەکەم و چی بـە ئێـوە ئـەڵێم، کـاریَ مەکـەن کـە هێزێـك بڕوخێنـێ و توانایـەك لەباربـەری و بێتـە مایـەی لاوازیـی و بێتوانایی، ئەو کارە بەتوندیی ئەگرم، هەتا توند بێ، خۆ ئەگەر هەر بۆم نەکرا کۆتـا دەرمان داخکردنە!.

(١٦٩)

## وتـارێك کاتی چوونی یارانی جەمەل بۆ بەسرە

خـودای بـەرزو بـالا پێغەمبـەری(صـلی الله علیـە وسـلم) ڕەوانـە کـردووە، ڕێنیشاندەرە، بە کتێبێکی گۆیاو زماندارو فەرمانێکی ڕاوەستاو، کەس لەسەری تێـدا ناچیَ، مەگەر خۆی خۆی لەناو بەریَ، ئەوەش بزانن کە ڕەوشتە نـەوباوەکان و کـارە گوماناوییەکان ئەوانەی خەڵك ئەفەوتێنن مەگەر خودا پەنای کەسێ بدا، مانـەوە لـە ژێر دەسەڵاتی خوادا پاراستنە بۆ ئەم کارەی ئێوە، ئێوەش شـانبدەنە بـەر فـەرمانی خودا، بە بێ بۆڵە و خورتەو نابەدڵیی.

قەسەم بە خوا، ئەوە نەکەن خودا دەسەڵاتی خۆی لە ئێوە دەسێنیَ و دەسـەڵاتی ئیسلام ئەگوازێتەوە و جارێکیتر نایەتـەوە بـۆ لاتـان، هـەتا لەوانـەوە نەگەڕێتـەوە بـۆ لایەکیتر.

## دوورخستنەوەی خەڵك لە نەیارانی

ئەم تاقمە یەکیانگرتووە و هاوڕازی یەکن، لـە ڕقەبـەریی مەزنایـەتیی مـن و منـیش تامـڵ ئەکـەم هـەتا تـرس لـە ئێـوە پەیـدا نەکـەم، بەڕاسـتی ئـەوان هـەلیان وەرگرتووە، لە لاوازیی موسڵمانان و تێکچوونی یاسایان، ئەوانـە دنیاویـستن و ئیرەیـی ئەبەن بەو کارەی خودا بەخشیویەتی بەکەسی ترو ئەیانەویَ هەڵیگێڕنەوە بۆ دواوە،

ئێوە ئەوەتان لەسەر منە کە بە کتێبی خودا کار بکەم، ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بگرم و بە ئەرکی ڕاستیی هەستم و سوننەتەکانی بەرز ڕابگرم.

( ۱۷۰ )

## وتارێك لەبارەی پێویستیی شوێنکەوتنی ڕاستیی لەکاتی بوونی دەلیل و بەڵگە

هەندێ عەرەب ئەو دەستەواژەی سەرەوەی وت کە کۆمەڵێك لە بەسرەوە ناردبوویان کە پێشەوا نزیك بووە لە بەسرە، کە گوایە نازانن حەق لای کێیە و دەیانەوێ بزانن کە پێشەوا نیازی چییە لەگەڵ کۆمەڵی جەمەل بۆ لابردنی گومانیان، ئەو کاتە پێشەوا ڕای خۆی پێگوتن، پاش ئەوە پێشەوا وتی: دەی تۆش مبایەعە بکە، وتی: من نوێنەری ئەو خەڵکەم هەتا نەگەڕێمەوە هیچ ناڵێم، ئەو کاتە پێشەوا وتی:

باشە ئەگەر ئەوانەی تۆیان ناردووە و بڕوایان بەپەیام و گەیاندنی هەیە وا تۆیان ناردبێ کە بزانێ لە کوێ باران باریوە و تۆش گەڕایتەوە و بۆت باسکردن، لە ئاو و گیا و ئەوانیش بەم قسەی تۆ، هاتن و چوون بۆ شوێنی وشکەساڵیی، تۆ ئەو کاتە چی ئەکەی؟ عەرەبەکە وتی: بەگوێیان ناکەم و خۆم ئەچم بۆ ناوگیاکە، ئیمام فەرمووی: کەواتە دەست بدە، ئەوکاتە پیاوەکە وتی: قەسەم بەخوا، توانام نەبوو کە زانیم عەلی لەسەرحەقە لەبەر ئەوە پەیمانم پێدا، ئەم پیاوە ناوی (کولەیبی جەرمیی)یە.

( ۱۷۱ )

## وتارێك کە نیازی ڕۆیشتنی هەبوو بۆ سیفین

خودایە... تۆپەروەرشی ئەم سەربانە بەرزەی، دروستکاری ئەم کەشە بەسراوە ڕاگیراوەی کە شەو و ڕۆژت لێدرووستکردووە و کردووتە بە شوێنی سوڕی خۆرو مانگ، شوێنی هاتووچۆی ئەستێرە گەڕۆکەکان و دانیشتوانی لە فریشتەیە و خەڵکێکی ماندوونەناس لە بەندایەتیی تۆ، پەروەردگار، ئەم زەویە کە کردووتە بە

شوێنحەوانەی بەشەر و شوێن سوڕەکانی ژیانی مارو مێروو و ئاژەڵ و ئەو هەموو بوونەوەرەی کە ئەبینرێ و نابینرێ.

بنیادنەری چیا بڵند و بەرزو سەختەکان کە مێخی زەویت پێڕاگرتووە و کردووتە بە شوێنی خۆحەشاردانی بەندەکانت و خەڵك پشتی پێدەبەستن لە تەنگانەدا[٢]، ئەگەر تۆ سەرمانخەی بەسەر نەیاراندا، داوا ئەکەم بمانپارێزی لە ستەم و یاخیبوون و ڕێگەی ڕاست و حەقمان نیشانبدە و ئەگەر ئەوانت سەرخست بەسەر ئێمەدا داوا ئەکەین شەهیدیی بکە بە بەشمان و لە فیتنە بمانپارێزە.

## لە جەنگدا

لە کوێن پاسەوانانی ماڵ و نامووس و شەرەف؟ لە کوێن پیاوە غیرەتمەندەکانی کاتی ڕووداوە گەورەکان و پارێزەرانی سەرو ماڵ؟ لە پشتتانەوە شەرم و شورەیی هەیە بۆ گەڕانەوە،و لەبەردەمیشتاندا بەهەشت هەیە.

(١٧٢)

## وتارێك

ستایش بۆ خودا کە هیچ ئاسمانێك ئاسمانێکی لێناشاردرێتەوە و زەویەك زەویەکی لێنادیار ناکات.

## لە ڕۆژی ڕاوێژدا کابرایەك وتی:
## ئەرێ کوڕی ئەبو تالیب بۆچی ئەوەندە سووری لەسەر ئەم کارە؟
## پێشەوا وتی:

نەخێر ئێوە زۆر ئەکەن و بەزاتی خودا ئێوە زیاتر حەزتان لێیەتی و زۆریش دوورن و من کەمترو زۆر نزیکم، من داوای مافێکی خۆم ئەکەم و ئێوە کەوتوونەتە نێوان من و ئەو، حەقە ئەوە ئەیدەنەوە بەناوچاوما و ناهێڵن، پێشەوا وا ئەڵێ: کاتێ بە بەڵگە دام بە ڕوویا لەناو کۆمەڵە ئامادەبووەکاندا کابرای خاوەن قسە وەك نێریی

[٢] بەتایبەتی بۆ کورد...... (وەرگێڕ).

هەر ئەیمرِان و بۆڵەی ئەهات و کەس نەیزانی چی ئەڵێ و چۆن وەڵامی من ئەداتەوە.

## داوای شەڕ لەسەر قورەیش

خودایە من داوات لێ ئەکەم کە دوژمنداریی قورەیش و ئەوەی هاوکارییان ئەکات بکە و داوای سەرکەوتن ئەکەم بەسەریاندا، چونکە بەتەنگ کەسایەتیی و خزمایەتیی نەبوون و شوێن و جێگەی منیان بچووک کردەوە، بە کۆی دەنگ بەربەرەکانی کارێکیان کرد کە مافی بێ چەند و چۆنی خۆمە و ئەوجا ئەڵێن حەق وایە تۆ ئەم ئەرکە وەربگری و ئێستە ئەڵێن حەق وایە وازی لێ بێنی.

## باسی تاقمی جەمەل ئەکات

ئەوان دەرچوون لە شاری مەدینە حەرەمی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم)پەلکێش دەکرد، هەر وەك کەنیزەکی کۆیلە ڕاکێشرێ وەختی سەوداو مامەڵە، بەرەو بە سرە ڕوویان نا، ئەو دوو کەسە ژنەکانی خۆیان لەماڵەوە دانا و حەرەمی هەمیشە جێگیر لە ماڵەوەیان بۆ خۆیان و بۆ غەیری خۆیان لە سوپایەکدا کە هەموو نەفەرەکانی بەڵێنی گوێرایەڵییان بە من دابوو، بە ئارەزوی خۆیان پەیمانیان پێدابووم بە خواستی خۆیان و بێ زۆر لێکردن پەلاماری کارگوزاریی من و پاسەوانانی بەیتولماڵی موسڵمانان و خەڵکی تریان لە دانیشتواندا، کۆمەڵێکیان بە دەستبەستراوی کوشت و کۆمەڵێکیش بە غەدر و پەنامەکیی.

دەی قەسەم بەخوا، ئەگەر لە موسڵمانان جگە لەیەك پیاو کەسیان نەکوشتبێ و بەدەستی ئەنقەست ئەوەیان کردبێ، بێتاوان و بێگوناح درووستە بۆ من ئەو سوپایە هەموو بکوژم، چونکە بەدیارەوە بوون و ئینکاری ئەو کارەیان نەکردووە و بەرگرییان نەکردووە لەو پیاوە، بەدەم یان بەدەست، وا بزانە درووست نییە بۆ کوشتنی تەنیا کەسێك، خۆ ئەوان کوشتاری موسڵمانیان بە ئەندازەی سوپاکەی خۆیان کردووە، کە پەلاماریانداوەتە سەریان.

(١٧٣)

## وتـارێك دەربـارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)
## (كێ شایستەی خەلافەتە و باسی گەندەڵی دنیا)

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمینـدارو و ڕازگـری سرووشـتی خودایـە، كۆتـا پێغەمبەری هەموو پێغەمبەرانە(درودی خوایان لە سەر بێت)، مـژدەدەری بـەزەیی و بەخشندەیی خودایەو ترسێنەری تۆڵەیەتی.

## كێ دەبێ بۆ خەلافە ؟

ئـەی خەڵكینـە.. باشـترین و چاكترین كـەس كـەمافی ئـەم ئەركـەی هـەبێ ئـەو كەسەیە كە توانای هەبێ بەسـەریا، شارەزای فـەرمانی خـودا بـێ لـەم بـارەوە، ئەگـەر ئاژاوەسازێك ئاژاوەی نایەوە، ئەبێ داوای لێ بكرێ واز لـە ئـاژاوە بێنـێ و سـەر نـەوی بكـات بـۆ حـەق، ئەگـەر نـەیكرد، شـەڕی لەگـەڵ دەكـرێ، (بـەو خودایـەی تەمـەنی بەدەستە) ئەگەر مەزنایـەتیی و پێـشەوایی دانەمـەزرێ هـەتا گشت خـەڵكیی دەنگی بۆنـەدا، كـە ئـەوەش ڕێگـەی نییـەو نـاكرێ، بـەڵام ئەوانـەی شایـستەی ئـەو ئەركـەن ئەتوانن دەنگی ئەوانـە بـدەن كـە ئامـادە نـین و لـەجیاتی ئـەوان بڕیـار بـدەن، جگـە لەوەش ئـەوەی ئامـادەبوو پەشـیمانیی بـۆ نییـەو ئـەوەی كـە ئامـادە نییـە بـۆی نییـە كەس دیاری بكات، حەز ئەكەم ئاگادارتان بكەم كە من شەڕ لەگەڵ دوو كەس ئەكـەم، یەكیان مافی بەسەر ئەم كارەوە نییە و ئەوی كە دژی ئەو كەسەیە كە وەریگرتووە.

داواتان لێئەكەم خۆپـارێزیی بكـەن لـە گـشت فەرمانـەكانی خـودا، چونكە ئـەوە چاكترین ئامۆژگاریی و ڕاسپاردەیە و پاشەڕۆژی لای خودا زۆر باشـە، دەرگـای جـەنگ كراوەتەوە لە نێوان ئێوە و ئەهلی قیبلە، ئەم ئاڵایە تەنها ئـەهلی شایـستەو زانـست و خـۆڕاگر هەڵێنـەگرێ و بـڕوای هـەبێ كـە حـەق و ڕاسـتیی لـە كـام شـوێنە، كەواتـە فەرموون بڕۆن و بەپێی فەرمان كار بكەن و لەكاتی فەرمان بەكۆتایی دەسـتهەڵگرن، هەرگیز پەلەمەكەن هەتا بەتەواویی كارتان بۆ ڕوون ئەبێتەوە، ئەوەش بـزانن ئێمـە بۆ هەر كارێك كە ئێوە بەلاتانەوە باش نەبێ گۆڕان ئەكەین.

## بێنرخیی ئەم دنیایە

زۆر هۆشیار بن ئەم دنیایە کە ئێوە ڕۆژ تا ئێوارە ئارەزووی ئەکەن و هەوڵی بۆ ئەدەن، ئەویش ڕۆژێ ڕقتان هەڵئەسێنێ و ڕۆژێك ڕازیتان ئەکات، ئەوە ماڵی هەمیشەیی ئێوە نییە و ئەو شوێنە نییە کە بۆی درووستکراون و ئەوەش نییە کە بانگکراون بۆی، ئەوەش بزانن کە هەمیشە نامێنێ بۆتان و ئێوەش بۆی نامێنن، ئەگەر هەندێ جار هەڵتان خەڵەتێنێ بەخێرو چاکە، لە هەمان کاتدا ترس دەخاتە بەرتان بە شەڕ و خراپە، ئێوەش وازبهێنن لە خەڵەتانیی و لە ترسانیی، واز بێنن لە (چەشەو تەما)ی و پەلە بکەن بۆ ئەو دنیایە، کە بانگەوازتان بۆ کراوە، بەدڵ خۆتانی لێلادەن، نووکە نووك مەکەن بۆی، وەك نووزەو نووکەی ئەو کارەکەرەی کە خۆشەویستیی لێوەرگیراوەتەوە و شاراوەتەوە، هەوڵ بدەن نیعمەتەکانی خودا لەسەر خۆتان تەواو بێ، بەهۆی خۆگرتنتان لەسەر فەرمانەکانی و پاراستنی ئەو ئەمانەتەی قورئان کە پێتان سپێراوە، ئاگادار بن کە ترستان نەبێ لە نەمانی هیچ شتێك لەم دنیایە، ئەگەر پارێزگاری پایەکانی ئاینەکەتان بکەن، خودا بۆ خۆی دڵ و دەروونمان و دڵ و دەروونتان ڕابگرێ، لەسەر حەق و ڕاستیی ئارامیی و خۆڕاگریی بکاتە بەشی ئێمە و ئێوە.

(١٧٤)

## وتارێك لەسەر تەڵحەی کوڕی عوبەیدیللا

### (ئەوکاتەی کە زانی تەڵحە و زوبەیر ڕۆیشتون بۆ بەسرە بۆ شەڕکردن)

ئەوەی ڕاست بێ هەرگیز من نەترساوم بە هەڕەشەی شەڕو نەترساوم بە لێدان، من لەسەر بەڵێنی پەروەردگاری خۆم ماوم، بەسەرکەوتن، قەسەم بەخوا، ئەو پەلەپەلە و خۆتەرخانکردنە بۆ داوای خوێنی عوسمان لەبەر ئەوەیە داوای لێنەکردی کە لە ئەستۆیەتی، چونکە ئەو جێگەی گومانە و کەس بە ئەندازەی ئەو حەزی لە ڕژانی خوێنی ئەو نەبووە، ئەوجا ئەیەوێ چەواشەکاریی بکات و چاوبەس بکات و خەڵك لێیتێکچێ و گومان پەیدا بێ؟ دووبارە سوێندم بەخودا، لە سێ کار لە بارەی عوسمانەوە هیچ کامی نەکردووە: ئەگەر کوڕی عەففان ستەمکار بێ ( وەك ئەو بۆچونی وابو) دەبوو یارمەتی بکوژەکانی بدایەو دژی هاوکارانی بوایە، ئەگەر ستەم لێکراو بوایە دەبوو یەکێك بوایە لە پاسەوان و بەرگریکارانی و پاساودەرانی

بوایه و ئەگەر خۆی لەگوماندا بوایه لەم دوو بۆچوون و ڕایە، دەبوو کەنارگیر بوایە و بێدەنگ بوایه له هەردوو لاو هیچ کاری بەسەر خەڵکەوە نەبوایە، کەچی لەم سێ ڕێگە هیچ کام نەبووە، هەستاوە بەکارێك نازانێ لە کام دەرگاوە دەرچێ و هیچ جۆرە بڕوبیانووی نەماوە و نییە.

( ١٧٥ )

## وتارێك بۆ ئامۆژگاریی و خزمایەتیی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )

ئەرێ بێئاگایانی لە خۆو چاودێرکراو لە غەیری خۆتانەوە! ئەوانەی خۆتان شتتان جێدێڵن و کەسیتر وەری دەگرێ، بۆچی ئەتانبینم لایەنی خواتان جێهێشتووە و ڕوتانناوە لە لایەکیکە، وا ئەزانم وەك ئاژەڵێك وان بەرەڵڵا بۆ ناو پاکژێکی دەرداویی و جۆگەئاوێکی پیس و پۆخڵی خۆشیدار، لە ڕاستیدا وەك ئەو حەیوانە ئالف پێدراوانە کە بە تێرکراویی ڕەوانەی کوشتارگە کراون و خۆیان نازانن چیان بەسەر دێ، ئەگەر تێربکرێن ڕۆژێکیان بەساڵێك ئەزانن و تێر بوونیان هەموو مەبەستێکیانە، سوێند ئەخۆم بەخودا، ئارەزوو بکەم ئەزانم هەر یەکەتان بۆ ئەڕواو لە کوێوە دێت و هەموو کارەکانی ئەزانم، بەڵام ئەترسم بە هۆی ئەم کارەی من بێباوەڕ بن بە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بەڵام هوشیاریتان ئەدەمێ کە ئەو زانستە ئەدەم بە کەسە زۆر تایبەتمەندەکانم کە دڵنیام ئەو مەترسیەی لێناکرێ، قەسەم بەو کەسەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی بەحەق ناردووە و لەناو خەڵکدا ئەوی هەڵبژاردووە، هەرگیز بە ڕاستیی نەبێ قسە ناکەم و من ئەوەم پێسپێردراوە، ئیتر هەیە بەم زانستە ئەفەوتێ و هەیە دەرئەچێ و ڕزگار ئەبێ و من کارم بەم ئەرکەوە نەبووە و نەشمزانی ئەنجامی چۆن ئەبێ، من لە مێشکمدا هیچ ناهێڵم و ئەوەی و ئەوەی پێموتراوە و بەگوێم ئاشنا بووە و پێموتراوە باسی ئەکەم.

خەڵکینە.. من قەسەم بەخوا، داوای شتێك ناکەم لە ئێوە کە خۆم لە پێش هەمووتانەوە نەبم و هەرگیز دوورتان ناخەمەوە لە کارێك کە خۆم لە پێش ئێوەوە نایکەم و دوورم لێی.

(١٧٦)

## وتارێك بە ئامۆژگاریی و گەورەیی قورئان و دژی نەوباوی خراپ

### (ئامۆژگاریی خەڵك)

سوود وەرگرن لە ڕوونكردنەوەی خودا، پەندو ئامۆژگاریی وەرگرن بە كەرەستەكانی ئامۆژگاری خودا، هەموو ڕاسپاردەكانی خوا وەرگرن، چونكە خودای بەرزو بێهاوتا بیانووی بڕیوون بە پاساوی زۆر ڕوون، شایەتیی لەسەر ئێوە داناوە كاری چاكی بۆ ئێوە بەیانكردووە و كاری بەد و خراپەی دیاریكردووە بۆ ئەوەی شوێن ئەو بكەون و خۆتانی لێبپارێزن، چونكە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەی فەرموو: بەهەشت پەرژینكراوە بە كارە خراپەكان، دۆزەخ چ كەنارو كەنداوی ئارەزووی بۆ ڕازێنراوەتەوە.

ئەوەش بزانن كە هەموو بە جێ هێنانێكی فەرمانی خودا جۆرێك ناخۆشیی و ناڕەحەتیی تێدایە، هەموو گوناح و تاوانێك جۆرێك لەزەت و خۆشیی تێدایە، كەواتە خودا ڕەحم بكات بە كەسێ كە واز لە ئارەزوو دێنێ و لەزەتی خۆی لەڕەگ دەردێنێ، چونكە ئەم نەوسی مرۆڤە زۆر دوورە خۆی لە شت لابدا و هەمیشە حەزی لەسەر پێچیی و بێفەرمانییە و بزانن بەندەكانی خوا باوەڕدار بەڕۆژو بە شەو بەگومانە لە نەفسی خۆی، بۆیە هەمیشە و بەردەوام سەرزەنشتی ئەكات و بەزیادە لەسەری زاڵە، ئێوەش وەك پێشینەی خۆتان بن وەك ئەوانەی لەسەر چاوتان بوون، پەتی دەوارەكەی دنیا هەڵكەنن وەك ئەو ڕەوە كە دەیەوێ باركات، جوان بیپێچنەوە بۆ باركردن بۆ شوێنی دیكە.

## گەورەیی قورئان

دەبێ بزانن كە ئەم قورئانە ئامۆژگارێكە هیچ كات ساختە ناكات، ڕێنیشاندەرێكە هەرگیز ڕێ هەڵە ناكات، گوتاربێژێكە هەرگیز درۆ ناكات، هەر كەس دانیشێ لەلای ئەم قوئانە بە بێ دوو سوود هەڵناسێ: شتێكی بۆ زیاد ئەبێ و لە شتێكی كەم ئەكات، زیادە لە بەرچاو ڕوونیی و كەمی پەردەی سەرچاو، ئەوەش باش

بزانن كه هەركەس هاودەمی قورئان بێت پێویستی بە كەس نییە و پێویستی بەسامانی هیچ كەس نابێ، بیكەنە تیمارو دەرمانی نەخۆشییەكانتان، یارمەتی لێبخوازن بۆ نارەحەتییەكانتان، چونكە دەرمانە بۆ گەورەترین بیماریی، ئەویش بێباوەڕیی و دوو ڕوویی و بەرەڵایی و ڕێونكردنە، بەم قورئانە داوای هەموو شت لە خوا بكەن، بۆ خۆشەویستی خودا با لەپێشتانەوە بێت، بەڵام سواڵی خەڵكی پێمەكەن، چونكە بەندەی خودا لەم قورئانە زیاتر بە كەسیتر داوا ناكات، ئەوەش بزانن ئەم قورئانە بۆتان ئەپارێتەوە، لە خوا تكای وەرگیراوە، گۆیای ڕاستگۆیە، هەركەس لە قیامەت قورئان تكای بۆ بكات، تكای وەرگیراوە، هەركەس قورئان شایەتی لەسەر بدات بۆی پەسەند ئەكرێ، لە ڕۆژی قیامەتدا بانگەواز ئەكرێ: هەر كەس هەر شتێكی چاندبێ پێوەی گیرۆدە جگە لەوانەی قورئانیان لە دڵیاندا ڕواندووە، دەبا ئێوەش لە گەشتیارانی قورئان و شوێنكەوتوانی بن، بیكەنە چاوساغ بۆ لای پەروەردگارتان، بیكەنە چاودێر بەسەر خۆتانەوە و داوەربێت لە سەر كردارەكانتان، هەموو ئارەزووەكانتان بە قورئان لەسەنگی مەحەك بدەن.

تكا ئەكەم كار بكەن، بۆ پاشەڕۆژ، دەست لەكار بن، ڕاست و درووست بن، خۆڕاگربن، خۆ پارێزبن، ئێوە كۆتاییتان هەیە، بۆ ئەوێ كار بكەن، ئالایەكتان هەیە بە ئالاكەتان ڕێگە بدۆزنەوە، ئیسلام ئامانجە، بەرەوە ئامانج بڕۆن، كاتێ ئەچن بۆ لای خودا با حەقی ئەوەتان پێ بێ و بەجێبەجێ كردنی ئەركەوە بڕۆن، من ئەمڕۆ شایەتم بەسەرتانەوە، بەڵام لەو دنیاش شایەتیتان لەسەر ئەدەم.

## ئامۆژگاریی خەڵك

هۆشیار بن، ئەوەی خوا بڕیاری لەسەر دابوو ڕوویداو قەزاو قەدەریش وردەوردە دێت، منیش گوتارم لەسەر بەڵێنەكانی خودایە (ئەوانەش كە گوتوویانە: پەروەردگارمان خودایەو لەگفتیان لایاننەداوە فریشتە دێنە لایان و پێیان دەڵێن نە بترسن نە خەم بخۆن، مژدەتان پێگەیشتووە ئەو بەهەشتەی كە بەڵێنتان پێدراوە) ئێوە وتووتانە (پەروەردگارمان خوایە) كەواتە لەسەر قورئانەكەی پەیڕەویی بكەن و لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئەو كار بكەن و بە پێی ڕێنماییەكان بجوڵێننەوە و هەرگیز

لێی لامەدەن، شتی زیادەو نەوباوی لێ زیاد مەکەن و بە پێچەوانەیەوە کارمەکەن، چونکە ئەو کەسانەی لا ئەدەن لە قورئان لە ڕۆژی قیامەت لە خودا دوورن، خۆتان بپارێزن لە لە کەدارکردنی ڕەوشتە بەرزەکان و هەڵگەڕانەوە لێیان، با یەك زمان بن و زمانی خۆتان بگرن، چونکە ئەم زمانە زۆر سرك و چەمووشە، سوێندم بە خودا، هیچ تەقوایەك سوودی نییە ئەگەر زمانی خۆی نەگرێ، زمانی باوەڕدار لە پشتی دڵەوەیە و دڵی دوو ڕوو لە پشتی زمانەوەیە، چونکە باوەڕدار ئەگەر قسە بکات باش بیری لێئەکاتەوە، ئەگەر چاك بوو ئەیلێ و ئەگەر خراپ بوو ئەیشارێتەوە، بەڵام دوو ڕوو هەرچی بەزمانیدا بێت ئەیبێژێ، نازانێ کام چاکەو کام خراپە، بۆیە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بڕوای بەندە ڕاست نابێ هەتا زمان ڕاست نەبێ، هەر کەس لە ئێوە ئەیەوێ بگاتە خزمەت خوا بادەم پاك و دەست پاك بێت، لە خوێنی موسڵمانان و سامانیان و زمان پاك بێت لەشەرەف و ناموسیان... با ئەم کارە بکات.

## قەدەغە کردنی کاری نەویاو

باش بزانن بەندەکانی خودا ! کەباوەڕدار ئەوە حەڵاڵ ئەکات کەسانی یەکەم حەڵاڵی کردووە و قەدەغەیە بەلایەوە ئەوەی یەکەم جار قەدەغە بووە، ئەوەی ئەمڕۆ خەڵك ئەیکاتە داب و نەریت ئەوەی حەرام بووە حەڵاڵی ناکا، چونکە حەڵاڵیی ئەوەیە کە خوا حەڵاڵی کردووە و حەرام ئەوەیە کە خودا حەرامی کردووە، ئێوە هەموو کارەکانتان تاقیکردووەتەوە و دانتان پێدا ناوە، پەندو ئامۆژگاریی نەتەوەکانی پێشووتان بۆ باسکراوە و بۆ ڕێگەیەکی ڕوون بانگکراوون، مەگەر کەڕ گوێ بیستی نەبێ و مەگەر کوێر نەیبینێ، ئەوەی خودا بەکارەسات و بەڵای خەڵك و نەتەوەی تر سوودی پێنەگەیاندبێ، بە هیچ شتێك سوودمەند نابێ، کە لەبەرچاوی کەمتەرخەمیی بینیوە، ئەزانێ کامە چاکە و کامە خراپە، ئەو خەڵکە دوو جۆرن: هەیە یاساو ڕێسای هەیەو دوای کەوتووە و هەیە خۆی شتی داهێناوە و پەیڕەوی ئەکات، کە لە لایەن خواوە بەڵگەی پێنەدراوە و پەیڕەوی سوننەتی نەکردووە و دەلیلی ڕوونی نییە.

## قورئان

خودای پاك ئامۆژگاریی نەكردووە بۆ هیچ كەس بە ئەندازەی ئەم قورئانە، چونكە ئەوە دەستگیرە بۆ لای خودا و تەنها هۆكارە بۆ لای خودا، ئەو قورئانە بەهاری دڵانە، كانی و سەرچاوەی زانستە، دڵ تەنها بەقورئان لەژەنگ پاك ئەبێتەوە لەگەڵ ئەوانەی قورئانیان لەبەر بوو ڕۆیشتن و ئەوانەی ماون كە بیریان چووەتەوە، یان لەبیری خۆیان بردووەتەوە، ئەگەر چاكتان بینی هاوكاریی بكەن و ئەگەر خراپتان بینی خۆتانی لێببوێرن، چونكە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ئەی فەرموو: كوڕی ئادەم ! چاكە بكەو واز لە شەڕ بێنە، ئەو كاتە تۆ سوارچاكی سەرچاوی ڕاستیت.

## جۆرەكانی زۆرداریی

ئاگادار بن كە زۆرداریی سێ جۆرە: ستەمێكە لێبوردنی نییە، ستەمێكە لەسەر زۆردارەكە بەسەر ناچێ، ستەمێكە لێخۆشبوونی هەیەو داوا ناكرێ.

ئەو ستەمەی كە لێبوردنی نییە هاوەڵ بۆ خودا دانانە، خودا ئەفەرموا: (هەرگیز خودا نابوورێ لەو كەسەی هاوەڵ بۆ خودا دائەنێ)، ئەو ستەمەی كە لێبوردنی هەیە ستەمی بەندەكانە لە خۆیان و گوناهی زۆر گچكەو ئەو ستەمەی بەسەرناچێ ستەمی بەندەكانە لە یەكدی، تۆڵەی ئەوێ زۆر سەختە، زامداركردن نییە بە چەقۆ و كارد، یان داركاریی بە تول و قامچیی، بەڵام لەوانەیە ئەمانە لەچاویدا زۆر سووك بن، زۆر ئامۆژگاریتان ئەكەم كە دوو ڕەنگ مەبن لە ئاینی خوا، چونكە بوونتان لەگەڵ كۆمەڵ لەگەڵ بێزاریتان لە حەق زۆر باشترە لە جیابوونەوەتان لەو شتەی پێتان خۆشەو بەتاڵە، خودا هەرگیز چاكەی نەداوە بەناكۆكیی و جیابوونەوە، لەمەو پێش و بۆ لەمەودواش.

## پێویستیی گوێڕایەڵیی

خەڵكینە.. بەهەشت بۆ ئەوكەسەیە كە عەیب و عاری خۆی ڕێگر بێت لە باسكردنی عەیب و عاری خەڵك، بەهەشت بۆ ئەو كەسەیە لەماڵی خۆی بێت و نانی ماڵی خۆی بخوات و سەرگەرمی خودا پەرستیی خۆی بێت و گریانی بۆ تاوانەكانی

خۆی بێت، ئەو کاتە خۆی بەخۆیەوە سەرگەرمە و خەڵك دوورە لە ئازاری.

( ١٧٧ )

## وتارێك لەبارەی هەردوو حەکەم

ئێوە بە کۆی دەنگ بڕیارتاندا کە دوو کەس دابنرێت، ئێمەش بڕیارمان لێوەرگرتن کە لە سەر قورئان کار بکەن و لە قورئان دەرنەچن، بە زمان پەیڕەوی بکەن و دڵیان دوای زمانیان بکەوێ، بەڵام ئەوان لە قورئان دەرچوون و دەستیان نا بەحەقەوە، کە بەچاوی خۆیان دەیانبینی، ئەم دوانە ستەمیانکرد و دوای ئارەزوو کەوتن و لارویریی پیشەیان بووە، ئێمە لە پێشەوە ئەوەمان لێدوورخستنەوە کە نابێ ستەم بکەن، دادپەروەر بن و کار بەحەق بکەن و ئەمانزانی کە بیروباوەڕیان خراپە، بۆیە ئەم مەرجەمان بۆ دانان، ئێمە مافی خۆمانە کە ئەم فەرمانە ڕەد بکەینەوە لەو کاتەی ئەوان لە حەق لایانداو کارێکیان بڕیاردا کە پێچەوانەی دادە.

( ١٧٨ )

## وتارێك باس لە شەهیدیی و خۆپارێز دەکات لە پاش دانانی بە خەلیفە

خودا هیچ کارێك خەریکی ناکات، کات نایگۆڕێ، شوێن نایگرێ، زمان ناتوانێ پێناسەی بکات، ژمارەی دڵۆپە بارانی لێ وننابێ، شوێن هاتوچۆی بای لێ تێکناچێ، دەنگی پێی مێرووڵەی لەسەر بەردی ساف لێ کپنابێ، مانەوەی مێرووی ورد لە شەوی تاریکدا لێ ونابێ، زانایە بە وەرینی هەموو گەڵایەك، بەجووڵەی چاو لەناو پێڵۆدا.

بەدڵ باوەڕم هەیەو بە زمان ئەڵێم کە هیچ خوایەك جگە لەو نییە و بێ هاوڕێ و هاوبەشەو جێگەی گومان نییە و پەشیمانیی لە ئاینی ئەو نییە، بەدیهێنەریی جێگەی ئینکار نییە.

ئەوە شایەتی کەسێکە کە نیازی پاکەو یەقینی پوختەو تای تەرازوی قورسە، شایەتی ئەدەم محەمەد بەندەو پێغەمبەری خودایە(صلی الله علیە وسلم)، لەناو هەموو خەڵکدا هەڵبژاردووە و دیاریکردووە بۆ بەیانکردنی هەموو دەستور و

یاساکان و تایبەتی کردووە بۆ بەخشندە ڕەسەنەکانی و پاڵفتەی کردووە بۆ پەیامبەرە زۆر بەنرخەکانی و بەهۆی ئەم مەردەوە نیشانەکانی ڕێگەی ڕاستیی دیاریکراوە و بەهۆییەوە پەردەی گومڕایی لەسەر چاوان لاداوە.

خەڵکینە.. دنیا ئەتوانێ ئەوەی زۆر دڵی پێی خۆشە و خۆی بە نەمر دادەنێ، بیخەڵەتێنێ، ڕەزیلی ناکات لەگەڵ ئەوانەی هەوڵی بۆ دەدەن و بەرگریش ناکات لەوانەی کە دەسکەوتیان تێدا هەیە، سوێندم بەخودا، هیچ نەتەوەیەك چاو شۆڕ نەبووە لە ئەو نیعمەتەی کە پێیاندراوە و پاشان لێیان وەرگیراوەتەوە، مەگەر بە هۆی تاوانکردن و خراپەکارییەوە نەبووبێ، چونکە (خودا هەرگیز غەدر لە عەبدی خۆی ناکات)، ئەگەر خەڵك لەو کاتەی کە تووشی کارەساتێ دەبن، یان نیعمەتیان لێوەردەگیرێتەوە یەکسەر بگەڕێنەوە بۆ لای خودا بەنیازی پاك و ڕەزامەندیی دڵیان، هەرچییان لەدەست چووە بۆیان دەگەڕێتەوە و هەموو لەناو چوویەکیان بۆ چاك ئەبێتەوە، من زۆر ترسم هەیە ئێوە ئەمڕۆ کاتی پشووتان بێت، لە خۆبایی بن، زۆر شت هەبوو بە ئارەزووی ئێوە بوو بەلای منەوە باش نەبوو ئێوەش مەبنە سوپاس نەکەران، ئەگەر ئەو کارە بۆ ئێوە بوو ئەوە بەختیارن، من تەنها ماندوو بوونم لەسەرە، ئەگەر ئارەزوو بکەم ئەتوانم بڵێم (خودا لە ڕابردو ئەبورێ).

(١٧٩)

## وتارێ کە زیعلەبی یەمانی پرسیاری کرد:
## ئەی میری باوەڕداران خوات بینیوە!؟

لە وەڵامیدا فەرمووی: بەندایەتیی کەسێ ئەکەم کە نەمبینیبێ؟ ئەوجا کابرا وتی: چۆنت دیوە؟ فەرمووی چاوی ئێرە بە ڕووبەڕوو نایبینێ، بەلام دڵی ئاوەدان بەڕاستیەکانی باوەڕ ئەیبینێ، نزیك و بەرچاوە بێ دەستلێدان، دوورە بێ بوونی میانە و نێوان، گۆیایە بێ بیرکردنەوە، بێ هەوڵدان پیشەکارە، بێ ئامێرو دەست و پەل نازکە، بێ شارەوەیی گەورەیە، بێ زبریی و قایمیی بینایە بێ ئامێر، بە بەزەییە بەلام نەك بە دڵ نەرمیی، هەموو ڕوویەك کڕنووش بەرە بۆ گەورەیی، بەنی دڵ ئەپچڕێ لە ترسی ئەو.

## (١٨٠)
# وتارێك له گازندەی هاوەڵانی

سوپاسی خوا ئەكەم لەسەر هەر بڕیارو فەرمانێكی، لەسەر هەر دادوەرییەكی كە كە كردبێتی، لەسـەر ئـەم بەڵایـەی بەسـەرم هـاتووە، لـە ئێـوە كۆمـەڵی بێگوێ و بـێ فەرمان، كە هەر چی بڵێم بـەگوێم ناكـەن و بانگتـان بكـەم وەڵام نادەنـەوە، گوێتـان نەدەمێ دەست ئەكەن بە ژاوە ژاوە، شەڕتان لەگـەڵ بكـرێ ترسـنۆك و لاوازن، ئەگـەر خەڵك پێشەوایەكیان هەڵبـژارد ئێـوە تانـەی لێئـەدەن، ئەگـەر بـانگبكرێن بـۆ ئـەركی قورس پاڵی لێ ئەدەنەوەو نایكەن، خوا بـاوكی خـەڵكی تـر بباتـەوە، چاوەڕێی چیان لێئەكرێ!، لەسەركەوتن و جیهاد، لەسەر مافی خۆتان، یان مردن، یان سەرنزمیی بـۆ ئێوەیە، قەسەم بەخوا، ئەگەر ڕۆژم هات (ئەبێ بێت) مـن لـە ئێـوە جیائەبمـەوە، مـن زۆر دلگرانم لە یاوەریی ئێوە، هەرگیز بە ئێوە خۆم بە زۆر نازانم. ئەرێ بـۆ خـاتری خودا، ئەوە ئاینێك نییە كۆتانكاتەوە، ئەوە (كورە)یەك نییە تیـژتان بكاتـەوە؟ باشـە ئەوە سەیرو ئەوە سەمەرە نییە كە مەعاوییە هەرچی وپەرچی بانگ ئـەكات و دوای ئەكەون، بێ هاوكاریی و یارمەتیی؟ من ئێوەم بانگكردووە بە حساب ئێوە پاشـكەوتی ئیـسلامن و پاشمـاوەی خـەڵكی پێـشینەن بـۆ هاوكـاریی و یارمـەتیی، كەچـی بڵاوەی لێئەكەن و لە من جیا ئەبنەوە، هەر كارێك كـە مـن لەسـەری ڕازی بم ئێـوە نـاڕازین، واش نەبووە ڕقم لە شتێك بێت ئێوەش لەسـەری بـن، ئـەوەی زۆرم خـۆش ئـەوێ كـە تووشم بێت مردنە!، دەرس و دەوری قورئانم لەگەڵ كردوون و فێـری یاسـا و ڕێگـەی شـەرعیم كـردوون، ئـەوەی نەتانناسـی فێرمكـردن و ئـەوەی بـەدڵتان نـەبوو بـۆم ڕوونكردنەوە، ئەگەر كوێر ببینێ و خەوتوو وەخەبەربێ ئاواتمە.

لەنەفامیی و نەزانین نزیكتر لەو كۆمەڵە ڕابەرەكەیانە كـە مەعاوییەیـە ئـەوەش كە ڕایان دەهێنێ كوڕی ژنە دیارەكەیە!.

## (١٨١)
## وتارێك
## ئەوكاتەی پیاوێكی نارد كە هەواڵی كوفەیان بۆ بێنێ كە هەندێك لە یارانی نیازیان هەبوو بڕۆنە ناو خەواریج و زۆر ترسیان لە ئیمام هەبوو

كە پیاوەكە گەڕایەوە لای وتی: ئەرێ دڵنیابوون و گەڕانەوە یان ترسان و باریانكرد؟ پیاوەكە وتی: نەخێر ڕۆیشتن. فەرمووی: خودا دووریانخاتەوە وەك (سەموود) دوور بوون، بەڵام كە سەری ڕمەكان كەوتە سەر دڵیان و شمشێر لە سەر سەریان دباری، ئەو كاتە پەشیمان ئەبنەوە، شەیتان ئەمڕۆ ڕوخاندنی و سبەی حاشایان لێئەكات و پشتیان تێئەكات، با ئەوەیان بەس بێ كە لە ڕێگەی دیاریی لایانداوە، هەڵگەڕانەوەیان بۆ گومڕایی و كوێریی و دەست نانیان لەحەق و ڕاستیی و یاخی بوونیان لە بێ ڕێگەییدا.

## (١٨٢)
## وتارێك

نوفی بەكالی دەڵێ: میری باوەڕداران ئەم وتارەی لە كوفە وتووە كە (جەعدەی كوڕی هوبەیرەی مەخزومی) بەردێكی بۆ دانابوو، فەرمنجیەكی قۆڵتەسكی خوریی لەبەر بوو، قایشی شمشێرەكەی لیفی خورما بوو، دوو پێڵاوی لە لیفی خورمای لە پێدا بوو، ناو چاوانی پەڵەی پێوە بوو، وەك ئەژنۆی وشتر

فەرمووی: ستایش بۆ خودا كە سەرەنجام هەموو خەڵك بۆ لای ئەوە و پاشەڕۆژی هەموو كارێك لای ئەوە، سوپاسی ئەكەم بۆ گەورەچاكەی و بورهانی ڕوونی و ئاشكرای زیادە مینەت و دەهەندەیی، ستایشێكی وەها كە لە حەقی قەزاو قەدەری ئەو بێ و جێبەجێكردنی شوكری ئەو بێ و نزیكخەرەوە بێت بۆ پاداشت، هۆكاری چاكەی زیاتر و باشتر بێ، داوای یارمەتی تەنها لەو ئەكەین، لە شێوەی داوا كارێك بە تەمای زیاتر بێ و بەهیوای سوودی زیاتر بێ و دڵنیا بێ كە جێبەجێی

ئەكات، دان بنێت بە زیادە ئیمانیی، بە دڵ و بە زمان سەر لەبەری بێ، باوەڕمان هەیە بەو خودایە وەك باوەڕی كەسێ یەقین بزانێ كە خودا دێت بە هاوارییەوە و گەڕابێتەوە بۆلای بە باوەڕەوە و سەری نەوی كردبێ بە قەناعەتەوە و بە پاكیی و دڵسۆزیی بێ، بە یەكتاپەرستیی و بە گەورەیی و بە شكۆی دانێ و بەسەروەری دابنێ، بە پەنای مەحكەمی دابنێ، لەگەڵ كۆششدا.

## خودای تاك و تەنها

لە كەس نەبووە ئەو خودا پاكە هەتا هاوتای هەبێ، كەسی لێنەبووە هەتا میراتگربێت و میرات لێگیراوی تیاچوو بێت، كات و سات پێشی نەبووە، زیاد و كەم بە سەریا نایەت و نەهاتووە، بەڵكو دەركەوتووە بۆ عەقڵ و فام بە نیشانەی درووستكراوە بە ڕاو تەگبیرەكەی و بەدادوەریی و فەرمانە یەكجارەكانی بەڵگەی درووستكردنی ئاسمانی ئەو ئاسمانە ڕاوەستاوانە بێپایەو كۆڵەكە، بەرزە بێپاڵپشت، بە بانگی كوتوپڕ هاتوون بەدەم فەرمانیەوە بێسستیی و بێتەمبەڵیی لە بازنەكانیاندا سوڕ ئەخۆن، لە بەر ئەوە بڕیاریانداوە و دانیانناوە بە پەروەردگاری خودادا، بوونەتە شوێنی عەرشی خودا و بوونەتە شوێنی فریشتەكان و قەرارگەی وشە پاكەكان و كارە چاكەكان، لە لایەن خەڵكی خوداوە ئەستێرەی كردووە بەنیشانە كە سەرلێشێواوان لەسەر زەوی ڕێگەی پێدەر بكەن، تاریكیی و نووتەكیی و پەرەی قایمی شەو توانای نییە ڕێگری تیشكی ئەوان بێت، عەبای ڕەشی تۆخی تاریك ناتوانێ ئەو ڕووناكییە بڵاوەی ئاسمانەكان لە مانگ كەمكاتەوە، پاكیی و بێگەردیی بۆ ئەو خودایە لەشەوی تاریكدا شتی لێوننابێ و لەتاریكیی و بێدەنگیی شیوەكانی زەوی نشێودا، لەسەر گردە ڕەشە سوورباوەكان و چیا بەرز و سەركەشەكان و بریسكەی تریشقەی ئاسۆی ئاسمانەكان و بزیسكەی تیژڕەوی ناو هەورەكان و داوەرینی گەڵاكان بە هۆی بارەش و كەشی بارانەوە، ئەزانێ دڵۆپەی باران لە كوێوە دێت و لەكوێوە ئەكەوێ و ئەزانێ مێرووله چی ڕائەكێشێ و بۆ كوێی ئەباو ئەزانێ مێشووله چەندە خۆراكی پێویستە و ئەزانێ چەندە گەرای پێیە.

## گەڕانەوە بۆ سوپاسی خودا

ستایش بۆ خودا کە بووە و هەیە پێش کورسی و عەرش و ئاسمان و زەوی و جنۆکە و ئینسان، بەخەیاڵ دەرك ناکرێ، ژیریی ناتوانێ قەبارەی بۆ دابنێ، داواکاری داواکار ڕاگیری ناکات، بەخشندەیی کەم ناکات، بە ئامێری چاو نابینرێ، سنووری بە (لەکوێ)ی بۆ دانانرێ، بە جووت وەسف ناکرێ، درووستکردنی بوونەوەری ماندوو بوونی نییە و بە ئامێرەکان نیشان ناکرێ، بە مرۆڤ هاوتا ناکرێ، ئەو خودایە کە گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەر موسا(صلی الله علیه وسلم) کردو زۆر بەڵگە و نیشانەی پیشاندا، بێدەست و ئامێرو بێ وتنی پیت و وشەو جوڵاندنی زمان و گەروو و دەمولێو.

ئەگەر ئەتوانی ئەی کەسی داواکار بۆ وەسفی خودا، وەسفی (جوبرەئیل و میکائیل)(سڵاوی خودا لە سەر ئەوان و گشت فریشتەکانی تر بێت) و سەربازە فریشتەکانی نزیك لە ژوورەکانی بارەگای پیرۆز کە وەك تەنێکی زۆر گەورە لە بەرگەورەیی خودا بەملاو بەولادا دێن و ئەچن، سەرگەردانن لە وەسفی خودادا، کە جوانترین پەروەردگارە بۆ بوونەوەر، بەڵکو ئەتوانی بەهەندێ سیفەت و شێواز باسی بکەیت، کێ ئەتوانێ وەسفی خودا بکات، ئەو کەسەی کە سنووری پێناسەی فەوتانە، کەواتە هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە جگە لەو کە ڕووناکیی هەموو تاریکیی لا بردووە، بە تاریکیی هەموو ڕووناکیی داپۆشیوە.

## ئامۆژگاریی بۆ خۆپارێزیی

ئامۆژگاری و ڕاسپاردەتان ئەکەم بەندەکانی خودا بە تەقوای خودا کە بەرگی جوانیی لەبەرکردوون، ژیانی بۆ دابینکردوون، ئەگەر بۆ کەسێ بکرایە لە پێناوی مانەوەدا، پەیژەیە بۆ ئاسمان دانێ و بۆ وەستان لە مردن ڕێگەیە هەبوایە، ئەوە بۆ (پێغەمبەر سولەیمانی کوڕی داوود پێغەمبەر)( سەلامی خوایان لێ بێت) دەبوو، کە دەسەڵاتی بەسەر (ئینس و جن)دا هەبوو لەگەڵ پلەی پێغەمبەریی و بەرزیی و شکۆی کۆشك و تەلاری، کە ڕۆژی تەواو بوو ماوەی نەما، نەماندایەبەر تیروکەوان و دنیا لەو بڕاو ئەویش لە دنیا نەما، شوێنەکانی چۆڵ و خەڵکێکە دەستیگرت بەسەر

سامانەکەیدا، ئێوە ئەبێ پەند وەربگرن لە نەتەوەکانی پێشین، کوا عیملاقەکانی کوڕی عیملاق؟ کوا فیرعەونەکانی کوڕی فیرعەون؟ کوا خاوەن شارەکانی (ڕەس) کە پێغەمبەرانیان تێدا سەر دەبڕی و پەیڕەوی پێغەمبەرانیان(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) کوژانەوە و ڕەوشتی ستەمکارانیان زیندوو کردەوە، لە کوێن سەردارانی سوپاو فۆشەن کە هەزارانیان تێدا شکاندو سەربازگەیان مۆڵ ئەداو شارانی تازەیان دروست دەکرد!؟.

ئەو خودایە بۆ زۆرزانیی و جوامێریی قەڵغانی داناوە، کۆی هەموو وێژەکانی داوە بەو کەسەی کە ڕووی لێکردووە و هەوڵی زانینی داوە و خۆی بۆ تەرخانکردووە، لای وایە ونبوویەکی دۆزیووەتەوە و پێویستیەکی دەستکەوتووە، ئەگەر ئیسلام غەریب بوو، خۆی بەغەریب ئەزانێ، پاڵی داوەتەوە، ملی لەزەوی ناوە، پاشماوەی بورهانەکانی خودایەو خەلیفەیەکە لە خەلیفەی پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت).

خەڵکینە.. من ئەوەندە ئامۆژگاریم بۆ بلاوکردوونەتەوە لە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) بۆ نەتەوەکانیان، ئەوەی ڕاسپێردراوان گەیاندویانە بە خەڵکانی پاش خۆیان و بەم تەمبێیە تەمبێمکردوون، بەلام ئێوە تەمێخوار نەبوون، زۆرم بۆ وتوون لە هەڕەشە و گوڕەشە، بەلام ئێوە بەیەکەوە نالکێن، خودا چیتان لێ بکات!!، بە تەمان ئیمامێکی غەیری من ڕێگەتان بۆ ڕەچەشکێن بکات و ڕێگەتان نیشانبدات؟.

حەز ئەکەم ئاگادارتان بکەم دنیا پشتی کردووەتە ئەوەی ڕووی تێکردووە و ڕووی ناوە بەوەی پشتی تێکردووە، پیاوە چاکەکانی خودا نیازیانکردووە بۆ کۆچ و بار، کەمی دنیایان فرۆشتووە بەزۆریی ئەو دنیا کە هەمیشەییە، چ زیانێکیان کردووە، ئەو برایانەی کە خوێنیان ڕژا، کە لە (سیفین) بوون، کە ئەمڕۆ زیندوونەبن! کە بە ناخۆشیی دەخنکان و ئاوی لێڵیان دەخواردەوە؟ ئەوەی ڕاستیبێ قەسەم بەخوا ئەوانە لای خودان و پاداشتیان وەرگرتووە و خودا لە شوێنی ئارامدا پاش ترس دایناون.

کوا ئەو برایانەم کە کەوتنە ڕێگە و لەسەر ڕاستیی ڕۆیشتوون؟ (عەممار)لە کوێیە؟ کوڕی (تەییەهان) لە کوێیە؟ (دووجار شەهید) لە کوێیە؟ کوا هاوشێوەکانیان

**کە پەیمانیاندا بۆ مردن و سەری براویان بە بەریدا ڕۆیشت بۆ ناپیاوەکان؟ پاشان دەستی هێنا بە سەر ڕیشیدا و زۆر گریا و ئەوجا وتی: ئاخ و داخ بۆ ئەو برایانە کە قورئانخوێن بوون و بە جوانیی ئەیانخوێند و چاك چاومڕوانی قەرزەکان بوون و جێبەجێیان ئەکرد، پەیڕەوی سوونەتیان ئەکرد و دوژمنی بیدعە بوون، داوای برپاریان لێکرا و هاتن بە دەمییەوە، بڕوایان بە ڕابەر هەبوو و دوای کەوتن. ئەوجا بە دەنگی بەرز بانگی کرد: فەرموون بۆ جیهاد، فەرموون بۆ جیهاد! بەندەکانی خودا، من لەمڕۆوە لێرە سوپا کۆ ئەکەمەوە، ئەوەی ئارەزووی هەیە بۆلای خودا با بێت بۆ ئێرە.**

**نوف ئەڵێ: دە هەزاری بۆ حوسەین دانا،و دە هەزاری بۆ قەیسی کوڕی سەعد، نیازی هەبوو بگەڕێتەوە بۆ سیفین، ڕۆژی هەینی دووبارە نەبووەوە نەفرەتلێکراو (کوڕی مەلجەم) لێیداو سوپا گەڕایەوە، ئێمە وەك ڕانەمەڕێك شوانی نەبێ و گورگ بکەوێتە ناویان وابووین.**

**(١٨٣)**

# وتارێك لەبارەی توانایی خودا، گەورەیی قورئان، ئامۆژگاریی و ترسان لە خودا

**ستایش بۆ خودا کە ناسراوە بێ بینین، بەدیهێنەرکارە بێ زەحمەت، هەموو بوونەوەری درووستکردووە بەو پەڕی تواناوە، هەموو بەناو خاوەنەکانی کردووە بە بەندەی توانای خۆی، گەورەی گەورەکانە، بە دەهەندەیی و بەخشندەیی، ئەو خودایە کە خەڵکی لەدنیا داناوە و بۆ (ئینس و جن) پێغەمبەری ناردووە(صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ڕووی دنیا لابەرێ!، بۆ ئەوەی ترس بخاتە بەردەمیان لە خراپەکانی و بۆ گەیاندنی پەندو ئامۆژگاریی و بۆ ئەوەی عەیب و عارەکانی دیاری بکات و بۆ ئەوەی هۆشیاریان بکاتەوە لە گۆڕانی تەندوستیی و نەخۆشیی لە سەریان و حەڵاڵ و حەرامیان و ئاگاداریان بکات کە گوێگرو فەرمانبەرداریان بەهەشتیی و بێگوێ و یاخییان بۆ دۆزەخە.**

**ستایش بۆ خودا تەنها لەبەر خۆی، وەك ستایشی ئەکەم لەسەر درووستکردنی**

هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی، هەموو ئەندازەیەك كۆتایی هەیە و هەموو كۆتاییەك تۆماری هەیە.

## باسی قورئان

ئەم قورئانە فەرماندەیەكی توندە، بێ دەنگێكی وتاربێژە، بورهان و بەڵگەی خودایە لەسەر درووستكراوی خۆی، پەیمانی لێوەرگرتوون، بەگیانی خۆیان بارمتەی لێوەرگرتوون، بەهۆیەوە ڕووناكیی ڕێگا تەواوە، بەهۆیەوە ئایین ڕێزی لێگیراوە، ئەو كاتەی پێغەمبەرەكەی(صلى الله عليه وسلم) بردەوە، هەموو فەرمانەكانی بۆ خەڵك لەم قورئانەدا جێگە كردووەتەوە، ئەو خەڵكەش گەورەیی و دەسەڵاتی خودایان لەگەورەدانانی خودا خۆی لە قورئان وەرگرت، ئەو قورئانە هیچ كارێكی لە ئێوە نەشاردووەتەوە لەبارەی ئاینەوە، هیچ شتێكی جێ نەهێڵاوە، لەوەی پێی خۆش بێ، یان ڕقی لێیبێ لەم قورئانەدا ئاماژەی پێكردووە و نیشانەی بۆ داناوە، ئایەتێكی پتەوی داناوە كە (نا) لە خراپە بكات، یان فەرمان بە چاكە بكات، ڕەزامەندیی خودا لەوەی كە ماوە یەك كەسە و ڕقی لەوەی كە ماوە یەك كەسە.

ئەوەش باش بزانن لە ئێوە ڕازی نابێ لە شتێكدا كە لە نەتەوەكانی پێش ئێوە ڕقی لێبووە و ڕقی لە شتێ نابێ كە لەوان ڕازی بووە و لە ئێوە ڕقی لێبێ، ئێوە بەڕێگەیەكی ڕچەشكاودا ئەڕۆن، ئێوە ئەوەی باسی ئەكەن دەنگەوەرەی پێش خۆتانە گەڕاوەتەوە، خودا كەفیلی ئەركی ڕۆزی دنیاتانەو داوای سوپاسی لێكردوون و بە زوبان باسی بكەن.

## ڕاسپاردە بە ترسان لە خودا

ئەو خودایە ڕایسپاردوون كە خۆپارێزیی بكەن لە گوناهو تاوان، كۆتاڕەزای خودایە، كۆتا داوایە لە خەڵكی خودا، لە خودا بترسن كە هیچی لێون نابێ، سەرتان بەدەستی ئەوە، هاتن و چوونتان لە مشتی ئەودایە، پەنهان ئەزانێ، ئاشكرای بكەن ئەینوسێ، لەسەر ئێوەی داناوە فریشتەی پاسەوان، هەرگیز حەق ون ناكەن و ناحەق نانووسن و ئەوەش بزانن (هەركەسیش لە خودا بترسێ دەرچوویەكی لێئەكاتەوە) بۆ

دەرچوون لە ئاژاوە و ڕوناکیی لە تاریکیی بە نەمریی دایناوە لەو شوێنەی حەزی لێیە، لە جێگەی بەرزو بەڕێز دایناوە، ئەو شوێنە ساباتی پاداشتی خودایەو لە ژێر سێبەری عەرشە، کەواتە ئیش بۆ گەڕانەوە بکەن، کێبەرکێی ئەجەل بکەن، زۆر نزیکە هیوا کۆتایی پێبێت و ئەجەل بگاتە سەرتان و دەرگاتان لەسەر داخا، لەو ڕۆژەدان کە (یارۆ) داوا ئەکات لە خودا بگەڕێتەوە بۆ ئەم دنیایە، لە پێش ئێوە، ئێوە ڕێبوارن لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دیکە، کە ئیزن دراون و ئەبێ تێشووتان پێبێ، ئەوەتان زانیوە کە ئەم پێستە ناسکە بەرگەی ئاگر ناگرێ؟ خۆتان ڕەحم بە خۆتان بکەن، چونکە ئێوە هەموو کارەساتەکانی دنیاتان ئەزموونکردووە، باش ئەزانن کە دڕکێ ئەچێ بە پێتاندا ئێشی چەندە؟ یان پێتان هەڵئەکەوێ و خوێنی لێدێ چەندە نارەحەت ئەبن؟ کە پێئەنێن بەسەر بەردی گەرمدا چۆن چرزەتان لێئەکەوێ، ئەی چۆنە ئەگەر ئاگر سەرو ژێربێ و لەسەر بەردی سوورکراوە بن و شەیتان هاوملتان بێ؟.

ئەوەتان زانیوە (مالیك ئاگرەوانی دۆزەخ) ئەگەر ڕقی لە ئاگر هەستێ،ئاگرەکان یەکتر دەڕوخێنن، کە هەڕەشەیان لێبکات لە دەرگاوە لە ترسان دەرئەپەڕن، ئەها..! پیری کۆنەساڵ، کە مووی سپی دەوری داوی !، ئاخۆ حاڵت چۆن بێ کە نێلەی ئاگر لە ملت دەئاڵێ؟ کەلەبچە و بازنی گەرم گۆشتی باسکی خواردووی؟.

بەندەکانی خودا!! بۆ لای خودا بگەڕێنەوە، ئێستە تەندرووست و دووری لە نەخۆشیی، ئێستە لە خۆشیدا پێش تەنگانە گەردنی خۆتان ئازادکەن پێش ئەوەی لە بارمتەدا بڕوات، چاو بەخەبەر بن و سکتان خاڵی بێ، قاچەکانتان بەکار بێنن و ماڵەکانتان خەرج بکەن و لە خۆشیی لەشتان بگرنەوە بۆ پاشەڕۆژتان باشە، ڕەزیلیی مەکەن لە ڕەنجاندنی لەش، خودا ئەفەرموێ: (ئەگەر هاوکاریی و یارمەتیی خودا بن، خودا هاوکارتانە)، دەفەرموێ: (ئەگەر قەرز بدەن بە خودا، خودا بۆتان چەندان ئەکات و پێتان لە زەوی قایم ئەکات)، خودا لە بێ دەسەڵاتی نییە داوای یارمەتیی ئەکات و لە بێسامانیی نییە کە داوای قەرزتان لێئەکات، خودا کە داوای یارمەتیی ئەکات هەموو سەربازی زەوی و ئاسمانی لە بەردەستە، بەرزو بەشکۆ و بەتوانایە، کە داوای قەرز ئەکات هەموو خەزنەی ئاسمان و زەوی لایە، دەوڵەمەندی بێمنەتە، بەڵکو ئەیەوێ بزانێ لە تاقیکردنەوەدا کێ کاری باش و چاك ئەکات، کاری باش

بکەن ئەبنە دراوسێی خودا لە ماڵی خۆیدا، لەگەڵ پێغەمبەران و فریشتەکان(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) و دەنگی ئاگر ناژنەون و لەشتان پارێزراوە لە ئازارو ئێش، ئەوە گەورەیی خودایە ئەیدا بەهەر کەس کە ئارەزوو بکات، خودا بەخشندەی گەورەیە، ئەوە ئەڵێم کە گوێتان لێبوو، خودا هاوکارمە لەسەر خۆم و ئێوە و باشترین وەکیلە.

( ١٨٤ )

## وتاریَ کە بە ( بورجی کوڕی مەسهەری تائی ) وت، کە ئەم بەدەنگی بەرز کە ئیمام گوێی لێ بێ وتی: حوکم تەنها بۆ خودایە، ئەم کابرایە یەکێك بوو لە خەواریج

پێشەوا وتی: بێدەنگبە خودا ئاژەت بشێوێنێ، هەی ددانکەل!، سوێندم بە خودا، حەق بە ڕوونیی دیارە، بەلام تۆی لەڕولاواز خۆت بەکەم ئەزانی، دەنگت نووزەیە، ئەوکاتەی کە ناحەق بارەی لێهەڵئەسێ، تۆ وەك شاخی بزن دەردەکەوی.

( ١٨٥ )

## وتاریَ لە سوپاسی خودا، وەسفی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و باسی هەندێ گیانلەبەر

ستایش بۆ خودا کە بینەر نایبینێ، لە دیمەنێکدا کۆ نابێتەوە و چاو نایبینێ، پەردە نایشارێتەوە، درووستکردنی بوونەوەر بەلگەی قەدیمییە، بە درووستبوونی خەڵکیی، بەلگەی بوونیەتی، لەبەر لێکچوونی بوونەوەر، ئەو نموونە و وێنەی نییە، ئەو زاتەی کە بەڵێنی ڕاستە، ستەم لەبەندەکانی ناکات، بە دادپەروەریی لەناو خەڵکدا کاری کردووە، دادوەرە لە درووستکراوەکانیدا، بەلگە لەسەر تازە درووستکردنی نیشانەی ئەزەلییەتی، بە بێدەسەلاتیی و کەمتوانایی درووستکراوەکان نیشانەی زۆریی دەسەلاتە بۆی، بە فەوتان و نەمانی بوونەوەرەکانی بەلگەی هەمیشەیی و ئەبەدییەتی، نەك بە ژمارە، هەیە بێپاڵپشت، زەین بۆی ئەچێ بەلام

به ڕەهەند و دوورو نزیكیی نا، هەموو ئاوێنــه بالاڕوانــەكان دەری ئەخــەن بــەلام بــێ بەرامبەری، وەهم و خەیاڵ بــۆی نــاڕوا، بــەڵكو خــۆی نمــایش ئــەكا بۆیــان و دەســتیان پێی ناگا و ئەوجا دەگەڕێنەوە بۆ دادگاییكردنی خودی خۆیان، لەو گەورانە نییە كە پەلی هاویشتبێ و كۆتایی هەبێ، ئەو خاوەن دەسەلاتانە نییـە كـە دەست ڕۆیـشتنی سنووری هەبێ، بەڵكو خۆی گەورەیە و دەسەلاتدارە بێسنوور.

## پێغەمبەری گەورە
## ( صلى الله عليه وسلم )

بەدڵ باوەڕم هەیە، بەزمان ئەڵێم كە محەممـەد(صـلى الله عليـه وسـلم)، بەنـدەی خودایە و پاڵفتەیە و ڕازگری باوەڕپێكراوە، ڕەوانەكراوە بە بەڵگەی ڕاست و بـەهێزو ڕۆشنی ڕێبازو پەیڕەوی بێكەموكوڕیی، ئەویش پـەیامی خـودای گەیانـدە خـەڵك، بـە هەموو سەرئێشەو ماندووبوونێكەوە، خەڵكی بانگكردووە بـۆ ڕاسـتەڕێ بـە شـارەزایی خۆی، ئالای ڕێنیشاندەری هەڵكردو چرای سەر منارەی ڕۆشنكرد، پەتی ئیـسلامی بـە توندی گرێداوە و دەسكی مەحكەمی بۆ داناوە.

## وەسفی هەندێ گیانلەبەر

ئەگـەر خـەڵك بـیر بكەنــەوە لـە گـەورەیی و توانـای خـودا و زۆریـی و بـەرزیی نیعمەتەكانی، دەگەڕانەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و ترسی ئاگری سـوتێنەریان ئـەبوو!، بـەلام دڵـەكانیان نەخۆشـەو چـاوەكانیان بیمـارە، باشـە ئـەوە بـۆ ورد نابنــەوە لـەو بوونەوەرە زۆر وردانەی كە خودا دروستیكردوون؟ چونكە لەگەڵ وردیی و ناسكیدا ڕێكیخستوون، چۆن لە یەكی بەستوون؟ چۆن چاو و گوێی بـۆ درووسـتكردون؟ چۆن ئێسك و ڕەگ و پێستی بۆ داناون!؟.

تەماشای مێروولەسوورە بكەن، لەگەڵ بچووكیی لەشی و ناسكیی تەنی، لەوانـەی بەچاو بـاش نـابینرێن و بـە هەسـتی ورد نـەبێ شـوێنیان دیـاری نابـێ، چۆن دەچـێ بەسەر زەویدا و دەكەوێ بەسەر ڕۆزیدا، دانـە دەگوازێتـەوە بـۆ هێلانـەو كونەكـەی و لـەژێرەوە دایـدەنێ، لەگـەرما و سـەرما پەیـدای ئـەكات، لـەهات و چـونیدا، متمانـەی

ڕۆزیــی پێــدراوه بــه ئــارەزووی خــۆی، خــودای منەتــدەر لــه بــیری نــەكردووه، دروستكاریی بێبەشی نەكردووه، هەرچەندە لەسەر بەردی ڕەق و وشك بێت، خۆ ئەگەر بیر بكەینەوه له شوێنخواردنەكەی و بەرزیی و نزمیی و لەناوەوەی لە ئێسك و پەراسوی و دیـواری گـەدەی و لەسـەری و لەچـاو و گـوێی، ئـەوكات سـەرت سـوڕ دەمێنێ لە شێوەی دروستكردنی كە بتەوێ وەسفی بكەی مانـدوو ئـەبی!، بـەرزیی و شكۆ تەنها بۆ ئەو زاتەی ئەم مێرووەی لەسەر قاچ وەستاندووه، چۆن ساق و ئـەژنۆی بۆ دانـاوه، لـەم كارەشـدا كـەس هاوكـاریی نـەكردووه، یارمەتیـدەرێ نـەبووه یارمـەتی بـدات، ئەگـەر چـاك بـیر بكەیتـەوه بـەڕوونی بـۆت دەرئەكـەوێ، داهێنـەری ئـەم و دارخورمـا هــەر یــەك كەســە، بــاڵابڕی هــەردووكیان هــەر خودایــە لەگــەڵ ئــەو جیاوازییـەی لای ئـەو داهێنـەره وگـەورەو ورده، قـورس و سـووك، بـەهێزو لاواز، لـه دروستكردنندا وەك یەكە.

## دروستكردنی ئاسمان و بوونەوەر

هەر بـەو شـێوەیە ئاسمـان و بـا، هـەواو ئـاو، تەماشـای خـۆر و مـانگ و ڕووەك و درەخت و ئاو و بەرد، جیـاوازیی شـەو ڕۆژ، زریـانی دەریـاو بـەرزیی و گـەورەیی ئـەم شـاخانە و درێـژیی سـەری چـیاكان و جیـاوازیی ئـەم زمانـە و ئـەم هـەموو زمانـە جیاوازانە بكەن.

دەك دۆزەخ بۆ ئەو كەسەی بڕوای بـەم داهێنـەره نییـە، ئینكـاری ئـەم ڕێكخـەره ئەكات، وا ئەزانن وەك گیای خۆڕسك جوتیاری نییە، بـەم شـكڵ و شـێوازە داهێنـەری نییە، ئەو بۆچوونەش هەموو بێبنەما و بێبەڵگەیە، نەگەڕاون بە شوێن توێژینەوەی ڕاست، ئـەرێ خـانوو بـەبێ وەسـتاو كرێكـار درووسـت ئـەبێ؟ ئـەرێ تاوانێـك بـه بـێ تاوانبار ئەكرێ؟.

## دروستكردنی كوللە

ئەگەر بتەوێ لەسەر كوللە بدوێی ئـەتوانی بڵێـی دوو چـاوی سـووری هەیـە، دوو بیلبیلەی وەك مانگی تێدا داگیرساوە، گوێی پەنهانی هەیە، دەم و ددانی ڕێكـی هەیـە، لەشێكی هەستیاری هەیە، دوو كەڵبەی هەیە بۆ قرتاندن، دوو داسی تیژی هەیـە بـۆ

دروێنەی دەغڵودان، جوتیار و کەشتیار زۆری لێئەترسن بۆ کشتوکاڵەکەیان، ناتوانن ڕاویبنێن، هەر بە کۆمەڵ هێرش بهێنن هەتا دێتە کێڵگەیان و بەئارەزووی خۆی تێر ئەخوات، هەموو کەرەستەی درووستکردنی بەقەدەر پەنجەی باریکەیە، گەورەیی و شکۆ تەنها بۆ ئەو خودایە کە (کڕنووشی بۆ ئەبەین، ئەوەی لە زەوی و ئاسمانە بە خواهیی و نە خواهیی)، ڕوو و ڕوومەتی خۆیان لەسەر خۆڵ دائەنێن، بە گوێڕایەڵیی لە درووستیی و نادرووستیدا ڕەشۆی خۆیان داوەتە دەستی بە ترس و لەرزەوە، باڵندە فەرمانبەری فەرموودەیەتی، پەڕو هەناسەی هەژمار کردوون، قاچەکانیان لە وشکانیی و تەڕایی داناوە، ڕۆزی بۆ دیاری کردوون و نموونەکانی نیشان داون، ئەوە قەلەڕەشە، ئەوە هەڵۆیە، ئەوە کۆترە، ئەوە وشترمژە، هەر باڵندە و ناوی خۆی هەیە و متمانەی ڕۆزیشی پێداوە، هەوری ئاوس و قورسی درووستکردووە، بەخوڕ باران دەبارێ لێی، دابەشیکردووە بەسەر زەویدا، پاش وشکیی تەڕی دەکاتەوە، گیا و ڕووەك پاش وشکبوونیان دووبارە شین ئەکاتەوە.

( ١٨٦ )

## وتارێ لەسەر یەکخواپەرستیی
## کە ڕەگی هەموو زانستی تێدایە

ئەوەی چۆنییەتی بۆ بڕیار بدات بە تاکی نازانێ، ئەوەی بیچوێنێ بەشتێ هەرگیز نیشانەی نەپێکاوە، هەرگیز بۆچوونی بۆ ئەو ڕاست نەبووە، ئەوەی کە بەراوردیکردووە لەگەڵ شتێکیتر، ئەوەی ئاماژەی پێبکات و لە خەیاڵی خۆیدا دایبنێ بەلای ئەودا نەچووە، هەرچی پێناسەی کراوە خۆی لە خۆیدا دەستکردە، هەرچی وەستاو هەیە غەیری ئەو نەخۆشە و بیمارە، کارایە بە ئامێر نا، دانەری بڕ و چەندە بە بیرکردنەوە نا، دەوڵەمەندە بە سوود وەرگرتن نا، کات و زەمان لەگەڵی نییە، ئامێر ناتوانێ دیاری بکات، بوونی پێش کات بووە، بوونی پێش نەبوون بووە، ئەزەل سەرەتایەتی، بە دانانی سۆز بۆ سۆزدار، زانراوە کە خودا سۆزو پەرچەکرداری نییە، بە دانانی دژایەتیی لە ناو دژەکاندا، زانراوە کە دژی نییە، بەهاوتا بوونی نییە، زانراوە کە هاوتای نییە، ئەو خودایە کە ڕووناکیی کردووە بە

دژی تـاریکیی، ڕۆشـنیی دژی دێزیـی، وشـکیی دژی تـەڕیی، گـەرمیی دژی سـاردیی، درووسـتکردنی ئەوانـە و تێکـەڵاوکردنی گـشت ڕەگـەزەکانیان و هاوتـاکردنی گـشت دژەکان، نزیککردنەوەی دوورەکانیان و جیاکردنەوەی نزیکەکان هەموو کاری ئەوە.

ئـەو خودایـە سـنووری بـۆ نییـە، ژمـاردنی نییـە، چـونکە ئامێرەکـان خۆیـان دەژمێـرن و هەریەکـەیان بـەهاوتایان ئامـاژەیـان پێئـەکرێ، ئەزلییـەتی ئـەو خودایـە ناکۆکە لەگەڵ پیتی (لە)، ئەبەدییەتی ناکۆکە لەگەڵ (هـەتا)، دوورە لـە (ئەگـەر)ەوە، بـەم ئامێرانـە بەدیهێنـەریان بـۆ عـەقڵ ڕوون ئەبێتـەوە، هەرچـەند بـە ئامێرەکـان هەرگیز نابینرێ، هەرگیز جوڵەو نەجوڵە بەسەریدا نایە، چۆن ئـەوە بەسـەریدا دێ، کە خۆی درووسـتیکردووە، چۆن پارچـەی لێدەبێتـەوە، کـە خـۆی جیایکردووەتـەوە، چۆن ئەوەی خۆی دروستیکردووە بەسەریدا دێت؟ ئەگەر وابێ دەبێ زاتـی، پارچـەو جیاوازیی پارچەی هـەبێ و حەقیقـەتی بـەش بـەش دەبـێ، ئەوکاتـە مانـای ئـەزەلیی نامێنێ، ئەگەر پشتەوەی هەبێ دەبێ پێشەوەی هەبی، ئەبێ خۆی تەواو بکات، ئەگەر نوقسانیی هەبێ، ئەوکات دەبێ دەستی کردنی لەسەربێ، ئەو کاتە دەبێتە بەڵگە نەك بەڵگە بۆ هێنانەوە، ئەوکات ئەوەی کار ئەکاتە غەیری ئەو، کاریش ئەکاتە ئەم، خودا گۆڕانی بەسەردا نایەو نەمانی  نییە و ونبوون و ئاوابوونی نییـە، لـە کـەس نـەبووە، هەتا بێتە خودای و کەسی لێنەبووە هەتا پێناسە بکرێ، گەورەترە لەوەی کە منداڵی هەبێ و لەوە پاکترە کە پێویستی بە ژنان هەبێ، ڕێگای وەهم بۆ لای نییـە، هـەتا بـڕ و چەندی بۆ دانێ، زیرەکیی نایگاتێ، هەتا وێنـەی بگـرێ و ئـامێری هەسـت نایپێکـێ هەتا گۆڕانی حاڵی بەسەردا بێت، بەشەو و ڕۆژ کۆن نابێ، لـە تـاریکیی و ڕووناکیـدا ناگۆڕێ، بەشی بۆ دیاری ناکرێ، بەڕەگەز یان دەسـت و بـاڵ بـە هـیچ جـۆرە عـەرزێك وەسـفی نـاکرێ، یـان  بـە بـەش و جیـاوازیی بـەش وەسـف نـاکرێ، ناچێتە نـاو هـیچ شـتێکەوە و لـە هـیچ شـتێکیش دەرناچـێ، پـەیام ئـەدا، بـەڵام بـە زمـان و گـەروو نـا، ئەبیستێ، بەڵام بە گوێچکە و چوونە ناوەوە نا، قسە دەکات، بەڵام بە پیت و وشە نـا، پـارێزەرە، بـەڵام بێمانـدوو بـوون و مەشـەققەت، داوا دەکـات، بـەڵام بـە شـاراوە نـا، خۆشەویستیی و ڕقی هەیە، بەڵام بەدڵنەرمیی نا، پێناخۆشیی و توڕەیی هەیە، بەڵام بێ ماندوو بوون، هەر کات ویستی شتێ بێتە بوون دەفەرموا (ببە ! ئەبێ)، بە دەنگ و گـوتن نـا، بـە بـانگ وگوێبیـستیی نـا، کـەلامی خـوای پـاك و بێگـەرد کردەیـە،

دروستکردنە لە خوداوە و بێ چواندنە، بێ هاو شێوەی دروستکراو لە پێشەوە، ئەو دروستکراوە ئەگەر قەدیم بێ دەبێتە خودایەکی دووەم، هەرگیز نابێژرێ، بووە و لە نەبوونەوە هاتووە، ئەو کات دیاردەی تازە دروستکراوەکانی بەسەردا بێ و لە نێوان خودا و ئەو تازە دروستکراوە کات نییە و زیادەفەزڵ نییە، چونکە دروستکارو دروستکراو و داهێنەرو داهێنراو، وەك یەك نەبێ، هەموو بونەوەری دروستکردووە، بێ وێنەی پێشینی، کە لە خودی دروستکراوەکە داوای یارمەتی لە هیچ دروستکراوێکی خۆی نەکردووە، زەوی داهێناوە بێ ئەوەی پێوەی خەریك بێ و ڕایگرتووە بێ وەستان، ڕایگرتووە بێ لاق، بەرز ڕایگرتووە بێ کۆڵەکە و پایە، پاراستوویەتی لە خوار بوونەوە و لارو وێریی و نەیهێشتووە پارچە پارچە بکەوێتە خوارو درزو ڕوخانی تێبکەوێ، مێخی بۆ داکوتاوە لەسەر خۆی و بە توندی بەستویەتییەوە و لەناویدا کانیی و چەشمەی لێهەڵقولاندووە و ئەو هەموو شیو و دۆڵەی تێدا دروستکردووە، لەو هەموو کارە سستیی نەبووە و بێ توانایی ڕووی تێنەکردووە.

خودا بەتوانایی بەرزیی دەسەڵاتی هەیە لە سەری و ئاگاداری ناوەکەیەتی بە هەموو جۆرە زانین و ناسینەوە، توانایی لەسەریەتی بەهەموو شکۆو بەرزیی و دەسەڵاتەوە، هیچ شتێك لەزەویدا نییە کە خودا بیەوێ زۆری بەسەردا نەشکێ یان بێفەرمانیی بکات و دەسەڵات پەیداکاتەوە بەسەریدا، هیچ تیژڕەوێك لە دەستی دەرناچێ، هەتا بیگرێتەوە، پێویستی بە سامانداری نییە، کە ڕۆزیی پێبدات، هەموو شت ملکەچی ئەوە، هەموو سەرنەوییە لە گەورەیی ئەو، ناتوانێ یاخی بێت و بڕوا بۆ لایەکی ترو زیان و قازانجی خودای پێویست نەبێ، هاوشانی نییە، هەتا لەگەڵی ڕێکبکەوێ و هاوشێوەی نییە، هەتا وەك ئەو بێ، هەر خودا بۆ خۆی لەناوی دەبا پاش بوونی، کە بوونەکەی وەك نەبوونەکەیەتی، چونکە فەوتان و نەمانی دنیا پاش ئەوەی لە نەبوون دایهێنا لە دروستکردن و بوونەکەی سەیرترو سەرسوڕهێنەرتر نییە، چۆن؟.. ئەگەر هەرچی گیانلەبەر هەیە باڵندەو ئاژەڵ، لە پەچەکەیان، لە لەوەڕگەکەی، لە هەموو جۆرو بیچم، لە هەموو گێل و گەمژەو زیرەك و بلیمەت، کۆبێتەوە بە هەموویان ناتوانن تەنها مێشوولەیەك پەیدا بکەن و بیهێننەبوون و هەرگیز نازانن چۆن دروستی بکەن، عەقڵیان سەرگەردانە لەم زانستە و سەرلێشواو

هێزیان دەڕوخێ و دەستەوسان ئەوەستن و دەگەڕێنـەوە بەدڵشکاویی و نائومێـدیی و ئەزانن کە بێتوانانن و بێهێزن و بێزانستن، دڵنیا دەبن کە ناتوانن درووستی بکـەن و ناشتوانن لەبوونیی لابدەن !!.

خودا تەنها خۆی دەمێنێ، پاش نەمانی دنیا، هیچ کەس و شـتێکی لەگـەڵ نییـە، وەك یەکەم جاری پێش داهێنانیان، بێکات و بێشوێن، ئەوکاتە وەخـت نامێنـێ، سـاڵ و مانگ و دەمژێر نامێنن، تەنها خودای خاوەن تواناو دەسـەڵات دەمێنـێ، هـەموو بـۆ لای ئــەو دەگەڕێتــەوە، نــە دەســەڵاتی بەســەر بوونیــدا هــەبووە و نــە ئــەتوانێ نەگەڕێتەوە، ئەگەر بتوانـێ نەگەڕێتـەوە مانـای مانەوەیـەتی، لـەکاتی درووسـتکردنی هـەر شـتێك توانـای بـەرگریی لـە درووسـتکردنی نـەبووە، هـیچ درووسـتکراوێك لـەو درووستکراوانە لە ژێر دەسەڵات و تواناییدا دەرنەچوون، ئەو هەموو درووستکراوە بـۆ زیادە هەیمەنە و دەسەڵات نـەبووە و بـۆ ترسـی لەناوچوونی دەسـەڵات نـەبووە و بـۆ پێویستیی خـۆی نـەبووە و بـۆ هاوکـاریی دەسـەڵاتدارێکێتر نـەبووە، بـۆ خۆپاراسـتنی نەبووە لە دژێکی پەلاماردەر، بـۆ زیادەسـامان و موڵـك نـەبووە، بـۆ زیـادەی هاوشـانی خۆی نەبووە لە هاوبەشیدا، لەبەر بێکەسیی و بێتاقـەتیی نـەبووە، هـەتا خـۆی پێـوە خەریك بکات و ڕزگاریی بێ لە بێهاودەمیی.

پاش ئـەوە خـودا خـۆی لـەناوی ئـەبا پـاش داهێنـانیی، نـە لەبـەر مانـدووبوونی و زەحمەتکێشانی لە درووستکردن یان لەبەر خۆشیی و حەسانەوەی خـۆی یـان لەبـەر قورسـیی و نـەبوونی کەرەسـتەی پێویـست، خـودا مانـدوو نابـێ لـە زۆر مانـەوەی بوونـەوەری خـۆی و هـەوڵ بـدات لـەناوی بـەرێ، خـودا بـە لوتـف و بـەزەیی خـۆی درووسـتیکردووە و ڕایگرتـووە، خـودا توانـای هەیـە دووبـارە پـاش لـەناو بردنـی و فەوتانی درووستی بکاتەوە، بەبێ ئەوەی پێویستی پێی هەبێ، بێ داوای یارمـەتیی و هاوکاریی لە هیچ کامیان و لە هیچ کەس، لەبەر ئەوەش نییە کەسی لانییـەو حـەزی لــەهاودەم و هاوڕێیــە، لەبــەر نــەزانین و نــەبینینی نییــەو لەبــەر هــەژاریی و دەسـتکورتیی نییـە، بـۆ سامان و دەوڵەمەنـدیی و لەبـەر زیـادیی دەسـەڵات نییـە، لـە بێدەسەڵاتییەوە.

(١٨٧)

## وتاریَ لەبارەی داستانی جەنگەکانەوە

ئاگادارتان دەکەم مەردانی خودا ! بە باوك و دایکم بەقوربانیان بم...!ئەوانەی کە ساڵانێك ناویان لە ئاسماندا ناسراوە و لەزەویدا نادیارە، ئاگادار بن ڕۆژێ دێ بەسەرتانا کاروبارتان ڕوو لە شکستە، لە یەك دادەبڕێن و سووکیی و بێنرخیتان بەسەر دێ، ئەو ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە زامی شمشێر لەسەر باوەردار ئاسانترە لە وەرگرتنی فلسێك لە بەر حەڵاڵیی و ئەوەی پێی دەبەخشرێ ئەجرو پاداشتی زۆرترە، لەبەخشندەکە، ئەو ڕۆژە بێ مەی سەرخۆشن، لەبەر زۆریی نازو نیعمەت و خۆشگوزەرانیی لەو ڕۆژەدا بێ پێویستیی سوێند ئەخۆن، بێ زۆر لێکردن درۆ ئەکەن، ئەو ڕۆژە کە بەڵاو کارەسات پشتان زامدار ئەکات، وەك کورتان پشتی وشتر ناوکەڕێژ ئەکات، ماوەی زۆری ئەو داماوییە و هیواو ئومێد زۆر دوورە.

خەڵکینە.. ئەم ڕەشۆیە کە قورسایی لەسەر پشت گرانە دەستی لێبەردەن، سەرئێشە بۆ خۆتان و دەسەڵاتتان پەیدا مەکەن، پەشیمان ئەبن لە کردارتان، وەکو جاری پێشین مەکەن، خۆتان بخەنە ناو بڵێسەی ئاگرەوە، خۆتان بپارێزن لە دووبارەکردنەوەی کارەکانی پێشووتان، ڕێگەی ڕاست بگرن، (بەوخودایەی تەمەنی منی بەدەستە) باوەڕدار ئەفەوتێ و بێباوەڕ دەرباز ئەبێ، نموونەی من و ئێوە وەك چرایە لەتاریکیدا، هەرکەس بەدەستیەوە بێ بۆی ڕووناك ئەکاتەوە و دەرباز ئەبێ، گوێڕایەڵ بن، خەڵکینە.. تێبگەن و لێبگەن و بەدڵ گوێبیستی بن، باش حاڵی ئەبن و دەچێتە زەینتانەوە.

(١٨٨)

## وتارێك بۆ ڕاسپاردن بۆ خۆپارێزیی

خەڵکینە داواتان لێ ئەکەم، ڕاتان ئەسپێرم.. لە خودا بترسن و خۆتان بپارێزن، زۆر ستایشی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو بەخشندەییەی بە ئێوەی داوە، ئەو هەموو نازونیعمەتەی بە ئێوەی ڕەوا بینیوە، ئەو هەموو چاکەی لەگەڵ ئێوە کردووە، زۆرجار بەتایبەتیی نیعمەتی بەئێوە داوە و بەسەری کردوونەتەوە بە بەزەیی خۆی.

## باسى مردن

داواتان لێئەكەم هەمیشە یادى مردن بكەن، زۆر كەم خۆتانى لێهەڵە بكەن، ئێوە زۆرجار عەیب و شورەییتان دەركەوتووە و خودا بۆى شاردوونەتەوە، زۆرجار شایستەى تۆڵەو سزا بوون و خودا مۆڵەتى داون، باشە چۆن ئەبێ ئێوە بێخەم بن لە مردن، بەڵام ئەو بێخەم نییە لە ئێوە؟ بە تەماى شتێك بن كە هات، مۆڵەتى ئێوە نادات!، لە ڕاستیدا باشترین ئامۆژگاریى، مردنى ئەوانەیە كە لەبەرچاوتانەوە ڕۆشتن و لەسەرشان بران بۆ گۆڕەكانیان، كە بە خواستى خۆیان سوار نەبوون، دایانهێشتنە گۆڕەوە و بەدڵى خۆیان نەبوو، وەك ئەوانە لەوانە نەبووبن كە زەوییان ئاوەدان دەكردەوە، وەك ئەو دنیا خانەى هەمیشەییان نەبووبێ، لە شوێنێكى چۆڵ نیشتەجێ كران، كە بە نیشتمانى خۆیانیان دەزانى، لەشوێنێك دانران كە چۆڵ بوو، سەرقاڵى شتێ بوون كە بەجێیان هێشت، ئەوەى دەبوو پێیان بوایە ونیانكرد، ناتوانن لاریى لەكارى خراپى خۆیان بكەن، ناشتوانن لەو كارەچاكەى كردوویانە زیادى بكەن، پاڵیاندا بە دنیاوە و ئەویش گومڕاى كردن و زۆر جێگەى بیروڕایان بوو، بەڵام ئەو دانى بە زەویدا.

## زوو تەواو بوون

كەوایە پەلە بكەن (خودا ڕەحمتان پێبكا) بۆ باركردن، بۆ ئەو جێگەى كە پێتان وتراوە، با ئاوەدان بێ و دەبێ دڵتان لایبێ و هەر بۆ ئەوێ بانگكراون، هەوڵبدەن نیعمەتەكانى خودا لەسەرتان تەواو بكەن، بە ئارامگرتن لەسەر فەرمانەكانى و خۆلادان لە بێفەرمانییەكانى، بەیانى لە ئەمڕۆوە نزیكە، دەمژمێر زۆر بە پەلە ئەڕوا، ڕۆژ بە پەلەترە لە مانگ، مانگ لەساڵ زووتر ئەڕوات، ساڵیش لە تەمەن.

(١٨٩)

## وتارێ لەسەر باوەڕ و پێویستیی کۆچ

بەشێك لە باوەڕ جێگیرە، مەند و وەستاوە لە دڵا، بەشێکیش لەناو سنگ و دڵ هاتوچۆیەتی، هەتا کاتی دیاریکراو، ئەگەر ویستتان خۆتان دووربخەنەوە لە کەسێك و تەبەڕڕای لێبکەن، پەلە مەکەن، ڕایگرن هەتا ئەمرێ، کە مردو پەشیمان نەبووەوە ئەوکات تەبەڕڕای لێ بکەن.

## پێویستیی کۆچکردن

کۆچ لە بەر باوەڕ و ستەم هەیە، وەك یەکەمجاری کۆچ، خودا چ پێوستیی بەکەسانێ هەیە، کە بە شاراوەیی لە وڵاتی کوفر باوەڕیان هەبێ و چ پێویستیی بە ئاشکرا کردنییەتی لە وڵاتی ئیسلامدا، کۆچ لەسەر کەس نییە هەتا باوەڕی تەواوی بە ئیسلام نەبێ، کە ئیسلامی زانی و دانیپێدانا و کارەکانی بۆ ئەنجام نەدەدرا، ئەوە دەبێ کۆچ بکات، ناوی بێدەسەڵات کە لێبوردراوە لە کۆچ، لەسەر کەسێ نابێ کە لە ئیسلام گەیشتبێ و بە گوێی ئاشنا بووبێ و بە دڵ باوەڕی پێهێنا بێ.

## بارگرانیی باوەڕ

کاری ئێمە (باوەڕ)ە قورسە، قورسیی دەوێ، کەس بۆی هەڵناگیرێ، مەگەر بەندەیەکی باوەڕدار، کە خودا دڵی تاقیکردووەتەوە، کە باوەڕی تێدایە، کەس لە وتاری ئێمە حاڵی نابێ، جگە لە دڵانی ئەمین و عەقڵی بە بڕشت!.

## زانستی ڕاسپێراو

خەڵکینە.. پرسیارم لێبکەن پێش ئەوەی لە دەستان دەرچم، من لە ڕێگەی ئاسمان شارەزاترم هەتا لە ڕێگەی زەوی، پێش ئەوەی ئاژاوە و فیتنە لنگی بەرزبکاتەوە و کوێرانە هەنگاو بنێ و عەقڵ و هۆشی یارانی ببات.

(١٩٠)

# وتاری لەستایشی خودا و مەدحی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و ئامۆژگاریی بە تەقوا

## (ستایشی خوا)

ستایشی خودا ئەکەم لەبەر ئەو هەموو بەخشندەییەی پێیداوم، داوای یارمەتی لێئەکەم، کە بتوانم ئەنجامی حەق و مافی جێبەجێ بکەم، خودا سوپاو سەربازی بە توانای هەیە، گەورە دەسەلاتی بەهێزی هەیە، باوەڕیشم هەیە کە محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، خەلکی بانگهێشت کردووە بۆ فەرمانەکانی شکێنەری دوژمنانیەتی، بە هەوڵ و تێکۆشان بۆ ئاینەکەی، هەرگیز توانای نەبووە کۆ دەنگیی لە سەر بەدرۆ خستنەوە، کە کۆڵی پێبدا و هەوڵی کوژاندنەوەی چراکەی بدرێ.

## ئامۆژگاریی بەتەقوا

بە توندیی دەست بگرن بە خۆپارێزیی و تەقوای خودا، چونکە دەستگیرێکی زۆر قایم و باوەڕپێکراوە، دەسکەکەی سەرەوەی پەناگایەکی پتەوە، دەست پێشبخەن بۆ مردن و ناڕەحەتییەکانی گیاندەرچوون، ئامادەبن بۆ تەشریفهێنانی، جێگەی بۆ چاك بکەن پێش ئەوەی ببێتە میوان، چونکە مەبەست قیامەتە، ئەوەش باشترین ئامۆژگارییە بۆ کەسێ کە ژیرو فامدار بێ، وانەیەکی باشە بۆ ئەوەی نەزانن، پێش ئەوە بڕۆنە ئەو کۆتاییە کە نازانن ناڕەحەتیی گۆڕەوشارە، ئێش و ئازاری بێئومێدیی، ترس و تۆقاندنی، داوگری لێواری گۆڕو ترس و لەرزین و بەیەکدا چوونی پەراسووەکان، کەڕبوونی گوێکان لە شریخەو ناڵەی ئازارو تاریکیی ئەلحەدی ژێر گۆڕو ترس و لەرز، پرس و پەیمان و خەفەتی بەردی سەر چاڵی گۆڕو قورسیی بەردو گڵی سەری !!.

دەخیلتانم.. ئێوە و خودا، بەندەکانی خودا...!، دنیا بە هێواش ئەتانبات، ئێوە و ئاخرزەمان، بە پەتی جەڵە ئاومل کراون، هەر ئەوەندەتزانی کە نیشانەکانی هاتەدی، لە نزیکەوە ئاڵاو پەرچی خۆی هەڵکرد، ئێوەی لە سەر پردی باریك ڕاگرت،

زۆری نەماوە بومەلەرزەی دەستپێبكات، بە توندیی سنگی بەسەرتانا بدات، هەموو دنیا و دانیشتووەكانی كۆتایی پێبێنێ و لەكۆشی خۆی فڕێتان بدات، ئەو كات وەك ڕۆژی ڕابردووی لێدێ و وەك مانگی پێشوو، تازەكانی كۆن ئەبێ و ئەپوترکێ، چاخەكان لەڕ ئەبن لەناڕەحەتیی و تەنگیی جێگاكەو زۆر كاری ناهەموار و ناخۆش و ئاگری تیژو هاروهاج و گڕوكڵپەو بڵێسەی بەرزو باڵا و تیشك و گەرمیی بەهێزو هەناسەو پەلاماری ڕقاویی و ترساندنی و درەنگ ئەكوژێتەوە، ئەوە هەڵگیرسانیەتی و بە هەڕەشەیەو بنی قووڵ و كەناری تاریك و تیانچە و قازانگی گەرمە و قوڵنەدا و بێئەنداز ئازارداره، كارەكانی ( ئەو كەسانەش كە هەر لە پەروەندەیان ترسیان بووه دەستە دەستە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەكرێن...) بێترس و بێپەروا لە ئازارو سەرزەنشت و هەڕەشە و لۆمەو و دوور لە ئاگر و لە ماڵی خۆیان حەساونەتەوە، زۆر ڕازیی و دڵخۆشن بە جێگەو هەوارگە و شوێنی حەوانەوەیان، ئەوانەش ئەو كەسانەن كە كاری پوخت و پاكیزەیان هەبووە و چاویان تەڕبووە بە فرمێسك، شەویان ڕۆژ بووە، بەگەردنكەچیی و پاڕانەوە و داوای لێبوردن لە خودا ڕۆژیان شەو بووە، بێ گوێنەدان بە خەمی دنیاو سامان و هەڵپەی دنیاویستیی، خودا بەهەشتی كردووە بە شوێنی حەوانەوەیان و بە زیادەپاداش و خەڵات، (ئەوانیش شایستەو قایل بوون بەو پاداشتە) لەژیانی خۆشگوزەرانیی، بەردەوام ئارام، ئێوەش بەندەكانی خودا !، ئاگاداری ئەو كارانەبن كە سەركەوتوو پێی دڵخۆش ئەبێ و كەوتوو و تەممەڵ زیانلێكەوتوو ئەبێ، بڕۆن بە پیریی و پێشوازیی ئەجەلتان، بەكاری چاك و بەسوود، چونكە لە بارستەی پێشەكیی كاری خۆتان پاداشتان تەنها ئەوەیە كە زوو ناردووتانە، ئەوە نزیكە بەلاترسێنەرەكە بگاتە سەرتان و گەڕانەوەی نییە و بڕوبیانوو كار ناكات، خودا ئێمە و ئێوە لەسەر فەرمانبەرداریی خۆی و پێغەمبەری ڕابێنێ(صلی الله علیه وسلم)، لە ئێمەو لە ئێوەش خۆش بێت، بە كەرەم و ڕەحمەتی خۆی، هەمیشە خۆڕاگرو ئارام بن لە جێگەی خۆتان، لەكاتی بەلاو كارەسات خۆگر بن، هەڕەشە و گوڕەشە مەكەن بە دەست و قاچەكانتان و دەستان بكەوێتە هەوای خۆی و هەرچی نەشێ بیڵێن، پەلە مەكەن لەو كارەی خودا داوای پەلەی نەكردووە، ئەوەی ڕاست بێ هەر كەس لەسەر جێگەی بمرێ و حەقی خودا و حەقی پێغەمبەر و ئال و بەیتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بزانێ بەشەهیدیی

مردووه و پاداشتی لای خودا هەیە، ئەجرو کرێی نیازەکەی هەیە و ئەو نیازە زۆر باشترە کە شمشێر هەلکێشێ لە کێلان، هەموو شتێك ماوەی خۆی و کاتی خۆی هەیە.

( ١٩١ )

## وتارێك كە ستایش بۆ خودایەو بۆ پێغەمبەرە
## ( صلی الله علیه وسلم )
## ( داوای دنیا بەکەمگرتن ئەکات )

سوپاس و ستایش بۆ خودا کە سوپاس و ستایشی گشتگیرە، سەربازی سەرکەوتووە، بەرزو بالآیە گەورەیی و شکۆی، دوبارە سوپاس و ستایشی ئەکەم لەسەر ناز و نیعمەتە دوانەکانی و بەخشندە و خەلآتە گەورەکانی، ئەو خودایە حیلمی گەورەیە و لێخۆشبوونی تێدایە، زۆر خاوەن دادە لە هەموو قەزاوەتێکدا، زانینی هەیە بەوەی ڕابردووەوە و بەوەش کە دێت، داهێنەری خەلکە بە زانست و درووستکارە بە حیکمەت، بەبێ چاولێکردن و لاسایی و بێ فێربوون لە کەسێکەوە و بێ لەبەر شۆردنەوەی نموونەی داهێنەری حەکیم و بێ هەلە و چاولێکردن.

## پێغەمبەری گەورە
## ( صلی الله علیه وسلم )

شایەتی ئەدەم محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە، کاتێ پەیامی پێسپارد کە خەلك لەناو شەپۆل گومڕایی و بێوێلیدا بوون، کوێرانە مەلەیان ئەکرد لە دەریای نەزانیندا، ڕەشمەی فەوتان ڕایئەکێشان و پەردەی قایم لەسەر دلیان کلۆم درابوو.

## ڕاسپاردن بۆ بەکەمگرتنی دنیاو خۆپارێزیی

بەندەکانی خودا...! ڕاتان ئەسپێرم بە ترسان لە خودا، چونکە ئەو ترسە خۆپارێزیی تێدایە و ئەوەش حەقی خودایە لەسەرتان، خودا بۆ خۆی داینـاوە بە هۆکاری پاراستن و چەتری ڕزگاریی و سەبەی دەبێتە چاوساغی ڕێگەتان، شارەزای

ڕێگەیە و ئەوەی ئەو دەستی بگرێ شوێنی پێی پتەوە و ئەو شوێنەی لێی دانراوە زۆر ئەمین و جێمتمانەیە، هەمیشە خۆی نواندووە بۆ گەلانی پێشوو و خەڵكانی رابردوو، چونكە زۆر كاریان پێیەتی بۆ سبەی ڕۆژ، لەو ڕۆژەی خودا ئەوەی چووە دووبارە زیندوویان ئەكاتەوە، ئەوەی پێیداون لێیان وەردەگرێتەوە و پرسیار ئەكات لەو فەرمان و كارانەی كە داویە بەسەریاندا، بەڵام ئەوەی ڕاستە زۆر كەم لە خەڵك ئەم ڕاسپاردەیان قەبووڵەو بەڕاستیی مافی خۆی داوەتێ ژمارەیان زۆر كەمە، ئەوانە خودای پاك خۆی وەسفیان ئەكات و ئەفەرموا: (لە عەبدەكانم كەمتریان شوكرێ دەكەن)، ملراكێشن و گوێ بگرن و پەیڕەوی بكەن، بەڕاستیی و بەدڵ خۆتانی لەسەر رابێنن، لەبری هەموو میرات و كەلەپوری پێش خۆتان وەری بگرن، میراتگری چاكە بن و قەڵب و خراپ وەر مەگرن، بەم تەقوایە خۆتان وەخەبەر بێنن لە خەو، ڕۆژی پێ ببەنە سەر و لەناو دڵتان جێگەی بكەنەوە، گوناهەكانتانی پێبشۆن، تیماری بیماریتانی پێبكەن، پەند وەرگرن لەوانەی ونیانكردووە و مەبنە جێگەی پەند وەرگرتنی ئەوانەی پەیڕەوییان كردووە، هۆشیار بن، بیپارێزن و ئاگاداری بن و خۆتانی پێبپارێزن لە دنیادا، پاك و خاوێن بن و خۆتانی پێئالوودە مەكەن و بۆ قیامەت هەمیشە دڵگەرم و شەیدا بن، ئەوانەی تەقوا بەرزی كردوون بەكەم مەزانن و ئەوانەش كە دنیا بەرزی كردوون بە بەرز مەزانن و بۆ خێرو بێرو بەراتی مەڕوانن، گوێ مەگرن لە بڵندگۆ و (بلوێرژەن)ەكانیان، وەڵامی قیڕەی قەلەكانیان مەدەنەوە، ڕوناكیی خۆتان بە تیشكی ئەوان مەزانن، سەرسام مەبن بەعەنتیكەو شتە بە نرخەكانیان، چونكە جوانیی و بریسكەكەی فێڵاوییە، وتەی درۆیە، سامانی تاڵانییەو عەنتیكەكانی دزیی و ڕووتكردنەوەیە.

ئەبێ زۆر ئاگادار بن !! ئەم دنیایە ژنێكە خۆنوێن و لە خۆبایی و بە عینوان و بە نازو بە عیشوەیە و سەركەش و بێلەغاوە و هەمیشە ماندەگرێ و درۆزن و بێپەیمان و سپڵە و سرك و نالەبارە، هەوەسباز و ڕەنگاو ڕەنگە، كاری هەمیشەگۆڕان و كەپرسەوزە و لەسەر یەكبار نییە، هێرشی بومەلەرزەیە، بەرزی سەرنەوییە و ڕاستیی گەمەیە و بەرزی نزمییە، وڵاتی شەڕو ئاژاوە و نیشتمانی ڕووتكردنەوە و تاڵانیی و چەپاو و ملشكاندنە، دانیشتووەكانی لەسەرلاق ڕاوەستاون و چاوەڕێی ئەجەل ئەكەن، وەك جەڵەب دراونەتە بەر بەری مەرگ و یەك بە دوای یەك بێ

ئەوەی یەك بەیەك بزانن، گشت ڕێگەکانی سەر لێشێوێنەو ماوەی خۆشاردنەوە و جێگای پەنای تێدا نییە، هەموو ئومێدی بێئومێدییە، کۆشك و سەراکان ئەیاندەن بەدەستەوە، قەڵاکان دەریان دەکەن و زیرەك و پیتوڵەکانیان زمانیان کول بووە، هەیانە لە مردن ڕزگاری بووە، بەڵام زامدارە و هەیانە پێستەکەی گیراوەتەوە و لاشەیان گۆشتەکەی بە دەرەوەیە و خوێنی ڕژاوە و گازی لە دەستی خۆی گرتووە و هەردوو دەستی ئەپروێنێ لە پەشیمانیدا، ڕووی لە سەر مەچەکی داناوە و خەفەتبارەو پەشیمانە لەڕاو بۆچوونی خۆی و گەڕاوەیە لە نیازی، فێڵ و تەڵەکەی پشتی تێکردووە و شەڕ ڕووی لێناوە، (ئەو کات وەختی ڕاکردن نییە).

ئای کە دوورە و زۆر دوورە !، ئەوەی ڕۆیی ڕۆیشت و ئەوەی چوو چوو، دنیاش هەروەك خۆی ماوە و نەگۆڕاوە، (ئاسمان و زەوی بۆیان نەگریان و مۆڵەتیان پێنەدرا).

(١٩٢)

## وتارێك کەناوی شکێنەرە یان تینووشکێن

### ئەم وتارە زیاتر زەمی شەیتان ئەکات لەسەر خۆبەزلزانینی و سوژدە نەبردنی بۆ ئادەم( درودو سلاوی خوای لە سەر بێت )، یەکەم کەس بووە کە نەتەوەپەرستیی توندڕەو و شانازیکەر بە ڕەگەز و شانازیی بە بنەچەی خۆیەوە کردووە، خەڵك هۆشیار ئەکاتەوە لە پەیڕەوی ئەم ڕێبازە

ستایش بۆ خودا کە شکۆو بەرزیی پۆشیوە، تەنها بۆ خۆی داناون و ماوەی نەداوە کە خەڵك لە بەری بکات، کردوونی بە قاغە و نابێ کەسیتر داوای بکات و ئەو دوو سیفەتە تەنها شایستەی خۆیەتی.

### سەرۆکی یاخیبوان

خودا نەفرەتی کردووە لەو کەسەی ئەم سیفەتە بداتە پاڵی خۆی لە بەندەکانی و ئارەزووی بکات و خۆی پێوە بنوێنێ، ئەوجا فریشتە زۆر نزیکەکانی تاقیکردەوە بۆ جیاکردنەوەی بێفیزەکان لە خۆبەزلزانەکان، ئەوکات فەرمووی:( هەموو پاکیی و بەرزیی بۆ ئەو بێ)، کە خۆی زاناش بوو بەهەموو شاراوەکانی ناو دڵیان و گشت

نهێنییەکانی نادیاریان، (کاتێ پەروەرێنی تۆ بە فریشتەکانی ڕاگەیاند وا خەریکم مرۆیەك لە قوڕ چێ بکەم، هەرگا لەشیم تەواوکرد و لە گیانی خۆم فووم پێدا کرد هەمووتان سوژدەی بۆ بەرن، ئەوسا فریشتەکان سوژدەیان بۆ برد، ئیبلیس نەبێ خۆی بە زلزانی و سپڵەیی کرد).

دەمارگیریی ڕێگەی لێگرت و شانازیی بە سەر پێغەمبەر ئادەمدا کرد(درودو سلاوی خوای لە سەر بێت)، لە درووستکردندا سەری گەرم بوو بە نەژادەکەی.

ئەم دوژمنەی خودا.. ڕابەرو پێشەوای هەموو دەمارگیرانەو پێشینەی هەموو خۆبەزلزانانەو پەیڕەوی دانا بۆ گشت شانازیکارانی بە نەژادەوە و ڕووبەڕووی خودا بووەوە و دژی ڕاوەستا لە دەسەڵات و شکۆو بەرزیدا، بەرگی گوێنەدان و نافەرمانیی لەبەرکردو ڕوو پۆشیی خۆبەکەمزانینی لابرد لە ڕوویدا.

زانیتان خودا بە هۆی خۆبەزلزانینییەوە چۆن بچووکی کردەوە و دایبەزان لە بەرزییەوە بۆ نزمیی، لە دنیا شکاو و تڕۆ و لە قیامەت ئاگری سەختی سوتێنەر !.

## تاقیکردنەوەی خەڵك

خودا لە توانایدا هەبوو ئادەم لە تیشك درووست بکات کە ڕووناکیی چاو ببات و دیمەنەکەی عەقڵ تێکبدات، ئەوەندە بۆنی خۆش بکات کە بۆن و بەرامەی هەناسە ببڕێت، ئەیتوانی بیکات و ئەگەر وای بکردایە گەردنی خەڵك لە ئاستی ئەوی دەبوو و ئەزموونەکەش لەسەر فریشتە سووك دەبوو، بەڵام خودای تاك و پاك و بەرز بۆ ئەزموون و تاقیکردنەوەی خەڵك بە هەندێ لەو کارانەی کە ڕەگی نازانن، بۆ جیاکردنەوەیان بە تاقیکردنەوە و لادانی خۆبەگەورەدانان لە خۆیان و دوورکەوتنەوەیان لە فیزو دەمارگیریی. لە ژێر ئەزموونندا داینان و ئەو کارەی نەکرد.

## داوای وەرگرتنی پەند

ئەوجا دەبێ ئێوە دەرس وەرگرن لەوەی خودا کردی بە ئیبلیس، کە هەموو کردە باشەکانی ماوەی تەمەنی پوچەڵکردەوە و هەموو ماندووبوون و بەندایەتیی بەفیڕۆدا، کە ئەم بەندە بێفەرمانە شەش هەزار ساڵ بەندایەتیی خودای کرد، خۆ

نازانرێ ئەم ژمارەیە بە پێوانەی ساڵی دنیایە یان ساڵی قیامەت!، هەموو لە پێناوی دەمژمێرێك لەدەمارگیریی.

كەواتە پاش ئیبلیس كێ بە سەلامەتیی لە تۆڵەی خودا دەرباز ئەبێ، بە هەمان كردارو سەرپێچییەوە؟ نەخێر! هەرگیز خودای تەبارەك و تەعالا مرۆڤێك ناباتە بەهەشت كاری فریشتەیەك بكات كە لە بەهەشت وەدەری ناوە، فەرمانی خودا لە زەوی و ئاسمان وەك یەكە، لە نێوان هیچ كەس لە خەلقی خودا ماوەی ڕێپێدان نییە، ئەگەر زیانەخرۆ بێت و بكەوێتە ناو قەدەغەكانی خوا.

## ترسان لە شەیتان

كەوابێ ئەبێ زۆر وریا بن و بترسن لەم دوژمنەی خودا، كە ئەم درمەی ئەو بگرن و تووشی هەمان نەخۆشی ببن و بتانخەڵەتێنێ و فریوتان بدات و گازتان بكات بۆ لای خۆی و بدا بە سەرتانا بە خۆی و سوپای سوارو پیادەیەوە،(بەوخودایەی گیانی منی بەدەستە) شەیتان تیری تەقاندووە بە سەرتانا و لە دووریی مەودای كەوانەكەوە نزیك بونەتەوە و زۆر لە نزیكەوە تیرتان بۆ ئەهاوێژێ، (وتی: ئەی پەروەرمەندەی من! هەر چۆن تۆ گومڕات كردم، لە ڕووی زەمین خراپەیان وەها لەبەر دەخەملێنم گشتیان لەڕێ هەڵە دەكەم).

ئەم هەڕەشە هاویشتنە بۆ مەودایەكی زۆر و فڕێدانی گومانێكی نادروست، تەنها ئەوانە بڕوایان پێیەو شوێنكەوتوون، كە شوێنی دەمارگیریی خێڵایەتیی نەفامیی و ڕەگەزپەرستیی كەوتوونی ئەو خزم و برایانە كە شوێن هەرێمپەرستیی و هۆزدۆستیی كەوتوون و پاڵەوانەكانی خۆبەگەورەزان و چاخی بێویڵیی، كاتێ چاوچنۆكەكان و تەماعبازانی ئێوە سەریان بۆ شۆڕكرد، كورسیپەرستان ڕەگیان لەناوتاندا داكوتا، ئەو كاتە ئەم ڕەوشتەی ئیبلیس لە شاراوەیی و نهێنیی گوێزرایەوە بۆ ئاشكراو بانگەشە، دەسەڵاتی خونكارییان لە سەرتان زاڵبوو، پێش قەرەوڵی سوپای هاتە ڕیزتانەوە، ئێوەیان كێشایە ناو گۆڕەپانی سووكیی و سەرشۆڕیی و ئالودەیانكردن بە كەوتن و تاوانی كوشتن و بڕین، بە زۆر قاچی ئێوەیان خشاندووە بەزامە بەسوێكانی و ڕمیان لە چاوتان كردووە و ملیان بڕیوون و لوتتان شكێنراوە و

بەنیازی لەناو بردنتانن و پەتیان لە لوت و قەپۆز ناون و کێشتان ئەکەن بەشەق بۆ ئەو ئاگرەی بۆتان دانراوە و ئیبلیس و شەیتانە ئینسانییەکان لە ئاینی ئێوەدا زیانی گەورەیان کردووە و ئاگریان لە دنیاتان بەرداوە و زیاد لەو کەسانەی کردووتانن بە دوژمنی خۆتان و هێرش و پەلامارتان داون.

کەواتە زۆر پێویستە زۆر رِق و کینەتان لەسەری بێ و پەیوەندیی خۆتان لەگەڵی بپچرێنن، چونکە بڕوا بکەن بە خودا ئەو شانازیکرد بەسەر باواتاندا و بەربووەتە گیانی خۆشتان لە هەموو شوێنێ، هەوڵ ئەدەن دەستان ببڕن، ناتوانن بە فێڵ و تەڵەکە خۆتان ڕزگار بکەن، کاری جددییتان پێناکرێ لە مەیدانی سەرشۆڕیتان و گۆڕەپانی مەرگ و جەولەی بەڵاو کارەسات، هەوڵ بدەن ئەو ئاگرەی ڕەگەزپەرستیی دڵتانە بیکوژێننەوە و ئەو ڕق و کینەی نەفامیی و بێویلیی لابەرن، دەبێ و وا باشە ئەو دڵ و ئازایەتییە لە باوەڕداردا دژی خوریەو دڵەڕاوکێی شەیتان بێت، دژی فێرکردنی خۆ بەزلزانین و ئەو بەگوێدان و فوودانەی شەیتان بێ، زیاتر خۆنەویستیی لەسەر سەرتان دانێن و خۆبەزلزانین لە ژێرپێ بنێن، ئەو فیزە لەگەردنی خۆتان داماڵن، خۆ بەکەم زانین و سادەیی بخەنە سەنگەرەکانی سنوورەوە لە نێوان ئێوە و دوژمنەکەتان کە ئیبلیسەو سەربازەکانی، چونکە ئەم نەفرەتلێکراوە لە هەموو گەلێك و نەتەوەیەك سەربازو و هاوڕازو هاوکاری هەیە، پیادە و سواری هەیە، هەرگیزخۆتان هەڵمەکێشن وەك یارۆ خۆی گیف ئەکاتەوە لە کوڕی دایکی بێ چاکە و باشە، یەکێ کە خودا پێی دابێ جگە لەو سیفەتە خراپەی کە خۆی بەگەورە بزانێ و دوژمنایەتیی ئیرەیی و بەس، دڵی گڕی گرتووە و لەئاگری ڕق و شەیتان فووی کردووە بە لوتیداو بای هەوای تێکردووە کە لەپاشا پەشیمانە لێی و لە ئەستۆی داناوە و گوناح و تاوانی پیاوکوژەکان هەتا قیامەت.

## ترسان لە فیز و خۆ بەگەورە زانین

ئاگادارتان ئەکەم کە ئێوە سەرتان کردووەتە لاساریی و یاخیبوون و بێفەرمانیی، خۆتان و دنیاتان گەندەڵ و پۆخڵ کردووە، بە ئاشکرا دوژمنایەتیی خودا و زۆرانبازیی و کوشتاری باوەڕداران دەکەن، ئێوە و خودا خۆتان مەهاوێنە ناو کوورەی خۆبەزلزانین و شانازی بێویلیی و نەفامیی، چونکە لەوێدا ڕق و کینە کەڵ

ئـەگرێ و شـوێن کوورەدەمـەی شـەیتانە، تـەنها بـەو سـیفەتە خراپـە نەتـەوەکانی پێشینی لە خشتە بردووە و ساڵانی ڕابـردوو وای لێهات لـەناو تاریکستانی نەفامیـدا ونبوون و کەوتنە ناو چاڵ و چۆڵی گومڕایی، سەرشۆڕ لـە تێخوڕین و گەردنکـەچ لـە جڵەوکێشاندا، کارگەیشتە ئەوەی دڵ و دەروونی ئەوانە لە ئاست شـەیتاندا وەك یـەك بـووە و سـاڵان و ڕۆژگـار لـە سـەر ئـەو ڕێگـە بـوون، بـەو فیـزو خۆبەگەورەکردنـەوە، دەروونیان جمەی دەهات.

## هۆشیاریدان بۆ بەگوێنەکردنی ملهوڕانی خۆ بە زلزان

زۆر هۆشـیار بـن، ئاگـادار بـن..! بترسـن زۆریـش بترسـن، لەگوێڕایـەڵیی گـەورە دەمارزلـەکان و سـەردارە لەخۆباییـەکان کـە خۆیـان بەگـەورەتر دێتـە بەرچـاو لـە خزمـەکانیان و زۆر بـەرز خۆیـان لەسـەرەوەی نەسـەبیان ئـەبینن، بـەم کارمیـان، جواندرووسـتکردنیان لـە خـواوە بـە ناشـرینیی و ڕەزاقـورس نیـشان دەدەن، سـپڵەن بەرامبەر درووستکردنی خۆیان بە جوانیی و باشـیی و لوتبـەرزیی ئەکـەن بەرامبـەر دادوەریی خوداو دەیانەوێ زاڵبن بەسەر نازو نیعمەتی خودا، ئەمانە بـەردی بناغـەی دەمارگیریی و پایە و کۆڵەکەی ئاژاوە و شمشێری بەخۆنازین و شانازیکەرن بـە بـاوك و باپیری نـەفامیی و بێوێڵییانـدا، لـەخودا بترسـن، دژایـەتی نیعمـەتی خـودا مەکـەن، ئیرەیی مەبەن بەو چاکەی کە خـودا پێـی بەخـشیوون و بـە فـەرمانی ئـەو سـەرکردە ناڕەسەن و ناجنس و ناپەسەندانە مەکەن کە ئاوی پاك و شـیرینتان بـە ئـاوی لێـڵ و شـلوێی ئەوانـەوە خـواردووە، سـاغیی و سـەلامەتیی خۆتـان لێ تێکـەڵکرد بـە دەردو بیمـاری ئـەوان، حـەقی خۆتـان ئامێتـە کـردە باتڵی ئـەوان، ئەوانـە ڕەگ و بنـچینەی پیـسیی و پـۆخڵین و بـبن بـەژێر جلـی بێگـوێی و نافـەرمانیی ئیبلـیس وەك وڵاخ سواریان بوون بۆ گومڕایی و کردنی بە لەشکرو سەرباز، پەلاماری خەڵکی پێ ئەدەن، خۆیان کردووە بە تەرجەمانی زمـانی ئـەوان و عـەقڵ و هۆشـیانی دزیـوە و چـونەتە ناو چاویان، فوو ئەکەن بە گوێتانـدا و بـە نیـشانەی کـردوون بـۆ تیرئەنـدازیی خـۆی وجێپێ و لیستی دەستی.

## پەند وەرگرتن لە ڕابردوان

پێویستە پەندو ئامۆژگاریی وەرگرن لە نەتەوە و گەلانی پێشوو، کە تووشی هێزو دەسەڵاتی خودا بوون و ئەو کارەسات و ڕووداوانەی تووشیان بووە و بەرتۆڵەی خودا کەوتوون و چۆن ڕوومەتیان لەناو خۆڵدا چەقیوە و چۆن لاڵ و پاڵ لێی کەوتوون، لەسەر گڵ، داوای پەنا و شاردنەوە لە خودا بکەن کە تووشی موربەی فیزو لەخۆباییبوون نەبن، وەك داوای پەنا لە خودا ئەکەن لە ڕووداوی زەمانە، ئەگەر خودا ماوەی بە کەسێ بدایە بۆ خۆبەزلزانین بۆ گەورەبەندەکانی خۆی و پێغەمبەران(درودو سلاّوی خوایان لە سەر بێت) دەستەکانی ڕەوا دەبینی، بەڵام خودای پاك و بێگەرد زۆر لای گرانە بەگەورەزانینیان و هەمیشە خۆنەویستیی پێخۆش بووە، هەمیشە ڕوومەتی خۆیان لەسەر خاك ناوە و ناوچاویان لەگەڵ گڵ تێکەڵاو کردووە و باڵیان داناوە بۆ باوەڕداران کە بەسەریدا بڕۆن، لەگەڵ ئەوەی کە هەژارو کەمدەست بوون، خودا بە برسیەتیی و نەبوونیی تاقیکردوونەتەوە و لە ئەزموونی نارەحەتیی و ناخۆشیی دایناون، بە جۆرەها بەلاو نارەحەتیی هەژاندوونی، هەرگیز ڕەزامەندیی و ناخۆشیی بەسامان و ماڵ و منداڵ لێك مەدەنەوە، چونکە تێنەگەیشتنە لە جێگەو کاتی ئاژاوە و فیتنەو شوێنی تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندو هەژاریی، ئەوەتا خودا دەفەرموا (ئاخۆ ئەوان پێیان وایە ئێمە کە بە ماڵ و کوڕان یارمەتیان دەدەمین هەر بۆ ئەوەیە کە پەلەمانە لە چاکە دەگەڵ کردنیاندا؟ نەخێر ئەمانە ئەزانن)، خودا بەندەی خۆی بە خۆهەڵکێشانی خۆبەزلزانان دژی لاواز تاقی ئەکاتەوە.

## کەمفیزیی پێغەمبەران
## ( درودو سلاّوی خوایان لە سەر بێت )

جارێك (موسای کوڕی عیمران) (سلاّوی خوای لە سەر بێت) لەگەڵ هارونی برای(سلاّوی خوای لەسەر بێت) دەچنە لای فیرعەون و دوو فەرمەنجی خورییان لەبەردا ئەبێ و هەریەکە گاڵۆکێکیان بەدەستەوە ئەبێ و مەرجیان بۆ دانا کە ئەگەر باوەڕ بهێنێ سامان و دەسەڵاتی بەردەوام بێ و هەمیشە ڕێزو شکۆی بمێنێ، فیرعەون

وتی: ئەوە بۆچی سەرتان سوڕدانامێنێ لەم دووپیاوە، مەرجم بۆ دادەنێن کە بەردەوام لەبەرزیدابم و موڵك و پاشایەتیم بمێنێ، کەچی خۆیان لەم بەرگە شڕو هەژاریی و بێدەسەلاتییەدان، ئەگەر ئەتوانن یارمەتی من بدەن بۆچی قۆڵ و ملتان پڕ نییە لە ئەڵقەی زێڕ؟ کە بەلایەوە زێڕو زۆریی زێڕ نیشانەی گەورەیی و خوریی و بەرگی خوریی نیشانەی هەژاریی و کەمدەستییە، ئەگەر خودا ویستی وابێ کە پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) ڕەوانە بکات بە خەزنەزێڕو کانی ئاڵتون و دەرخستنی بەهەشت و باڵندەی ئاسمان و دڕندەکانی سەرزەویمان لەگەڵبێ، ئەتوانێ و ئەیکات، خۆ ئەگەر خودا داوا بکات ئەو کاتە ئەزموون و تاقیکردنەوە کاری نییە و پاداش و تۆڵە نەدەبوو و کاری ناردنی پێغەمبەر(درودو سلاوی خوای لە سەر بێت) پوچەڵ و بێنرخ دەبوو، ئەوکاتە باوەڕدار لەگەڵ بێباوەڕ تێکەڵ دەبوو، ئەوکاتە وشەکانی باوەڕ هاوتا نابن لەگەڵ ماناکانیان، بەلام خودای پاك و بەرز پەیامی خۆی بە پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت)ی خاوەن عەزم و ئیرادەی بەهێزدا ناردووە، بە چاو بێهێزو لاواز دەبینێرێن لە ڕووی دەرەوە، بەلام ئەو پەڕی بڕوای پڕ بە دڵ و بینایی لە دەوڵەمەندیی و بێپەروایی بە هەژاریی و بێهێزیی پڕ بە چاو و گوێ لە ڕووی ئازار پێگەیاندنیان هەیە.

ئەگەر پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) خاوەن دەسەلات و هێزی بێمەترسیی بونایە و خاوەن دەسەلات و خونکاری بێمنەت بونایە و بەرزو گەورەیی و پاشایەتی بوونایە کە ملی زۆردارانی ئەوی بکردایە و کاروانی کێشەو گرفتی خەڵك لای ئەوان گوشاد بوایە، ئەوکات کەم کاریگەر دەبوو لە دلان و پەند وەرگرتنی زیاتر فیزوگەورەییان بە خەڵك دەداو خەڵك لە ترس و لەرزدا مەیلیان بۆلایان دەچوو، ئەوکات نیازەکان تێکەلاو دەبوون و چاکەکان دابەش دەبوون لە نێوان باوەڕدارو بێباوەڕدا، بەلام خودای پاك و بێگەرد ویستی شوێنکەوتنی پێغەمبەران(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) و باوەڕ بە کتێب و پەیامەکانی بکەن و گەردنکەچیی بۆ ئەوو سەرنەوی بۆ فەرمانی و خۆدان بەدەستەوە بۆ گوێڕایەڵیی کارگەلێك بن، تایبەت بە خودا هیچ شلوێ و لیلیی تێدا نەبێ هەتا ئەزموون و تاقیکردنەوە قورس و پرسینەوە گەورەتر بێت، پاداش و خەلاتیش بە نرختر و گەورەتر دەبێ.

# كەعبەی پیرۆز

باشە ئێوە نابینن کە خودای پاك و بەرز خەڵكانی پێشینی لە (ئادەم)ەوە(درودو سلاوی خوای لە سەر بێت) هەتا دواین، لەم گێتییەدا تاقیکردووەتەوە، بە چەند بەردێکی بێزیان و بێسود و بێچاو و جێ وگوێ کردوویەتی بە ماڵی خۆی و خەڵکی بانگکردوە بۆ ڕاگرتنی بە پیرۆزیی و ڕێزەوە، ئەوجا لە سەختترین ناوچەی زەوی و ڕەقترین بەردو بەرزتر لەملاو ئەولای خۆی و وشکترین خاك و بێ ڕووەکترین زەمین و تەسکترین شیوی بێ باران لە نێوان چیاگەلێکی زبرو لم و چەوێکی لوس و وردو کانیاوێکی کەمئاو و دیهاتگەلێکی دوور لە یەك کە هەرگیز سمدار و پێدار تێیدا گەشە ناکات، ئەوجا فەرمانی داوە بە باوکە ئادەم و کوڕەکانی(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت) باڵ ڕاوەشێنن بەرەو ڕوی و کۆچ و بارکردن بۆی بووەتە شوێنی حەوانەوە و پشویان و کۆتایی کاروان و قۆشەنگیان و بووەتە بازاڕی بازرگانیی و ئارامگای گیان و دڵ لەو شوێنە چۆڵ و لاویی و بیابانەدا و لە ناو شیو و دۆڵە قووڵ و چۆڵەکاندا و لەناو ئەو دورگەی لە نێوان دەریا لەیەك بڕاوەکاندا، هەتا شانی خۆیان کرکەن و بەدەم بانگەوازی خوداوە دەڕۆن و بە هەروەڵە و نەرمەغار لەسەر پێی خۆیان بڕۆن، چڵکن و کوڵکن و موو ئاڵۆزو کراس و شەڕواڵ فڕێداراو، بە بەردانەوەی قژو موویان خۆیان کردەوە بە عیبرەت، تەنها لەبەر سەرنەویی و سەرشۆڕیی بۆ خوداو شاندانە بەر ئەزموونی سەخت و خۆپالاوتن تەنها بۆ خودا، ئەوەش لەبەر ئەوەی خودا ئەو شوێنەی کردووە بە جێگای بەزەیی و بەخشندەیی خۆی و تووڵە ڕێگەی بۆ بەهەشت، ئەگەر خودای پاك و بەرز ماڵی پارێزراوی خۆی و دروشمە بەرزەکانی خۆی لەناو بەهەشتی پڕ لە بەروبووم و ڕووباری ئاو و دەشتی پڕ پیت و بەرهەمدا دانایەو چڕو و سێبەری دارو درەخت و بەروبوومی دەسڕەس و شوێنماڵ و کۆشك و سەراو دێهات نزیك و دەوڵەمەند بە گەنمی ڕەشداس و باخ و باخچەی سەوز و گوندی جوان و بەرچاو و کۆزو گوڕەپانی بەرسێبەرو کشتوکاڵی گەش و تێر ئاو و ڕێگەی تەخت و بێگرێ و گۆڵ، ئەگەر وا بوایە ئەندازەی خێر و پاداش و خەڵاتی کەم و بچووك دەبوو، هەتا ئەرك و ماندوو بوون زۆر بێ پاداش زیاترە، ئەگەر بناغەی ئەو ماڵەو بەردی بنچینەی لە گەوهەرو دانەو زمرود بوایە و

پیرۆزە و نقێمی سەوز بوایە و یاقووتی سوور بوایە و ناوەکەی ڕووناکیی و تیشکی بدایەتەوە، ئەوکاتە گومان زۆر کەم دەبوو، ڕووبەڕوو بوونەوەی شەیتان کەمتر دەبوو، دڵەڕاوکێ و بێباوەڕیی زۆر لاواز دەبوو، بەڵام خودای پاك و بەرز بەندەکانی خۆی بە نارەحەتیی زۆر سەخت تاقی ئەکاتەوە و بەندایەتیی قورسیان لەسەر شان دائەنێ و زۆر بە قورسیی تاقییان دەکاتەوە، تەنها بۆ لادانی فیزو خۆبەزلزانین لەدەروونیاندا بۆ بەخشینی هێمنیی و ئارامیی بە گیانیان بەم شێوە دەرگای بەزەیی خودا هەمیشە کراوە دەبێ، ڕێگە پەیوەند ئەبێ بۆ لێبوردنی خودا بۆ بەندەی خۆی.

## دووبارە هەڕەشە و ترساندن

بترسن لە خودا و خۆتان بپارێزن لە پەلەکردنی یاخیبوون و بێفەرمانیی و لە پاشەڕۆژی پڕ لە کوێرەوەریی ستەمکردن، زۆر خراپیی پاشەڕۆژی خۆ بەزلزانینە، بەڕاستی ئەمانە داو و تەڵەی گەورەی ئیبلیسە و هەموو فێڵە و ساختەکاری لە ئەمانەدا کۆکردووەتەوە و زۆرانبازیی پێئەکات لەگەڵ دەروونی پیاوان، وەك ژەهری کوشندە، هەرگیز بێتوانا نییە لە چاڵی قووڵی دڵا و هەرگیز هەڵە ناپێکێ و ڕێك ئەدا لە نیشانە، ئەم چەکانەی شەیتان زانا لە بەرزانین و هەژار لەبەر بەرگی کۆن و ڕزیوو لە دەستی دەرباز نابێ.

هەر لەبەر ئەوەیە کە خودا پاسەوانی بۆ باوەڕدار داناوە کە بەندایەتیی خودایە بە نوێژو بەزەکات و بەڕۆژووە فەرزەکان، تەنها بۆ ئارامکردنی دەموچاو و دەست و پێ و ترساندنی چاو، سەرنەویکردنی دڵ و دەروون و سووککردنی باری دڵ و لادانی فیزو لوتبەرزیی لەسەریان، چونکە ئەم جۆرە بەندایەتییە قوراویی و خۆڵاویی کردنی ڕوومەتی ڕەسەن و گەورەیی بەگڵە بۆ نیشاندانی خۆبەکەمزانین و نوساندنی ئەندامە بەڕێزو چاکەکانە بە خاك بۆ کەمکردنەوە، نوساندنی سك و گەدە بە پشتەوە لە ڕۆژوودا بۆ نیشاندانی داماویی لەگەڵ ئەوەش لە زەکاتدا بەخشینی بەرهەمی زەوییە بۆ هەژارو داماو و کەمدەست.

باش وردببنەوە ئەم کردارانە چەندە بەسوودن بۆ هەڵکێشانی ڕەگی شانازیی بەخۆکردن و بنبڕکردنی خەڵفی فیزو خۆبەزلزانین.

## دەمارگیریی

ئـەوەم بـاش زانیـوە و بـۆم دەركـەوتووە كـە هـەر كـەس لـەم خەڵكـەی دنیـا دەمـارگیریی و ڕەگەزدۆسـتی بكـات بـۆ هـەر شـتێك تـەنها دەردو نەخۆشـییە بـۆ چاوبەسـتی نەفامـەكان، یـان نیـشاندانی بەڵگەیـە كـە بـۆ عەقڵە نـەفام و گێـژەكانی غەیری ئێوە، چونكە دەمارگیرن، بێ سەبەب، بێ بەڵگە، بێ بەهانە.

تەماشـا بكـەن ئیبلـیس دەمـارگیریی بـۆ پێغەمبـەر ئـادەم(درودو سلاّوی خـوای لەسەر بێت) بوو لەبـەر نـەژادی و تانەوتەشـەری لێـدا، لـە شێوەی درووستكردنی و وتی: (من لە ئاگرم و تۆ لە گڵی)، دەوڵەمەنـدی گـەلانی تێرو تەسـەل و خـاوەن نـازو نیعمەت دەمارگیرییان بۆ دیاردەو دەركەوتنی ئەو خۆشیی و كامەرانییـە كـە هەیانـە ئـەڵێن: (ئێمـە خـاوەن مـاڵ و سـامان و كـوڕین، هـەر ئـازار ناچـەژین)، ئەگـەر هـەر دەمارگیرییش پێویست بوو، با بۆ ڕەوشتی بـەرز و كـاری چـاك و ئەنجامـدانی ئەركـە جوانەكان بێت، كە عەرەبە نـەجیب و دەروون بـەرزو دەستگوشـادو خانـەدان و دیـوە خاندارانەكان شـانازییان پێـوە دەكـرد، وەك شاهەنگەكانی خێڵەڕەوەنـدەكان بـەكاری چاك و عەقڵی بـەرزو دڵ و دەروونـی پـاك و ڕوون و بـەرزو ئاسـەواری چـاك و بـاش، ئێوە زیاتر سووربن لەسەر سیفەتی چاك و باش و سوپاسـكراو، وەك خۆپاراسـتن لـە ستەم لـە نزیـك و هاوسێ و بـەجێ هێنـانی بـەڵێن و گوێڕایـەڵیی بـۆ گـەورە و بـاش ئەنجامـدانی چـاكەو بـەگوێ نـەكردنی نـەفس و هـەوا و هەمیـشە هـەوڵ بـۆ دەسـت گوشادیی و دەروونبەرزیی و وازهێنان لە یاخیبوون و سەركێشیی و بە گەورە زانینی كوشتن، یەكسانیی و داد بۆ خەڵك و خواردنـەوەی ڕقـی دەروون و خۆدوورخـستنەوە لە گەندەڵیی و وێرانكاریی لەسەر زەوی، زۆر ئاگاداربن و لە بەرچاوتان بێ، چی هات بەسـەر قەومـەكانی پێـشوو لـەو هـەموو تۆڵـە و سـزاو ئـازارە بـە هـۆی كـردارە قێزەونـەكانیان و خـووە ناشـیرینەكانیان ! لـە هـەردوو لای چـاكەو خراپـە پەنـدو ئامۆژگاریی وەرگرن و دووربن لەوەی وەك ئەوان بن و لە شێوەی ئەوان كاربكەن.

ئەگەر ئێوە باش وردببنەوە لە هەردوو حاڵەتی بـەختیاریی و شـەرمەزاریی یـان هەر كارێك كـە هۆكـاری بـەرزیی ئـەوان بـووە، ئێـوە ئـەنجامی بـدەن و بـەكام كاریـان دوژمنیـان ڕاونـاوە و خۆشـیی و بەختـەوەریی بـاڵی كێـشاوە بەسـەریانا، ئێـوە پێـی

هەستن، بەکام کردار نیعمەت و خۆشیان بۆ هاتووە و بەچی سەربەرز، بە چی یەکبوون و دووربوون لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی و بە چی پێکەوە ژیاون و هاوکاری هاوڕازبوون، ئێوەش بەهەمان شێوە بکەن، ئەوجا کام کردارو ڕەفتاریان بووەتە هۆی شکاندن و نزمیی و بێپشت و پەنا و بێهێزو بێتوانا وەك ڕقەبەریی و کینەدۆزیی و شەڕو ئاژاوە و لە یەکترازان و لەیەك دوورکەوتنەوە و دەستبەرداریی یەکبوون، ئێوە دووربن و نزیك مەبنەوە لێی، دەبێ ئێوە زیاتر لەیادی باوەڕدارانی پێشین بن، لە کاتی تاقیکردنەوە و ئەزموونی بەڵاو کارەسات چۆن بوون؟ بزانن چەندە باری شانیان قورس بووە و چۆن بەڵاو موسیبەت شان و قۆڵی ماندووکردوون، چەندە کەمدەست و کەمدەرامەت و ژیانقورس بوون، چۆن فیرعەونەکانیان کردبوونیانن بە بەندەو کۆیلەو لە ژێر باری ستەمدا ئازاریان دەچەشت و تاڵاویان بە گەروودا دەکردن، ئەم حاڵەش کەم ماوە نەبوو، زۆری دەخایاندو ئەوان توانای خۆدەربازکردن و خۆڕزگارکردنیان نەبوو، هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ لابردنی ئەم ستەم و زۆر و بێدادییە، هەتا ئەو کاتەی خودا بۆی دەرکەوت کە ئەوانە لەژێر باری خۆ گرتندا زۆر باش دەرچوون و لە تاقیکردنەوە سەرکەوتوو بوون و تەنها لەبەر خودا و خوداپەرستیی ئەو هەموو بارەیان هەڵگرتووە، خودا لە تەنگانەی بەڵاو ناخۆشیی ژیان و قورسیی ستەم دەرگای لێکردونەتەوە و لەباتی سەرشۆڕیی سەربەرزیی و لە جیاتی ترس و بیم ئاسایش و ئارامیی بۆ گەیاندن و خودا کردنی بەسەردارو میرو قازی و پێشەوای بەرز، بەرادەیەك جوامێریی و بەختەوەریی لە خوداوە باری بەسەریاندا، کە هەرگیز بە ئومێدی نەبوون بە خەیاڵیش، باش ورد ببنەوە چۆن ئەوکاتەی کە میللەت و گەلەکەیان یەکگرتوو و خۆگرتوو دەست لەناو دەست بوون و بۆ چوون و بیروباوەڕیان ئاشنا بوو بە یەك و دڵیان پێکەوە و دەستیان لەناو دەست بوو، چەکیان بۆ هاوکاریی یەکدی بوو، چاویان بۆ دوژمن تیژ بوو، یەك ئیرادەو یەك هێز، خۆتان بڵێن، نەبوونە گەورەو سەرداری خەڵك لەسەر زەوی و لە هەموو نیشانە دوورو نزیکەکان نەبوونە پادشاو خونکار بەسەر خەڵکەوە؟ دووبارە جوان وردببنەوە، بزانن ئەوەتەی کاریان بەم شێوە گەشتووە و لەم دواییەدا جیابوونەتەوە و پێکەوەژیان نەماوە، دەم و دڵ لە یەك ترازاون و ناکۆکن و پارچەپارچە و بەش بەش بوون و دەچن و چوون بەگژی یەکدیداو یەکتر دەکوژن، چۆن خودا بەرگی

کارەسات و شەرەفی لێسەندوون و نازو ناسکیی نیعمەتی لێشاردوونەتەوە و بوونەتە چیرۆك و ئەفسانە بۆ خەڵك.

## پەندوئامۆژگاریی لە گەلانی ڕابردوو

ئێوە دەبێت پەند وەربگرن لە حاڵ و باڵی کوڕی ئیسماعیل و کوڕانی ئیسحاق و نەوەی ئیسرائیل(درووود و سڵاوی خودایان لەسەر بێت)، ئاگاداری ئەو حاڵ و باڵە چەندە بە یەك ئاشنان و چەند نزیکن لە یەکەوە و چەندە نموونەی یەکدین.

باش وردببنەوە لە ئەحواڵیان لە کاتی دووبەرەکیی و ناکۆکیی نێوانیان و لە یەك دابڕانیان لە شەوەزەنگی ساڵانێك کە کیسراکان و قەیسەرەکان خۆیان کردبوو بە خودایان و دەبوو بیانپەرستن و هەڵیاندەکەندن و ڕاگوێزیان دەکردن لە زەوی بە پیت و خاکی پڕ بەرهەم و لە ڕووباری ڕەگ لە ئاویان لادەبردن و سەر شینایی و سەر سەوزایی و شاداویان بردن بۆ شوێنی ڕەگ و ڕیشکی گیای (شەیح) و کانگای با و گێژەڵووکە و تۆز و خۆڵ و ژیانی پڕ لە کوێرەوەریی، لەو بیابان و چۆڵەوانییەدا دەیانکردن بە شوانی کوڵك و موو، نزمترین و پەسترین نەتەوە و گەل لەڕووی ژیان و ژیارەوە لە وشکەساڵیی و بێبارانیی و فاتوفڕیی نیشتەجێ دەبوون، باڵێك نەبوو، بانگێك نەبوو، پەنای بۆ بەرن و ڕزگاریان بکات و سێبەرێك نەبوو کەمێ تێیدا پشوو بدەن و بحەسێنەوە و کەمێ هەست بە سەربەرزیی و سەربەخۆیی بکەن، ژیان ئاڵۆز بوو، حاڵ و باڵ تێکچوو بوو، دەستەکان لەیەك ترازابوون و زۆری بێهونەر بوون، لە کوێرەوەریی هەمیشەو لەناو توێژی نەفامیی و زیندەبەچاڵکردنی کیژان و داروبەردو بتی پەرستراو وپچڕاندنی نزیك و خزم و تاڵان و ڕووتکردنەوە و کوشتن و کوشتاری یەکتریدا بوون[3].

[3] ئەمڕۆ وەك دوێنێ وایە، (نیازیان وابوو کورد ببەنە ئەو جێگەی خۆیان و خۆیان بێنە بەهەشتی خودا، لەسەر زەوی کوردستان، بەڵام خودا ماوەی نەدا...... ع – ب).

## نیعمەتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەر
## ( صلی الله علیه وسلم )

زۆر بە پەرۆشەوە تەماشا بکەن کە شوێنەواری نیعمەتەکانی خودای پاك لەسەر زەوی (ئیسماعیل) (سلاوی خوای لە سەر بێت) کە بۆی ڕەوانە کردوون پێغەمبەرێك کە لە ئەنجامی پەیڕەویی و بەگوێکردنی نەتەوەکەی گرێ داوەتەوە بەیەکەوە و لەسەر بانگەوازەکەی هەموو کۆدەنگن و پەیوەستن پێکەوە، کە ئەو نیعمەتە گەورەیە باڵی ڕەحمەت و بەزەیی خۆی لەسەر ڕاگرتوون و ڕووباری خۆشیی و کامەرانیی و بەختیاریی بۆ هێناون، سەراوی سەروازی کردووە و خەرمانی کۆ کردوەتەوە بۆیان و لەژیانی نەرم و شین بە خۆشیی ژیان بەسەر دەبەن، دەسەڵات و فەرمان لەناویاندا پیادەکراوە، دەسەڵاتی بە زەبرو حەوانەوە لە ژێر کەپری شکۆو هێزدا، هەموو کارو هەرمان و دەسەڵات گرێدراوە بە خواستیان، دەسەڵاتی جێگیر و فەرمانڕەوا بەسەر جیهاندا و خاوەن فەرمان بەسەر پادشا و میری دەوروپشتدا، دەسەڵاتیان وەرگرتووە لە وانەی دەسەڵاتیان بەسەریانەوە بوو، ئەوان ئیمزای حوکمەکان دەکەن لەسەر ئەوانە کە ئەمان حوکمیان لەسەریان هەبوو، کەس ناتوانێ دەست لە دەمی ڕمیان بدات و ناتوانرێ گورز لە بەردیان بدرێ.

## سەرزەنشتی یاخیبوان

ئاگادارن و دەبێ ئاگادار بن کە ئێوە دەستان هەڵگرتووە لە گوێگرتن و پەتی فەرمانتان پساندووە، قەڵای سەختی خوداتان کونکون کردووە، کە تێیدا دەمانەوە و ئاڵوگۆڕتان کردووە بە دابونەریتی نەفامیی، چونکە خودای پاك منەتی لە سەر کۆمەڵی ئەم میللەتە داناوە، ئەوکاتەی کە فەرمانیداوە بە یەکریزیی و لە سێبەری هاوڕازیی بە سەربەرزیی بژین، بۆ پشوودان تێیدا بحەوێنەوە، کە هیچ کەس قەدری نازانێ و نازانێ نرخ و بەهای چەندە زۆرە، لە هەموو شتێك بەنرختر و گرانترەو لە هەموو بەنرخێك نرخدارترە.

باش بزانن ئێوە پاش کۆچکردنتان بوونەتەوە بە (ئەعراب) واتە دەشتەکیی و پاش یەکدڵیی و یەکدەستیی بوونەتەوە بە گروپ و ڕەوتی هاودژ، هیچ

پەیوەندییتان بە ئیسلامەوە نەماوە، جگە لەناوەکەی نەبێ و لەباوەڕ نازانن، جگە لەوێنە بێگیانەکەی نەبێ، خۆتان لە پەندی خۆتان دەڵێن: (ئار نەوەك عار)، وا دیارە دەتانەوێ ئیسلام بەرەودوا بخەن و نەوی بکەن لە پەورو بۆ شکاندنی پەرژینی و هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن و پەیمانێ کە خودا دایناوە بە جێگەی پیرۆزیی لەزەویدا و شوێنی ئارامیی و دڵنیایی خەڵك.

ئێوە ئەگەر پەنا بەرنە لای کەسێکی تر بێ باوەڕەکان شەڕتان لەگەڵ ئەکەن، ئەوجا نە جبرەئیل و نە میکائیل(سلاوی خودایان لەسەر بێت) و نە کۆچبەران و نە هاوکاران نەماوە و نییە یارمەتیتان بدات، تەنها شمشێرو چەك، هەتا خودا فەرمانی خۆی ئەدا بۆ ناوبژییتان، ئێوە پەندی خۆتان هەیە و شارەزان لە تۆڵەی خوداو کارە کەمەرشکێنەکانی و ڕۆژ و ڕوداوەکانی، ئێوە نابێ داوای لەسەرخۆیی و هێواشیی بکەن و وا بزانن لە خودا گیرنابن بە نەفامیی خۆتان و گاڵتە بەسەختگیریی خودا بکەن و بێ ئومێدبن لە تواناو هێزو دەسەڵات، چونکە خودای پاك نەفرەتی نەکردووە لە سەدەکانی ڕابوردو نزیك بەخۆتان؟ تەنها لەبەر ئەوەیە فەرمان بەچاکەو، نا لەخراپەیان پشتگوێ خستووە، خودا نەفرەتی کردووە لە بێعەقڵ و گێلەکان، چونکە سواری گوناح و تاوان بوون و، نەفرەتیشی کردووە لە ژیرو بە فامەکان، چونکە بەنەرکی خۆیان هەڵنەساون بۆ نا کردن لەخراپە.

ئەوەش بزانن ئێوە زنجیری ئیسلامتان پساندووە، دەستورەکەتان فەرامۆش کردووە و فەرمانەکانتان مراندووە، خودا فەرمانی پێداوم، کە دژی لادەران و ئاژاوەچیان بم و دژی گەندەڵکارو پۆخڵەکان بم لە سەر زەوی و لەگەڵ پەیمانشکێنەکان بەحەقی خۆیان شەڕم کردووە، لە بارەی لادەران و پەڕگران و لاگرانەوە هەوڵی خۆم داوە، ئەوانەش لە هێڵ دەرچوون و پەتیان پچڕاند شتی زۆرم پێکردن و سەرم نەوی کردن، شەیتانی ناو تاقەکەش من لە کۆڵم کردنەوە بە هەورە بروسکەیەك کە خۆم گوێم لە لەرزە سنگ و جوڵەی دڵی بوو، کەمێك لە یاخیبوان ماون و کەمن، ئەگەر خودا ئیزنم بدا، ئەمجارە ئەچمە سەریان و لە دەسەڵاتیان ئەدەم، تەفروتونایان ئەکەم، مەگەر تاکە تاکە لەملاو ئەولای زەوی دەستم پێیان نەگات.

## گەورەیی و ئازایەتیی پێشەوا
## ( سلاوی خوای لێ بێت )

من هەر لە منالیەوە لەسەر سنگی عەرەب چۆکم داناوە و شاخی درێژی ڕەبیعە و موزەرم شکاندووە، خۆ ئێوەش باش ئەزانن جێگە و شوێنم لە پێغەمبەرەوە چەندە نزیك و پەیوەندە(درودو سلاوی خوای لە سەر بێت)، چەندە پلەی تایبەتیم هەیە، منی لە کۆشی خۆیدا داناوە کاتێ ساوا بووم و ئەینووسانم بەسنگییەوە و لەباوەشیداو لە سەر جێگەی خەوتن ئەیخەواندم، لەشی ئەنووسان بە لەشمەوە و بۆنی خۆشی ئەدا لە لوتم و تیکەی دەمی لەناو خۆی ئەجوی و لە ناو دەمی منی دەنا، تەنها یەك وشە درۆی لێنەبیستووم و هەڵەیەکی کرداریی لێنەبینیووم، خودا خۆی هەر لەکاتی شیرخواردنی، فریشتەیەکی گەورەی کردووە بە هاوڕێی کە فێری ڕێگەی چاك و ڕەوشتی بەرزی بکات و کام خو و نەریتە پەسەندە لە جیهاندا ئەوەی نیشانداو بەڕۆژو بەشەو منیش هەمیشە لە شوێنی بووم وەك بێچوو بەشوێنی دایکەوە هەر ڕۆژە نیشانەیەکی ڕەوشتبەرزیی فێرئەکردم و داوای لێئەکردم پەیڕەوی بکەم، هەموو ساڵێ ئەچووە (حەڕا) تەنها من ئەمبینی لە ماڵدا، تەنها پێغەمبەرو خەدیجە و من بووین(درودو سلاوی خوایان لە سەر بێت)، بەڕاست ئەڵێم خۆم گوێم لێبوو ناڵەو نرکەی شەیتان، ئەوێ کاتێ کە سروش هاتەسەری، گوتم ئەی پێغەمبەری خودا( صلی الله علیە وسلم) ئەو نرکەیە چی بوو؟ فەرمووی: ئەوە شەیتانە بێئومێد بووە، لە پەرستنی ئەوەی تۆ دەیبیستی منیش دەیبیستم، ئەوەی تۆ ئەیبینی منیش ئەیبینم، بەلام تۆ پێغەمبەر نیت، تۆ وەزیریی و لەسەر ڕێبازی چاکی.

من خۆم لەگەڵی بووم، کە پیاوە گەورەو ماقوڵەکانی قوڕەیش هاتن بۆ لای وتیان: محەممەد تۆ داوای کارێکی زۆر گەورە ئەکەیت کە باو باپیرانت داوایان نەکردووە، کەس لەم خانەوادە داوای نەکردووە، ئێمە پرسیاری شتێکت لێئەکەین ئەگەر وەلامت داینەوە و پێت وتین ئەو کاتە ئەزانین تۆ پێغەمبەری و ڕەوانەکراوی( صلی الله علیە وسلم)، خۆ ئەگەر وەلامت نەبوو ئەوە تۆ جادوگەری و درۆزنی، فەرمووی پرسیاری چی ئەکەن؟، وتیان ئەو درەختە بانگ بکەو بە هەموو

**ڕەگ و ڕیشکەوە هەڵیکەنە و بێت لەبەر دەمتدا بوەستێ، فەرمووی: خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەگەر خودا ئەو کارەی کرد باوەڕ دێنن و شایەتی بە حەق دەدەن؟ گوتیان: بەڵێ ! فەرمووی دەی منیش ئەوەتان پیشان دەدەم کە داوای ئەکەن و ئەشزانم ئێوە خۆتان ناخەنە ژێر سێبەری چاکەوە، هەندێ لە ئێوە لەناو چاڵدا فڕێدەدرێن و هەندێك جیابوونەوە و دووبەرەکیی و کۆمەڵ کۆمەڵ دەبن، ئەوجا فەرمووی: ئەی دار و درەخت ئەگەر باوەڕت هەیە بەخودا و بە ڕۆژی دوایی و ئەزانی کە من پێغەمبەرم لە خوداوە، بەڕیشکەوە هەڵکەنرێ و وەرە لە بەردەمم بوەستە بە ئیزنی خودا ! قەسەم بەو خودایە، کە بەحەق پێغەمبەری ناردووە( صلی الله علیه وسلم) ئەو درەختە بەڕەگەوە خۆی هەڵکەندو هاتە بەردەم پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم)، بە شنەو شەکاوەیەکی زۆر بەهێز وەك باڵی تەیر شەقەی پەلوپۆی دەهات و هات بەڕێکیی لەبەردەم پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) وەستا، بەشەکاوەیی و لارو لەنجە، خەڵفی زۆر بەرزی نزمکردەوە بۆ سەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەندێ لە لقەکانی کەوتە سەرشانی من، کە لە ڕاستی پێغەمبەرەوە( صلی الله علیه وسلم) وەستا بووم، کاتێ کە ئەم قەومە ئەوەیان بینی بە فیزو دەعیەوە وتیان: نەخێر پێی بڵێ نیوەی بێت بۆ لات و نیوەکەی لە جێگەی خۆی بێ، پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) فەرمانی بەدارەکەدا ئەویش بەهەمان شێوە نیوەی بە جوانترین شێوە هات بە پیرییەوە و ئەوەندە نزیکبوویەوە لە پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) چووە پاڵی، ئەوجار زۆر بە بێباوەڕیی و خۆ بەزلزانین وتیان: فەرمان بدە ئەم نیوە بڕواتەوە، وەك جارانی لێبێتەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەو شێوە فەرمانیداو گەڕایەوە، ئەوا من وتم: هیچ خودایەکی بەحەق نییە جگە لە (الله) من یەکەم باوەڕدارم بە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم) و باوەڕم هەیە ئەم کارەی ئەم دارە بە فەرمانی خودا بووە و بۆ باوەڕ هێنان بە پێغەمبەریی تۆو بەرزیی فەرمایشی تۆ، بەڵام ئەو کۆمەڵە هەموویان وتیان: نەخێر جادوگەرە، درۆزنە، جادوی سەیرو سوکی لایەو ئەبێ هەر نموونەی ئەم کەسە باوەڕت پێ بێنێ، (مەبەستیان من بوو)!.**

**من لەو کەسانەم لە ڕێگەی خودا دا لە تانەو تەشەری کەس ناترسن، ئاژەیان ئاژەی ڕاستگۆیانەو وتاریان وتاری بەرزە پیاوانە، شەویان ئاوەدان و ڕۆژیان ڕوناکە،**

دەستیان بە قورئانەوە گرتووە، ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکانی خودا جێبەجێ ئەکەن و پەیڕەویی ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەکەن، خۆیان بەگەورە نازانن، فیزو دەعیەیان نییە، خیانەت ناکەن، گەندەڵیی ناکەن، دڵیان لە بەهەشتەو لەشیان لەکاردایە.

(١٩٣)

## لە وتارێکدا باسی خۆپارێزەران ئەکات

دەگێڕنەوە کە هاوەڵێکی میری باوەڕداران بە ناوی (هەمام) کە زۆر خوداپەرست بوو وتی: میری باوەڕداران.. باسی خۆپارێزەران و تەقواکارانم بۆ بکە بە شێوەیەك وەك لەبەر چاوم بن!، میر لە وەڵامدا کەمێ بێدەنگ بوو و فەرمووی: هەمام...! لە خودا بترسەو چاکەکرداربە، کە (خودا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێزگارکارن و ئەوانەی کرداری چاکە ئەکەن)، بەڵام هەمام قانیع نەبوو بەو وەڵامەو دووبارە داوای کرد، ئەوجا فەرمووی: پاش سوپاس و ستایش بۆ خودا و دروود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، پاش ئەمانە...

خودای گەورە و پایەبەرز خەڵکی درووستکردووە و لەکاتی درووستکردنیدا پێویستی بە ئەنجامدانی فەرمانی ئەوان نەبووە، ترسی نەبووە لە بێفەرمانیی و گوێنەدانیان، چونکە بێگوێی ئەوان زیان ناگەیەنێ بەو کەسەی ئەوان بێگوێیان کردووە و بەجێگەیاندنی فەرمانی سوودو قازانجی لێومرناگرێ و لە ناویان ژیواری پێداون و هەریەکەیان لە جێگەی بڕیار پێدراویانی داناون.

پارێزگار ئەوانەن خاوەن کاری باش و چاك و بەرزن، گوتاریان ڕاستە بەرگیان ئابورییە بێ زیادو کەم، ڕۆیشتنیان هێواش و ئارامە، چاویان گرتووە لە حەرامەکانی خودا کە حەرامی کردووە، گوێچکەیان تەنها بۆ زانستی بەسوود و بەکەڵکە، دڵ و دەروونیان لە بەڵاو کارەسات وەك خۆشیی و هەرزانییە، ئەگەر لەبەر ئەجەل و ماوەی دیاریی نەبوایە بۆ چاو تروکانێك ڕۆحیان لە لاشەیان ئۆقرەی نەدەگرت، چونکە شەوق و زەوقیان لای پاداشتە و ترسیان لە سزاو تۆڵەیە، خودا لە چاویاندا زۆر گەورە و هەموو کەسیان لا بچووکە، ئەوان بۆ بەهەشت وەك ئەوەیە کە بەدوویانەوە بیت، لە بەهەشتدا بە نازو نیعمەتەوە ئەژین، لەگەڵ ئاگریش وەك

ئەوەیە لەبەرچاویان بێ و تێیدا ئازار بچەژن، دڵیان خەمناكە، خراپەیان نییە، لەشیان لاوازەو پێویستییان سووكە و نەوسیان پاك و بێتەماعە، چەند ڕۆژێك ئارامیان گرتووە و خۆڕاگربوون و ماوەیەكی زۆر لە خۆشیدا دەبن، بەڕاستیی ئەوە بازرگانییەكی بە سوودو قازانجە خودا بۆی داناون، دنیا ئەوانی ئەوێ و ئەوان دنیایان ناوێ، دنیا دیلی كردن و ئەوانیش بەگیانی خۆیان سەرانەو باجیانداوە، لە شەودا پێیان توند ڕاگرتووە و بە دەنگی نزم و پاڕانەوە قورئان ئەخوێنن، دڵی خۆیانی پێ خەمبار دەكەن و زامی خۆیانی پێ دەهێننە سۆ و تیماریشی پێ دەكەن، هەركاتێ ئایەتی مژدە و خۆشیی دەبینن دڵیان لەسەری ئارام دەبێتەوە و ئومێد پەیدا دەكەن، دڵیان تەكانی بەختەوەریی بۆ ئەداو وا ئەزانن لە بەرچاویانە، ئەگەر ئایەتی ترس و تۆڵەیان بینی بە دڵ گوێی ئەدەنێ و وا هەست دەكەن هەناسەی ئاگری دۆزەخ و خواردنەوەی هەناسە لە بناگوێیانە، پشتیان چەماوەیەو تەویڵیان لەسەر خاكە، لەگەڵ لەپی دەست و نووكی پەنجەكانی پێیان ئەپاڕێنەوە لە خودا گەردنیان لە ئاگر بپارێزێ، بەڵام بە ڕۆژدا جوامێرو زاناو داناو پیاوچاك و پارێزگارو لە ترسی خودا لەش و لاریان وەك تیری كەوان تاشراوە، كە خەڵك تەماشایان ئەكا وا ئەزانێ نەخۆشن، كەچی هیچ جۆرە بیمارییان نییەوا ئەزانی دەستیان لێوەشێنراوە و تێكچوون، بەڵام دەستیان لێنەوەشێنراوە، بەڵكو لە ترسی گەورەدان، ڕازی نابن بە كارەكەمەكان و زۆرەكانیش بەزۆر دانانێن، ئەوانە هەمیشە تۆمەت بۆ نەفسی خۆیان دەكەن و لە خودا ترسیان هەیە لە وەرنەگرتنی كارەكانیان، ئەگەر یەكێكیان لە بەردەم خۆیدا ستایش كرا ترسی لێئەنیشێ لەو وتارەو دەڵێ: من لە تۆ باشتر خۆم ئەناسم و خودام لە من زیاتر ئاگادارە لە كردارم، خودایە نەمگری بە وشەی ئەوانەو زیاتر بم لە بۆچوونی ئەوان و لێمخۆشبە لەو تاوانەی كە ئەوان پێی نازانن.

نیشانەی یەكێك لەمانە ئەوەیە بەهێزو بەتوانایە لە ئاییندا، خاوەن توانایە لەگەڵ نەرمیدا، باوەڕی بە یەقینە، پەلەیەتی بۆ زانست، زانستی لەگەڵ جوامێرییە، ناوەندییە لە ساماندا، بە ترسە لە خواپەرستیدا، لە هەژاریی جوان خۆی دیاری ئەكات خۆگرە لە بەڵادا، حەزی لە حەڵاڵە، چالاكە لە بانگەوازدا، دوورە لەچاوچنۆكیی، كاری چاكە ئەكات و ترسی وەرنەگرتنی هەیە، ئێوارەی لێ دێ بیری لای سەبرو شوكرە، ڕۆژی لێ ئەبێتەوە دڵی لەیادی خودایە، شەو بەترسەوە دەخەوێ،

ڕۆژ بــە ڕووخۆشــیی بــە خەبــەردێ، ترســەکەی لەوەیــە نــەوەك بــێ ئاگــایی ڕووی تێکردبێ، خۆشیەکە لەوەدایە کە تووشی بەخشندەیی و بــەزەیی خــودا بــووە، ئەگــەر نەفسی تــاریکی لا گرانبــێ و داوای لێ بکــات کــە ئــەنجامی بــدات بــە گــوێی ناکــات و داواکەی ڕەد ئەکاتەوە، فێنکی چــاوی لــە کــاری ئــەو دنیایــە، دورو بێباکــە لــەو شــتەی کەمخایەن و کەمبایەخە، جوامێریی و زانستی ئاوێتە کردووە، کــردارو ڕەفتــاری وەك یەکە، هیواو ئومێدی نزیکی هەیە، کەمتر هەڵە و نوچــدانی هەیــە، دڵــی هەمیــشە لــە خــۆفی خودایــە، نەفــسی قانعــە، خــۆراکی کەمــە، کــاری ئاســانە، هەمیــشە بــاوەڕی پارێزراوە و لە شوێنی ئەمینە، ئــارەزووی مــردووە، ڕقــی خــۆی قــوت داوە، چاکەی لێ چاوەڕوانە و ترسی ژیانی نییە و دڵی ناگرێ، ئەگەر لەگەڵ بێئاگاو بێ پەروا دانیشێ لەوانە دەژمێــرێ یــادی خــودا ئەکــەن و ئەگــەر لــە نــاو یادکــەرانی خــودا بێــت لەگــەڵ بێئاگایاندا تۆمار ناکرێ.

لێبووردەیــە لــەوەی ســتەمی لێئــەکا، ئــەوەی بێبەشــی ئــەکا ئــەم بەشــداری ئــەکا، ئــەوەی دەنگــی لێوەرئــەگرێ ئــەم هامۆشــۆی ئــەکات، دوورە لەگاڵتــەو گــەپ و قــسەی هــەرزەگۆ، گوفتــاری نــەرم و لەســەرخۆیە، خراپــەی بــزرە و چاکەی حــازرە، خێــری بــەرەو ڕووە، خراپــە پــشتی هــەڵکردووە لێــی، لــەزریان و گــەردەلولی ژیانــدا ســالارو ســەنگینە، لــە کارەســات و ناخۆشــیدا خــۆڕاگرە، لــە دەوڵەمەنــدیی و ســامانداریی سوپاسگوزارە، ستەم ناکات لەوەی ڕقی لێیە، تووشی گوناح نابێ لەوەی خۆشی ئــەوێ، دان ئەنێ بەحەقدا پێش ئەوەی شایەتی لێبدرێ، دەستپاکە ئەگەر شتی لادانــرێ، لــە بیری ناچێ ئەگەر لەسەری پێویست کرا لە بیری بــێ، هــەرگیز نــاو و نــاتۆرەی خــراپ بە دەمیا نایەت، هاوسێ لە دەستی زیان ناخوات، شادکامیی ناهێنێ بە بــەڵای خــەڵك، خــۆی لــەکاری باتــڵ هــەڵناقورتێنێ و لــە حــەق و ڕاســتیی لانــادا و دەرناچێ، ئەگــەر بێدەنگ بوو خەفەت ناخوات، ئەگەر پێکەنی دەنــگ بــەرز ناکاتــەوە، ئەگــەر ســتەم و بێدادیی بەسەردا کرا لە بیری تۆڵەیدا نییە و ئارام و خۆڕاگرە، هەتا خودا تۆڵەی بۆ ئەسێنێ، نەفسی هەمیشە لە ئازاردایــە چونکە بــەگوێی ناکــات، خــەڵك ئاســودەیە لــە زیــانی، خــۆی مانــدووکردووە بــۆ قیامــەت و پــشووی داوە بــە خــەڵك لــە زیــان و ناخۆشیدا، دوورە پەرێزیی لەوانەی لێی دوور ئەکەونــەوە بــەبێ منــەتیی و پــاکیی و خــاوێنیی بــە نزیــك بوونــەوە لــەوەی نزیکە لێــی، نــەرمیی و دڵسافیی و بــەزەیی بــە

دوورکەوتنی لەوەی دوورە، بە فیزو خۆبەگەورەگر نییە و نزیکیی هەمیشە بۆ فێڵ و خەڵەتاندن و فریودان نییە.

ئەڵێن کە پێشەوا لە وتارکەی بوویەوە هەمام یەك هاواری کرد و گیانی لەگەڵ دەنگەکەی پەروازی کرد !!، میری باوەڕداران فەرمووی: دەی بە خودا لەوە دەترسام کە بە سەری هات، ئەوجا فەرمووی: ئامۆژگاری بە پێزو بەرێزو و جوانبێژی بەو شێوە، کاریگەرە لەسەرپیاوی خۆی.

کابرایەك وتی: ئەی باشە تۆ بۆ بەو شێوە کارت تێناکات؟ میر فەرمووی: بەدبەخت خودا بتفەوتێنێت هەر کەسەو ئەجەلی خۆی و کاتی خۆی تێناپەڕێ لێی و هۆکاری خۆی هەیە و بێ ئەو نابێ، هیواش بە ! جارێکی ترئەم وشە دووبارە مەکەرەوە ئەوە شەیتان فووی کرد بە دەمتاو لە سەرزمانی داناوی.

**( ١٩٤ )**

## وتارێك لە باسی دوو ڕووەکان

سوپاس و ستایشی خودا دەکەین لە سەر ئەوەی ڕێگەی بۆ خۆش کردووین بۆپەرستنی و ئێمەی پاراستووە لە بێفەرمانیی، داوا ئەکەین بە بەخشندەیی خۆی زیاتری بکات و باشتردەست بگرین پێیەوە، بە دڵ و زمان بڕیار دەدەین کە محەممەد(صلی الله علیه وسلم) بە ندەو پێغەمبەری خودایە، لەپێناوی ڕەزامەندیی خودا تووشی هەموو نارەحەتیی و ناخۆشییەك بووە، هەموو تاڵیی و سوێرییەکی نۆشیوە، خزم و نزیکەکانی خۆیان لێگۆڕی و وەرگەڕان لە ڕوویدا، دوور و دەوروبەریش دژی وەستان و هێرش و پەلاماریاندا، عەرەبیش هەوسار و ڕەشمەی خۆی داماڵی و دوژمنایەتییان ئاشکرا کرد، ئاوزەنگیاندا لە سکی وڵاخەکانیان بۆ جەنگ و شەڕی، بەرادیەك دوژمنایەتیان هێنایە بەرگۆڕەپانی ماڵەکەی، لەو پەڕی شوێن و نیشتەجێیان!.

خودا پەرستەکان ئامۆژگاریتان ئەکەم، کە تەقوای خودا بکەن و ئاگادارتان ئەکەم ترستان هەبێ لە دوو ڕووەکان، چونکە ئەوانە وێڵن، گومڕان، لە خشتەبەرن، خۆیان هەڵەن و خەڵك بە هەڵەدا دەبەن، جۆرەها ڕەنگ لە خۆیان دەدەن، هەموو

جۆرە هونەرێك بەكار دێنن، بەندەیان بە كۆڵەكەوە دەبەستەوە، لە هەموو داوگەیەكەوە چاودێریتان ئەكەن و بۆتان دانیشتوون، دڵ ودەروونیان گەن و نەخۆشە و دەموچاو و روویان پاك و خاوێنە، كاریان هەمیشە بەدزیی و گزییە، ژێر بەژێر و نەرمەبڕ، وتارو گوتاریان دەرمانەو وتاریان تیمارەو كردارو رەفتاریان دەردی بێدەرمانە، ئیرەیی دەبەن بە هەرزانیی، كارەسات قورس و ناهەموار دەكەن، كاریان بێئومێدكردنە و پڕوپاگەندەیە لە هەر رێگەو رێبازێك، كوشتەیان هەیە لای هەموو كەس، واسیتەیان هەیە بۆ هەموو ناخۆشیەك، فرمێسكیان هەیە، مەدح و سەنا بە یەكتر دەدەن بە دەستەوام و قەرز، هەمیشە چاوەڕوانی خەڵات و بەراتن، كە سواڵ بكەن ئەلالێنەوە و ئەپاڕێنەوە، ئەگەر رەخنە بگرن هەموو پەردە لادەبەن، ئەگەر دادوەریی بكەن تیژڕەو و توندڕەون، بەرامبەر هەموو حەقێك باتڵیان هەیە و ئامادەیە، بۆ هەموو راستێك لارێكیان هەیە، بۆ هەموو زیندوویەك پیاوكوژێكیان هەیە، بۆ هەموو دەرگاو قوفڵێ كلیلیان هەیە، بۆ هەموو شەوێكی تاریك چرایان هەیە، هەمیشە بۆ گەیشتن بە ئامانج و بازاڕیان بێئومێدیی بڵاو ئەكەنەوە، ورە و وزەی خەڵك دائەبەزێنن و جنس و كاڵای خۆیان برەو پێئەدەن، وردەی قەڵبیان بە عەنتیكە دەفرۆشن، كە قسە ئەكەن هەمیشە بە توێكڵەوە ئەدوێن، ئەگەر وەسف بكەن بە پێچ و پەنا ئەیكەن، رێگە خۆشكەرن هەتا خەڵك دەخەنە سەر رێگایان، تەنگەبەرەكان لار و وێر ئەكەن بۆ هەڵدێرانی رێبواران، ئەمانە دەستەو كۆمەڵێ شەیتانن و جزی ئاگرەكانن، (ئەوانە كۆمەڵەی شەیتانن، باش بزانن كە هەر كۆمەڵەی شەیتان زیانبارن).

(١٩٥)

## وتارێك بۆ سوپاسی خودا و سەنای پێغەمبەرو ئامۆژگاریی

### (سوپاسی خودا و شایەتومان)

ستایش تەنها بۆ خودایە كە شوێنەواری دەسەڵاتی دیار و ئاشكرا كردووە، شكۆو بەرزیی و وێنە و شێوازی روونەو چاوی عەقڵ و فامی سەرگەردان كردووە، لە هەموو دەسەڵات سەرسوڕهێنەرە، بیرو خەیاڵی زانا و داناى داوەتە دواوە، ئەگەر

ویستت كرۆكی سیفەتەكانی بزانی، بە دڵ و بە زوبان شایەتی ئەدەم، كە هیچ پەرستراوێكی بە حەق نییە جگە لە خودا، ئەم شایەتییە لە باوەڕو یەقینەوە هاتووە بە دڵسۆزیی و دڵپاكیی و دڵنیاییەوە، شایەتی ئەدەم كە محەممەد بەندەو پێغەمبەری ڕەوانەكراوە(صلی الله علیه وسلم)، لەو كاتەی پەرچەمی ڕێگە ڕزیو بوو و پرۆگرامی ئایین كوژاوە بوو، ئەركی گەیاندنی حەقی لە ئەستۆ گرتووە، ئامۆژگاریی خەڵكی كرد، ڕێگەی درووست و ڕاستی نیشانی خەڵكدا، فەرمانیدا بە میانەڕەویی، درودی خودا لە گیانی پاكی و ئال وبەیت و یار و یاوەری بێ.

## ئامۆژگاریی

خودا پەرستان زۆر باش بزانن..! كە خودا بە خۆڕایی و بێئامانج ئێوەی درووست نەكردووە، دەستی لێبەرنەداون و بەرەڵابن، ئەزانێ بە ئەندازەی نیعمەتەكانی لەسەرتان، چاكەكانی لەسەرتان ئامار كردووە، ئێوەش پێویستە داوای سەركەوتنی لێبكەن بەسەر دوژمندا، داوای پیرۆزیی و زەفەری لێبكەن، هەمیشە داواكار بن و بەنیاز بن لە خەلا ت و بەراتی، چونكە پەردە لە نێوان ئێوە و ئەو نییە و دەرگای لە ئێوە دانەخستووە لە هەموو شوێنێ، سامانی كەل ناكات و خەڵات و بەراتی كەم ناكات، بە سواڵ لێكردنی دوایی نایە و دەسەنە وەرگرتنی لە بن نایە، كەس ناتوانێ كەسی تری لێبشارێتەوە، دەنگ دەنگی لێ ناشێوێنێ، بەخشینی تاڵانیی لاینابا، ڕەقیی بەرگری ناكات لە بەزەیی، هەر وەك بەزەیی ڕێگر نییە لە تۆڵە و سزای، هەرگیز سك و پێشەوە، پشت و پاشەوەی ناشارێتەوە، پشت ناتوانێ پێشەوە ببڕێ، نزیكی دوورە، بەرزی نزیكە، هەم ناوە، هەم دەرەوە، شاراوەیەو ڕوونە، دادوەرەو كەس ناتوانێ دادگایی بكات، بوونەوەری بەدیهێنەر كردووە بێ ماندوو بوون و بیركردنەوە، ماندوو و شەكەت نەبووە و كەس یارمەتیی نەداوە.

تكاتان لێئەكەم بەندەكانی خودا..! لە خودا بترسن، خۆتان لە گوناح بپارێزن، چونكە جڵەوی بەختەوەرییە و خوانی ژیانە، بەتوندی دەست بگرن بە بڕوانامەكانی و پەیوەندو پەیوەست بن بە ڕاستییەكانییەوە، ئەتانگەیەنێتە شوێنی حەوانەوە و پشوودان و نیشتەجێتان دەكات لە نیشتمانی پان و بەرین و بە پیت و

**له کۆشك و سەراو قەڵای پارێزراو و هەواری سەرفرازیی لە (ئەو ڕۆژەی کە چاو هەوڵەق دەبێ) و هەموو ناوچەیەك تاریکەو زینەماڵ و مەڕو ماڵات بێخاوەنە، فوو ئەکرێ بە کەڵەشاخداو هەموو گیانلەبەرێك گیانی دەرئەچێ و هەموو زمان و زاراوەیەك ڕادەگیرێ، چیا بەرزو کەژە سەرکەشەکان نەوی دەبن، چیا سەخت و ڕەقەکان دەتوێنەوە، کام بەرد زۆر ڕەقە دەبێتە تۆزو تراویلکە و شوێنەکەی دەبێتە سارایەکی تەخت و بێ گرێوگۆڵ، واسیتە نییە کە شەفاعەت بکات، دۆست و هاوڕێ نییە سوودی هەبێ، بڕوبیانوو نییە کەڵکی هەبێ.**

## ( ١٩٦ )

# وتارێك باس لە ناردنی پێغەمبەر ئەکات

## ( صلى الله عليه وسلم )

**خودا پێغەمبەری ڕەوانە کرد(صلى الله عليه وسلم) لە کاتێ کە زانستێ نەبوو ڕاوەستاو، ڕوناکییەکی دیار نەبوو، پەیڕەو و ڕێبازێك نەبوو کە ڕوون و ئاشکرا بێ، من ئامۆژگاری ئێوە ئەکەم بەندەکانی خودا، هەمیشە پەرهێزکار بن و ترس دەخەمە بەرچاوتان لە دنیا، چونکە ماڵێکی دوورمەودایەو دەبێ زوو چۆڵی بکەی، شوێنەکەی خنکێنەرە، ئەوەی تێیدایە کۆچەرە و هاوڵاتی لە خۆی ناگرێ، دانیشتوانی سەریان لە گێژاودایە، وەك دەریاوانی سەرکەشتیەك کە ڕەشەبایەکی بەهێز لە ناو شەپۆلی دەریادا دەیهەشۆکێنێتەوە، کە هەندێك خنکاو و مردووە و هەندێکیش بەسەر تەختەوە خۆیان گرتووتەوە و بەملاو ئەولایاندا دەبات و بەرەو هەڵدێریان دەبا، ئەوەی خنکا دەست ناکەوێتەوە، ئەوەی ماوە بەرەو تیاچوون ئەڕوا، بەندەکانی خودا !، ئێستە تێبگەن، کە زمانتان بەرەڵایە، لەشتان ساغە، ئەندامتان نەرم و نۆڵە، جێگەتان فراوانە، ماوەتان پان و بەرینە، پێش ئەوەی هەلتان لە دەست بچێت و مەرگ بێت، بڕوا بکەن بە هاتنی، پێش هاتنی.**

(١٩٧)

## وتارێك بۆ شارەزابوون لە پیاوەتیی و وەرگرتنی فەرمانەکانی

لەڕاستیدا ئەوانەی جێگای متمانەو ڕازگری پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بوون لەیارانی، باش دەزانن کە دەمژمێرێك بەرپەرچی فەرمانی خودا و پێغەمبەرم نەداوەتەوە و من هەمیشە دڵی پێغەمبەرم بە جێهێناوە و دڵم داوەتەوە لە شوێنگەلێك کە پیاوە پاڵەوان و ئازاکان پاشەکشێیان تێدا کردووە و خەڵك بۆ دواوە لێی گەڕاوەتەوە، ئەوەش بەدەمەوە چوون و بەیارمەتیی و هاوکاریی چونێکە کە خودا لوتفی لەگەڵم کردووە، ئەوکاتەی کە زاتی پاکی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) گیانی پاکی سپارد، سەری لەباوەش و سنگی مندا بووە و کە خوێنی هەڵهێنایەوە لە ناو مشتی مندا مایەوە و منیش بۆ تەبەروك هێنام بەدەم و چاومدا، وە من خۆم ئەرکی شۆردنم لە ئەستۆ بوو لەگەڵ فریشتەدا و ئەو ماڵە پڕبوو لە دەنگ و سەدای فریشتەکان، دەستەیەك دەهاتنە خوارەوە و دەستەیەك بەرز دەبوونەوە، هەرگیز دەنگ و چپەیان لە گوێم نەبڕاوە، کە خەریکی ناردنی درووود بوون بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) هەتا ئەو کاتەی ئەسپەردەی خاکمان کرد، دەی توخودا کێ لە من نزیکترە لە حاڵی مان و نەمانیدا؟ دە بگەڕێن بۆ ڕوناکیی و فام و ژیریتان، دەبا نیازتان پاکبێ و باوەڕدار بن و دژی دوژمنەکانتان بن، سوێندم بەو کەسەی کە تەنها ئەو خودایە، من لە سەر جادەی ڕاست و ڕەوانم و ئەوان لەناو چاڵی ناڕاست و باتڵدان، ئەوەی بیستان گوتاری منە و داوای لێخۆشبوون بۆ خۆم و بۆ ئێوەش دەکەم.

(١٩٨)

## وتارێك دەربارەی گشتگیریی زانستی خودا، بە وردەکاریی و گەورەیی قورئان و ئیسلام

خودا زانایە، ئاگاداری نوزەی دڕندەکانە لە بیابانەکاندا، ئاگاداری گوناهی بەندەیە لە پەنهانیدا، ئاگاداری جموجوڵی ماسیەکانە لە دەریاکاندا، ئاگاداری تێکەڵاوی ئاوە لەگەڵ با توندەکاندا، باوەڕم بەم خودایە و بەم پێغەمبەر محەممەدە

**هەیە (صلی الله علیه وسلم) کە پاڵفتەو هەڵبـژێردراوی خودایـە و ڕاگـری سروشـە و ڕەوانەکراوی بە ڕۆحی خۆیەتی، ئەوجا مـن ئامۆژگاریتـان ئەکـەم، بـە تـەقوای خـودا کـە لـە نـەبوون و سـەرەتاوە ئێـوەی درووسـتکردووە و بـۆ لای ئـەویش دەچـنەوە و سەرکەوتن و بە ئاوات گەیشتنتان تەنها بـەوەوە دەبـێ، مـەیلتان هـەر لای ئـەو بـێ و ڕێگەتان هەر بۆ لای ئەو بێ و پەناتان هەر لای ئەوە لە کاتی ترسدا، چونکە تـەقوای خودا دەرمانی بیماری دڵتانە، ئەو ڕوناکیی کوێری دڵتانە و چاکبوونەوەی نەخۆشی لەشتانە، چاکسازی گەندەڵیی دەروونتانە و پاککەرەوەی چڵکی نەفستانە، ڕۆشـنگەری تـەمی بینینتانـە، ئـارامی بەخـشی تـرس و دڵەلەرزەتانـە، تیـشکی لابـەری تـاریکیی ڕەشتانە، دەبێ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، بەرگی سەر لەش و پۆشتەییتان بێـت، لـە دووتـوێی بـەدەنتان و لەسـەر پەراسـووەکانتان بێـت، ڕابـەرو فەرمانـدەی هـەموو کارەکانتان بێت و کانیی سازگاری کاتی ئـاو خواردنـەوەتان بـێ، واسـتەی گەیـشتن بـە ئامانجەکانتان بێت، چەترو قەڵغانی ڕۆژی ترسانتان بێ، چـرای نـاو گۆڕەکانتـان بـێ، هێمنبەخشی درێژی تەنیایی و بێکەسییتان بێ، پشووی ڕۆژی ناخۆشتان بێ، چـونکە جێبـەجێ کردنـی فـەرمانی خـودا، شـوێنی ئـەمنی جێگـە دڵ تەزێنەکانـە و ترسـە چاوەڕوانی کراوەکانە و بڵێسەی ئاگرەتیژەکانە، ئەوەی کە خوای هـەبێ ناخۆشیی بـا نزیك بێت، لێیدەبوێرێ و کاری تاڵ و تفتی بۆ شیرین ئـەبێ، لـە گێـژاوی شـەپۆل بـا قـەبارەی هـەبێ، لادەرەکـاری زۆر قـورس ئاسـان و سـووك دەکـات، بـارانی کـەرەم و بەخشندەی لەسەرە، پاش گرانیـی و قـات و قڕیـی، بـەزەیی بـاڵ ئەکێـشێ بەسـەریدا، پاش بارکردنی کانیی نازونیعمەتی بـۆ ئەتـەقێ، پـاش وشـك بـوونی بـارانی بـەخوڕی بەرەکـەت دەبـارێ، پـاش ئـەوەی ورد ئـەباری، لـە خـودا بترسـن سـودمەند بـن لـە ئامۆژگاریی بە پەیام ئێوەی ئامۆژگاریی کردووە و نیعمەت و بەخششی داوە پێتـان، خـۆ ڕام بکـەن بـۆ بەندایـەتیی خـودا، خۆتـان دەربـاز بکـەن لـە بـەجێ هێنـانی فەرمانەکانی.**

## گەورەیی ئیسلام

ئەوجا باش بزانن ئەم ئیسلامە ئایینی خودایە، خۆی هەڵیبـژاردووە بـۆ خـۆی و لە بەردید و چاودێری خۆی درووستیکردووە، پوخت و پاڵفتەی کردووە بۆ چاکترین درووسـتکراوی خـۆی، پایـەو کۆڵەکـەی لەسـەر خۆشەویـستیی و نـەرمیی و بـەزەیی دانـاوە، هـەموو ئاینـەکانی بـە دەسـەڵاتی خـۆی تێـدا کـۆ کردووەتـەوە و گـشتگیرە بـۆ هەموو نەتەوە و نەژادەکان و بیانووی دوژمنانی بڕیووە و سەری نەوی کردوون بـە بەخـشندەیی خـۆی، نـەیارانی دەستەپاچـەو دامـاوکردووە بـە یارمـەتیی و هاوکـاریی خـۆی، گـشت پایـەکانی سـەر لێـشێواوی ڕوخانـدووە بـە هێـزو دەسـەڵاتی خـۆی و لـە ساباتی خۆیدا جێگەی کردوونەتەوە، تینوێتی خەڵکی شکاندووە لە حەوزی خـۆش و شـیرینی، هـەموو هەسـێرو حـەوزەکانی هەمیـشە پـڕە بـۆ ئـاو هـەڵگۆزەکانی، ئـەوجا بناغەی بە شێوەیەك داڕشتووە کـە هـەرگیز دەسگیرەکەی شـکاندنی بـۆ نییـە و جیـا نابێتەوە و جومگەکانی لە یەك ناترازێ و بناغەی نالـەرزێ و ناڕوخـێ، پایـەکانی لار نابن و ناپوکێنەوە، نەمامی هەرگیز لە ڕیشك نایەتە دەرەوە و ماوەی بە سەرناچێ و کۆتایی نایە، ڕەگ و ڕیشکی نابڕێ، یاساو ڕێساو دەستوری کۆن و ڕزیـو نابـێ، ڕێبـازی هـەرگیز تووشـی تەنگەبـەریی نابـێ، هـەرگیز خـاکی شـل نابێتـەوە و لەسەرڕۆشـتنی ناخۆش بـێ، ڕەشـیی نایـەت بەسـەر کازیوەی بەیانییەکانیـدا، هـەرگیز چـەمینەوە و لاربوونەوە بۆ ڕاستەکانی نابێ، خەڵف و لقەکانی چەماوە نابێ، ڕێبازی ماندوو بوون و شەکەتی تێدا نابـێ، کوژانـەوەی چـرای نابـێ، هـەرگیز شـیرینی نابێتـە تـاڵیی، بنـی پایەکانی لە ڕووی ڕاستییەوە بە نەرمیی و جوانیی چووە بە ناخی حەق و ڕاسـتیدا، بنەماکانی بە توندیی داڕێژاوە و کانیی و چـەشمەکانی هەمیـشە ئـاودارە بـە زۆریـی، شـۆڵەی چـراکانی هـەرگیز گـڕی ئاگرەکـەی ناکوژێتـەوە، چـرای سـەر مـەنارەکانی، ڕوناکیی ڕێگەی ڕێبوارانە و نیشانە و ئاماژەکانی بۆ ڕێگاکان دیاری کـراوە و کـانیی و قەمی سەر ئاوەکان ئامادەن بۆ ئاوخۆران، خودا هەموو ڕەزایـەتیی و کۆتاخۆشـنودیی لـەم قورئانـەدا دانـاوە، ئـەو پـەڕی بـەرزیی و شـکۆی بـە پایـەکانی داوە و تەختـەی پەرستنی تێدا داناوە، لای خودا لە چوارچێوەیەکی پتەو و جێگـەی متمانـەدا دانـاوە، قەڵایەکی بەرزو مەحکەم و بورهان و بەڵگەی گەش و ڕوناکە، گـڕی ئـاگری بەتیـشك و بێدوکەڵـە، دەسـەڵاتدار و مـەنارە بـەرزە، دەمـشکێنی ڕەخنـەگرو تانـەدەرە، ئـەم

قورئانە بەم شێوەیەیە، ئێوەش ڕێزی بگرن، پەیڕەویی بکەن، شوێنی بکەون، حەقی خۆی پێبدەن و لە شوێنی شایستەی ڕابگرن.

## باسی پێغەمبەری گەورە
## ( صلى الله عليه وسلم )

ئەوجا خودای پاك و بەرز محەممەد (صلى الله عليه وسلم)ی ڕەوانە کرد بە حەق و ڕاستیی و درووستیی لەو کاتەی ئەم جیهانە لە بڕاوانەوەیە، پێش قەرەوڵی ئەو دنیاش دەرکەوتووە جوانیی دنیا بەرەو تاریکیی دەڕوا، ئەو خەڵکەی لەسەر لاق ڕاگرتووە، سەرەتا زبرو دڕکاوییەکانی دەرکەوتووە، ملی کەچ کردووە بۆ نەمان و ڕوخان، لەبەر کۆتایی ماوەکەی، نیشانەکانی بەرەبەرە سەری هەڵداوە و دەستی ناوە بەڕووی دانیشتووەکانییەوە و ئەڵقەی پەیوەندیی نێوانیان بەرەو پسان ئەچێ، پەت و گوریسی بڵاو بووەتەوە، نیشانەکانی بەرەو نەمان و پوترکان دەڕوا، خەریکە عەیب و عاری دەرئەکەوێ و درێژیی کورت ئەبێتەوە.

خودا ئەم پێغەمبەرەی(صلى الله عليه وسلم)داناوە وەك بەیاننامەیەك و ئاگاداریی بۆ پەیامەکەی، بەخشندە و گوشادی بۆ میللەتەکەی، بەهارە بۆ کۆڕو کۆمەڵی زەمانی خۆی، بەرزیبەخشە بۆ هاوکارانی، جوامێریی و مەردایەتییە بۆ یارو یاوەرانی.

## قورئانی بەڕێز

ئەوجا... خودا ئەو کتێبەی بۆ نارد، کە هەرگیز ڕوناکیی چراکانی ناکوژێتەوە، مەشخەڵێکە کە شۆڵەی کز نابێ، دەریایەکە بنی نییە، پەیڕەوێکە ڕێبازی وننابێ، بریسکەیەکە تاریکیی تیشکی لانابا، دادوەرێکە بورهان و بەڵگەکانی دانامرکێتەوە، دەستەواژەیەکە دیوارەکانی ناڕوخێ، تیمارێکە زامەکان لە دەستی قوتار نابێ، هێزو دەسەڵاتێکە یارو یاوەرانی ناشکێن، حەق و مافێکە هاوڕازانی شکست ناهێنێ، (کان)ی باوەڕە و ناوەڕاستی سەرچەشمەی زانستەو دەریاکانیەتی، باخی دادپەروەرییە و جۆگەلەکانییەتیی، سێکوچکەی ئیسلام وماڵەکانییەتیی، شێوی ڕاستیی و

درووستییە و زەوییە نەوییەکانییەتیی، دەریایەکە بە ئاوهەلگۆزین کەم نابێ، کانییەکە بە ئاو لێبردنی وشك نابێ، شەتاوەیەکە بەکارهێنانی لەبن نایە، کاروانسەرایەکە رێبواران رێگەیان لێتێك ناچێ بۆی، ئاڵا و پەرچەمێکە کە کاروانیان لێیان ون نابێ، باخ و شینایییەکە کەس ناتوانێ خۆی لێلابدا.

خودا کردوویەتی بە ئاوی زوڵاڵ بۆ زانایان، بەهارێکە بۆ دڵی شەرعزانەکان، زیارەتگایەکە بۆ رێگەکانی پیاوچاکان، ئەو دەرمانەیە کە رووداوی بەکارهێنانی نەخۆشیی نییە، روناکیی بێ تاریکییە، دەستگیرێکی قایم و مەحکەمە، قەڵایەکی پتەوی پەناگایە، بەرزییە بۆ ئەوەی کە شوێنی کەوێ، ئاشتییە بۆ دەروونی ئەوەی بچێتە ناوی، دەلیل و رێنیشاندەرە بۆ ئەوەی دوای کەوێ، بیانووە بۆ ئەوەی پێی بنازێ، بورهانە بۆ ئەوەی گوتاری پێبدا، شایەتە بۆ ئەو کەسەی سکاڵای پێبکا، سەرکەوتنە بۆ ئەوەی دانوستان و گفتوگۆی پێبکات، هەڵگری ئەو کەسەیە کە هەڵیگرێ، هۆی گواستنەوەیە بۆ ئەوەی بەکاری بێنێ، نیشانەیەکی دیارە بۆ ئەو کەسەی لە خۆی دەئاڵێنێ، قەڵغانە بۆ ئەو کەسەی بەرگی جیهاد لەبەر بکات، زانستە بۆ تێگەیشتوو، فەرموودەیە بۆ خۆشخوێنی، حوکمفەرمانە بۆ ئەو کەسەی دادوەرە.

## ( ١٩٩ )

## وتارێك کە ڕاسپاردەی یارانی پێئەکات

هەمیشە بە دەم نوێژەوە بن، پارێزگاری لێبکەن، زۆری ئەنجامبدەن، لە خودا خۆتان نزیك بکەنەوە بە هۆیەوە، چونکە (بەڕاستیی لەسەر باوەڕداران فەرمانێکی پێویستە).

باش وردببنەوە لە وەڵامی دۆزەخیان، کە پرسیاریان لێدەکرێ:(بۆچی ئێوە هاتوون بۆ سەقەر؟ گوتیان: ئێمە لە نوێژ خوێنەران نەبووین)!!، بەڕاستی گوناح دەوەرێنێ، وەك وەرینی گەڵا، گوناح بەرەڵاکارە وەك کردنەوەی گرێ و ئەڵقەی گوریسە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چواندویەتیی بە ئاوی مەعدەنی، واتە ئاوی گەرمی کانیاو کە لە بەردەمی ماڵە پیاوێك بێ کە لەشەو و رۆژێکدا پێنج جار خۆی لێبشوا، چۆن چڵك و چەپەڵیی پێوە ئەمێنێ، کەسانی باوەڕدار مافی خۆیان

داوەتـێ، کـە بـەهیچ جوانییـەکی بـەنرخیان نەگۆڕیوەتـەوە و بـە هـیچ فێنکیـی و چاوڕوونییان نەگۆڕیوەتەوە، لە ماڵ و لە منداڵ.

خـودای پـاك و بێگـەرد ئەفـەرموا: (ئـەوە کەسـانێکن کـە بازرگـانیی و کـڕین و فرۆشـتن لایاننـادا لـە یـادی خـودا و ئەنجامـدانی نوێـژ و بەخـشینی زەکـات)، پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) زۆر ماندوو دەبوو بە نوێژ، لەگەڵ ئەوەشـدا مـژدەی پێـدرابوو بـە بەهەشـت، خـودا ئەفـەرموا: (فەرمانبـدە بـە خانەوادەکەت بـە نوێژ و خۆشت خۆڕاگربە لە سەری)، کە هەمیـشە فـەرمان بـۆ خێزانەکـەی بـە نوێـژ هەبوو، خۆیشی بەردەوام بوو لە سەری.

## زەکات

ئەوجا... زەکات لەگەڵ نوێژدا کراوە بە قوربانیی و قۆچ بۆ ئەهلی ئیسلام، هەر کەس بە دڵی پاك بیـدات، ئەبێتـە کەفارەتی لـە گونـاح و دەبێتـە پـەردەی لـە ئـاگرو پـارێزەری، هەرکـەس زەکاتیـدا، دڵ و دوا نـەبێ و زۆر خەفـەتی بـۆ نـەخواو چـاو لـە شوێنی نەبێ، چونکە هەر کەس بە نابەدڵ دەری بکات و مەبەستی لـەوە باشـتری بـۆ دانابێ، ئەوە نەفامە بە ڕەوشتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و زیانی کـردووە لـە پاداشت و کارەکەی و ونیکردووە و زۆر پەشیمانە.

## ئەمانەت و دەستپاکیی

دانەوەی سپاردە بە خاوەنەکەی ئـەرکی بـاوەڕدارە، هەرکـەس جێگـەی شایـستەی نـەبێ خـۆی ڕەنجەڕۆیـە، چـونکە سپاردە درا بـە ئاسمانـەکان لـە سـەرەوە و زەوی لـە خوارەوە ڕاخرا بە چیا و شـاخە بـەرزەکان کـە کۆڵەکـەی زەوییـە و لەوانـە درێـژترو پانترو بەرز وگەورەتر نییە، خۆ ئەگەر وەرنەگرتنی بە درێژیی و پانیی و بەرزیی و هێـزو دەسـەڵات بوایـە دەبـوو ئـەوان هـەڵیبگرن، بـەڵام ترسـیان هـەبوو کـە بۆیـان هەڵنەگیرێ لەترسی سـزا، بـەڵام لەوانـە لاوازتـر کـە مرۆڤـە هـەڵیگرت (کـە بەڕاسـتی ستەم لە خۆکەرو نەفامە).

## زانستی خودای بەرز

خودای پاك و بەرز هیچی لێ وننابێ لەو كارانەی كە بەندەكانی ئەیكەن، لە شەو و لـە ڕۆژدا، زۆر بـە وردیـی ئاگـاداره، زانـستی هەمـە لایەنـەی هەیـە لـە سـەریان، ئەندامەكانی خۆتان شایەتی ئەدەن، دەست و قاچ و دەمتان سەربازی خودان، دەروون و دڵتان چاودێر و هەواڵگره، پەنهانیتان لای ئاشكرایە.

( ٢٠٠ )

## وتـارێك لەبـارەی مەعـاوییە

## ( خودای پاك و بێگەرد هیچی لێ ون نابێ )

قەسەم بە خودا مەعاوییە لە من داناو زاناتر نییە، بەڵام نهێنیگره و تاوانكاره، ئەگەر ترسی نەبوایەو و ڕقم نەبوایە لێی، لە هـەموو كـەس زیـاتر بلیمـەت دەبووم، بـەڵام هـەموو نهێنگرییـەك تاوانێكـە و هـەموو تاوانێـك حەشـاردانێكە و هـەموو تاوانبارێك ئاڵایەكی هەیە پێی دەناسرێ لە ڕۆژی دواییدا، دوباره سوێندم بـە خـودا، بە فێڵ و حیله غافلگیر نابم و بەهێز و توانا لـە سـەر حـەق نـاجوڵێم و لاواز نـابم و گێل نابم.

( ٢٠١ )

## وتـارێك بۆ هاندانی گرتنەبەری ڕێگەی ڕاست

خەڵكینـە...! هـەرگیز هەسـت مەكـەن بـە بێكەسـیی و چـۆڵەوانیی لـە ڕێگـای بانگەوازی حەقدا، لەبەر ئەوە مەردی ئەو مەیدانە كەمە، چونكە ئەو خەڵكە لەسەر سـفرەیەك دانیـشتوون تێرخـواردنی زۆر كەمـە، برسـیەتیی زۆر درێـژ خایەنـە، خەڵكینە... ئەوەی خـەڵك كۆئەكاتـەوە بـۆ تۆڵـە پێخۆش بـوون و پێنـاخۆش بوونـە، چونكە ئەوەی، كە وشترەكەی بە مردویی سەربڕی یەك نەفەر بوو، بەڵام سزاو تۆڵە بۆ هەموو بوو، چونكە هـەموو پێخۆشـحاڵ بـوون بـەو كـاره، خـودای پـاك دەفـەرموا: (سەریان بـڕی و هـەر پەشـیمانییان بـۆ مایـەوە، ئـەوە بـوو زەوییەكـەیان دەنگـی زۆر قورسی لێپەیدا بوو، وەك دەنگی گاسنی سوورەكراو لە خاكێكی نەرمدا).

( ٢٠٢ )

## دەگێڕنەوە ئەوکاتەی خانمی خانمان فاتیمە ئەسپەردە کرا وەك یەکێك قسە بۆ پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) بکات لە سەر گۆڕەکەی

فەرمووی: درود و سەلامت لەسەر بێ ئەی پێغەمبەری خودا، لە من و لە کچەکەت کە نزیکتەو دانراوە و زۆر پەلە بەخزمەتت ئەگا، بە خودا ئەی پێغەمبەی خودا(صلى الله عليه وسلم) من بێئارامم بۆ کچە نازدارەکەت، خۆگرتنم زۆر تەنگە، بەلام فورسیی جیابوونەوە لە تۆ کەمێ هۆی دلدانەوەمە و کارەساتی ڕۆشتنی ئێوە پرسە و سەرەخۆشیم لێئەکات، چونکە من خۆم لەشی پیرۆزی ئێوەم لەناو گۆڕ دانا و گیانی پیرۆزت لە سەر سنگ و دلی من دەرچووە، (ئێمە هەموو کاری خوداین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە)، سپاردەکە گەڕاوە بۆ خاوەنەکەی و بارستە وەرگیرایەوە، بەلام خەم و خەفەتی من هەمیشەیە، شەوگارم بێخەوە، هەتا ئەو ڕۆژە خودا جێگەیەکم بۆ دیاری ئەکا لەو مالەی تۆ تێیدا نیشتەجێی، لەوێ کچەکەت باس و خواسی ستەمی مافخواردنی لە لایەن ئوممەتەکەتەوە بۆ دەگێڕێتەوە، پرسیاری زۆری لێ بکەو هەوالەکانی لێوەربگرە، چونکە ماوەی ڕۆیشتنی ئێوە زۆر نییە و یادت لەبەر چاو ون نەبووە، سەلامی خودا لە سەر هەردوکتان بێ، سەلامی شێلراو بە فرمێسك و خواحافیزیی و بێ ڕق و کینە و بێ تاقەتیی، کە جێتان دێلم بۆ گلەیی نییە، ئەگەر بمێنمەوە لەبەر گومانی خراپە نییە، بە بەلێنی خودا بە خۆڕاگران.

( ٢٠٣ )

## وتارێك لە دنیا نەویستیی و هاندان بۆ قیامەت

خەلکینە... ئەم دنیایە مالی وەختییە، قیامەت مالی هەمیشەییە، لە ڕێگەدا تێشوو بۆ شوێنی حەوانەوە هەلگرن، هەولبدەن نهێنییەکانتان باس مەکەن لای ئەو کەسەی کە هەموو نهێنییەك دەزانێ، ئەم دنیایە لە دلتان دەربکەن، پێش ئەوەی لەشتان تێیدا دەرچێ، ئێوە لێرە تاقیکراونەتەوە و بۆ شوێنێکیتر درووستکراون،

مەردم ئەگەر تیاچوو، خەڵك ئەڵێن چی لە شوێنی جێماوە، فریشتەش ئەڵێن چی پێش خۆی کەوتووە؟ ڕەحمەت لەباوکتان هەندێ پێش دەست بخەن، هەتا ببێتە قەرز بۆتان لە دوای خۆتان زۆر بە جێ مەهێڵن، هەتا بار بێ لە سەرتان.

( ٢٠٤ )

## وتارێك لە سەر ئەو قسانەی کە یارانی دووبارەیان ئەکردەوە

خۆتان پڕچەك و ئامادە بکەن خودا ڕەحمتان پێبکات، چونکە هاواری کۆچکردنتان پێکراوە، زۆر دڵەودوا مەبن بۆ کەیبانۆی دنیا، بڕۆن بەو کەمە تێشووەی پێتانە، لەپێشتان کۆسپی نارەحەت هەیە، هەواری زۆر ترسناك و مەترسیدار هەیە، دەبێ پێیدا تێپەڕن و کەمێ تێیدا ستار بکەن، ئەوەش باش بزانن دیمەنی مەرگ زۆر نزیکبووەتەوە، ئەوەندەی نەماوە کەڵبەی گیر بکات لێتان و کاری زۆر ناخۆش ڕووبەڕووتان ببێتەوە و تەنگ و چەڵەمەی پڕ لە مەترسیی بێتە سەرتان، پەیوەندیی لەگەڵ دنیا ببڕن، خۆتان بەکاری تێشووی تەقوای خودا ماندوو بکەن.

( ٢٠٥ )

## وتارێك لەگەڵ تەڵحەو زوبەیردا پاش پەیماندان بەخەلافەت لەکاتێکدا ئەم دوانە گلەیی و گازندەیان هەبوو بۆچی داوای یارمەتی نەکردووە لێیان؟

پێشەوا فەرموی: ئێوە کەمێ ڕقتان هەستاوە و کەمێ خۆتان دوا خستووە، ئاگادارم بکەن چ حەق و مافی ئێوە هەبوو لەم کارەدا، کە من دەستم بەڕوویەوە ناوە، کام بەش بووە، حەقی ئێوە بووە من خۆم هەڵگرتووە؟ یان کام حەق و ماف هەبووە بۆ موسڵمانان، کە من کەمتەرخەم بووم لە ئاستیدا و سستیی و لاوازیم کردبێ، یان نەمزانیبێ، یان هەڵەم تێدا کردبێ؟.

قەسەم بەخودا، حەزم لە خەلافەت نییە، ئارەزووم لەمەزنایەتیی نییە، بەڵکو

ئێوە منتان پەلكێش كردووە بۆی، سەپانتان بە سەرمدا، ئەو كاتەی ئەو ئەركە درا بەسەرما تەماشای قورئانم كرد بزانم چی لە سەرمە و بە چی فەرمان ئەدا من شوێنی بكەوم و كامە ڕەوشت و سوننەتی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم) پەیڕەوی بكەم ! من پێویستیم بەڕاو بۆچوون و ئامۆژگاریی ئێوە نەبووە و بە غەیری ئێوەش نییە، هیچ كارێ نەبووە، كە نەیزانم و پێویستم بە ئامۆژگاریی ئێوە هەبێ و بەگشت موسڵمانان، خۆ ئەگەر پێویست بێ هەرگیز ئێوە پشتگوێ ناخەم لەبارەی ئەوەی، كە ئێوە باسی ئەكەن، كە گوایە من هاوبەرامبەریم نەكردووە، بەڵكو من بەڕای خۆم نەكرد و بە تاكڕەویی پەیڕەویم نەكردووە، بەڵكو من و ئێوەش ئەزانن پەیڕەوی پێغەمبەرم(صلی الله علیه وسلم)كردووە و ئەوەش كۆتایی پێهاتووە، ئەو كارەی خودا بڕیوێتیەوە پێویست بەڕای ئێوە ناكات، خودا خۆی دابەشی كردووە و پێی ڕازی بووە، كەواتە قەسەم بە خودا، نە ئێوە و نە خەڵكی تر مافی گلەیی و گازندەی نیە، داواكارم لە خوا دڵی ئێوە و دڵی خەڵكی تر بۆ حەق ڕابكێشێ و سەبرو ئارامیی بدات بە دڵی ئێمە و ئێوەش، ئەوجا فەرمووی: خودا ڕەحم بكات بە كەسێ، كە حەق ئەبینێ و هاوكاریی لێئەكا و ستەم ئەبینێ و لای ئەبا و هاوكاری ئەبێ لە سەر لابردنی.

( ٢٠٦ )

## وتارێك كە بیستی یارانی نەفرەت ئەكەن لە ئەهلی شام لەشەڕی سیفین دا

من زۆرم پێگران و ناخۆشە ئێوە جنێودەر بن، بەڵام ئەگەر كردەكانیان باس بكەن و حاڵ و باڵیان دیاری بكەن، باشترە لە قسە پێوتنیان، باسكردنیان باش نییە، زیاتر بڕوبیانوویان دەبڕێ، لەبەر ئەوەی جنێو و قسەیان پێ بڵێن، خودایە خوێنی ئێمە و ئێوە بپارێزە! نێوان ئێمە و ئەوان باش بكە و ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدە، هەتا حەق جیا دەبێتەوە لە ناحەق، هەتا ئەوانەی لە ڕاستیی لایانداوە و ڕێگەی خراپیان گرتووە و دەگەڕێنەوە.

( ٢٠٧ )

## لەهەندێ ڕۆژانی سیفیندا كە بینی حەسەن پەلەیە بۆ شەڕ

وتی ئەو كوڕە هەرزە بگرن، با نەڕوا و خانەی من كاول نەكا، چونكە من حەز ناكەم ئەم دوانە زوو بمرن (حەسەن و حوسەین)...، تەنها لەبەر ئەوە نەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) قەڵاچۆ نەبێ.

( ٢٠٨ )

## وتارێك لەكاتێكدا كە یارانی كەوتنە ناكۆكیی لەبارەی ناوبژیوان

( حكم )

خەڵكینە... نێوان من و ئێوە بە خواستی من نییە، چونكە جەنگ ماندووی كردوون، سوێند ئەخۆم، كە جەنگ زۆری لێسەندون و زۆر ماندووی كردوون، بەڵام نەیارەكەتان ماندووترو شەكەتترە، من دوێنێ میر بووم و ئەمڕۆ مەئموورم، دوێنێ (نا)م لێئەكردن و ئەمڕۆ (نا)م لێئەكرێ، حەزتان لە مانە، منیش نامەوێ هەڵتان نێم بۆ شتێ پێتان ناخۆشە.

( ٢٠٩ )

## پێشەوا چووە لای عەلای كوڕی زیادی حارسی لەبەسرە نەخۆش بوو

وتی ئەم خانووە گەورەت بۆچی بوو، كە تۆ بەرەو ئەو دنیا ئەڕۆی و لەوێ پێویستت بە ماڵ هەیە!؟ خۆ ئەشتوانی بەرەو ئاخیرەتی بەری، بیكەیتە دیواخانی میوان و خزمەتی میوانی تێدا بكەیت و خزم و كەسی تێدا بەسەر بكەیتەوە و مافی مافدارانی تێدا وەربگریتەوە، ئەو كاتە ئەتوانی بەرەو ئەو دنیای بەری، عەلا وتی: میری باوەڕداران، سكاڵام لەدەست عاسمی برام هەیە، فەرمووی چیەتی؟، وتی: بەرگی پۆشیوە و تەركی دنیای كردووە، فەرمووی بانگی بكەن بۆم، كاتێ كە هات فەرمووی: دوژمنی نەفسی خۆت! شەیتانە، كە ئەوینداری كردوی، چۆن بەزەیت نایە بە ماڵ و مناڵت، ڕەنگە وا بزانی خودا خواردنی خۆشی حەڵاڵ كردووە و حەزناكەی

وەریگری؟ تۆ لەوە کەمتری لای خودا، حەلاڵی خودا بە کەم بزانی !!، لە وەڵامدا وتی: میری موسڵمانان، ئەی تۆ بۆ بەرگ و پەڵاست زبرە و خواردنت وشکە؟ فەرموی: خودا بتگرێ من وەك تۆ نیم، خودای تەعالا فەرزیکردووە لە سەر پێشەوا و ڕابەری موسڵمانان، کە دادپەروەر بن و بە ئەندازەی هەژاران بژین، بۆ ئەوەی هەژاریی ژان و ئازار بۆ فەقیر زیاد نەکات.

(٢١٠)

## کەسێك پرسیار لەبارەی کاری نەوباو دەکات

ئەو جۆرە باس و خواسەی لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) گەیشتووە بە پێشەوا دەفەرموا: ئەوەی بەدەست و دەمی خەڵکەوەیە ڕاست و ناڕاستی تێدایە، ڕاستیی و درۆی تێدایە، حوکم لابەرو حوکم لابراوی تێدایە، گشتیی و تایبەتیی تێدایە، پتەو و یەکمانا و چەندبارهەڵگری تێدایە، پارێزراو و وەهمی تێدایە و لە زمانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) هەر لەکاتی خۆیدا درۆ هەڵبەسترابوو بە ڕادەیەك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە سەر دوانگە فەرمووی: (ئەوەی درۆ بەدەمی منەوە بەدەست ئەنقەست هەڵبەستێ، با جێگەی خۆی لە ئاگردا دیاری بکا)، ئەوەی فەرموودەی داوە بە تۆ چوارکەسە، پێنجەمی نییە.

## دوو ڕووەکان

پیاوی دوو ڕوو و بەڕواڵەت باوەڕدارە، ڕەنگی ئیسلامی لەخۆی داوە، گوێی لەگوناح نییە و خۆی لێنابوێرێ، بە زمانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) قسە ئەکات بەدەستی ئەنقەست، ئەگەر خەڵك بزانێ دوو ڕووە و درۆزنە فەرموودەی لێوەرناگرن و بڕوا بەگوفتارو قسەی ناکەن، بەڵام ئەڵێ چۆن ئەبێ جێگەی باوەڕ نەبێ، ئەوە یاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بووە و خۆی بە چاوی خۆی بینیویەتی و گوێبیستی بووە و ڕاستەوخۆ لەخۆی وەرگرتووە !، ئیتر خەڵك فەرموودەکە وەردەگرن، خودا بۆ خۆی باسی دوو ڕووی بۆ کردوی و پێناسەی بۆ کردوی و لەپاش پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەزیندوویی ماون، خۆیان لە پێشەوایانی گومڕاو ڕێ لێتێکچوو نزیککردووەتەوە، ئەوانەی خەڵك بە درۆ و

بوختان خەڵك ئەنێرن بۆ ئاگر، ئەوانیش كاروباریان پێ سپاردوون و لەسەر شان و ملی خەڵكیان داناون، بەهۆیانەوە دنیاخۆریی ئەكەن، ئەوەش دیارە خەڵك لەگەڵ پادشاو دنیان، جگە لە وانەی خودا پاراستوونی، (ئەوە یەكێك لە چوارەكە).

## هەڵەبازەكان (الخاطئون)

پیاوێك لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شتێكی بیستووە، وەك پێویست ئەزبەری نەكردووە و وەهمی خۆی تێكەڵ كردووە و لە دەستی ئەنقەست درۆ ناكات، ئەوە بەو شتەی لەدەستیدایە ئەیگێڕێتەوە و خۆیشی كاری پێئەكات و دەڵێ خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە(صلى الله عليه وسلم)، ئەگەر موسڵمانان بزانن بۆچوونی خۆی تێكەڵاو كردووە، هەرگیز لێی وەرناگرن، ئەگەر خۆیشی ئاگادار بێت لەم تێكەڵاوییە بەرپەرچی ئەداتەوە.

## گومانلێكراوەكان

پیاوی سێیەم لە پێغەمبەری بیستووە(صلى الله عليه وسلم) شتێك، كە فەرمانی پێداوە لە یەكەمجارو پاشان قەدەغەی كردووە، بەڵام ئەم نازانێ قەدەغەكراوە، یان بیستویەتی قەدەغەی شتێكی كردووە و پاشان فەرمانی پێداوە و ئەم نازانێ فەرمانی پێدراوەتەوە، حوكم لابراوەكەی لەبەرەو حوكم لابەرەكەی لەبەر نییە، خۆ ئەگەر بزانێ ئەو كارە حوكمی نەماوە پەیڕەوی ناكا و ئەگەر موسڵمانان بزانن ئەوەی دووەم لابراوە وازی لێدێنن.

## ڕاستگۆیانی ئەزبەركاران[4]

پیاوی چوارەم بەدەم خوداوە درۆناكات و لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) درۆ هەڵنابەستێ، ڕقی لەدرۆیە لە ترسی خودا و بە گەورە و مەزن ڕاگرتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و گومانی تێكەڵاو نەكردووە، بەڵكو بە چاكیی

[4] ئەزبەركاران : ئەوانەی دەق لەبەردەكەن.

گوێبیستی بووە، وەك خۆی لەبەریکردووە لە زەمینیدا وەك بیستوویەتی، زیاد و کەمی لێنەکردووە و حوکم لابەرەکەی لەبەرە و کاری پێکردووە و حوکم لابراوەکەی دەزانێ و ڕەدی دەکاتەوە، زۆر شارەزایە لە گشت و تایبەت و هەریەکەیان لە شوێنی خۆی داناوە و چەندمانا هەڵگرو پتەو و یەك ماناش ئەزانێ، زۆر جار لە فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەستەواژەیەك دوو ڕووی هەیە، یان گشتییە، یان تایبەتە، ئەوەی گوێبیستی ئەبێ حاڵیی نییە لە مەبەستی خوداو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و گوێگرە، ئەم دەستەواژە هەڵئەگرێ و بە جیاواز لەمەبەست ڕافەی دەکا و نیازەکە حاڵیی نابێ و نازانێ لە کوێدا بەکار هاتووە، ئەوەش وا نییە، هەرکەس یاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)حاڵی ئەبێ، زۆرجار یاران پێیان خۆش بوو عەرەبی دەشتەکیی و خەڵکی نەناسراو بهاتایە پرسیاری بکردایەو ئەوان گوێیان لێ بوایە، بەڵام من هەرچی لەم بارەوە گوزەراوە، پرسیارم کردووە و لەبەرمکردووە، ئەوە ئەو جۆرە نەوباوانەن، خەڵك لە سەری ئەڕۆن و جیاوازی تێدایە و لەگێرانەوەیاندا نەخۆشیی و لاوازیی هەیە.

(٢١١)

## وتارێك لەبارەی بوونەوەرە سەرسوڕهێنەرەکان

خودا بە توانای لە بن نەهاتووی خۆی و دەسەڵاتی بێ سنووری و بە جوانیی و وردیی و بێ نموونەی پێشین، کە توانیویەتی لە ئاوی دەریای بێ بن و بە شەپۆلی لە یەك ئالاویی، وشکانیی بێ تەڕایی درووستبکات، ئەوجا لەو وشکاییە بونەوەرێکی چین چین پێکبێنێ، حەوت ئاسمان درووستبکات، پاش لە یەکجیاکردنەوەیان لە یەکتریی و بە فەرمانی خۆی ڕایانبگرێ و هەر یەکەیان لەسەر سنووری خۆی ڕابگرێ و لەسەر سەدەمێکی سەوز زەوی ڕابگرێ لەسەر دەریاو دەریالۆشەی گوێڕایەڵیی خۆی، کە سەری بەندایەتیی بۆ نەویکردووە و دانیناوە بەگەورەیی و دەسەڵاتی خۆیدا، ئەوەی ڕەوانە و ڕێ ئەکات لە ترسی ئەوە و لە خاکی چیا بەردی گەورە و ڕەقی درووستکردووە، هاوشان لەگەڵ گردو نووکی چیا بەرزو سەختەکان،

كه ڕەگیان چووه بەناخی زەویدا و هەریەكەیان لە شوێنی خۆی بە چاكیی دامەزراوه، سەری لە كەشكەشانی فەلەكە و ڕەگی لەناو ئاوه و سەری دەرهێناوه و لە دەشتەكان و پێدەشتەكان جیابووەتەوه، بنجی داكوتاوه لەزەویدا و لە كەنارو ناوەندا زەوی بەستووەتەوه، ئەوكاتە چیاكان سەركەش و سەربەرز بۆ سەرەوه كشاون و درێژڕاكشاون بەسەر زەویدا، وەك پایەو كۆڵەكەی لێهاتووه بۆ زەوی و بەو مێخە توند زەوی ڕاگیراوه، بەو شێوه لە جوڵە براوه بۆ ئەوەی دانیشتوان تووشی سەرەگێژه نەبن و ڕۆچێت بۆ خوار و لە خولگە بترازێ.

پاكیی و بێگەردیی بۆ ئەو زاتەی، كە زەوی ئارام كردووەتەوه، پاش ئەو شەپۆلانە ئاوەكەی وشككردووەتەوه، پاش تەڕیی و لینجیی، ئەملاوئەولای وەك بێشكەو جۆلانەی كردووه بۆ خەڵك، وەك فەرش ڕایخستووه بۆیان لەسەر دەریای هارو هاج و وەستاو و نەجوڵاو بۆ ئەملاو ئەولای خۆی، وەستاوه و ناڕوا بەرێوه، بای توندی زریان شەپۆلی ئەدا بەیەكدا، وەك مەشكە دەیژەنێ و ڕەوانەی هەوری دەكات، كە وەك فرمێسك دێتەوه سەرزەوی، (ئەوه پەندە بۆ ئەوەی دڵی لە بەر خودا ئەلەرزێ و ئەترسێ).

## (٢١٢)

## وتارێك كه داوای ڕا پەڕینی یارانی ئەكات دژ بە ئەهلی شامی سەردەمی خۆی

خودایه ! هەر بەندەیەكی تۆ لەبەندەكانت وتاری ئێمەی گوێ لێ بێ، كە ئەم وتاره دادپەروەره و دووره لە ستەم و بەرژەوەندیی ئاین و دنیای بێ خراپەو گەندەیی تێدایە و... پاش بیستنی نەیەوێ پەیڕەوی بكات و، حەز بكات پشتی تێبكاو یارمەتی تۆ نەدات و تەمبەڵیی و سستیی بكات لە بەرزكردنەوەی ئاینەكەت، ئێمە تۆیان لەسەر ئەكەین بە شایەت، ئەی ئەو كەسەی بە هەموو جۆرێ شایەتیی و هەموو دانیشتوانی زەوی و ئاسمانەكانت دەكەیتە شایەت، ئەوجا تۆ بێ منەتی لە یارمەتی ئەوان و بەندكردنیان بە گوناهی خۆیان.

(٢١٣)

## وتارێك باسی گەورەیی خودا ئەکات

سوپاس و ستایش بۆ خودای بەرزو بێ هاوشێوەی درووستکراوەکانی خۆی، لە سەرەوەی وەسفی پێناسەکارانەوەیە و ئاشکرایە بە هۆی دامەزراوە سەرسوڕهێنەراکانی، شاراوەشە بەو هەموو دەسەلات و توانایەی، کە هەیەتی لە بیرو بۆچوونی بیردۆزەرانی، زانایە بێ خۆ فێرکردن و زیادوکەم و زانستی لە ئەندازەی لایەکی دی، وەرنەگیراوە بە هەموو کارەکان بێ بیر کردنەوە و شاردنەوەی لە دڵدا، کە هەرگیز تاریکیی بەسەردا نایە و بەتیشك ڕوناك نابێتەوە، شەو ماندووی ناکات و ڕۆژ بە سەریدا نایە، بەچاو نابینرێ و زانستی بە وەرگرتنی دەنگ و باس نییە، درووود لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە خودا ڕوناکیی پێبەخشیوە و لە هەڵبژاردن و پاڵفتەکردنیدا خۆی دیاری کردووە، خودا بەهۆی ئەم نورەوە ڕەوشتە زبرەکانی پینە کردوە و بیروڕا ناپەسەندەکانی دووریوەتەوە، سەرکەوتووە بە سەر ئەوانەی، کە بەرەنگاری حەق و ڕاستییان کردووە و هەموو قورسەکانی ئاسان کردووە، زەوییە سەختەکانی شیکردووەتەوە بەڕادەیەك، لادان و ونبوونی لای ڕاست و لای چەپی نەهێشتووە.

(٢١٤)

## باسی گەورەییەکانی پێغەمبەر ئەکات (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ وەسفی زانایان و ئامۆژگاریی بە خۆپارێزیی دەکات

دوبارە شایەتی ئەدەم، کە خودا دادپەروەرانە داد ئەکا، فەرمانەکانی یەکجارییە، شایەتی ئەدەم، کە محەممەد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرو بەندەی خودایە و ڕەوانەکراوی بە حەقە و گەورەی بەندەکانییەتی، لەو ڕۆژەی خودا بەشەری کردووە بە دوو بەشەوە، ئەو لە باشترینە، خودا ماوەی نەداوە بەشی داوێنپیسیی لە نەژادیدا هەبێ، تاوانبار دەستی نەبووە لە نەسەبیدا.

ئاگادار بن خودا بۆ چاکە خەڵکی داناوە، حەق و ڕاستیی پایە و کۆڵەکەی

**هەیـە، بـۆ فەرمانبـەرداری دەسـتگیری درووسـتکردووە و، بـۆ هـەموو ئەنجامـدانی فەرمانێك، خـودا هاوکـارێکی دانـاوە بـە سـەر زمانیانـەوە و دڵـەکانیان دادەمـەزرێنێ، بەشی هەموو کەسێ ئەکات، کە داوای بکات و تیماری هەموو دەردەدارێکە، کە بیەوێ** چارەی دەردی بکات.

## پێناسەی زانایان

باش بزانن، کە بەندەکانی خودا دانراون بۆ پاراستن و هـەڵگرتنی زانـستەکانی **خودا داد و زۆر بە توندیی پارێزگاریی لێئەکەن و چاوگەکانیان پاك ئەکەنـەوە، بـۆ ئەوەی بەرەوانیی بـڕوا، هەمیـشە هـەوڵی پەیوەسـت و پەیوەنـد ئـەدەن بـۆ یـەك، بـە خۆشیی و خۆشەویستیی کۆئەبنەوە، هەمیشە بە جامی ژیریی و فام، ئاوی زوڵاڵ بـە یەك دەدەن و تینوێتیی یەکتر لائەبـەن، هـەرگیز گومـان لـە نێوانیانـدا نییـە و پەلـە ناکەن لە ناووناتۆرە لە پاشملە، بەم شێوەیە ژیریـی و عـەقڵیان دامـەزراوە، هـەر بـەم جۆرە خۆشەویستیی دەگۆڕنەوە و بەم جۆرەش هامۆشۆی یەکتر ئەکەن، ئەوانـە وەك تۆوی دانەویڵە شـەن و کـەوکراون و تـۆوی (بـەد)یـان لێ لابـراوە و بەرهـەمی چـاك و پاکیان هەیە.**

## ئامۆژگاریی بە خۆپارێزیی

دەی با هەموو کەس ئامۆژگاریی و پەند وەربگرێ و ترسـی ڕوداوی جـەرگبڕی **هەبێت، پێش هاتنی و هەموو کەس ئەوە بزانێ، تەمەنی زۆر کـەم و دانیـشتنی کـەم ماوەیە، لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێك ئەگوێزرێتەوە، دەبێ کار بکا بـۆ مـاڵی تـازەی و بزانـێ بۆ کوێ سەفەر ئەکات، بەهەشتی پان و بەرین بۆ خـاوەن عـەقڵی سـاغ و سـەلیم، کـە شوێن ئەوکەسە بکەوێ شارەزایەو ڕێگە بەڵەدە، دووربکەوێتەوە لەو کەسەی دەیخاتـە ناو چاڵەوە، هەمیشە ڕێگەی بێگرێ و چاڵ و چۆڵ بگرێ و، بـە چـاوی سـاغ و شـارەزا ڕێگە ببڕێ و گوێڕایەڵی دەلیلەکەی بێت، ڕێگـە ببـڕێ پـێش ئـەوەی هـەموو دەرگاکـان کلۆم بکرێ و پەردەی پەیوەندیی بڕۆخێ و، لەگەڵ پەشیمانیی و گەڕانەوە لەتاوان و گوناح خۆی بپارێزی، لە (لەکە)ی کەتنی خراپ، چونکە ڕێگەو ڕێبازی خۆی گرتووە نابێ لابدا.**

( ٢١٥ )

## دوعاو نزا

## كە هەمیشە بەم شێوە ئە پاڕایەوە

ستایش بۆ خودا، كە بەزیندوویی و بێ نەخۆشیی ڕۆژی لێكردمەوە، ڕەگ و ڕیشەم بە سەلامەتیی مایەوە و بەهۆی كارە خراپەكانم سزا نەدرام، كۆتایی بە ژیانم نەهات و پاشگەز نەبوومەتەوە لە ئاینەكەم و بێباوەڕ نەبووم لە پەروەردگارم و نامۆ نەبووم لە بیرو باوەڕم، ژیریم تێكنەچووە، سزاو تۆڵەكانی گەلانی پێشینم بە سەردا نەهات، ڕۆژم كردەوە بەندەیەكی كراوم و ستەمم لە خۆم كردوە، خودا تۆ بەڵگەت لەسەرم هەیە و من بیانووم نییە، ناتوانم هیچ بەدەست بێنم، جگە لەوەی تۆ پێت بەخشیووم و، ناتوانم خۆپارێزیی خۆم بكەم جگە لە پاراستنی تۆ، خودایە من پەنا ئەگرم بە تۆ كە هەژار بم لە سامانی تۆ یان ڕێگەم لێ ونبێ لەسەر ڕێبازی تۆ، یان لە ژێر دەسەڵاتی تۆدا ستەمم لێ بكرێ، یان بچەوسێمەوە لەو كاتەی هەموو فەرمان لەدەستی توانای تۆدایە، خودایە گیانم، كە یەكەم خۆشەویست و بەنرخمە لێ وەرگرە كە ئەكەم سپاردەیەك كە لامە و هەموو ئەو نیعمەتەشی، كە پێت بەخشیووم، خوایە پەنا ئەگرین، كە لە فەرمانی تۆ دەرچین، یان لە ئاینەكەت پاشگەز بینەوە، یان دوای هەواو هەوەس بكەوین، لە بری ئەو ڕێگە ڕاستە، كە تۆ بە ئێمەت ڕەوا بینیوە.

( ٢١٦ )

## وتارێك لە سیفین

لەپاش ئەوە... ئاگادار بن خودا حەقی منی لە سەر ئێوە داناوە بەوەی كە بووم بە ڕابەرتان و ئێوەش حەقتان لەسەرمە، وەك ئەوەی من لە سەر ئێوەم هەیە، ئەوەش بزانن، كە حەق لە بەجێ هێنانی دوو لایەنە، لە هەموو شتێك فراوانترە، بەڵام بۆ بەشكردن زۆر كەم مەودایە، ئەوەندەی بۆی هەیە ئەوەندەش لە سەریەتی و ئەوەندەی لە سەریەتی ئەوەندەش بۆی هەیە، تەنها كەسێ كە بۆی هەیەو لە

سەری نییە ئەوە خودایە، نەك خەڵك، حەقەکەش ئەومیە، کە بە فەرمانی ڕابین، چونکە خودا دەسەڵاتی ڕەهای هەیە بە سەر خەڵکەوە و لە پاداشتی بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی پاداشتی داناوە، تەنها بە بەخشندەیی خۆی بێ زۆر و سەپاندن و زیاتر، بۆ ئەوانەی فەرمانی جێبەجێ دەکەن.

## مافی سەردار و مافی خەڵك

ئەوجا... خودای پاك و بێگەرد هەندێ لە مافەکانی خۆی داوە بە هەندێك بە سەر هەندێکی تردا و ئەو مافانەی وا داناوە، کە هاوڕاز بن بە یەك و هەندێك بە هەندێك پێویست دەکات و هەندێك فەرز نابێ، جگە لە بە جێهێنانی هەندەکەی تر و، لە هەموو مەزنتر خودا لە مافەکانی خۆی مافی داوە بە سەردار لە سەر هاوڵاتیی و، مافی هاوڵاتیی لە سەر (والی) فەرز کردووە و دیاریی کردووە بۆ هەر لایەك، ئەوەش بوومتە یاساو ڕێسا بۆ پێکەوە ژیان و سەربەرزیی ئاینەکەیان، هەرگیز چاکسازیی هاوڵاتیی، بێ چاکسازیی سەردارییان نابێ و، چاکە و باشەی سەردار بەستراوە بە چاکرەفتاریی هاوڵاتییەوە.

هەرکات هاوڵاتیی مافی تەواویدایە سەرگەورەکانی و، سەرگەورەش بە هەمان پێودانگ مافیدایە ڕەعیەتی خۆی، ئەو کات حەق پایەدارە، ئاینی پەیڕەوە، نیشانەی دادە و دادپەروەریی و ساڵ و زەمان بە شێوەی دروست دەڕوا و بەو زەمانە دەڵێن باش و ئەو کاتە ئومێدی مانەوەی دەسەڵات هەیە و، چاو چنۆکیی دوژمن بێئومێد دەبێ و پاشەکشە دەکات.

ئەگەر هاوڵاتیی زاڵبوو بە سەر گەورەی خۆیدا، یان گەورە ستەمیکرد لە ژێر دەستەی خۆی، ئەو کاتە گوتارەکان لە یەك دەترازێن و نیشانەی ستەم و بێدادیی دەرئەکەوێ و، گزوگیا و گیاکەڵە لە ناو ئایندا پەیدا ئەبێ، میانڕەویی پەیڕەوکراو شەقام بە جێ دەهێڵێ، ئەو کاتە کارو هەرمان بە ئارەزوو دەبێ و حوکمی شەرع ڕادەگیرێ و بیماری دەروونیی گەشە دەکات و زۆر ئەبێ، ئەو کاتە ڕاگرتنی مافی گەورە بە نامۆ ناژمێردرێ، هەر وەك گەورە بە بەتاڵ دادەنرێ، هەر ئەو کاتە پیاوچاك و پاك بەکەم دادەنرێ و هەرچی و پەرچی و پیاوخراپ بە بەرز تەماشا دەکرێ، ئەو کاتەش سزاو تۆڵەی خودا لە سەر خەڵك زۆر قەبە دەبێ، لەبەر ئەوە

زۆر پێویستە هاوڕاز و هاوکار و هاوڕاوێژ بن لە نێوان خۆتان و یارمەتیی یەکدیی بدەن، هیچ کەس" هەر چەندە زۆر بە تەنگ ڕەزایەتی خوداوە بێت و زۆر تێکۆشەر بێ لە کاری باش" ناتوانێ بگاتە ئەو ڕادەی خودا شایستەی پێدا بۆ فەرمانبەرداریی خۆی، بەڵام پێویستە حەقی خودا لە سەر بەندەی خۆی جێبەجێ بکرێ، بەپێی توانای خۆی و هاوڕازیی و هاودەنگیی لە نێوان خۆیاندا، وە هیچ کەس "هەر چەندە لە ڕاست وتن و گەیاندندا پلەی بەرز بێ، وە لە ئاینداریيدا جێگە دار بێ" ناتوانێ پاداشتی ئەو هاوکارییەی خودا بداتەوە کە پێیداوە بۆ ئاسانکردنی باری سەرشانی و ئەنجامدانی حەقی خودا، هیچ کەس "هەرچەندە خەڵك بە بچووکی دابینێن و بە چاوی سووك تەماشا بکرێ" ناتوانێ یارمەتیی بدرێ و هاوکاریی بکرێ.

لەو کاتەدا یەکێ لە یارانی زۆر ستایشی کرد و بەگوێ بیست خۆی بۆ فەرمانی دەرخست، پێشەوا فەرمووی: لە پاداشتی گەورەیی و مەزنی خودا و بەرز ڕاگرتنی لە دەروونی خۆیدا دەبێ هەموو کەس خۆی بەکەم و بچووك دابنێ، "لەبەر گەورەیی خودا" هەموو کەس، جگە لە خودا و لەوە شایستەتر ئەو کەسەیە، کە نیعمەت و نازی خودای زۆری پێدراوە و زیاتر چاکەی خودای بە سەرەوەیە، چونکە هەتا نیعمەتی خودا گەورەتر بێت، حەقی خودا لە سەری گەورەتر دەبێت، لە هەموو شت گاڵتەجاڕ زیاتر ئەو کەسەیە لە کاربەدەستان لای پیاوچاکان کەوا نیشان بدرێ، کە حەزی بەگەورەیی و شانازیی و بە خۆنازیی هەیە، زۆر پابەندی لە خۆباییە، من زۆرم پێناخۆشە، کە بەزەینی ئێوەدا بێت، کە حەزم بە پیاهەڵدان و مەدح و سەنایە، من وانیم "سوپاس بۆ خودا" خۆ ئەگەر لە دڵەوە حەزم لەوەبێ، دەبێ وازی لێبێنم، لەبەر خۆبەکەم زانینم بەرامبەر گەورەیی و مەزنیی خودا، چونکە گەورەیی هەر شایستەی ئەو خودایە.

لەوانەیە خەڵك بەلایەوە شیرین بێ، لەکاتی تاقیکردنەوە و ئەزموونی ناڕەحەتییدا، مەدح و سەنا بکرێ، بەڵام تکام وایە بۆنی مەکەن، نەوەك لە خۆم بایی بم و دەرچم لە ئەنجامدانی ئەرکی خۆم، لە ڕووی ئێوە و خودادا و نەتوانم ئەنجامی بدەم، یان ئەرك و پێویستیی سەرشانم بەجێ نەگەیەنم، حەزم نییە وەك گەورە ستەمکارانم بانگ بکەن و نازی قەبەم لێبێنن، پێمخۆش نییە بەحەق و ناحەق بدەن بە ئەستۆدا و ڕوپامایی بکەن بۆم، حەز ناکەم ڕیایی و بە ئەستۆدانم لەگەڵدا

ڕەفتار بکەن، وا گومان مەبەن باری شانم قورسە لە داواکردنی مافی خۆم و، خۆم بە گەورە دانێم، چونکە ئەو کەسەی مافی خۆی بەقورس بزانێ، یان دادی خۆی بەقورس دانێ، کار بۆ کردنی لە سەر شانی قورسترە، هەرگیز لەوتنی وشەی حەق کەمتەرخەم مەبن، یان ڕاوێژکاریی دادپەرستبن، چونکە من خۆم بەدوور نازانم لە هەڵە و زۆر دڵنیانیم لەکاری خۆم، مەگەر خودا بەفریادم بگات، لە خۆم زیاتر بە دەسەڵاتە، چونکە من و ئێوە بەندەو کۆیلەی خودایەکی پەروەردگارین، کە جگە لەو کەسیتر شایستەی خودایی نییە، دەسەڵاتی لە ئێمە زیاترە بە سەر خۆماندا، هەتا خودی خۆمان، ئەتوانێ دەربازمان بکات لەو ناخۆشییەی بە سەرماندا داهاتووە، کە پاش گومڕایی ڕێگەمان نیشاندراوە، چاومان بینایە پاش کوێریی.

( ٢١٧ )

## وتارێك لە بارەی سکاڵا و گازندەی لە قوڕەیش

خودایە، داوات لێئەکەم بۆ دوژمنایەتیی قوڕەیش، چونکە ئەوان نێوانی خزمایەتیی منیان پساندووە، کاسەی منیان قڵپکردووەتەوە، بە کۆدەنگ دژی مافی من وەستانەوە و هاتن بەگژما، کە من لە هەموو کەس زیاتر شایستە بووم بەو کارە و، وتیان تۆ دەبێت لەحەقدا بەشت هەبێ و لە حەقدا بێ بەش بیت، دەبێ ماوەیەك خەفەتبار بیت و بمری بە داخ و کەسەرەتەوە، ئەوە بوو منیش تەماشا ئەکەم هاودەمم نییەو هاوکارم نییە و کەس نییە بەرگریم لێ بکات، یارمەتیدەرم نییە، تەنها خانەوادەی خۆم نەبێ، منیش پێمخۆش نەبوو هەموویان بدەم بە کوشت، لەبەر ئەوە پووشم لە چاوم هێشتەوە و تفی خۆم قوت دایەوە بە سەر گیرانی گەرومدا و، خۆمگرت بە خواردنەوەی ڕقی خۆمدا، کە وەك گوژاڵکە تاڵبوو لە سەر دڵ و دەروونم، ئەوەندە ئێشی هەبوو وەك دەمی تیژی چەقۆ.

## لە باسی ڕۆیشتنی بۆ بەسرە

فەرمووی: والییەکانم بڕۆنە لایان و ئەمین سندوقەکانی گەنجینەم، کە لە دەستمدایەو لە سەر هەموو دانیشتوانی بەسرە پێویستە گوێڕایەڵم بن و بوون، پەیمانیان پێداوم، ئەوانە کە پەلاماریان داون، کۆمەڵیان تێکداون و یەکێتیی و

یەکرپیزییان ڕوخاندن و پەلاماری دۆستەکانی میان داوە و هەندێکیان کوشتوون بە جەورو ستەم، هەندێکیان دانیان گرتووە بە سەر شمشێرەکانیان و بەو شێوە ماون، هەتا ڕاستگۆیانە دەچنە لای خودای خۆیان.

( ٢١٨ )

## وتارێك کە چووە سەر لاشەی تەڵحەو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەتابی کوڕی ئەسید لە جەمەل

ئەوە باوکی محەممەدە، کە لێرە بەغەریبیی کەوتووە، بەڵام قەسەم بەخوا، پێمخۆش نەبوو لە قوڕەیشدا کوژراو هەبێ، لە ناو سکی ئەم قامیشەڵانە من تۆڵەی خۆم لە عەبدولمەناف سەندووەتەوە، بەڵام گەورەکانی نەوەی (جەمح) لە دەستم دەرچوون، ئەوانە ملەقووتەیان بوو بۆ کارێ، کە شایستە نەبوون بۆی، ئەوە بوو ملیان شکاو گەردنیان پەڕی و پێی نەگەیشتن.

( ٢١٩ )

## وتارێك باسی ڕێبواری ڕێبازی خودا ئەکات

ئەم ڕێبوارە ژیریی و فامیی بەزیندویی ڕاگرتووە، هەوا و نەفسی مراندووە، هەتا وای لێهاتووە قایمایی تەنکبووە، زبریی ناسك بووە، تیشکێ لەبەر چاوی ڕوناکیی داوە و ڕۆشنی کردووەتەوە، ڕێگای بۆ ڕوناك کردووەتەوە و لە سەر ڕێگەی ڕاستیی داناوە، ئەم دەرگاو ماڵ و مەقامە داویەتە دەستی ئەوی تر، هەتا گەیاندویانەتە دەرگای بێومیی و سەلامەتیی و شوێنحەوانەوە و پشوو، هەر دوو پێی بە ئارامیی لەشی لەشوێن هێمنیی و ماندوو دەرچوون داناوە، چونکە ئیشی بە دڵی کردووە و خودای خۆی ڕازی کردووە.

(٢٢٠)

## وتارێك، له پاش خوێندنه‌وه‌ى ئايه‌تى

## (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ * حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ)،

## (شانازيتان به فره‌يى (ماڵ) و (مناڵ)، ئێوه‌ى به‌خۆيه‌وه خافڵاندوه هه‌تا هه‌مووتان بوونه ميوانى گۆڕستان)

فه‌رمووى: ئاى...! چه‌ند مه‌به‌ستى تێدايه! چه‌نده بۆ دوور بيرو هۆشى تێدايه! چه‌نده ديده‌نييه‌كى بێئاگايى تێدايه! چه‌نده مه‌ترسيه‌كى سامناكى تێدايه، چه‌نده زوو پێشبينى خۆيان له بير كردووه، چه‌ند به شانازييه‌وه و له دووره‌وه بۆيان ئه‌ڕوانن، ئه‌وه چۆن خۆ هه‌ڵكێشانێكه به باو باپيرانيانه‌وه! يان به زۆرى له ناوچوانيان خۆيان به زۆر دادەنێن، بۆ چه‌ند لاشه‌يه‌كى بێ گيان ده‌گه‌ڕێنه‌وه و له بزوتن و جوڵه كه‌وتوون، خۆ ئه‌وانه زياتر بۆ په‌ند و ئامۆژگاريى باشترن، هه‌تا جێگه‌ى شانازى بن، ئه‌وانه به نه‌ويكردنى سه‌ر له به‌رده‌ميان ژيرانه‌تره، هه‌تا مايه‌ى خۆهه‌ڵكێشان و شانازى بن، ئه‌وانه به چاوگه‌لێكى شه‌وكوێر و مزمۆڵه‌وه ته‌ماشا ئه‌كه‌ن و وردئه‌بنه‌وه، له گه‌رمه‌ى نه‌فاميى و سه‌رلێشێواوييدا ئه‌وانه‌يان هێناوه‌ته‌وه ياد.

ئه‌گه‌ر ئه‌و خاك و زه‌مينه بهێننه زمان، له‌و هه‌واره كۆن و چۆڵوهۆڵه‌دا و له‌و به‌هاره هه‌واره چۆڵه‌دا بۆيان باس ده‌كه‌ن و بۆيان ده‌گێڕنه‌وه، ئه‌وانه‌ى ئێوه له سه‌ر زه‌وى به سه‌ر لێشێواويى و گومڕايى ڕۆيشتن و ئێوه‌ش دواى ئه‌وان به نه‌فاميى و گێليى ده‌چن، ئێوه‌ش هاتووچۆيان ده‌كه‌ن و پێئه‌نێن به‌كاسه‌ى كه‌لله سه‌ريانداو ده‌تانه‌وێ له لاشه‌ى ڕزيو و پوتركاوياندا شتێك شين بكه‌ن و، له‌وه‌ى ئه‌وان فڕێياندداوه بله‌وه‌ڕێن و له‌و شوێنه نيشته‌جێ بن، كه ئه‌وان كاول و وێرانيان كرد، ڕۆژانێك ماوه له نێوان ئێوه و ئه‌واندا، كه شيوه‌نگێڕان و ماته‌مگران له سه‌ر ئێوه‌ش به كوڵ بگرين.

ئه‌وانه دواپێشينه‌ى ئێوه‌ن و ئاوكێشه‌كانى ئێوه‌ن، له سه‌ر قه‌مى ئاوخواردنه‌وه، كه پێش ئێوه جێگه‌ى به‌رز و مه‌يدانى سوارچاكيى وگۆڕه‌پانى ڕمبازيى و ديوه‌خانى

پڕ لە پادشا و ڕەعیەتدا، لە ناو سکی گۆڕدا ڕێگە دەبڕن، لە ژێر دەسەڵاتی خاکدا گۆشتی پێوە نەهێشتوون و هەمووی خواردووە و خوێنی خواردونەتەوە لە بۆشایی و کونوکەلەبەری گۆڕیاندا وشك بوونەتەوە، جووڵەیان نەماوە بە بوومەلەرزە و بوونەتە کووپەی (دراو) و نادۆزرێنەوە، کارەسات و ناخۆشیی ئەم دنیا تووشی ترس و دڵە لەرزەیان ناکات، گۆڕانی بارودۆخ تووشی خەفەتیان ناکات،گوێ نادەن بە ڕاوەشاندنی زەویلەرزە وگوێبیستی ڕەشەبا و زریان نابن، کۆمەڵە بزرێکن چاوەڕێی هاتنەوەیان لێناکرێ و شایەتگەلێکن، کە ئامادەی شایەتیی نابن، خۆ ئەوانەش کۆمەڵیان جەم بوو، پرش و بڵاو کران، هاودەم و هاوڕازی یەك بوون، لە یەك دوورکەوتنەوە، لە بەر ئاشنایەتیی و دووریی گەڕەك نییە، کە هەواڵیان نییە و شوێنەواریان کەڕولاڵ بووە، بەڵام جامێ دەرخواردیان دراوە و لە گوێی خستوون و بێ دەنگی کردوون و گوێیانی کپ کردووە و لە جوڵەی خستوون، ئەوانە یەکەم ڕوانین و باسکردنیان وا دێتە بەرچاو، کە کوشتەی خەون و هاوسێی بێدەنگ و سەدان و دۆستگەلێکن، کە هامەشۆی یەکتر ناکەن، دەسکی پەیوەندیی یەکترناسین پچڕاوە لە نێوانیاندا و، پردی برایەتییان لە نێواندا پساوە، هەموویان لە ژووری یەککەسیدان و هەمووشیان پێکەوەن، دەنگیان لە یەك وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دۆست و هاوڕێ بوون، نە بەیانیی ڕۆژباش لە یەکتر ئەکەن، نە ئێواران یەکتر ئەدوێنن، کام شەو و ڕۆژ ئەوانە کۆچیان تێدا کرد، کە شەویان ڕۆژی نییە و ڕۆژیان شەوی نییە، بە چاویان لە ماڵەکانیاندا کارەساتی ترسناك و ناخۆشیان دیوە، فرەتر لەوەی لێی دەترسان، دیاردە و ڕوداوەکانیان زیاتر هاتە بەرچاو لەوەی، کەدایانناباوو بۆ خۆیان، هەردوو ئەنجامی کۆتایی بەهەشت و دۆزەخ بۆیان ئامادە کراوە، بەختەوەریی و کوێرەوەرییان لە بەرچاوە، ئەگەر بێنەگۆو قسە بکەن ناتوانن، ئەوەی ئەیبینن بۆیان باس بکەن، ئەگەر ئاسەواریان کوژاوەتەوە، هاڵ و هەواڵیان بڕاوە و نەماوە، بەڵام بۆ پەند و ئامۆژگاریی وەرگرتن لەبەرچاون، هەستی بیستن و گوێگرتن لە عەقڵ و فامەوە شتیان لێوەرئەگرێ، بە بێدەنگیی قسە ئەکەن و زمانحاڵیان ئەڵێ: ئەو دەموچاو و ڕوومەتە گەش و جوانە، چۆن ناشیرین و تەڵخ بووە، ئەو لەشولارە نەرم و ناسك و لووسە، چۆن پوکاوەتەوە و بەرگی ڕزیو و پەڕپووت و پینەکراویان لێئالاوە ! چۆن تەنگیی شوێنپاڵدانەوە لەشی هێناونەتەوە

يەك و چۆڵەوانيى بوومتە ميراتيان، چۆن بان و سەربان ڕوخاوە بەسەر شوێن حەوانەوەمان، هەموو جوانى لەشمان پووكاوەتەوە و ڕزيوە، شێوە و ئاژەمان تێكچووە و لەم شوێنە تەنگەلانەدا وا ماوينەتەوە، بەتەما نين ڕۆشنايەك بۆ ئەم ناخۆشييەو فراوانيەك بۆ ئەم تەنگلانە هەبێ.

ئەگەر لە مێشكى خۆتدا بۆ نموونە بگەڕێيت، پەردە لە سەر چاو و بنێيت لابدرێ و ورد بيتەوە، چۆن ئامێرى بيستن دەمى لە كرم و مێروودا وشكبوومتەوە و، لە بيستن كەوتوون و چۆن چاوەكانى بەگڵ و خۆڵ وەك كل ڕشتووە و چووە بە ناودا و ڕۆچووە، چۆن ئەو زمانە پاراو و بەرەڵايە پارچەپارچە كراوە و ئەو دڵانە چۆن لە جووڵە كەوتوون و سارد بوونەتەوە لەناو قەفەزەى سنگدا، پاش ئەو هەموو هۆشياريى و ئاگاداريى و بەئاگاييە، چۆن ئەو دەست و پەنجە ناسكانە ڕزيو و پوكاونەتەوە و ناشيرين بوون !!، ئەو هەموو ڕێگەى دارِزان و داوەرينەيان بە سەردا هاتووە و خۆيان بەئاسانيى داوە بە دەستەوە، نە دەستەكان تواناى بەرگرييان ماوە، نە دڵەكان حەزيان لە ترس و هاوار و پاڕانەوە هەيە، ئەگەر بەو شێوە لە بەرچاو بڕوانى، دەبينى ئەو دڵانە چەندە خەفەتبارو كۆسكەوتوون و، ئەو چاوانە چەندە پووش و تۆز و خۆڵيان تێدايە، ئەوانە لە هەموو ناخۆشيى و تەنگ و چەڵەمەيەكدا، چ حاڵيان هەيە و ناتوانرێ ئازوگوێزى پێ بكرێ، چەندە نارەحەتيى و داماوييان هەيە، بۆت ڕوون نابێتەوە.

ئاى چەندە لاشەى گەورە زەوى خواردى و، چەندە ڕەنگى شۆخ و شەنگ و لە دنيا بەناز پەروەردە تەڵخبوون، چەند شازادانە بەخێوكراو گۆڕاوە و، كاتى دڵتەنگيى خۆى بە سەيرو سەفاوە بردە سەر و سەرى دەنا بە ڕابواردنەوە!! ئەگەر ناخۆشيى بۆ پێش بهاتايە نەوەك نەرم و ناسكى ژيانى كەم بێتەوە، ڕەزيليى ڕوو بكاتە گەمە و گاڵتەو يارييەكانى، لەو ساتەوەختەى، كە لە پێكەنين و كەيف و ئاهەنگ و شاديدا بوو، دنيا بە دەميەوە پێدەكەنى و ئەم بەدەمى دنياوە پێدەكەنى و، لە ژێر سێبەرى ژيانێكى نەرم و گەرم و چەوردا دەژيا، زەمانە پێشێلى كرد و درِكى زريسك لە لەشى ئالا و ڕۆژان و شەوان هێزيان لێبرِى و مەرگ لە حەشارگە و داوگەوە لە چاوەڕوانيدا بوو بۆى و لە نزيكەوە خەم و خەفەت چاوشاركێى لێئەكرد و بەنەرميى دەيدواند و ئەو هەموو دەرد و بيمارييەى بەسەردا هێنا، لەو كاتەى زۆر دڵنيا بوو لە لەشساغيى

و تەندروستیی خۆی و حەکیم و پزیشك زۆر بەدڵنەوایی، گەرمیی و تای لەشیان دەگۆڕی بە فێنکیی و ساردیی و گۆڕینی سەرمای بەگەرما، کەچی یاخیبوونی گەرمای بە ساردیی نەکوژاندەوە و نەیتوانی فێنکیی بە گەرمیی بجوڵێنێ و نەیتوانی نەزمی بەدەنی ڕاگرێ لە نێوان بەرزیی و نزمیی لێدانی دڵ و بەخشینی هیوای چاکبوونەوەی، کە هەموویان دەستەوسان ماون لە کەمکردنەوەی دەرد و بیمارییەکانی و پزیشکەکانی تووشی حەپەسان و سەرسوڕمان کرد و خزم و کەس و کاری بێ توانا بوون لە بەیانی جۆری نەخۆشییەکانی و زمانیان لاڵ بوو لە هۆکاری بیمارییەکەی لە ئاستی ئەوانەی هەواڵپرسیان دەکرد لە حاڵ و ئەحواڵی نەخۆشییەکەی و ناکۆك بوون لە وەڵامدانەوەی نهێنیی نەخۆشییەکەی و هەندێ لای وابوو لەو دەردە ڕزگاری نابێ و هەندێ لای وابوو نزیکە چاك بێتەوە و هەندێ خۆی ئامادەکرد بۆ دڵدانەوە و پرسە و سەرخۆشیی و سەبووریی خۆی بە مردووەکانی پێش ئەم دەدایەوە.

ئا لەو کاتەی ئەو لەسەر باڵی جیابوونەوە بووە لەم دنیایەو بە جێهێڵانی دۆست و خۆشەویستەکانی، هەر لەو کاتەدا کارێ وەپێش هات و بیماری جەرگبڕو هەناسەساردیی بەسەر هێنا و، زیرەکیی و ژیریی سەرلێشێواو کرد و، تەڕیی و نەرمیی زمانی وشك بوو، لە ئەنجامدا زۆر کەس، کە مەبەستی بوو وەڵامێ وەرگرێ، بێ توانا بوو لە وەرگرتنی وەڵام و بانگکردنی دڵزامارێ بۆ بیستنی وشەیەك لێی کەڕ بوو، لە ئاستی لەو گەورەی، کە ئەمی بە مەزن دادەنا و بچووکێك، کە جێگەی بەزەیی ئەم بوو، مەرگ ئێش و ئازار و ژانگەلێکی وای هەیە، کە وەسف ناتوانێ بەیانی بکات، یان بە عەقڵ و فامی خەڵك ڕێك بکەوێ و بگونجێ.

( ٢٢١ )

## وتـارێك پاش خوێندنی ئەم ئایەتە

( رِجَالٌ لاَ تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلاَ بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللّهِ )

## ( پیاوانێ کە نە بازرگانی و نەسەودا یادی خودا و نوێژ کردن و زەکاتدانیان لەبیرنابات )

فـەرمووی: خـودای پـاك و بـەرزو بێگـەرد یـادی خـۆی کـردووە بـە پاککـەرەوە و ڕۆشنکەرەوەی دڵەکان، لە تۆزو چڵك و، گوێ سووك ئەکات بـۆ بیـستن پـاش قورسـیی و، چاوەکان ڕوون ئەکاتەوە پاش کزیی و شەونەبینین و جڵەوی پێ شل ئەکات، پاش بێ فەرمانیی و لاساریی، هەمیشە خودا گـەلێ فراوانـی بەخـشندەکانی لـە چاخێکەوە بـۆ چـاخێك و لـەکاتی نـەهاتنی پـەیام و سـروش، لـەو نێوانـەداو لـە چـۆڵبوونی بانگەوازی خوداپەرستیی جۆرە بەندەیەکی هەبووە، کە لە دەروون و دڵ و هەسـتیان جـۆرە ئیلـهامێکی پێبەخـشیون و گوتاریـداوە بـەفام و عـەقڵ و هۆشـیان، چـرای بـۆ ڕۆشنکردوون لەگوێ و چاو و دڵدا، کە خەڵکیان ئاگادار کردووە لـەیادی خـودا و ڕۆژە پرشـنگدارەکانیان وەبـیر هێنـاون و، ترسـیان ناوەتـە بـەریان لـەو شـوێنانەی خـودا ئامادەی کردووە بۆ خەڵك بە شێوەی شارەزا و چاو ساغیی نـاو بیابانـەکان بـۆ ڕاسـت ڕێکردن و میانـەو ڕوون ڕێگـەگرتن، خـەڵك و ڕێبواریـان شـارەزا کـردووە و مـژدەیان پێـداون بـە ڕزگاربوونیـان و لا نـەدان بەڕاسـت و بەچـەپدا و، دەسـتیان گرتـوون بـۆ ڕێگەی خودا و هۆشیار و ئاگاداریان کردوون لە خۆف و تۆقاندن، بـەو شـێوە بونەتـە چرای ئەو تاریکستانە و دەلیل و شارەزای ڕێگە لارو وێرەکان.

ئەو یادەی خودا کەس و ئەهلی خۆی هەیە، کە لە جیاتی دنیادا هەڵیان گرتووە، نە بازرگانیی و نەکڕین و فرۆشتن لای نەداون لەیاد کردن، ڕۆژانی ژانیان بەو یادەوە بڕیوە، دەم بە هاوار بوون، لادان لە کارە قەدەغە کراوەکان لـە خـوداوە و داویانـە بـە گوێی بێئاگا و کەمتـەرخەمەکانـدا، هەمیـشە کاریـان فـەرمان بـووە بـەداد و خۆشـیان پەیڕەویان کردووە و، (نا)یان کردووە لە خراپە و خۆشیان دوورەپەرێز بوون لێی، وا دەبینـران، کە وازیـان لـە دنیـا هێنـاوە بـۆ ئـەو نیـا، هـەر لـە دنیـادا لەبـەر ئـەوە ئـەو

دیویان لەبەر چاوو بوو، ئاگاداری خەڵكی بەرزەخ و نێوان ئەملاو ئەو لاو درێـژیی مانەوەیان لەوێ و قیامەت خۆی نمایش كـردووە بۆیـان بـە هـەموو ڕازو بەڵێنـەكان، ئەوانیش مەردانە بۆ خەڵكیان ڕوونكردووەتەوە بە شێوەیەك وا دەزانـرا ئـەوان شـت ئەبینن، خەڵك نایبینـێ و شـت ئەبیـسن خـەڵك نایبیـستێ، ئەگـەر بـە عـەقڵی خـۆت شێوەیان لەبەرچاو بگـری، زۆر بـە جـوانیی ئـەو شـوێن و جێگـە چاكەیان دەبینـی و كۆڕو دانیشتن و گردبونـەوەیان وەك فەرمانـدەی سوپا ناونیـشان و نامـەی كرداریـان لەناو دەفتەر تۆمار كراوە و، لێپرسینەوە و توێژینـەوەیان لـە سـەر كـراوە و، خۆیـان دادوەری خۆیـان بـوون لـە هـەموو ورد و درشـت و كارێـك، كـە پێیـان سـپێراوە و كەمتەرخەمییان تێدا كـردووە، یـان قەدەغـە كـراوە لێیـان و كەمتەرخـەم بـوون لـە ئاسـتی و كـۆڵی قورسـی خۆیـان لـە سـەر پـشتی خۆیـان نـاوە و، مانـدوو بـوون لـە هەڵگرتنی، لە بەر ئەوە گوێت لە گریانی هێواش و لـە سـەرخۆیانە و هەنـدێ بـانگی گریانی بێ شەرمیان بەرز بووەتەوە، بە دەنگی چوتەو نزم لەگەڵ خوای خۆیان قسە ئەكەن و لە سەر بەردی پەشیمانیی و دانپیانـان بـێ ئـۆقرە دانیـشتوون، ئەگـەر بـەم شێوە وێنەیان لە زەینی خۆتدا بكێشی، دەبینی ئەوانە ئاڵا و نیشانەی ڕێگان و چرای شەوی تاریك و ترسن، فریشتەكان لەدەوریان كۆبوونەتەوە و ئارامیی و هێمنیی و لە سـەرخۆییان لێـدەبارێ، دەرگـای ئاسمـان كراوەتـەوە بۆیـان و جێگـە و شـوێنیان بـۆ ڕێككراوە، بە هەموو ڕێزو قەدرێكەوە خودا ئاگاداری كـردوون، كـە بـۆ ئەوانـە خـودا ڕازییـە لـەكاریان و سـوپاس كـراون لـە ڕووی جێگـە و ڕێگـەوە، سـروەی گفتوگۆیـان دێتەگوێ و هەستی پێئەكەن لە خوداوە و، خودا لێبوردنی بۆ لابردنـی بێدەسـەڵاتیی و هەژارییان پێ بەخشیوون، چونكە ئەوانـە خۆیـان بـە بارمتـەی بەخـشندەی خـودا دانـاوە و، خۆیـان بـەدیل و دەستبەسـەری ئـەو زانیـوە و، دڵیـان زامـی درێژخایـەنی خـودای تێـدا بـووە و، گریانـە زۆرەكـەی چـاویان ئـەمڕۆ، لـە هـەر دەرگایـەك، كـە ئارەزووی چوون بۆ لای خوای تێدا بـێ ئـەوان دەسـتیان داوە لـە قوڵفـەی بـۆ لێـدانی داواكارن لای كەسێك، كە دەرگای بەخشندەیی فراوان و كراوەیەو، هەتا ئێـستە كـەس ناهومێـد نـەبووە لـە بـەرقاپی ئـەودا، كەواتـە خـۆت لێپرسـینەوە بكـە لـە خـۆت، خەڵكێكە جگە لە تۆ خۆی پرسی خۆی هەیە بۆ خۆی نەك بۆتۆ.

(٢٢٢)

## وتارێك له وه‌ختی خوێندنی ئه‌م ئایه‌ته‌دا

## ( يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ )

## ( ئه‌ی به‌نی ئاده‌م چی تۆی له‌ حازری په‌روه‌رنده‌ی[٥] خۆت و به‌خشنده‌بادی هه‌وا كرد ؟ )

فه‌رمووی: ئینسان پوچه‌ڵترین به‌رپرسه‌ له‌ ڕووی به‌ڵگه‌وه‌، له‌ خۆبایترین به‌هانه‌بڕاوه‌ له‌ڕووی بیانووه‌وه‌، زۆر شانازی ئه‌كات به‌ نه‌فامیی و نه‌زانیی خۆیه‌وه‌، ئه‌رێ ئه‌ی مرۆڤ، چی وای لێكردووی ئه‌وه‌نده‌ ئازا و چاونه‌ترس بی بۆ گوناح و سه‌رپێچیی؟ چی ئه‌وه‌نده‌ له‌ خۆبایی كردووی به‌رامبه‌ر به‌په‌روه‌ردگارت؟ چی وا دڵنیا و بێ باكی كردووی به‌ فه‌وتانی نه‌فسی خۆت؟ له‌و نه‌خۆشیی و ده‌رده‌دارییه‌ چاكنه‌بویته‌وه‌ و له‌و خه‌وه‌ خه‌به‌رت نه‌بووه‌ته‌وه‌؟ ئه‌وه‌ به‌زه‌یی و ڕه‌حمت بۆ خۆت نییه‌ به‌قه‌ده‌ر به‌زه‌ییت بۆ كه‌سی تر؟ زۆر جار ئه‌بینی یارۆی به‌رخۆری گه‌رم و ده‌چی سێبه‌ری بۆ ئه‌كه‌ی، یان كاورای ئازاردار، كه‌ به‌ ئێشه‌وه‌ ئه‌ناڵێنێ و باری له‌شی گرانه‌ و، ده‌ست ده‌كه‌ی به‌ گریان بۆی و به‌زه‌ییت پێدا دێته‌وه‌!! ئه‌ی چی وای لێكردوی ئه‌وه‌نده‌ به‌ ئارام و خۆگربیت بۆ ده‌ردی خۆت؟ ئازا و چاو قایمی له‌ لێقه‌ومانی خۆت و پرسه‌ و سه‌ره‌خۆشیی و گریانت نییه‌ بۆ خۆت، ئه‌ویش له‌ هه‌موو كه‌س لای تۆ به‌ڕێزترو مه‌زنتره‌، ئه‌رێ ئه‌وه‌ چۆن هاتنی كێشه‌و ڕق به‌ كتوپڕیی خه‌به‌رت ناكاته‌وه‌؟ كه‌ خۆت هاویشتووه‌ته‌ ناو گوناح و تاوانی گه‌وره‌ و به‌ په‌له‌ی به‌رز هه‌نگاوی بۆ ده‌نێیی!.

كه‌واته‌ تیماری ده‌ردی سارد و سڕی دڵی خۆت بكه‌، به‌ لێبڕانی توند و به‌ لابردنی خه‌و له‌ چاوه‌كانت، به‌ خه‌به‌ربوونه‌وه‌ و هۆشیاربوونه‌وه‌! گوێڕایه‌ڵی خوای خۆت به‌ و خۆت به‌ یادی ئه‌و هێمن بكه‌ره‌وه‌، بێنه‌ به‌رچاوی خۆت، كه‌ تۆ پشتت له‌و هه‌ڵكردووه‌، ئه‌و ڕووی كه‌ره‌می له‌ تۆیه‌ و بانگت ئه‌كات، هه‌تا لێت ببورێ و له‌ ناو نازو نیعمه‌تی خۆیدا داتبنێ، ئه‌وه‌یه‌ گه‌وره‌یی خودای به‌توانا، چه‌نده‌ به‌ڕه‌حم

[٥] په‌روه‌رنده‌ : په‌روه‌ردگار.

و بـەزەیی و کەرەمـەا ئەوەشـە خـواریی و پەسـتیی لاواز و بێتوانـایی چـاو قـایم و نەبەرد لەسەر گوناح و بێگوێی، خۆت ئـەبینی لـە پـەنای ئـەودا نیشتەجێی و لـەناو بەخـشندەیی و نیعمـەتی ئـەودا خـۆت ئەگـەوزێنی، لەگـەڵ ئەوەشـدا بەخـشینی لێنـەبڕیوی و پـەردەی لەسـەرت لانـەبردووە، نـەك هـەر ئـەوە بـەڵكو بـە قـەدەر چـاوترووکانێك ئـەو نیعمەتـەی پێیـداوی نەیگرتووەتـەوە و، ئـەو گوناحـەی بـۆی داپۆشـیوی ئاشـکرای نـەکردووە، ئـەو بەڵایـەی لـە سـەری لابـردووی دوبـارەی نەکردووەتەوە، گومانت چۆنە ئەگەر بە فـەرمانی بکەی!! سوێندم بـە خـودا ئەگـەر سیفەتی تۆ لە یەکێك لەو دوو هاوتا بـەهێزو دەسـەڵات و دوو هاوتەریبـە لـە توانـادا بوایە، تۆ یەکەم دادوەر دەبووی لە سەر خۆت، کە ئەو سیفەتە زۆر بـەد و خراپـە و لە کارە ناڕەواکانە.

با بەڕاستی منیش بڵێم: دنیا سەرکەشی نەکردووی، بەڵام تۆ خۆت بە دنیـا بـای هەواکردووە و دەستخەڕۆ بویت، گۆڕانی دنیـا و پەیـدا بـوونی پەنـد و ئامۆژگـاریی و ئاگادارکردنـەوەت لـە سـەریان لـە بەرچـاوتە و زۆر دادپـەروەرە لـە بەڵێنـەکانی، لـە بابەتی هـاتنی بـەڵا و کارەسـات بـە سـەر لـەش و کەمبوونی توانـاو هێـزت، دنیـا زۆر ڕاستگۆیانە و دادپەروەرانە لەگـەڵ تۆیـە و درۆت لەگـەڵ ناکـات و هەڵتناخەڵەتێنی، ئەتۆ خەتای خۆتە پەنـدەکانی ئـەو جێگـەی گومانتـە و هـەواڵ و دەنـگ و باسـەکەی بەدرۆ دەزانی، خۆ ئەگەر بتەوێ باش بیناسی و لـە ماڵە چۆڵەوانییەکانی و هـەوارە ڕوخاوەکانیدا بۆی بگەڕێی، زۆر بە جوانی دەیخاتەوە یادت و پەندەکانیشت بـۆ ڕوون ئەکاتـەوە، وەك کەسـێکی دڵـسۆز و خـەمخۆر، زۆری تـۆ مەبەسـتە و نایـەوێ تووشـی ناڕەحەتیی ببی، بەڕاستی ماڵێکی چاکە بـۆ ئەوانـەی، کـە پێـی ڕازی نـین و گـەڕەکی ئەوەی نایەوێ تێیدا نیشتەجێ بێ، ئەوانـەی دڵخۆشـن و بەختـەوەرن بـە دنیـا، هـەر ئەوانــەن ئــەمڕۆ لێــی ڕائەکــەن و خۆیــان دوور ئــەگرن، ئەگــەر فــوو کــرا بــە کەڵەشـاخەکەدا و ڕۆژی قیامـەت بـە هـەموو کـارە گەورەکانییـەوە هـات، هـەموو بەندەیـەك لای جێگـەی شایـستە و بەندایـەتیی خـۆی دانـرا و، هـەموو پەرسـتراوێ لەگـەڵ بەنـدەکانی خـۆی ڕووبـەڕوو کـرا، هـەموو ڕەنجبـەرێك لای گـەورەی خـۆی ڕاوەسـتا، ئەوکاتـە لـە دادپـەروەریی و یەکـسانپەروەریی، بـرژانگ لەیـەکنانێك و چاوترووکانێك لـە هـەوادا و خـشەی پێیـەك لـە زەویـدا پاداشـت درایـەوە، بـە حـەق و

پاساى خۆى نەبێ جێبەجێ نابێ، ئەو كاتە زۆر بەلگە پوچەڵ دەكرێتەوە و زۆر برِوبيانوو رِەد دەكرێتەوە، كەواتە ئينسان! هەر ئەمرِۆ كارێك بكە، كە ئەو رِۆژە بيانوومكەت جێگيربێت و بەلگەت چەسپاو بێ و، بتوانى بەرگرى لە خۆت بكەيت، كارى چاك و هەلگيراو وەرگرە، لەو دنيايەى بۆت هەلگيراو نابێ و خۆت بە جوانيى و چاكيى ئامادەبكە بۆ ئەم سەفەرە و، چاوەرِێى گزنگى رِوناكيى بكە و، كۆلۆبارەكەت باربكە و لەگەڵ كاروانەكەدا رِێبكە!.

( ٢٢٣ )

## وتارێك كە پاكانە ئەكات لە زۆر و ستەم

قەسەم بەخودا ئەگەر بە ئاگاداريى و بە هۆشى خۆمەوە لە سەردرِكى وشترخۆر شەو بكەمەوە، يان پێ لە زنجيرو كەلەبچە رِاكێشرێم، لام زۆر خۆشترە لەوەى لە رِۆژى قيامەت برِۆمە لاى خودا و پێغەمبەرەكەى(صلى الله عليه وسلم) بە شێوەى زۆردارو ستەمكار لەسەر هەندێ لە بەندەكانى و داگيركاريم لەسەر دەسكەوتێكى كەم لێيان! من چۆن ستەم ئەكەم بۆ كەسێك، كە زۆر بە پەلە و بەلەز بەرەو فرِين و وردبوون دەرِوا و زۆر لە ناو خۆڵ و خاك دەمێنێتەوە!؟ بە خودا عەقيلى برامم ديوە، كە زۆر هەژارو داماو بووە و پارِاوەتەوە بۆ مەنێ گەنم، منداڵ و زارۆكەكانيم بينى چلكن و مووگرژو رِەنگزەرد لە برسان و لە رِوتان، وەك دەموچاويان بە (خوم) رِەش كرابێ و چەند بارە ئەو داواكارييەى كردووەتەوە، چەند جار پێى وتم، منيش بە جوانيى گوێم بۆ شلكردو وايزانى ئاينى خۆم دەگۆرِمەوە بۆ ئەو، بۆى نەرم ئەبم و كارى بۆ ئەكەم، بە پێچەوانەى رِێبازى دياريكراوى خۆم، منيش ئاسنێكم گەرم و سوور كردەوە و لە بەدەنى نزيكم كردەوە، بۆ ئەوەى تێى بگەيەنم و پەندى دادەم، ئەو هاوارى لێبەرز بووەوە وەك كەسێك داخى بكەيت و ئازارى زۆر پێگەيشت، كەمى مابوو بە مەقاشەكە بسووتێ، پێم وت: شيوەنگێران شيوەنت بۆ بكەن، ئەى عەقيل! ئەوە لە گەرمى ئاسنێك هاوار ئەكەى، كە بەندەيەك گەرمى كردووە بۆ گەمە و يارى خۆى و دەتەوێ رِامكێشى بۆ ئاگرێك، كە خوداى زۆر بە دەسەلات بۆ تۆلەى خۆى هەلى گيرساندووە و بلێسەى بەرز بووەتەوە، تۆ لەوە هاوار ئەكەى و من هاوار نەكەم

**لەوگڕە سوتێنەرە ! لەوەش سەیرتر: جارێك یەكێك دای لە دەرگا و لە سەر سینییەك بڕێ حەڵوا و كولیچەی هاوردبوو بە هەویركاریی درووستكرابوو، من بێزم لێكردەوە و وامزانی بە لیكی دەمی مار شێلراوە، یان بە ڕشانەوەی ژەهرەكەی، پێم گوت: ئەوە سیلەی ڕەحمە، زەكاتە، خێرو سەدەقەیە؟ ئەگەر ئەوەیە ئێمەی ئال و بەیت لەسەرمان حەرامكراوە ئەو جۆرە خەیرو حەسەناتە، كابرا وتی: نە ئەوەیە و نە ئەمەیە، بەڵكو ئەوە دیارییە بۆم هێناوی، وتم: دایكت ڕۆڵەڕۆت بۆ بكات و ژنان بالۆرەت بۆ بكەن، ئەتەوێ لە ڕێگەی ئاینەوە فێڵم لێبكەیت و بمخەڵەتێنی!؟ سەرت لێتێكچووە، یان شێت بووی، یان وڕێنە ئەكەی!؟ قەسەم بەخودا، ئەگەر هەر حەوت كیشوەری دنیا بە هەموو كانەكانی ژێر زەویم پێ بدرێ، بۆ ئەوەی بێفەرمانیی خودا بكەم لە مێرولەیەك و لەتە دەنكە جۆیەكی لێبستێنم، هەرگیز نایكەم و ئەو دنیای ئێوە لای من سووكترە لەو گەڵایەی، كە لە دەنووكی كوللەیەكدایە و هەندێكی لێكرماندووە، عەلی چی داوە لەو شتەی بەرەو نەمان و لە ناوچوون دەچێ و چییەتی لە خۆشخواردنێك، كە كەم دەخایەنێ، پەنا بەخوا، لە خەوی عەقڵ و خراپیی نوچدان، تەنها بەو هاوكارم.**

**( ٢٢٤ )**

## نزاو پاڕانەوە و پەنابردن بۆ خودا كە پێویستیی جێبەجێ بكات

**خودایە ڕووم بپارێزە بە بەخشینی دارایی، ڕووم سووك مەكە بە نەداریی، نەوەك داوای ڕۆزیی بكەم لەوانەی تۆ ڕۆزیدەریانی و بپاڕێمەوە لە خەڵكە ناباشەكەت، تووشی بەڵای سوپاسگوزاریی ئەوەی شتم پێدەدا و تووشی ئازاوەی خراپەوتنی ئەوەی بێبەشم ئەكات، تۆ خۆت لەپشتی ئەوانەوە خاوەن بەخشش و نە بەخشینی (تۆ لە سەر هەموو شت بە تواناى).**

( ٢٢٥ )

## وتارێك له زەمی دنیا و ناشیرینکردنی

**ماڵێکه له هەموو لایەکییەوە بەڵا دەوری داوە، بە نەهێنیگریی[٦] ناسراوە، حاڵ و ئەحواڵی کەمدەوامە، میوانەکانی بێوەی نابن، حاڵ و باڵی جۆراوجۆرە، کات و وەختی لەگۆڕانە، ژیان تێیدا بێزراوە، ئارامیی تێیدا نەماوە، دانیشتوانەکەی بوونەتە نیشانە بۆ تیرباران و پێکاندن، هەمیشە تیر ئەندازییان بۆ ئەکات و تیریان بۆ دەهاوێ و بە مەرگ لەناویان دەبا.**

**ئەوەش باش بزانن خوداپەرستەکان! ئێوە و ئەو بارەی تێیدا دەژین لەم دنیایە، بە هەمان ڕێگەی ئەوانە دەچن لە پێشەوە بوون، ئەوانە لە ئێوە بە تەمەنتر بوون و زیاتر ئاوەدانیان کرد و، ئاسەواری زیاتریان لە پاش جێماوە و دەنگ و سەدایان نەماوە و، وزە و جوڵەیان وەستاوە و لەشیان ڕزیوە و ماڵیان چۆڵە و شوێنەواریان کوژاوەتەوە، لە بریتی کۆشك و تەلاری ڕازاوە و، لە جیاتی فەرش و ڕایەخی داخراو بەردی گاشەبەرد و بەردی داتاشراو و، گۆڕی بن زەوی و گۆڕیچەدان، کە خۆی لە سەر وێرانە و بۆ کاولکردن دانراوە و بەگڵ و قوڕ درووستکراوە و ماڵ و دەرماڵی هەموو وێرانە و کوچە و کۆڵان و گەڕەکی چڕوپڕە و خەڵکەکەی هەموو ئاوارەیە و بەیەکتر نامۆ و چۆڵەوانیی و بیانیین و هەر یەکەیان سەرگەرمە بە کارو نامەی کاری خۆیەوە و نایپەرژێتە سەر خەڵکی دیکە، دڵخۆش نین بە نیشتمان و هاتوو چوون و دیدەنی یەکتریان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دیواریان لکاوە بە یەکەوە و زۆر لە یەك نزیکن، چۆن توانای هامشۆیان دەبێ؟ وەك خۆڵی بێژراوە هاڕاون و ڕزیون و بەرد و گڵ وردوخاشی کردوون؟ زۆر نزیکە ئێوەش بە حاڵی ئەوان بن و بارمتە بن لە شوێن پاڵدانەوە و، ئەو چاڵانە ئێوەش لەباوەش بگرێ، ئاخۆ حاڵتان چۆن بێ، کە بەو شوێنە گەیشتن و گۆڕەکانتان لە یەك جیاکرایەوە، (هەر لەو جێیە هەموو کەسێك بە ئەزموون تێ ئەپەڕێ، هەر کارێکی لەپێشدا کردوویەتی دێتەوە ڕوو، دەیانبەنەوە لای خودای گەورەی، بەڕاستیی هەموویان هەر درۆیە هەڵیان بەستبوو بە فیڕۆ چوو).**

---

[٦] نهێنیگر : ناپاکی، غەدر، زۆرداریی.

(٢٢٦)

## نزاو پاڕانەوە و پەنا بەخوا بردن کە ڕێگەی ڕاستی نیشاندا

خودایە...! تۆ لە هەموو ئاشنایەك ئاشناتری بەدڵی دۆستەکانت، لە هەمووشیان ئامادەتری بۆ بە دەمەوە چوون و ئەنجامدانی ویستەکانیان، ئەوانەی خۆیان داوەتە دەستی تۆو پشت بە تۆ دەبەستن، تۆ نهێنیی و شاراوەیان ئاگاداری و دەیانبینی و ناو دڵ و دەروون و هەستیان لە بەرچاوتە، ئەزانی چاویان هەتا کوێ بڕئەکات و بینایان توانای چەندە، نهێنیی و ڕازیان لای تۆ ڕوونە، دڵیان بۆ لای تۆ هاوار و پاڕانەوەی هەیە، ئەگەر چۆڵیی و بێکەسیی بە خۆیانەوە ببینن، یادی تۆ ئاشنا و دڵئاوەدانیان ئەکات، ئەگەر بەڵا و ڕوداوی دڵتەزێن دابارێ بە سەریانا، پەنا بۆ تۆ دەهێنن و هاوار بۆ لای تۆ دێنن، زۆر باش ئەزانن جڵەوی هەموو کارەکانیان لە دەستی تۆیە، سەرچاوە لە دادوەربی و فەرمانی تۆ وەردەگرن.

خودای من ئەگەر لە کێشە و پرسەکانی خۆم تێنەگەیشتم، ئەگەر نابینابم لە ئاست داواکانم، تۆ ڕێگام نیشانبدە بۆ بەرژەوەندییەکانم، دەستم بگرە بۆ سەر ڕێگەی ڕاستم، ئەوە لە ڕێنمایی تۆ نامۆ نییە و تازە نییە لە فریاکەوتن و دەربەستی تۆ، خودایە، تۆ بە لێبوردن و لێخۆشبوونم لەگەڵ بکە و بە یاساو دادم لەگەڵ مەکە.

(٢٢٧)

## وتارێك کە مەبەستی لە هەندێ یاری خۆیەتی

خودا گەیشتە فریای وڵاتەکانی (فلان کەس)، چونکە توانی لارییەکان ڕاست بکاتەوە و تیماری دەردە کوشندەکان بکات، پەیڕەویی ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بکات و ئاژاوە و ناکۆکیی دوای خۆی بە جێ هێڵا و بە بەرگی پاکوخاوێنەوە ڕۆیشت، شورەیی کەمبوو، زۆر کاری چاکی ئەنجامدا و پێش خراپە و ناخۆشییەکان کەوت، فەرمانی خودای جێبەجێ کرد، زۆر بە پارێزەوە حەقی خودای ئەنجامدا، خۆی تەشریفی برد و خەڵکی لەسەر ڕێگەوبانەکان جێهێشت، کە ناشارەزا ڕێی لێدەرناکا و شارەزاش زۆر دڵنیا نییە لە ڕۆیشتن لەسەری.

( ٢٢٨ )

## وتارێك كاتێ پەیمانی پێدرا

ئێوە ئامادەبوان.. دەستی منتان بەزۆر ڕاكێشا و من دەستم نەدانێ، ئێوە دەستان پانكردەوە و من دەستم نوچاند، ئێوە گەلەكۆمەكێتان كردە سەرم، وەك ڕەوەحوشتری تینوو بۆ سەر حەوزی ئاو، ڕۆژی ئاودان بە ڕادەیەك پەتی پێڵاوەكان پچڕان، بەرماڵی سەرشان كەوتە خوارەوە و پیرو لاواز و نەخۆشەكان بوون بە ژێرەوە، خۆشیی و كامەرانیی و بەختەوەریی خەڵك بە پەیمان پێدانم، كە منداڵی ساوا گەشكەی بۆ كرد و پیرو كەنەفت بە لارەلار و بە لەرزەوە پێشوازی لێكرد، نەخۆش و دەردەدار بە دەست بە باڵەوەگرتن دەهاتن، كچی تازەپێگەیشتوو پەچەی لە سەری لابرد لە پەلەپەلیدا !.

( ٢٢٩ )

## وتارێك بۆ هەندێ مەبەست

پارێزگاریی و خۆپاراستن بۆ خودا، كلیلی هەموو گرفتێكە، كۆڵ و باری زیندووبوونەوەی دواییە، گەردنئازادییە لە كۆیلەیەتیی و ڕزگارییە لە فەوتان و لەناوچوون، هەموو داواكارێك بەم هۆیەوە سەركەوتوو دەبێ و ڕاكردوو دەگاتە شوێنحەوانەوە، مەبەست دێتە ئەنجام.

## گەورەیی كار

هەوڵ بدەن، كار بكەن، كاری باش بەرز ئەبێتەوە، پەشیمانیی سوودی زۆرە، نزا و پاڕانەوە دەبیسرێ و وەردەگیرێ، لەو كاتەدا كار بكەن، كە باری ژیانتان چاكە و بە پێی خۆتان ئەڕۆن بەڕێوە، هەوڵ بدەن كار بكەن پێش ئەوەی تەمەنی داگیراوتان بێتەپێش، یان نەخۆشیی لەكارتان دابڕێ، یان مەرگی ناخلاف بدا لە سەرتان، ئەوەش بزانن مردن هەموو خۆشیی هەرس دەكات، هەموو ئارەزوویەكی خۆشیی لێڵ ئەكات، پێچ و سەفەرتان دوور ئەخاتەوە، میوانێكی بەدفەساڵە و ناحەزە،

هاوتايەكى چارنەكراوە، دەستوەشێنێكى چاوەڕواننەكراوە، هەر كە بوون بە داو و پەتەكانییەوە و بوون بە ژێر كارەساتەكانییەوە، بوونە بەركەوتی تیرەكانی و دەسەڵاتی بە سەرتاندا زاڵبوو، هێرش و پەلاماری بۆ هێنان و بەرنەكەوتنتان زۆر كەم بوو، ئەو كاتە زۆر نزیكە هەوری ڕەش و تاریكیی گەماڕۆتان بدات، دەرد و ژانەكانی برستان لێببڕێ، تاریكیی كارە سەختەكانی داگیرتان بكات، لە هۆش خۆچوون و بوورانەوەكانی داگیرتان بكات، ئازاری ماندوو كردنەكانی بەهێز بكات لە سەرتان و چین و پەردە تاریكەكان لە سەرتان كەڵەكە بكات، زبریی و ڕەقیی خواردنەكانتان دەرخوارد بدات، ئاوەها كات بە كتوپڕیی و لەناكاو نوزەتان لێببڕێ و كۆڕو كۆبوونەوەتان پرش و بڵاو بكات و ئاسەوارتان بكوژێنێتەوە، خانە و یانەكانتان چۆڵ و هۆڵ بكات، میراتگران بانگ بكات بۆ دابەشكردنی ماڵە وێرانەكەتان، ئەوانەی لەناویان دەرباز دەبن، یان دۆستە و خۆشەویستی تایبەتە و سوودمەند نابێ، یان خزمی نزیك و دڵتەنگە و بێدەسەڵاتە، یان شادكامە و ناخۆشیی و خەفەت ناخوات بۆت.

## گەورەیی كاری جددی

زۆر پێویستە لەسەرتان هەمیشە كارەكان زۆر بە جددی و هەوڵ و ماندوو بوونەوە بكەن، ئامادەباشیی و بەدەستهێنانی كەرەستەی تەواو و هەڵگرتنی تێشووی پێویست لەو خانەی تێشوی لێدەست دەكەوێ، ئەو دنیایە هەڵتان نەخەڵەتێنێ وەك گەلانی پێش ئێوەی تەفرەداوە، وەك ئەو چەرخ و كاتە ڕۆیشتووە، كە چۆڕەبڕەیان كرد لە شیرەكەی و سوودیان وەرگرت لە یەكەم گزنگ، هەڵهاتنی و ئەو هەموو كەرەسەیان تەواو كرد و هەموو شتە تازەكانیان كۆن كرد، ئێستە شوێنەكانیان بۆتە گۆڕستان و ماڵ و سامانیان بە میوانی براوە، ئەوانەی دیدەنییان دەكرد نایان ناسن و گوێ نادەن بەوانەی بۆیان گریاون و وەڵامی ئەوانە نادەنەوە بانگیان دەكەن، لەبەر ئەوەیە ئاگادارتان ئەكەم كە بترسن لەدنیا، چونكە فێڵبازە بۆ خەڵەتاندن، بەخشندەیە و زەلیلە، پۆشتەكارو ڕووتكەرەوەیە، هەرزانی كەمدەوامە، ئازارەكانی بێكۆتاییە، بەلا و ناخۆشیی برانەوەی نییە.

## سیفەتی دنیا نەویستەکان

ئەوانە لە دنیادا بوون و دنیا نەویست بوون، وەك ئەوە بوون، کە خەڵکی ئەوێ نەبن بە بەرچاو ڕوونیی کاریان دەکرد، پێشبینییان هەبوو بۆ کارە ناجۆرەکان، جموجۆڵیان لە ناو ئەهلی دنیا بۆ قیامەت بوو، بە چاکی دەیانڕوانی لە ئەهلی دنیا، کە مردنی لەشیان بە گران دەهاتە بەرچاو، بەڵام خۆیان مردنی دڵەکانیان لەزیندووەکان لا گرانتر بوو.

( ٢٣٠ )

## وتارێك لە شاری زیقار، لە ڕێگەی بەسرە خوێندیەوە

پێغەمبەری سەردارو ڕابەر(صلى الله عليه وسلم) شانیدایە بەر فەرمانی خودا، توشی ناخۆشیی و سەرئێشە بوو لە سەری، پەیامی پەروەردگاری بە جوانیی گەیاند، خودا درز و بۆشایی نێوانی پێ پڕکردەوە و هێنایەوە یەك، دڕاوییەکەی دووریيەوە و پینەی دڕاوەکەی کرد، خزم و نزیکەکانی گەیاندەوە بە یەك و بە یەکەوەی ئاشت کردنەوە، پاش ئەو هەموو ڕق و کینەی ناو دڵ و دەروونیان، ئەو ئاگرە گڕدارەی لەسنگیاندا کوژانەوە.

( ٢٣١ )

## وتارێك کە گفتوگۆ ئەکات لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە کە هەواداری بوو ئەوەش لەکاتی بوونی بە خەلیفە و داوای ماڵی لێکرد

فەرمووی: ئەم ماڵ و دارایی و سامانە، نە هینی منە و نە هینی تۆیە، ئەمە بەشی موسڵمانان و پشکی ئەوانە و دەسکەوتی شیری ئەوانە، ئەگەر هاوبەشیت کردوون لە جەنگەکانیاندا، ئەوە تۆش بەشت وەك ئەوانە، دەنا ئەوەی ئەوان چنیویانەتەوە و شارۆیانکردووە، بۆ دەمی خۆیانە.

( ٢٣٢ )

## وتارێك کە کەسێ ویستی قسە بکات و دەمی گیراو بۆی نەهات

## ( باس لە گەورەیی خانەوادە و خراپیی زەمانە )

ئەوەتان زانیوە، کە زمان پارچە گۆشتێکە لە ئینسان، ئەگەر سەرپێچی کرد لێی، ماوەی قسەکردنی نادات و ماوەی گوتاری نادات، ئەگەر بۆی بلوێ ماوەی هەبێ و ئێمەش میری وشەو گوتارین، لەناو ئێمە و بە زمانیدا ڕەگ و بنج و پشکی داکوتاوە، لە سەر ئێمە پەلوپۆ و چڵوخەڵفی شۆڕ بووەتەوە بە سەرماندا.

## گەندەڵیی زەمانە

ئەوەش باش بزانن بەر ڕەحمەتی خودا بکەون، لە ساتەوەخت و زەمانێکدان بۆ ژیریی قسەی حەق زۆر کەمە، زمان لە وتنی ڕاستیی و درووستیی کۆڵە و بێتوانایە، ئەوەی پابەندە بەوەوە پەست و سەرشۆڕە، خەڵکی ئەو زەمانە خۆیان داناوە بەدیار یاخیبوون و بێفەرمانیی، کۆدەنگن لە سەر ڕووپامایی و ماستاوکردن، لاویان بەدڕەوشت و خووناپەسەندە و پیریان گوناحکارە، زانایان دوو ڕووە و قورئانخوێنیان ساختەکارە، بچووکیان ڕێزی گەورەی نییە و دەوڵەمەند و ساماندariyan هەژارپەروەر و بەخێوکەر نییە.

( ٢٣٣ )

## پە یمانی وەرگرت لە ئە حمەدی کوڕی قوتەییە،

## لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزید، لە مالکی کوڕی دوحییە

دەیگێڕێتەوە، کە لای بوون و باسی ناکۆکیی کراوە و فەرمووی: ئەزانن بۆچی ناکۆکیی و جیاوازییان هەیە، چونکە کەرستەی ڕەگ و نەژادیان لە یەك دوورە، ئەوانە یەك پارچە بوون و تۆپەڵەیەك لە گڵی شۆرەك و سوێر و شیرین و سەخت و ڕەق و نەرم و بەرزیی و دەشت، لەبەر ئەوە بە سروشتی ئەو خاکەی لێی درووست بوون نزیکن، بە گوێرەی نەژادی خاکەکەیان جیاوازییان هەیە، هەیانە دیمەنی جوان

و خۆشڕەنگە و ژیریی و فامی کەمە و درێژباڵا و کەم زۆرو وردە، ئیشکەری چالاك و ناشیرین بیچم، کورتەباڵا و هوشیار، دڵ و دەروون بەرز، تەبیعەت ڕووخۆش و کەم تورە، گێل و بێئاگا و دڵەڕاوکێ و زمانبەرەڵڵا و ئازاو بە ورە.

( ٢٣٤ )

## ئەم وتارە لەکاتی شۆردنی لاشەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و کفن و دفنیدا بوو

به باوك و دایکم به قوربانت بم، ئەی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم)، بە مردنی تۆ ئیتر پێغەمبەریی و هەواڵ و دەنگوباسی ئاسمان بڕا، کە بۆ کەسیتر نییە، ئەوەندە تایبەتمەندیی، مایەی دڵدانەوەی غەیری خۆتی، ئەوەندە گشتگیریی، وا دەزانرێ لەگەڵ خەڵك یەکسانی، ئەگەر خۆت فەرمانت نەدایە بە خۆگرتن و ئارامی و (نا)ت نە فەرموایە لە هاوارو گریانی بە کوڵ، هەرچی فرمێسك و تەڕیی لە سەرماندایە دامان ئەباران بۆت، چاك بوونەوە لە دەرد و سەبووریی درێژخایەن دەبوو، خەم و داخ و ئۆف و ئازار هاوڕێمان دەبوو، کە هێشتا هەر کەم دەبوون بۆت، بەڵام ئەوەمان لێقەبووڵ بکە، کە ناتوانین دەستبەرداری بین و لە تواناداخۆمانی لێ بەرگری بکەین، بە باوك و دایکم بە قوربانت بم، لە لای خودا و پەروەردگاری خۆت یادمان بفەرموو، با لە یادت نەچین و لە یادت بین.

( ٢٣٥ )

## باسی کۆچی پێغەمبەر هەتا ڕۆیشتن بۆ مەدینە ( صلی الله علیه وسلم )

هەمیشە دەگەڕام بە شوێن هەواڵەکانی و ئاگاداری دەنگوباسی بووم، هەتا گەیشتمە عەرەج (شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا).

( ٢٣٦ )

## لەبارەی دوو حەکەمەکەی نێوان و زەمی ئەهلی شام

ئەوانـە زبـرو تـوڕە و هەرچـی و پەرچـی، هـەتیو مـەتیو و بەنـدە و کۆیلـە و بـەدکردار و نەفـسنزم، پەسـت و سەرسـەریی ئـەملاولا بـوون، کۆکرابوونـەوە لـە دەوروبەر و دۆزرابوونەوە لە ڕەگ و نەژادی ناپەسەند، لەوانەی کە دەبوو فێرکـرێن، تـەمبێ بکـرێن، پـەروەردە بکـرێن، فێـری ئـەدەب و زانـست و لـە ژێـر چـاودێریی و دەسـەڵاتدا دەسـتیان ببەسـترێتەوە، ئەوانــە نــە کۆچـبەران و نــە ئەنـسار بـوون و لەوانەش نەبوون، کە نیشتەجێی ئەو دەڤەرەبن، ئەو خەڵکە بۆ خۆیان هەڵبژاردووە نزیکترین کەس لەوانەی ئێوە خۆشتان ئەوێ، ئێوەش داتاننـاوە بـۆ خۆتـان نـزیکترین کەس لەوانەی ناتانەوێ، ئێوە لە بیرتانە عەبدوڵڵای کوڕی قەیس دوێنێ وتی : ئـەوە ئاژاوەیـەك درووسـتکراوە، کەواتـە تیرەکانتـان ورد بکـەن و شـیرەکانتان بکەنـەوە بـە کێلاندا، ئەگەر ڕاستگۆ بوو ئـەوە هەڵەی کـردووە لـە بۆچوونەکەیدا و بـە زۆر پێـی نــەکراوە، ئەگــەر درۆزن بــوو ئــەوە گومــانلێکردنی پێـوە نووســاوە، دەبــوو ئێــوە عەبدوڵڵای کوڕی عەباستان بکردایە بەگژی عەمری کوڕی عاسـدا، ئـەو ڕۆژە مۆڵـەت بەهەند وەربگرن، دەوری ئەملا و ئەولای ئیسلام بدەن و پارێزگاریی لێبکەن، نابینن وڵات و دەســەڵاتتان چــەپاو ئــەکرێ و بــەردەڕەق و ســەختەکانتان ئــەپێکرێ و ئەشکێنرێ !!.

( ٢٣٧ )

## باسی ئال و بەیتی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دەکات

ئەوانـە ژیانـەوەی زانـستن، فەوتانـدنی نـەفامیین، حیلمیـان خەبـەر لـەزانینیان دەدات، بێدەنگیی و نتمی هەواڵی زمانپاراویی و گۆیاییان دەکات، هەرگیز دژی حەق نابن و لەسەر حەق ناکۆك نابن، ئەوانە پایە و کۆڵەکـەی ئـاین و ئیـسلامن، پـەناگا و حەشـارگەی دەربـازبوونن، لـە درنـدە و جانـەوەر، بـەهۆی ئەوانـەوە حـەق گەیـشتە ئاستی شایستە، باتڵ و نارەواش لەشوێنی خۆی هەڵکنرا و زمانی ناحەق بـڕا لەبنـدا، لە ئاین تێگەیشتوون بە ژیریی و پاراستن و جێبەجێ کردنی، نەوەك بە تێگەیشتنی

بیستن و گێڕانەوە، چونکە حیکایەتخوانی زانست زۆرە، پەروەردەکاری زۆر کەم.

( ٢٣٨ )

## باسی پەلە کردن بۆ کارو کردەوە

کەواتە پێویستە ئێوە کار بکەن، هەتا هەناسەی مانتان هەیە، ڕۆژنامەی کاری باش ئامادەیە بۆ تۆماری کاری چاك، پەشیمانیی لە بەردەمدا ڕاخراوە، ئەوەی پشتی لە فەرمان هەڵکردووە بانگ دەکرێ، خراپەکار بێئومێد ئەکرێ پێش کوژاندنەوەی کار و کۆتایی مۆڵەت و، بەسەرچوونی ماوە و داخستنی دەرگای گەڕانەوە و بەرزبوونەوەی فریشتە، مرۆڤ لە خۆی بۆ خۆی وەربگرێ، لەزیندوو بۆ مردوو وەربگرێ، لە فەوتاو بۆ ماوە، لە کەموەخت بۆ هەمیشە وەخت.

مرۆڤ ئەوەیە لە خودا بترسێ، کە بەرەو ئەجەل دەڕوا و ماوە و تەمەنی بۆ درێژکراوە بۆ کاری باشە کردن، مرۆڤ ئەوەیە لغاوی نەفسی خۆی کردووە بە ڕەشۆی خۆی و پەلکێشی کردووە بە هەوساری خۆی، بەهۆی لغاوەکەوە پاراستویەتی لە بێفەرمانیی خودا و، بە هەوسارەکەی ڕایکێشاوە بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خودا.

( ٢٣٩ )

## هانی یارانی دەدا لەسەر جیهاد کردن

خودا بۆ خۆی داوایکردووە ستایش و سوپاسگوزاریی بکرێ، ئەوەش لە ئەستۆی ئێوەی داناوە و بەشێکە لە ئەرك، بۆ ئەوەش ماوەی پێداون لەکاتی بەسەربردنی تەمەندا، کە گۆڕەپانی ئەو ئەرکەیە و لەوێدا ئەتوانن کێبەرکێ بکەن و بتوانن گرەوی خۆتان ببەنەوە، کەواتە ئێوەش پشتێنی لێ گرێ بدەن و باڵی لێ هەڵکەن و زیادە پشێنیی و فەقیانەکان توند بکەن، کاری بە پەلە و جددی لەگەڵ ڕاخستنی سفرە و خوان ڕێکناکەوێ، یان سەفەر و زەمان پێکەوە نابێ، دەزانن ڕاوتەگبیری ڕۆژ خەو لە چاو لائەبا تاریکیی شەو باشترین هەلە بۆ ئەنجامدانی کارە گرنگەکانی ڕۆژ، بیری کاری گەورە تاریکی لائەبا !.

(٢٤٠)

## بە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسی وت کە نامەی عوسمانی کوڕی عەففانی هێنا بوو کە گەمارۆ درابوو، داوای لێکردبوو بچێ بۆ ماڵیان کە لە یەنبەع بوو بۆ ئەوەی ژاوەژاوی خەڵك کەمبکاتەوە

فەرمووی: ئەی کوڕی عەباس، عوسمان چی دەوێ؟ مەگەر ئـەوەی نـاوێ، کـە مـن بکاتە حوشتری ئاوهەڵگۆزینی بیر!؟ بۆ پێشەوە و بۆ دواوە ناردی کە بـڕۆم و دەرچـم و ئەوجا نـاردی، کـە بـڕۆم و ئێـستە ناردوویـەتی کـە بـڕۆم بـۆ لای، قەسـەم بـەخودا، ئەوەندە بەرگریم لێکردووە ترسم هەیە گوناهبارببم.

## کۆتـایی وتـارەکانی

پاش ئەمە نامە و پەیامەکانی دێت کـە بـەژمارە (١) دەست پێـدەکات، تکایـە بـۆ ئاگاداریتـان... لەگـەڵ ڕێـزم بەشـێك لـە بـژاردەی نامـەکانی سـەرداری بـاوەڕداران، تایبەتن بۆ نەیارەکان و سەرکردەی تر، کە لە ناوچەکاندا بوون.

(١)

## نامەیەك بۆ دانیشتوانی کوفە
## کاتێ لەمەدینەوە دەچوو بۆ بەسرە

لە بەندەی خودا عەلی میری باوەڕداران بۆ خەڵکی کوفە، ناوچاوی ئەنسار، بڕبڕەی پشتی عەرەب... باسی کارەساتی عوسمانتان بۆ ئەکەم بەو شێوەیەی، کە بیستنی وەك بینین وابێ بۆتان، خەڵك ڕەخنەیان هەبوو تانەیان لێئەدا، منیش، کە یەکێك بووم لە کۆچبەران، زۆرم حەز ئەکرد ڕازی بکەم و دڵی ڕاگرم و کەمتر لۆمەی بکەم، تەڵحە و زوبەیر سووکترین هامەشۆیان بۆ لای گورگە لۆقەبوو، سووکترین گۆرانی و عەتابەیان بالۆرە بوو بە دەنگی بەرز و لەعایشەوە تورەییەك هەستی پێدەکرا.

ئیتر وا ڕێککەوت هاتە پێشەوە، کۆمەڵێك پەلاماری بدەن و بیکوژن و خەڵك زۆر بە پەلە پەیمانیاندا بە من بە ئارەزووی خۆیان، کەس زۆری نەبوو بە سەریانەوە و کەس بەپاڵنان ئەوەی پێنەکردن، بەڵکو بە ئارەزوو و خواستی خۆیان بوو، یانەی کۆچبەران خەڵکی خۆی وەدەرنا و خەڵکیش هەڵکەنران لێی و بە جێیان هێشت، قازان و تیانچە هاتە کوڵ و چەپۆکانی کرد، ئاژاوە درووست بوو لەسەر تەوەرەی دەسەڵات، دەی کەواتە ئێوەش زۆر بە پەلە وەرن بۆ لای میری خۆتان، دەست بدەنە کار بۆ جیهاد، ئەگەر خودا ویستی.

(٢)

## نامەیەك بۆ ئەهلی کوفە دوای گرتنی بەسرە

ئەوەش دەڵێم، خودا پاداشتان بداتەوە خەڵك و ئەهالی ئەم شارە لە بریتی ئال و بەیتی پێغەمبەرەکەتان(صلی الله علیه وسلم)، بە جوانترین پاداشت، کە ڕەوایە بۆ ئەوانەی فەرمانی جێبەجێ ئەکەن و سوپاسگوزاریی گشت ناز و نیعمەتەکانی دەبن، ئەوەی ڕاستبێ ئێوە گوێبیستی من بوون و فەرمانتان جێبەجێ کرد، لەگەڵ بانگکردنتان بە ئەرێ وەڵامتان دایەوە.

(٣)

## دەڵێن، شەریحی کوڕی حارس دادوەری میری باوەڕداران بووە و خانوویەکی لەوکاتەدا کڕیوە بە (هەشتا سکە)ی زێڕی دینار و ئەوەش بە پێشەوا گەیشتووە و شەریحی بانگکردووە و پێی دەڵێ:

بیستوومە خانووت کڕیوە بە هەشتا دینار و قەواڵە(کتاب)ت پێنوسیوە و شایەتت لە سەری داناوە، ئەوجا شەریح وتی: بەڵێ میری باوەڕداران، ئەوجا پێشەوا بە تورەییەوە تەماشای کرد و وتی: ئەها ! شەریح نازانی کەسێك دێتە سەرت تەماشای قەواڵەکەت ناکا و داوای شایەتیش ناکا و زۆر بە پەلە پەلت ئەگرێ و لە ماڵەکەت دەرت ئەکات و دوورت دەخاتەوە و ئەتسپێرێ بە گۆڕی تایبەت بەخۆت ! باش بڕوانە شەریح ..!! نابێ و ناکرێ ئەو خانووەت کڕیبێ لە ماڵی غەیری خۆت، ئەو پووڵ و پارەیەت لە غەیری حەڵاڵیی خۆت دابێ ! ئەگەر ئەوەت کردبێ ماڵوێران و زیانلێکەوتوی دنیا و ئاخیرەت بیت، بەڵام ئەگەر لە وەختی کڕینی ئەو خانووەدا زوو بهاتای بۆ لای من، ئەو کاتە خانووەکەت نەدەکڕی، منیش بەگوێرەی ئەم شێوازەی خوارەوە قەواڵەم بۆ درووست دەکردی ئەوکاتە مەیلی کڕینی ئەو خانووەت نەدەبوو بە سکە و زیوی درهەمێك و زیاتر.

## ئەوەش نموونەی قەواڵەی منە

بە پێی ئەم قەواڵەیە، بەندەی داماو لە مردوویەکی کڕی، کە جێگەی پێلێژکراوە بۆ کۆچوبار، خانووەکەی، کە کڕیوویەتی لەو ماڵانەیە، کە خەڵك تێیدا بایی هەوایەك و لە کووچەی فەوتاوەکانە، لە گەڕەکی نەماوەکانە، ئەم خانووە چوار سنووری هەیە:

سنووری یەکەم: ڕێگەیەك ئەڕوا بۆ شوێنی دەرمەکان و جێگەی بیمارەکان.

سنووری دووەم: بۆ لای مەڵبەندی کارەسات و کوێرەوەرییەکان دەڕوا.

سنووری سێیەم: دەچێ بۆ لای حەزە بکوژەکان و لەناوبەرەکان.

سنووری چوارەم: ئەڕوا بۆ ماڵی شەیتانی لە خشتەبەر و ڕێونکەر، لەوێوە بۆ دەرگای ئەم ماڵە دەست پێئەکات.

ئەم پیاوە هەڵخەڵەتاوە فێڵلێکراوە، ئەم خانووەی کڕیوە بۆ ئومێدی زۆر دوور، لەم کابرا جێگە لێژکراوە، بۆ ئەوەی دەری بکەن لە خانووی ئارامیی و قەناعەت، بۆ یانەی سەرشۆڕیی سواڵ و پاڕانەوە، کەچی ئەم کڕیارە نازانێ ئەم خانووە ماڵی پەستیی و داماوییە، ئەم خانووە کام خانووە ؟ ئەومیە لەشی پادشایانی داڕزاندووە، گیانی ستەمکارانی سەندووە، سامانی فیرعەونەکانی لەناوبردووە، وەك کیسرا، قەیسەر، توبەع، حمیەر، ئەوانەش، کە سامان لە سەر سامان کۆ دەکەنەوە، ئەوانەی کۆشك و سەرا دروست ئەکەن و دەیڕازێننەوە، جوانیی تێدا دروست ئەکەن و گەنج کۆدەکەنەوە و زەخیرە هەڵئەگرن، بەنیازی خۆی بۆ کوڕ و نەوەی پاش خۆی، کە دێن و هەموویان ڕاپێچ کراون بۆ مەیدانی پرسینەوە و نمایش بۆ پرسیارو وەڵام و شوێنی تۆڵە و پاداشت، ئەوێ ڕۆژێ، کە دادوەر فەرمانی خۆی دەر دەکا، (هەرگا فەرمانی خودا هات، دەبێ ڕاستیی مەردم ڕابگا و هەرکێ لەسەر پڕوپوچە تێیدا دەچێ)، شایەتی ئەم مامەڵە عەقڵ و ژیرییە، ئەو ڕۆژە شایەتی ئەدا، کە دیلی هەوا و ئارەزوو بەرنەبێ، هەموو پەیوەند و پەیوەستەکانی دنیای لێدەبێتەوە.

(٤)

## نامەیەك بۆ هەندێ سەرکردەی سوپاکەی

ئاگاداربە... ئەگەر ئەوانە هاتنە ژێر فەرمان ئەوە باشە ! و ئەوە خواستی ئێمەیە و حەزمان لێیەتی، ئەگەر هەر سوور بوون لە سەر کۆبوونەوە بۆ دووبەرەکیی و ناکۆکیی و یاخیبوون و سەرکەشیی، ئەوانەی بە گوێت ئەکەن بیاننێرە بۆ شەڕی ئەوانەی بە گوێت ناکەن، بە یارمەتیی ئەوانە گوێڕایەڵ و ئامادەی فەرمانت دەبن، دژی ئەوانە، کە بەزیو و دانیشتوون، چونکە ئەوەی بە بیانووە بۆ دژی، شەڕویستیی دەکات، نەبوونی و ئامادە نەبوونی زۆر چاکترە لەهاتن و ئامادەبوونی، دانیشتنەکەی زۆر بە سوودترە لە هەڵسانەکەی.

( ٥ )

## نامەیەك بۆ ئەشعەسی كوڕی قەیس لە ئازربایجان

ئەوكارەی بۆت دانراوە، وا نەزانی چەشەیە بۆت، بەڵام سپاردەیەكە لەگەردنت، لە سەری خۆتەوە چاودێری دەكرێ لێی، نەكەی ستەم لە خەڵك بكەی، هەرگیز نیازی پەلاماردانت نەبێ، هەتا دڵنیا نەبی ماڵ و دراوت لە دەست بێ لەو ماڵەی خودا داوییە بە تۆ، تۆ ئەمینداری سندووقی، هەتا دەیگەیەنیتە دەستم، ئومێدەوارم منیش لەگەورەخراپەكان نەبم بۆ تۆ... سەلام.

( ٦ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

ئەوەی ڕاستبێ ئەوەی پەیمانیداوە بە ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان، پەیمانیشیان بە من داوە لە سەر هەمان مەرج و بەرنامە، ئەوەی لەوێ ئامادەبوو بۆی نییە بە ئارەزوو هەڵبـژاردن بكات، ئەوەی لەوێ نەبوو بۆی نییە ڕەدی بكاتەوە، ڕاوێژ بۆ موهاجیرو ئەنسارە، هەركەسیان ویست و ناویان برد و كردیان بە پێشەوا، ئەوە ڕازی خودای لەسەرە، هەر كەس دەرچێ لە بڕیاریان بە داهێنراوێك بۆیان هەیە بەرپەرچی بدەنەوە، بیگەڕێننەوە بۆ لای خۆیان، ئەگەر گوێبیست نەبوو شەڕی لەگەڵ ئەكەن، لە سەر پەیڕەوی ڕای باوەڕداران، خودا هاوكاری ئەومیە، كە خۆی دایناوە.

(بەو خودایەی كە گیانی منی بەدەستە) ئەی مەعاوییە، ئەگەر بە ڕاوبۆچوونی ژیریی و عەقڵ بیر بكەیتەوە و ئارەزووی تێكەڵ نەكەی، ئەزانی و بۆت دیارە، كە من بێ تاوانترین كەسم لە خوێنی عوسمان و تۆ باش ئەزانی، كە من زۆر دوور بووم لێی، مەگەر هەر سوور بیت لە سەر تاوان بەرامبەرم، ئەگەر وابوو بە ئارەزووی خۆت تاوان بكە چۆنت بۆكرا ... ئیتر سەلام.

(٧)

## نامەی دووبارە بۆ مەعاوییە

ئەوجا پاش ئەوە...، پێمگەیشت ئەو ئامۆژگارییە هەڵبەستراوە، بە نەخش ڕازاوە، بە جوانیی نوسیوتە بەو هەموو فریودان و لادانە و ناردووتە بۆم بە ئیمزا کراویی، تێکەڵە بە بۆچوونە خراپەکەت و نامەی کەسێکی ناوچاو ڕووتە و نەشارەزای ڕێگەیە، کەسێکی سالار نییە ڕێگەی پێنیشاندا، هەوا و ئارەزووی فەرمانڕەوایی گازی کردووە، ئەویش بە پیرییەوە چووە و ڕێ ونیی دەستی کێشاوە، ئەویش دوای کەوتووە و دەستیکردووە بە وڕێنە و ژاوەژاوی بێمانا، ڕێگەی لێتێکچووە و هەنگاوی کوێرانە ئەهاوێ، ئەزانی بۆ؟ چونکە پەیمانبەستن یەکجارە، دووبارە نابێ و پەشیمانی نییە و دووبارە بەسەرکردنەوەی تێدا نییە، ئەوەی لێیدەرچووە بەهانەجۆ و بێبەڵگەیە و ئەوەی دوودڵە دوو ڕووە.

(٨)

## نامەیەك بۆ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی کە ناردی بۆ لای مەعاوییە

پاش ئەوە... کە ئەم نامەیەت پێگەیشت بچۆ بۆلای مەعاوییە، لەگەڵی ببڕەوە و بە ڕاستیی و درووستیی لەگەڵیدا کار بکە، ئەوکات لە نێوان جەنگێکی دەرکردن لە نیشتمانی و ئاشتییەکی بێ دەسەڵاتی، ئەگەر شەڕ و جەنگی هەڵبژارد، ئاسایشی لە گەردن بکەرەوە و شەڕی پێڕابگەیەنە، ئەگەر پەیمانی بەست پەیمانی لێوەربگرە، ئیتر سەلام.

(٩)

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

ئاگاداری بکە خێڵی ئێمە ویستیان پێغەمبەرەکەمان(صلی الله علیە وسلم) بکوژن، لە ڕەگ دەرهێنانی بنەچە و بنەماڵەی ئێمە بوون، نیازی زۆر کاری خراپیان هەبوو بەرامبەرمان، زۆر کاری ناماقوڵیان دژمان ئەنجامدا، ئاوی پاك و شیرینیان

لێمان قەدەغەکرد، لە ناو ئێش و ئازاردا گردیان کردینەوە، لەناو شیو و شاخی ڕووت و بێلەوەڕیان دانایین ! ئاگری شەڕ و جەنگیان دژمان هەڵگیرساند، لەو لاشەوە خودا ئێمەی کردە پاسەوانی دەستوور و یاساکەی، بە دەوری شوێنە پیرۆزو ڕێزدارەکەی دانایین، باوەڕدارمان تەنها ئەجر و پاداشتی دەویست و بێباوەڕمان نەژادی دەپاراست، هەرکەس لە هۆزی ئێمە موسڵمان بوایە لە قورەیشدا ڕووت دەکرایەوە، لە هەموو سوێندخواریی و پەیمانێکدا بۆ لای ئێمەیان دەنارد، توانای بەرگری لێنەدەما، هۆزێک نەبوو حەشاری بدات و بیپارێزێ، بۆ لەناوبردن و کوشتنی لە شوێنی ئاسایشدا بوو، پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) درود لە سەر خۆی و ئالی بێت، کە شەڕ و جەنگ گەرم دەبوو، خەڵکیتر پاشەکشەیان دەکرد، ئال و بەیتی خۆی دەخستە پێشەوە، بە هۆیانەوە یارو یاوەرانی دەپاراستن لە گەرمیی شیر و ڕم، ئەوە بوو عوبەیدی کوڕی حارس لە جەنگی بەدردا کوژرا، حەمزە لە ئوحد و جەعفەر لە موئتە، ئەو کەسەی بمەوێ ناوی بەرم ئەتوانم، کە ویستیان بگاتە پلەی شەهیدی، بەڵام خودا ئەجەلی ئەوانی نزیك دانا و مردنی ئەمی دواخست.

زۆر سەیر و سەمەرەیە ئەو زەمانە، ئێستا وای لێهاتووە من هاوشان دەکرێم بە کەسێ، کە بە تۆزی پێمدا ناگات و وەك من پێشینەی نەبووە، کە هیچ کەس ناتوانێ خۆی لێی نزیك بکاتەوە، مەگەر کەسێکی خۆهەڵکێش بێت داواکاری شتێ بێ، کە من ئاگادار نیم و خوداش بۆ خۆی ئەزانێ کە ئاگادار نیم، بەڵام بەهەرحاڵ سوپاس بۆ خودا، لەبارەی ئەوە، کە داوا دەکەی بکوژانی عوسمانت بۆ بنێرم، بیرم کردەوە لەم داوایە بۆم دەرکەوت لە توانای مندا نییە ئەوانە تەسلیم بکەم، نە بەتۆ و نە بە غەیری تۆ.

(بەو خودایەی کە تەمەنی منی بەدەستە) ئەگەر لەم کارەمدا واز لەوانە نەهێنی و خۆت دوور نەکەیتەوە لە یاخیبوون و دوو بەرەکیی، ئەوەت پێنیشان دەدەم، بەم نزیکانە بە شوێنتدا بگەڕێن، داوات لێناکەن لە وشکانیی و دەریادا و لە دەشت و چیادا، بەڵام داواکردنێکە، کە زۆر پێت گرانە و لەسەرت دەکەوێ و دەسکەوتی زۆرت لاگرانە و میوانگەلێکن، کە حەز بە دیداریان ناکەی، ئیتر سەلام بۆ ئەوەی شایستەیە.

(١٠)

## نامەیەك بۆ مەعاوییە دووبارە

ئاخۆ حاڵت چۆنە ئەگەر بۆت دیارکەوت ئەو عەبایەی داوتە بەسەر شانتا و چۆن خۆبادانێ شانازی پێئەکەیت و فێڵت لێکراوە، بە جوانییە دیارەکەی بانگی کردوی و تۆش بە پەرییەوە چوویت و پەلکێشی کردوی، تۆش ملت ڕاکێشاوە بۆی و فەرمانی پێداوی، تۆش گەردنکەچی بوویت، ئەوەش بزانە زۆر نزیکە هەڵوێست بێ بەسەر شانتا، بە هیچ قەڵغانێ خۆت بۆ نەپارێزرێ، خۆت لابدە لەم کارە و بۆخۆت دانیشە و خۆت ئامادەکە بۆ لێپێچانەوە، قۆڵت هەڵکە بۆ ئەو نەهامەتییەی، کە بە سەرتدا دێت، هەوڵبدە ئەوانەی لە خشتەت دەبەن گوێبیستیان بیت، ئەگەر وا نەکەی ئەوە من لە بێئاگایی خەبەرت ئەکەمەوە، تۆ خۆشلەوەڕی، خەڵەتاوی، شەیتان بە تەواویی سواری سەرت بووە، هەموو هیوا و ئومێدی خۆی پێ جێبەجێ کردوی و تێکەڵاوە بە گیان و خوێنت، دەنا تۆ ئەی مەعاوییە...! کەی سیاسەتمەداری خەڵك بوی؟ کەی ئێوە سەرداری ئەم میللەتە بوون؟ بێ پێشینەتان، بێ ڕەسەنی و بنەماڵەییتان، پەنا بە خودا لە مانەوەی پێشینەی پێشووتان، ئاگادارتان ئەکەم نەخەڵەتێن، لە خۆبایی لەخۆتان بگۆڕێن، بە خەیاڵی ئومێدی بێ جێی نهێنیی و ئاشکرا لای خۆتەوە بانگەشەی جەنگت کردووە، ئەگەر ڕاست ئەکەی واز لە خەڵك بێنە و خۆت وەرە مەیدانەوە، با هاوکاری هەردوو لا دوور بن لە شەڕ، هەتا پێت بسەلێنم کام لامان تەمومژ دڵی داگرتووە، کام لامان چاوبەست کراوە، بمناسە من باوکی حەسەنم بکوژانی باپیرت و خاڵۆت و برات، وەك شکانی تووڵی تەڕم لە ڕۆژی (بەدر)دا هەمان شیرم لە دەستە ! هەمان ورە و وزەم لاماوە، کە لەگەڵ نەیاراندا هەم بوو، نایەنم نەگۆڕیوەتەوە، بڕوام بە پێغەمبەری تری نوێ نەهێناوە ! من لە سەر هەمان پەیڕەوم، کە ئێوە بۆ تەماع وازتان لێهێناوە و هاتنتان بۆی بەزۆر بوو، بە خەیاڵی پووچی خۆت بۆ تۆڵەی خوێنی عوسمان ئەوە ئەکەیت، تۆ خۆت باش ئەزانی خوێنی عوسمان لە کوێ ڕژاوە ! لەوێ داوای بکە، ئەگەر داوای ئەکەی ئەتبینم، کە داماوی بەدەست جەنگەوە، ئەو کاتەی، کە قەپت لێئەگیرێ، وەك حوشتری بارگران، لە بەرچاوم کۆمەڵەکەت چۆن داوا ئەکەن لەترسا، پاش کوتانی یەك لە دوای یەك و

لەناو بردنی سەرەمڕ و کوشتاری یەك لەدوای یەك، کە بە قورئان کار بکەین، لەگەڵ ئەوەش خۆیان بێباوەڕن بە قورئان و لە پەیمانی پاشگەزبوونەوە.

( ١١ )

## وتارێ کە ئامۆژگاریی ئەو سوپایە دەکات کە بۆ جەنگی ناردوون

ئەگەر دابەزین بۆ دوژمن، یان دوژمن دابەزی بۆتان، با هەمیشە لە بەرزیی بن، یان لە دامێنی چیادا بن، یان لە پێچاوپێچی ڕووباردا بن، بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بێ بۆتان و توانای بەرگریی و گەڕانەوەتان هەبێ، یان ڕووی کوشتارگەتان لە یەك ڕوو بێ، یان دوان، هەمیشە چاودێرتان هەبێ لە بەرزایی چیاوە، یان سەرشانی گردۆڵکەکان، نەوەك دوژمن پەلامارتان بدات، لە شوێنی مەترسیدار، یان شوێنی بێترس، ئەوەش بزانن پێشقەرەوڵیی خەڵك چاویانە، چاوی جاسووسگەش پێشڕەویی سوپایە، نەکەن لەیەك دابڕێن، ئەگەر دابەزین، با هەمووتان پێکەوە بن، ئەگەر بارتان کرد بەیەکەوە بن، کە شەوتان بە سەرهات، با ڕمەکانتان بە دەورتاندا بێ و خەوتان سووك بێ، یان پچڕپچڕ بێ.

( ١٢ )

## ڕاسپاردەی بۆ مەعقەلی کوڕی قەیسی ڕەماحیی کە ناردی بە سێ هەزارەوە بۆ شام

لە خودا بترسە، کە بەدیداری ئەگەی و ناتوانی لە دەستی دەرباز بی، تەنها شەڕ لەگەڵ ئەوە بکە، شەڕت لەگەڵ دەکات، هەمیشە با ڕۆیشتنت لە فێنکیی بەیانیی و ئێوارەدا بێت، لە کاتی گەرمادا دابەزە بۆ پشوودان، لە ڕۆیشتن پەلە مەکەن، لە سەرەتای شەو ڕێ مەکەن، چونکە خودا بۆ پشووی داناوە و بۆ مانەوەیە، بۆ کۆچ و بار نییە، پشوو بدە بە لەشت، با پشت و لەشت ئیسراحەت بکات، کە شەو کەوتە کۆتایی، یان کە گزنگی پارشێو هات لە سەر بەرەکەتی خودا بڕۆ بۆ مەبەست، کە بەرامبەر بە دوژمن ڕاوەستای لە ناوەندی سوپاکە بەو ئەوەندە نزیك مەبەرەوە، وا

بزانن بۆ شەڕ هاتووی، ئەوەندەش دوور مەبە، وابزانن لە جەنگ ئەترسی، هەتا فەرمانی منت پێئەگات، نەکەن ڕق و کینە شەڕتان پێدروست بکات، پێش ئەوەی داوای ڕێکەوتن بکەن، بیانووبڕیان بکەن.

(١٣)

## نامەیەك بۆ دوو فەرماندەی سوپاکەی

من لەسەر ئێوە و لەسەر ئەوانەی ژێردەستی ئێوەشە، مالیکی کوڕی حارسی ئەشتەرە، بە چاکیی گوێی بۆ بگرن و بە فەرمانی ئەو کار بکەن، با وەك قەڵغان و بەرگی ئاسن بێ بۆتان، ئەو لەوانەیە ترسی ترسنۆکیی لێ ناکرێ و تووڕە و قورس نییە، هەموو سستییەك لە پەلەکردن باشترە و هێواشیی لە تیژیی باشترە.

(١٤)

## ڕاسپاردە بۆ سوپا پێش دەستپێکردنی شەڕ لە سیفین

هەرگیز دەست مەکەن بەشەڕ، هەتا ئەوان دەست پێئەکەن، چونکە سوپاس بۆ خودا ئیوە لەسەر حەقن، دەست پێنەکردنی ئێوە، تا ئەوان دەست پێنەکەن بەڵگەیەکی تری ڕاستیی ئێوەیە، ئەگەر بە یارمەتیی خودا ئەوان شکان، ئەوەی ڕائەکات دوای مەکەون، ئەوەی ترساو و داماو بوو، بەرگریی نەکرد مەیکوژن، زاماری کەوتوو مەکوژن، ئازاری ژنان مەدەن، هەرچەند جنێو بدەن بە شەرەف و ناموستان و قسە بە فەرماندەکان بدەن، چونکە لە هێزو دەروون و عەقڵدا لاوازن، ئێمە فەرمانمان پێدراوە بۆ دەست هەڵگرتن لە ژنان، کە بێباوەڕ بوون، ئەگەر پیاوێك بە پیچەکێك، یان داردەستێك لە ژنی بدا، مایەی شورەییە بۆ خۆی و بۆ نەوەی پاش خۆی.

(١٥)

## لەكاتی شەڕكردن لەگەڵ دوژمن ئەی فەرموو:

خودایــە هــەموو دڵ و دەروون بــۆ لای تۆیــە، هــەموو پێشــچوونێك و هــەموو چاوەڕوانییەك و هەموو هەنگاوێ، هەموو شەكەتیی لەش هەر بۆ تۆیە، خودا ئەوانە ڕق و كینـەیان ئاشـكراكرد و قـازانی زوخـاوی دڵیـان هاتوومتـە كـوڵ، خودایـە ئێمـە تەنها سـكاڵامان نـەمانی پێغەمبـەرە لـە ناومـان و زۆریـی دوژمنـان و پـرش و بڵاوی بۆچوونەكانمانە، (ربنـا افـتح لبيننـا و بـين قومنـا بـالحق وأنـت خيرالفـاتحين... ئـەی خـودای پەروەرەنـدەمان تـۆ لـە نێـوان ئێمـە و هۆزەكەمانـدا داوەریـی بكـە، چـاكترین داوەر هەر خۆتی).

(١٦)

## لە كاتی شەڕدا بە یارانی دەفەرموو:

بـا زۆر نـاخۆش نـەبێ لاتـان ڕاكـردن، كـە گەڕانـەوەی لـە دواوە بـێ، یـان ئـەملاو ئەولاكردن، ئەگەر هێرشی لەگەڵ بێ، شمشێرەكانی خۆمـان مـافی تـەواوی پێبـدەن و شوێنی كاریگەر بۆ مردن دیاریی بكەن، هەوڵ بـدەن دەسـت بـە تونـدیی بـۆ دوژمـن درێژ بكەن، بە هێز و كار دەست بوەشێنن و بێدەنگ بن، چونكە لە شكانەوە دوورە، قەسەم بەو كەسەی دانەی سەوز كـردووە و مـرۆی درووسـتكردووە، ئەوانـە بـاوەڕدار نین، بەڵكو بە زۆر سەریان نەوی كردووە، ئێستەش بێباوەڕییان شاراوەیە، هـەر كـات هاوڕێیان زۆر بوو دەریئەبڕن.

(١٧)

## لە وەڵامی نامەیەكی مەعاوییەدا نوسیویەتی

ئەو داوایەی، كە كردووتە بێم بۆ شام، ئـەوە بزانـە ئـەمڕۆ ئـەوەی دوێنـێ پـێم نـەداوی ناتـدەمێ، ئـەو قـسەیەت، كـە جـەنگ عـەرەبی خـواردووە، جگـە لـە چـەند كەسێكی لاوازی مـاوە، ئـەوە بزانـە ئـەوەی بەحـەق خـوراوە بـۆ بـە هەشـتە، ئـەوەی ناحـەق خواردوویـەتی بـۆ دۆزەخـە، ئـەوەت كـە وەكـو یـەكین لـە جـەنگ و لـە

جەنگاوەرییدا، ئەوە تۆ لە سەر گومانی خۆت لە من زیاتر نیت لە سەر یەقین، خەڵكی شامیش پابەندتر نین بۆ دنیا لە خەڵكی عێراق بۆ قیامەت، ئەو قسەیەت، كە وتووتە ئێمەی نەوەی عەبدی مەناف، ڕاستە ئێمە ئەوین، ئومەییە وەك هاشم نەبوو، حەرب وەك عەبدولموتەللیب نەبوو، ئەبوسوفیان وەك ئەبوتالیب نەبوو، كۆچكردوو وەك دیلی بەرەڵلا كراو نەبوو، ڕەسەن و باوك و دیار وەك نارِەسەن و بێباوك دیار نییە، حەقدار وەك ناحەق نییە، باوەڕدار وەك گەندەڵ نییە، زۆر خراپە نەوەیەك شوێنكەوتووی پێشینێك بكەوێ، كە لە دۆزەخ پاڵی داوەتەوە، بەلاّم ئێمە سوپاس بۆ خودا پاشماوەی پەیام لە دەستمانە، كەللەسەری سەرزلان پێ نەویی كرد و چینی خوارەوەمان پێ بەرز كردەوە، ئەوێ ڕۆژێ، كە عەرەب پۆل پۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە، ئەو خەڵكە باوەڕی هێنا بە خواهیی و نەخواهیی، ئێوەش هاتنە ناو ئایین، جا بۆ دەسكەوت، یان لە ترس، بەلاّم ئەوانەی پێشكەوتوو بوون، خەلاّتی پێشكەوتنیان پێدرا، موهاجیر و ئەنسار بە چاكە و پاكیی خۆیان ڕۆیشتن، كەواتە ئێوە لە خۆتانا پشكی شەیتان لابدەن و ماوەی مەدەن ئەوەندە زاڵبێ بەسەرتانا، ئیتر سلام.

(١٨)

## نامەیەك بۆ عەبدوڵلاّی كوڕی عەبباس كە لە بەسرە كارگێڕی بوو

زۆر باش بزانە ئەو بەسرەیە شوێنی دابەزینی ئیبلیسە و نەمامی ئاژاوەیە لەو شەتلگەیەدا، تۆش بە چاكە ڕەفتاریان لەگەڵ بكە و گرێی ترسیان لە دڵدا بكەرەوە، بیستوومە خۆت كردووە بە پڵنگ بەسەر هۆزی تەمیم و بە زبریی و ڕەقیی لەگەڵیان مامەڵەت كردووە، ئەوە بزانە هۆزی تەمیم هەمیشە ئەستێرەیان ئاوا نەبووە، مەگەر ئەستێرەیەكی تریان هەڵهاتووە و لەناو پێشینەیان بە ڕق و كینە ناویان نییە، نە لە جاخی نەفامیی و نە لە ئیسلام، لەگەڵ ئێمە پەیوەندی خزمایەتیان هەیە، نزیكیی تایبەتییان هەیە، ئێمە پاداشتمان دەبێ بە سەریان بكەینەوە، گوناحمان ئەگات بیبڕین، باوكی عەبباس كۆچ و هەوارت لەوێ داگرە، خودا ڕەحمت پێبكا لەو شوێنەی، كە ئەوەی تێدا گوزەراوە، بەدەم و دەستت لە چاكە و

خراپە، چونکە ئێمە هاوبەشین تێیدا، ئەبێ جێگەی متمانەی من بیت، با ڕاوبۆچوونم لە بەرامبەرت لاواز نەبێ، ئیتر سەلام.

( ١٩ )

## نامەیەك بۆ هەندێ کارگێڕی

ئەوجا... هەندێ لە سەرۆك هۆزو خێڵ و گەورەکانی ئەو شوێنەی تۆ، ئاگاداریان کردم، کە تۆ لەگەڵیاندا زۆر توند و ڕەقی، بە چاوی سووك و بێنرخ تەماشایان ئەکەی، منیش بیرمکردەوە، کە ئەوانە شایستەی ئەوە نین، خۆیان لە بێباوەڕیی نزیك بکەنەوە، دوور بکەونەوە لە بەڵێن و پەیمانی تازەیان، پێویستە بەرگی گەرمی نزیك لە توندیی لەبەر بکەی، هەمیشە میانڕەوبە لە نێوان زبریی و نەرمیی و نزیککردنەوە و دوورخستنەوەیان، ئەگەر خودا حەزبکات.

( ٢٠ )

## نامەیەك بۆ زیادی کوڕی باوکی خۆی
## ئەم پیاوە جێگری عەبدوڵلای کوڕی عەباس بوو لە سەر بەسرە و عەبدوڵلا لەو ڕۆژەدا لە سەر ئەوێ و ئەهواز و فارس و کرمان کارفەرمانبوو

من قەسەم ئەخۆم بە خودا، سوێندی ڕاستیی، ئەگەر بۆم دەرکەوێ تۆ گەندەڵیت کردووە لە دەسکەوتی موسڵمانان، بچووك، یان گەورە، بە شێوەیەك ئەتبەستمەوە، کە توانای بەخێوکردنی ماڵ و منداڵت نەبێ، باری پشتت قورس ئەکەم و سووك و بێنرخت ئەکەم، ئیتر سەلام.

( ٢١ )

## بۆ ئەوەی پێشوو

وازبێنە لە دەستبلاویی و ئابوریی ڕاگربە، ئەمڕۆ یادی سبەی بکە، بە ئەندازەی پێویست پارە خەرج بکە، ئەوی دیش هەڵبگرە بۆ دوارۆژ، تۆ ڕەنگە بە تەمای

پاداشتی بێدەمار و بێفیزەکانت هەبێ و خۆت لە دەمار زلەکانیت و بە تەمای کە (خۆت لە نازو خۆشیدا بژیت و قەدەغەی ئەکەیت لەهەژار و بێوەژن)، بەتەمای، کە خودا ئەجر و پاداشتی چاکەبەخشانت بکات ! هەموو کەس پاداشتی بە گوێرەی دەستپێشخستنی دەبێ بۆ ئەو شوێنە دەڕوا، کە زەخیرەی ناردووە.

( ٢٢ )

## نامەی بۆ عەبدوڵلای کوڕی عەباس کە عەبدوڵلا دەڵێ بە ئەندازەی فەرموودەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) سوودم وەرگرتووە

ئەوجا... لەپاش ئەوە، مرۆڤ حەزی لێیە دەستی بگات بەو شتەی لەدەستی نەچووە، پێی ناخۆشە لە دەستدانی ئەوەی نەدەبوو لەدەستی بدات، دەی با تۆش خۆشییت بەوە بێت لە قیامەتدا دەستت ئەکەوێ و ناخۆشییت بۆ ئەوە بێ، کە لە دەستت چووە لە دەسکەوتی دنیا، زۆر کەیفخۆش مەبە، ئەوەش کە چووە بۆی نارەحەت مەبە، با هەمیشە خاوەن هیممەت بیت بۆ پاش مەرگت.

( ٢٣ )

## پێش وەفاتی و لەکاتی لێدانی کوڕی مولجەم وەك ڕاسپاردەو ئامۆژگاریی

ڕاسپاردەم بۆ ئێوە ئەوەیە، کە هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن (محەممەد پێغەمبەری خودایە)(صلی الله علیه وسلم) ڕەوشت و ڕێبازەکەی ون مەکەن، ئەم دوو پایە بەرز ڕابگرن، ئێوە دوور ئەبن لە زەم و لۆمە، من دوێنێ هاوڕێی ئێوە بووم، ئەمرۆ بووم بە ئامۆژگاریی و سبەی جیا دەبمەوە، ئەگەر مام، خۆم خاوەنی خوێنی خۆم دەبم، ئەگەر فەوتام ئەوە کۆتاییم سەرئەنجامە، ئەگەر لێیبووردم، ئەوە لێبووردن کاری نزیك بوونەوەمە لە خودا، چاکەیەش بۆ ئێوە، ئێوەش لێیخۆشبن، (أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ... ئێوە حەز ناکەن خودا لێتان ببورێ).

سوێندم بەخودا، هەرگیز لە مردنی کتوپڕ نەترساوم و لە پەلاماردا خۆم نە

پاراستووە، من وەك ئاوكێشی شەو بووم و داواكار بووم و دەستم كەوت، (وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِلْأَبْرَارِ... ئەوەی لای خودا چاكترە بۆ مەردانی خودا).

( ٢٤ )

## ڕاسپاردەی بۆ كاری پێویست لە سامانی، پاش گەڕانەوە لە سیفین

ئەوە فەرمان و ڕاسپاردەی بەندەی خودا عەلی كوڕی ئەبو تالیب، میری باوەڕدارانە لەماڵ و دارایی، بۆ ئەوەی هۆكاری چوونە بەهەشتم بێ و ئارامیی پاش مردنم پێبدا، حەسەنی كوڕی عەلی بەم كارە هەڵدەستێ، بە چاكە لێی دەخواو بە چاكەو بەخشندەیی لە سەر بكا، ئەگەر حەسەن تووشی كارەسات بوو و مرد حوسەین زیندوو بوو، پاش ئەو، حوسەین بەو كارە هەڵسێ بە هەمان شێوەی ئەو كار بكات، بۆ نەوەی فاتیمە لە خەیر و سەدەقە لە ماڵی عەلی بۆ نەوەی عەلی هەیە، لەبەر ئەوە ئەوانەم كردووە بە بریكاری خۆم لە نەوەی فاتیمە، تەنها لە بەر خودا و نزیكیی لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم)، بۆ ڕێزلێنان لە حورمەتیان و بەرزڕاگرتنی پەیوەندییان، ئەو كەسەی، كە سەرپەرشتی ئەو سامانە ئەكات، ئەبێ ڕەگی سامان لەناو نەبا، تەنها لە بەر و بەرهەمەكەی بە پێی ئەو ڕێنومایییەی، كە بۆم داناوە، هیچ لقێكی ئەو دارخورمایە نابڕێ، هەتا ئەو ڕادەی دارەكان بۆ باخەكە دادەپۆشێ، هەرچی كەنیزە و كارەكەرم هەیە و لە ژێر گرێبەستی من بووە و منالی هەیە، یان دووگیانە دەمێنێ و بەشی خۆی هەیە، ئەگەر منالەكەی مرد و خۆی مابوو ئازاد بێ، كۆیلە نییە و ئازادە.

( ٢٥ )

## ڕاسپاردە بۆ ئەو كەسەی زەكات كۆ ئەكاتەوە

لە بەر ئەوە دامانناوە تا بزانرێ هەمیشە لە ورد و درشت، بە مەبەستی حەق و داد بووە، بڕۆ لە ڕێگەی خۆپاراستن لە خودای بێ هاوەڵ، هەرگیز موسڵمانان نەترسێنی، هەرگیز داوای شتێكی لێ نەكەی پێی گران و قورس بێ، زیاد لە حەق خودا زیادەی لێ وەرنەگری لە ماڵ و سامانی، كە چوویتە ناو گوندەكەوە لە سەر

چەشمەی ئاوەکەیان دابەزە و مەچۆرە ناوماڵەکانیان، ئەوجا... هێمن و ئارام و لەسەرخۆبە و نەرمیی و سادەبە، هەتا دەچیتە ناویان و سەلامیان لێدەکەی، لە سەلام و هەواڵپرسین کەموکوڕیی نەکەی و ئەوجا بڵێ: بەندەکانی خودا خەلیفە و مەردی خودا منی ناردووە بۆ لاتان بۆ ئەوەی حەقی شەرعیی لە ماڵ و داراییتان لێوەربگرم، هەرچی حەقی خوداتان ئەگەر لایە فەرموو تەسلیمی منی بکەن، ئەگەر کەسێ وتی مـن لام نییە دوبارەی مەکەرەوە لێی، ئەگەر بە بەڵێ وەڵامی دایەوە لەگەڵی بڕۆ، بێ ئەوەی هەڕەشەی لێبکەی و بیترسێنی و ستەمی لێبکەی و باری شانی قورس بکەی، هەرچی پێدای لە دراوی زێڕ و زیو، ئەگەر ڕان و حوشتری هەبوو مەڕۆ ناو ئاژەڵەکانی، مەگەر خۆی داوا بکات، چونکە ئەوە زۆری ماڵی خۆیەتی، ئەگەر چویتە ناو ڕانەکەی وەك زۆردار و ستەمکار و کاربەدەستی سەرملی ئەو کارە مەکە، دەست مەدە لە هیچ حەیوانێك، بە هێنان یان ڕاونان کارێ مەکە خاوەنەکەی پێی گران بێت، ماڵەکە بکە بە دوو بەشەوە و خۆی دەربەست بکە کامیان هەڵئەگرێ، هەر کامی هەڵگرت ڕێگری لێمەکە، ئەوەی مایەوە دوبارە دابەشی بکە بە دوو بەش و خۆی دەربەست بکە، هەرچی پەسەند کرد تۆ ڕێگر مەبە، هەر بەم شێوە دەکەی، هەتا ئەگاتە ئەو بەشەی، کە حەقی خودایە، لە ئەو ماڵەی ئەگەر لە بەشێك پەشیمان بوویەوە قەبووڵی بکە و دوبارە تێکەڵی بکەرەوە، وەك جاری یەکەم، چۆنت کردووە مافی شەرعی لێوەربگرە.

زەکاتی زۆر پیر وەرمەگرە و پەککەوتەش وەرمەگرە و دەستوقاچ شکاو وەرمەگرە و نەخۆش و دەردەدار وەرمەگرە و عەیبداریش وەرمەگرە، کە وەرتگرت بەدەستی کەسی پاك و جێگەی بڕوانە نەبێت مەیدە، کە ئاین داربێ و دڵسۆز بێ بۆ ماڵی موسڵمان هەتا ئەگاتە دەست سەرداری موسڵمانان و ئەویش دابەشی ئەکات، شوانەکانی با دڵسۆز و دڵنەرم و دەستپاك و پارێزگار بێ، هەڵەشە و توڕە و دەستقورس بۆ حەیوان نەبێ، با لەو کەسانە نەبێ زوو ماندوو ئەبێ و کەنەفت و کەلەلا نەبێ، ئەو کاتە بە ئارامیی و هێواشیی ڕەوانەی لای ئێمەی بکە و ئێمەش بە پێی فەرمانی خودا دابەشی ئەکەین، ئەگەر داتە دەست ئەمینداری خۆت پێی بڵێ دایك و بەچکە جیانەکاتەوە و هەموو شیرەکەش نەدۆشێ، نەوەك زیان بە بێچووەکەی بگات، ماندووشی نەکات بە سواری زۆر بۆ بەکارهێنان، وەك هاوتاکانی

بەکاری بێنێ، پشوو بدات بە ماندووەکانیان، لەسەرخۆ بێ لەگەڵ شەلکەو سمزامار و ماندووەکان، هەمیشە بۆ سەر ئاو و کانییان ببات، هەرگیز لایاننەدا لە لەوەڕی باش بۆ گوێڕێگەی بێ پووش و پەلاش و بۆگەی پووش و هەر جارێ بۆ ماوەی چەند کاتێ پشوویان پێ بدات، وازیان لێ بێنێ لە ئاوی کەم و ناو پاکژیی باش بۆ ئەوەی بە باشی بلەوەڕێن و ئاو بخۆنەوە، هەتا ئەگاتە دەستمان بە قەڵەویی و پاك و خاوێنیی، نەوەك ماندوو و شەکەت و لەڕ و لاواز بن، ئێمەش بە پێی کەلامی خودا دابەشی ئەکەین، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بۆ تۆ پاداشت هەیە و زۆر نزیکە، لە پێگەیشتن و تێگەیشتنی، ئەگەر خودا حەزبکات.

( ٢٦ )

## داوایەك لە هەندێ کارگێڕی کە ناردبووی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ماڵ

ئەوە فەرمانی منە بۆ ئەو، کە تەقوای هەبێ لە کارەکانی بە نهێنیی و شاراوەیی، کە جگە لە خۆی کەس پێی ئاگادار نییە و کەس بریکاری نییە، غەیری خۆی و فەرمانی پێ ئەدەم کارێ نەکا بە ئاشکرا، لە ئەنجامی جێبەجێکردنی فەرمانی خودا، کە ڕێك نەبێ لەگەڵ کارە شاراوەکانی، چونکە هەر نهێنیی ناکۆك نەبوو لەگەڵ ئاشکرایی و کردار و گوفتاری ناجۆر نەبوو، ئەوە ڕاسپاردەی ئەنجامداوە و بە ڕاستیی بەندایەتیی خۆی بە جێگەیاندووە، هەروەها فەرمانی پێدەدەم، کە ڕووبەڕوویان نەبێتەوە و سەرسامیان نەکات و لە گەڵیان زبر نەبێ وەك ئەوەی زیاد خۆی بەگەورە و مەزن بزانێ، چونکە ئەوانە برای دینیی ئەون و هاوڕازی ئەون بۆ جێبەجێکردنی حەقەکان، خۆت لەم زەکاتە بەشی خۆت هەیە و مافی دیاریکراوت بۆ دانراوە، لەگەڵ مسکێن و هەژار و کەمدەرامەتەکاندا هاوبەشی، بێخەمبە مافی خۆت پێئەدەین و تۆش مافی خەڵك بدە، ئەگەر ئەوەت نەکرد لە ڕۆژی قیامەتدا داواکاری زۆر دڕندەت دەبێ و لە هەموو کەس زیاتر داماو و بێکەس دەبیت، لە ڕووی ئەوانەی داواکارن لەلای خودا، کە هەژار، مسکێن، سوالکەر و قەرزار و ڕێبوارەکانن، هەرکەس یاریی و خیانەت لە ئەمانەت بکات، لەناو گەندەڵییدا خۆی

بلـەوەرپێنێ، خـۆی و ئـاینی لەوانــە نـەپارێزێ، ئـەوە هـەر لـەم دنیایـەدا تووشـی شـەرمەزاریی و سەرشۆڕیی دەبـێ، لـە ڕۆژی قیامەتـدا شـەرمەزارتر و سەرشـۆڕترە، گەورەترین خیانەت، خیانەتە لە ماڵی میللەت و پیسترین دەستپیسیی ئەوەیە، کە لە پێشەوا و ڕابەری خۆت بکەیت، ئیتر سەلامم قەبوڵ بکە.

( ٢٧ )

## نامەی پەیماننامە بۆ محەممەدی کوڕی ئەبوبەکر کە ناردی بۆ میسر

دەبێ باڵی نەرم و نیانیـان بـۆ شـۆڕ بکەیتـەوە، ڕووی خۆشـیان پێبـدەی، سـادە و ئاسان و ساکاربیت، وەك یەك تەماشا و بە تیلەی چاو بۆیان بنـواڕی، هـەتا گـەورە و زەنگینەکان بە تەما نەبن ستەمیان بۆ بکەی، هەژارەکان لـە دادپـەروەریت نائومێـد نەبن، بەندەکانی خودا! خودای بەرزو بێهاوتا لێپرسینەوەتان لەگەڵ ئـەکات! لـە ورد و درشـت و دیـار و نادیـاری کارەکانـدا، ئەگـەر سـزای هـەبوو ئـەوە ئێـوە سـتەمکارن، ئەگـەر لێبـوردنی هـەبوو، ئـەوە ئـەو بەخـشندەیە، بەنـدەکانی خـودا ئـەوەش بـزانن، کەسـە باشـەکان ڕۆیـشتوون بــە حـازریی دنیــا و قــەرزی قیامــەت، هاوبەشـی دنیاویستەکان بوون لە دنیا و هاوشانی ئەوان نەبوون لە قیامەت، لە دنیا چۆن بـاش بـوو ژیـان و چـۆن خۆشـگوزەران و هـەیانبوو ڕایـانبوارد و بـەختیان لـە شـێوازی کەیفخۆشان بووە، ئەوەی ملهوڕ و ستەمکاران دەستیان کەوت، بـۆ ئـەمانیش هـەبوو، بەڵام بە تێشوو و کۆڵوباری چاکەوە و بـە قازانجی زۆرەوە، هـەر خۆشـییەك لـە دنیـا تەرکیان کردبوو لەوێ وەریان گرتەوە، بۆیان دەرکەوت کە لە بارەگای بەرزی خودان، سبەی لە قیامەت نزایـان ڕەت نابێتـەوە، لـە خۆشـیی بەنـدەکانی خـودا بەشـیان کـەم ناکات، هەمیشە لـە نزیکی مـەرگ بترسـن، کەرەستەباشـیی بـۆ پەیـدا بکەن، چونکە باری گرانی پێیـە، قورسایی زۆر گـەورەی لایـە، لـەو جێگـە چاکەی پـێ خراپـە، یـان خراپەی پێ چاکە، کێ هەیە ئەوەندەی ئەوەی کـار بـۆ بەهەشـت ئـەکات نـزیکتر بـێ، کێ هەیە ئەوەنـدەی کـار بـۆ ئـاگر ئـەکات نـزیکتر بـێ، ئێـوە ئـاوارەی مـەرگن، ئەگـەر نیشتەجێ بن ئەتانگرن، ئەگەر ڕابکەن پێتان ئەگەن، لە سێبەرتان زیـاتر لەگەڵتانـە، مۆری مەرگ لە ناوچاوانتانە، بەڕەی دنیا لە ژێرتان هەڵئەگیرێ، بترسن لـەو ئـاگرەی

بنی قووڵە، گەرمیی بەهێزە، ئازاری هەمیشە تازەیە، ماڵێکی بێ بەزەییە، هاوار لە کەس نابیسترێ، ئازار لە کەس کەم ناکرێتەوە، ئەگەر حەزتان لێیە ترستان زۆر لە خوا بێ و ئومێدتان پێ هەبێ، هەر دوو کۆکەنەوە، چونکە بەندەی خودا دەبێ چەندە ئومێدی بە خودا هەیە، ئەوەندەش ترسی هەبێ، هەر کەس ئومێدی بەخودا زۆر بێ، زۆریش ئەترسێ.

محەممەدی کوڕی ئەبو بکر! ئەوە بزانە من تۆم کردووە بە سەرداری بەهێزترین سوپام، کە لە میسرە، دەبێ بزانی زۆر زاڵبی بەسەر ئارەزووتدا و بەرگری لە ئاینەکەت بکەی، ئەگەر لە ژیاندا تەنها یەك دەمژمێرت[7] هەبوو لەبەر خەڵك خودا لە خۆت مەڕەنجێنە، خودا خەڵکی تری بۆ جێگەی تۆ داناوە، بەڵام بۆ خودا لە خۆی زیاتر کەسی تر نییە لە جێگەی، نوێژەکان لە کاتی خۆی بکە، پەلە مەکە لەکاتی خۆی و دواشی مەخە لەکاتی خۆی، هەموو کارێ پاشکۆی نوێژە، ئەوەش بزانە ڕابەری ڕێبازی چاك و پێشەوای خراپ و دۆستی پێغەمبەر و دوژمنی پێغەمبەر وەك یەك نین، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە منی فەرموو: ترسی میللەتی خۆم نییە، نە لە باوەڕدار و نە لە بێباوەڕ، چونکە باوەڕدار باوەڕی بە خودا ماوەی نادا کە خراپە بکا، بێباوەڕیش خودا بە بێباوەڕیی خۆی لە ناوی دەبا، تەنها ترسم لە دوو ڕووە لە دەروونەدا و زمانزان، قسەی وەك ئێوەیە و کردەوەی دژی ئێوەیە.

( ٢٨ )

## نامەیەك بۆ وەڵامدانەوەی مەعاوییە

### ( لە نامە جوانەکانە )

لە پاش ئەوە... نامەکەتم پێگەشت، کە تێیدا ئەڵێی: خودا محەممەد(صلی الله علیه وسلم)ی هەڵبژاردووە بۆ ئاینەکەی و بەهۆی یارانەوە خودا یارمەتیدا، ئەوە ڕاستە، بەڵام زەمان بەهۆی تۆوە شتی سەیری بۆ ئێمە لابوو، کە دەستت داوەتە ئاگادارکردنەوەی ئێمە، لە ئەزموون و تاقیکردنەوەمان و ئەو نەرمیی و بەزەییە،

---

[7] دەمژمێر : کاتژمێر

كه بەهۆی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) بۆمان ماوەتەوە، تۆ وەك ئەو كابرا وای، كە خورما بۆ (هەجەر) ئەبا، یان ڕامیاری ئەسپی ڕەسەن بانگكردن بۆ كێبەركێ و تیرئەندازیی، بە خەیاڵی خۆت ئەڵێی چاكترین كەس فلان و فلانە لە ئیسلامدا، شتێكت وتووە ئەگەر ڕاست بكەی خۆت لابردووە، ئەگەر وانەبی عەیب و شورەیی تۆی تێدا نییە، تۆ چیتداوە لە چاك و چاكتر، لە ڕامیار و ڕەعیەت، ئەوە كاری دیلە بەرەڵڵا كراوەكان و كوڕانی بەرەڵڵاكان نییە، جیاوازیی لە نێوان ئەنسار و موهاجیر و دانانی پلەوپایە و ناسینی چینەكانیان، ئەوە دەنگی ئەو تیرەیە لە براوەكان نییە، دادوەریی فەرمان، فەرمان لەسەر خۆی ئەدا، ئەرێ ئەی ئینسان بۆچی لە سەر چۆكی خۆت پاڵنادەیتەوە، تۆ ئەزانی باڵت چەند درێژە؟ بۆچی دوا ناكەوی، كە قەدەر دوای خستووی، چ پەیوەندە بە تۆ كێ سەركەوت و كێ ژێر كەوت؟ نە ژێركەوتن زیانی بۆ تۆ، نە سەركەوتن سوودی بۆ تۆ نییە، تۆ زۆر زیاد ڕۆشتووی بۆ چۆڵەوانیی و گومڕایی و زۆر لاتداوە لە ناوەڕاستی ڕێگە، ئەوە تۆ نابینی؟ (مەبەستم ئاگاداریی تۆ نییە) ! بەڵام نیعمەتی خودا ئەژمێرم، كە هەندێ كەس لە ڕێگەی خودا شەهید بوون لە كۆچبەران، هەر یەكەیان گەورەیی خۆی هەیە و جێگەی دیارە، بەڵام، كە لە ئێمە شەهید بوو، ناوی بە (گەورەی شەهیدان) دانرا و پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم)، كە نوێژی لە سەركرد، حەفتا (الله اكبر)ی بۆ كرد، ئەوەت زانیوە، كە كەسانێ هەبوون دەستیان لە ڕێگەی خودا بڕوا و هەریەكەیان زیادەگەورەیی هەبوو، بەڵام كاتێ یەكێ لە ئێمە ئەوەی بەوان كرا بەم كرا، پێی وترا ئەو باڵشكاوە دوو باڵی هەیە لە بەهەشت، خۆ ئەگەر لە ترسی خودا نەبێ، كە قەدەغەی كردووە پیاو خۆی هەڵكێشێ، ئەتوانێ هەر كەس ئارەزوو بكات گەورەیی زۆر باس بكات، كە دڵی موسڵمان پێی ئاشنایە و ڕەدی ناكاتەوە گوێی گوێگران، كەواتە وازبێنە، كە جارێ نەت پێكا، دوبارەی مەكەوە، ئێمە دیل و شاگردی خوداین و خەڵكیش شاگردی ئێمەیە، سەروەریی پێشینەمان و ئاسایی ئەمڕۆمان وای لێنەكردین، كە تێكەڵاوی خۆمانتان نەكەین، ژنمان لێ هێنان و پێماندان وەك هاوشان، كەچی واش نەبوو بۆ ئێوە، ئەوە چۆن وا ئەبێ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ئێمەیە، بەدرۆخەرەوە لە ئێوەیە، شێری خودا لە ئێمەیە و شێری پیلانگێڕان لە ئێوە، گەورەشەهیدی لاوانی بەهەشت لە ئێمەیە،

**منـدالّ و زارۆی دۆزەخ لـە ئێومیـە، لـە ئێمـە گـەورەژنانی دنیایـە، لـە ئێـوەش درك بەکۆڵ، زۆر شت هەیە بۆ ئێمە، زۆریـش لـە سـەر ئێـوە، ئیـسلامی ئێمـە بـە جـوانیی بیستراوە و ژیانی نەفامیی جێگەی ڕەخنە نیە، قورئان، کە کـەلامی خودایـە ئـەوەش لایدا بۆمان دەگێڕێتەوە، وەکو خودا ئەفەرمووێ: (وَأُولُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِـبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ ... بەگوێرەی کتێبی خودا خزم بۆ خزم لە نامۆ نزیکترە، خودا لە هەر شت ئاگادارە)، یان دەفەرمووێ: (إِنَّ أَوْلَـى النَّـاسِ بِـإِبْرَاهِيمَ لَلَّـذِينَ اتَّبَعُـوهُ وَهَـذَا النَّبِـيُّ وَالَّـذِينَ آمَنُـوا وَاللَّـهُ وَلِـيُّ الْمُـؤْمِنِينَ... ئـەو کەسانەی لـە هـەموو کـەس لـە ئیـبراهیم نزیکترن ئەوانەن، کە ئەوسا شوێنی ئەو کەوتوون و ئەم پێغەمبەرە و ئەوانـەش، کـە بڕوایـان پـێ هێنـاوە، خـوداش یـاری هـەموو باوەڕدارانـە)، کەواتـە ئێمـە جـاریّ بـە خزمایەتیی و جارێك بە باوەڕ باشترین.**

**لەو کاتەش، کە کۆچبەران بەڵگـەیان نیـشانی ئەنـساردا لـە ڕۆژی (کەپرەکـە) بـە نزیکیی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليـه وسـلم) و سـەرکەوتنیان بەدەست هێنـا، ئەگـەر ئـەوە سـەرکەوتن بـێ بـەو هۆیـەوە، ئـەوە ئێمـە حـەق وایـە بـە بەڵگـەی بـزانین بـۆ خۆمـان، ئەگـەر سـەرکەوتن بـە شـتی تـر بـووە، ئـەوە ئەنـسار لەسـەر داوای خۆیـان پابەندن، بەهەڵە بۆچوونت وایە، کە من ئێرەییم بـردووە بـە هـەموو خەلیفـەکان و بێفەرمانیم کردووە لەگەڵیان، خۆ ئەگەر ئەوە ڕاست بێ تاوان لە سەر تۆ نییە، هەتا پۆزش لەسەر تۆبێ، ئەوە ناتەواوییەکە شورەیی بۆ تۆ نییە.**

**ئەوجا وتووتە: من وەکو حوشتری گوریس لە لوتکراو ڕایان کێـشاوم بـۆ بەسـتنی پـەیمان، قەسـەم بـەخوا، نیـازت زەم بـووە، بـەڵام ئـەوە مەدحـە ! ویـستوتە خـەڵکیی شـەرمەزار بکـەیت، بـەڵام خـۆت شـەرمەزار کـردووە، چونکە موسـڵمان عـەیب نیـیە ستەملێکراو بێ، ئەگـەر گومـانی لـەباوەڕی خـۆی نـەبێ و یـەقینی گومانـاویی نـەبێ، ئـەوەی بـاسمکردووە بەڵگـەی منـە بـۆ غـەیری تـۆ، بـەڵام بـۆ تـۆ هەنـدێکم بـە پێـی پێویست باسکردووە، ئەوجا باسی ڕوداوی مـن و عوسمانـت کـردووە، ئـەوە بەڕاسـتیی حەقی خۆتە گفتوگۆی لەسەر بکەی لەبەر خزمایەتیت لەگـەڵ ئـەو، بـەڵام لـە مـن و لە تۆ کاممان زیاتر دوژمنکارییمان کردووە و کاممان جێگـەی کوشـتارگەی شـارەزایە، توخوا ئەو کەسەی، کە بەهەموو هێزی یارمەتیی و هاوکاریی خـستە بـەردەمی و لـە**

وەڵامدا قەبووڵی نەبوو وە بە توندیی داوای کرد، کە حەقت نەبێ بەسەریەوە و پێیوت کەسم لە سەر لامەبە، یان ئەو کەسەی بە توندیی داوای هاوکاریی و یارمەتیی لێکرد و کەچی نەهات بە دەمییەوە و بە دەستی ئەنقەست خۆی دواخست، مەرگی بۆ ڕەوانە کرد لە جێی هاوکاریی، هەتا بەو قەزاوقەدەرەی خۆی گەیشت، نەخێر قەسەم بەخودا، خودا بۆ خۆی ئەزانێ کێ سستیی کرد لە هاوکاریی و بەدەنگ ئەیوت بە براکانی وەرە بۆ لام و بگەرە فریام، بەڵام ئەوان پیاوی جەنگ نین و خۆیانی لێنادەن، بەکەمیی نەبێ.

من هەرگیز بیانوو ناهێنمەوە، کە من زۆر کار و کردار و ڕوداوی ئەوم بەدڵ نەبووە و پێم ناخۆش بووە ئەو کارانەی، ئەگەر ڕێنیشاندان و ئامۆژگاریی گوناح بێ، ئەوە زۆر کەس کە لۆمە ئەکرێ بێگوناحە، چونکە زۆر کەس زۆر ئامۆژگاریی دەکا تووشی گومان دەبێ لە خەڵکەوە، بەڵام من هیچ مەبەستم نەبووە (جگە لە ئاشتی و ڕێك کەوتن بە پێی توانام و تەوفیق تەنها لە خودا داوا ئەکەم و تەنها پشتیشم بەو بەستووە)، ئەوەشت فەرمووە: کە گوایە من لەلای تۆ تەنها شمشێرم هەیە، خۆم و یارانم ! لام سەیرە ئەو پێکەنینە پاش ئەو گریان و فرمێسکرژاندنە !.

ئەوە کەی کوڕانی عەبدولموتەللیب لە ڕووی دوژمنان پاشەکشەیان کردووە و بە شمیشێر ترساندونیانن !؟ (کەمێ سەبر بکە هەتا حەمەل دێتە ناو جەنگەوە)، ئەوکاتە ئەوەی تۆ داوای ئەکەی بێتە مەیدانەوە دێت و زۆر لێت نزیك دەبێتەوە و ئەوەی زۆر بە دووری ئەزانی، ئەوە هاتم بە پەلە بۆ لاتان لەگەڵ سوپایەکی زۆر گەورە لە موهاجیر و ئەنسار و شوێنکەوتوانی چاك، کە ئەمسەر و ئەو سەری زۆر پان و بەرینە و تۆزیان گشتگیرە و بەرگی مەرگیان پۆشیوە، حەزیان لێیە لە یەکەم بەیەکگەیشتندا بۆلای خودا بچن، لەگەڵیاندا ئەوەی بەدرییەکان هەیە و شمشێری هاشمی، کە خۆت چاك شارەزای، دەمی شیرەکان لە بەرامبەر براو خاڵ و باپیر و خزمانت چۆنە و (وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ... ئەوانەش لە زۆردار و ملهوڕان دوور نییە).

( ٢٩ )

## نامەیەك بۆ دانیشتوانی بەسرە

لەبەر ئەوەی گوریس و کوڵك و مووتان زۆر شیکردووەتەوە و پرش و بڵاوبوون بەڕادەیەك، حەزم ئەکرد لە بیرتان بکردایە، بەڵام من لە تاوانبارتان خۆش بووم و بە شمشێر شوێنی بەزیوتان نەکەوتم و خۆبەدەستدانم لێقەبوڵ کردن، ئەگەر ڕاوبۆچوونی هەڵە و وێرانکەرتان و لاوازیی و بێنرخیی بیرکردنەوەتان، کە زۆر ناحەقە دەیەوێ دژایەتی من بکات، ئەوە من بە خۆم و سوپاوە نزیك بوومەوە لێتان و کاروانم بارکردووە بۆ لاتان، ئەگەر کارێ بکەن، کە بە مەجبوریی بێم بۆ سەرتان، کارێکتان بە سەر دێنم جەنگی (ڕۆژی جەمەل) لە چاویدا وەك لێسانەوەی دەمی کەوچك وابێت !!، لەگەڵ ئەوەشدا من ئەوەی گوێڕایەڵە ڕێزی زۆری هەیە لام، هەموو ئامۆژگاریتان وەردەگرم، هەرگیز لە تاوانبارەوە ناڕۆم بۆ بێتاوان، لەپەیمانشکێنەوە ناچم بۆ خاوەنبەڵێن.

( ٣٠ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

تەقوای خودا بکە لەو شتانەی لەبەر دەستە و باش جیای بکەرەوە، حەقیان چییە لەسەرت، بگەڕێوە بەگرتنە بەری ڕێگەیەك، کە بیانووی نەزانینت نییە، فەرمان بەجێهێنان نیشانەی دیار و ئاشکرای هەیە، ڕێگەی تەخت و ڕوونی هەیە، ڕێگە بێگرێ و کۆسپە، مەبەست و ئامانج کێ داوای ئەکات، ماف کێیە و مرۆی عاقڵ و ژیر دەیدات بە خاوەنەکەی، پیاوی پەست و نەفسنزم نکۆڵیی لێئەکات، هەرکەس بە هەر ناوێ لەو ڕاستییە لایدا، ستەمکار و نالەبارە و لە ڕاستیی لایداوە، کوێرانە وێڵە و سەرگەردان، دەستی لە نیعمەتی خوداوە ناوە و بەتەمای ئازار و خەشمی خودایە.

وریابە! بگەرە فریای نەفسی خۆت، خودا ڕێگەی نیشانداوی، ئەوە ئۆباڵی کارە چەوتەکانتە بەم شێوەی گەیاندوی، پێدەچێ ئەسپی خۆت بۆ ناوچاڵ دەهاژوی، بۆ کۆڵانی بێباوەڕیی هەنگاو دەنێی، دەروونی خۆت ئەو قورە خەستەی بۆ داناوی،

دەیەوێ لەو لیتەیەت هەڵبکێشێ و بەرەو تیاچوون و لەناوچوونت بەرێ، بەو ڕێگە سەخت و دژوارت ئەبات.

(٣١)

## ڕاسپاردە بۆ حەسەن لە گوندی حازرین کە لە سیفین گەڕایەوە

لەو باوکەی، کە تێدا چووە، دانیناوە بە قورسیی زەماندا، تەمەن پشتی هەڵکردووە لێی، خۆی داوەتە دەستی چەرخی ئەمڕۆ، نەیارە لەگەڵ ئەم دنیا، لە شوێن مردوان جێنیشینە، سبەی نیازی کۆچی هەیە، بۆ ئەو کوڕەی دڵی بەندە بەکارێك، کە پێیناگا، ڕێبوارێکی ڕێگەی ئەوانەیە، کە فەوتان، نیشانەی تیری دەرد و نەخۆشییە، لەناو لەپی دەستی ڕۆژگارە، تیر بەرکەوتووی گشت نالەباریی و بەلایەکە، بەرکەوتووی کۆیلەی دنیایە و بازرگانی لەخۆبایی و قەرزاری گشت مەرگەکانە، دیلی مەرگە و هاوپەیمانی داخ و خەم و خەفەتە، هاوشانی داماویی و ناخۆشییە، پەیکەری دەردەدارییە، کەوتەی ئارەزووەکانە، جێنشینی مردوانە.

ئەو جا... پاش ئەوە، ئەوەی بۆم دەرکەوتووە، کە ئەو زەمانە پشتی لە من کردووە، کات لە من هەڵی تۆڕاندووە و قیامەت بە پیرمەوە هاتووە، ماوەم نییە، کە باسی غەیری خۆم بکەم و گرنگی بەدوا ڕۆژم بدەم، بەڵام من، کە خەریکبوون بە خۆمەوە تاکی کردوومەتەوە لە ئێش و ئازاری خەڵك، کەچی بۆچوون و ڕای خۆم ڕێگەی نەدام و لایدام لە خواستی خۆم، پوختەی کاری خۆمی دایە دەستی خۆم، ئەو کارەش هەنگاوی پێنام بۆ کاری جددی و بێ گاڵتە و شۆخیی و بۆ ڕاستییەك، کە درۆی تێکەڵاو نییە، لەبەر ئەوەی، کە تۆم داناوە بە پارچەیەك لە خۆم، بەڵکو بە تەواوی خۆم تۆم بینیوە، بەڕادەیەك ئەگەر شتێ بەرتۆ بکەوێ، بەرخۆم کەوتووە، ئەگەر مەرگ بۆ تۆ هات بۆ من هاتووە، لەبەر ئەوە هەرچی لای تۆ مەبەستە، لای منیش مەبەستە، وەك مەبەستی خۆم، لەبەر ئەوە ئەم نامەیەم بۆ نوسیویت بۆ ئەوەی لات بێت، ئەگەر مام و ئەگەر مردم، زۆر بە دڵنیاییەوە ڕاسپاردەت ئەکەم بە تەقوا و لەخوا ترسان (ئەی کوڕ خۆم)!.. هەمیشە پابەندییت هەبێ بە فەرمانەکانی خودا، ئاوەدانکردنەوەی دڵ و دەروونت بەیادی خوداوە، دەستگرتن بەو

دەسگیرەی خودا دایناوە، دەبێ کام دەسگیر پتەوتر و قایمتر بێت، لە دەسگیری نێوان تۆ و خودای بەرز ! ئەگەر تۆ دەستی توند پێوە بگری ! دڵت بە زیندوویی ڕابگرە، هەمیشە بە ئامۆژگاریی و بیمرێنە بە وازهێنان لە دنیا و بەهێزکردنی یەقین، ڕووناکیی بکەرەوە بە جوامێریی و حیکمەت، هەمیشە سەری پێ نەوی بکە بە یادی مردن، بڕیاری پێبدە بۆ نەمان و دەرد و بەڵاکانی دنیای لەبەرچاو ڕوون بکەرەوە، هۆشیاری بکەرەوە لە هێرشی زەمانە و ناخۆشیی گۆڕانی چەرخ و زەمان و شەوان و ڕۆژان، هەواڵی چاخەکانی پێشینی بۆ باس بکە، بەیادی بهێنە ئەوانەی پێش تۆ چیان بەسەر هات، بڕۆ سەفەری هەوار و ماڵ و ئاسەواریان بکە، ببینە بزانە چیان کردووە لەو شوێنەی، کە گواستوویانەتەوە لێی، لە کوێ و لە چ ماڵێك نیشتەجێ بوون، ئەو کات بۆت دەرئەکەوێ لە دۆست و خۆشەویستەکان جیابوونەتەوە و چوونەتە وڵاتی غەریبیی و نامۆیی، تۆش وا خۆت دابنێ، کە دەبیتە یەکێك لەوان، کەواتە شوێن پشوودانت چاك بکە و قیامەت بە دنیا مەفرۆشە، ئەوەی نایزانی قسەی لەسەر مەکە، گوتار لەسەر کارێ مەدە، کە لە سەرت نییە، لە سەر ڕێگەیەك مەڕۆ، کە بزانی وندەبیت، چونکە دەستهەڵگرتن لە سەرلێشواویی، چاکترە لە خۆدانە دەست گێژاو، فەرمان بە چاکە بکە لە چاکان دەژمێرێی، نا بکە لە خراپە بەدەست و بە زمان و خۆت دوور بگرە لە خراپە و خراپەکار، بە هەوڵ و کۆششی خۆت و جیهاد لە ڕێی خودا بکە، وەك ئەرك و پێویستیی، لە بەرخودا لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسە، خۆت بهاوە ناو نارەحەتیی بۆ کاری حەق و ڕاستیی، لە هەر کوێ هەبوو، خۆت لە شەرعدا شارەزا بکە، خۆت ڕابێنە لە سەر ئارامگرتن و خۆڕاگریی لەسەر ناخۆشیی، ئارامگرتن ڕەوشتێکی زۆر بەرزە، بۆ هەموو کارێك پەنا بۆ خودا بەرە، چونکە بەو کارە خۆت لە ئەشکەوتی مەحکەم و شوێن پارێزگەیەکی قایم و پارێزەرێکی بە دەسەڵات دەبینی، لە داوا کردن لە خودای خۆت دڵسۆزانە بە، چونکە بەخشین و نەدان، تەنها لای ئەوە، لە هەموو کارەکانتدا بیری قووڵ و تیژ بکەرەوە و چاکە و خراپەی ڕوون بکەرەوە، ئەم ڕاسپاردەم تێبگە، هەرگیز دووری مەخەرەوە لەخۆت و کەناری مەکە، چونکە باشترین وشە ئەوەیە سوودی هەبێ، ئەوەش باش بزانە زانستی بێسوود چاکەی نییە، ئەو زانستەش، کە حەق نییە فێری ببیت سوودمەند نابێت.

کوڕی خۆم! من، کە هەستمکرد تەمەنم بەرە و کۆتایی دەچێ و ڕۆژ بەڕۆژ سست و لاوازتر دەبم، لەبەر ئەوە ئەم ڕاسپاردەم کردی و بازێ کاری باشم بۆ باسکردوی، پێش ئەوەی ئەجەلم نزیك بێتەوە، ئەوەی لە دڵمە بۆ تۆی باس بکەم، پێش ئەوەی هەندێ ڕاوبیرم کەم بکات، وەك لەشم کەم ئەکات، یان پێش ئەوەی هەندێ ئاژاوەی دنیا و ئارەزووی هەواو نەفس داتبگرێ بۆت باس بکەم، ئەوکاتە وەك گیاندارێکی نارەحەت و تووش و سرك بە رچاو بکەوی، دڵی لاو وەك خاکی بێ درك و داڵە، هەرچی تێدا بڕوێنی وەری دەگرێ، لەبەر ئەوە پەلەمکرد بۆ دادانی ئەدەب، پێش ئەوەی دڵت ڕەق بێ و گیانت وابەستە بێ و بتوانی ڕاوبۆچونی ڕاست و ڕەوان پێشوازی بکەی، هەندێ هەرمان هەیە خاوەن ئەزموونەکان ئەرکی بە ئەزموون کردنیان لە کۆڵ تۆ کردووەتەوە، لەسەر تۆ نەماوە خۆت نارەحەت بکەیت و تاقی بکەیتەوە، ئەوەتان بۆ هاتووە، کە ئێمە بە گەنجی هەوڵمان بۆ ئەدا و بۆت ڕوون ئەبێتەوە، ئەوەی لای ئێمە تاریك بوو.

کوڕی خۆم ! من ئەگەر چی تەمەنم زۆر نییە وەك پێشینەی خۆم، زۆرم هەوڵداوە هەواڵیان و دەنگوباسی پێشینەکان بزانم، بە ڕادەیەك بەناو ئاسەواریاندا تێپەڕیووم وەکو ئەوانم لێهاتووە، بەڵکو لەبەر زۆر بیرکردنەوە لە کار و باریان، وەك ئەوەیە لەگەڵ یەکەم کەس و دواکەسیان ژیابم، لەبەر ئەوە ئەزانم ڕوون و لێڵ لە یەك جیا کەمەوە، سوود و زیان ئەناسم، لە هەموویان بۆ تۆ جیام کردووەتەوە، سەرکۆتەڵ و بنبێژنگ، کامیان جوانە بۆ تۆم هەڵبژاردووە، لە تۆم لاداوە ئەوەی نادیارە، ئەوەی بە باشم زانیوە و بۆ تۆ باشە، باوکی دڵسۆز مەبەستێتی و من بە چاکم زانیوە بۆ ڕەوشت و ئەدەبی تۆ، بۆت ئامادە بکەم، تۆیەك، کە لە سەرەتای تەمەن و هەوەڵی عومرتە ڕوو لە زەمانیت، دڵێکی ساف و نیازێکی پاك و دەروونێکی بێخەوشت هەیە، زۆرم مەبەستە، کە دەست بکەی بە فێربوونی قورئان، کە کەلامی خودای بەرزە و فێربوونی مانا و مەبەستەکانی و یاسا و شەریعەتی ئیسلام و حوکمەکانی و حەلاڵ و حەرام، نامەوێ لەوە زیاتر سەرگەرمت بکەم، زۆر ترسم هەبوو، کە لێت تێك بچێ، ئەوەی خەڵکی تر سەرگەردانە لە سەری لە ڕووی بیروڕا و بۆچوون، کە زۆریان لایان شاراوەیە، هەر لەبەر ئەوەیە حەزم کردووە ئەوەت لێ دوبارە بکەمەوە، کە ئاگاداریت زۆر باشترە لەوەی هەنگاو بنێی بۆ کارێ، کە دڵنیا

نیم تووشی زیان نابی و ئومێدم بە خودا هەیە، کە تەوفیقت بدات بۆ ڕێی ڕاست و لە سەر جادەی تەخت داتبنێ، لەبەر ئەوەی ئەم ڕاسپاردەیەم بۆ ناردی، کوڕم ئەوەش بزانە.. ئەوەی زۆرم مەبەستە لە منی وەربگری و بەگوێم بکەی لەم ڕاسپاردەیەدا، خۆپارێزیی و تەقوایە لە خودا، خۆت ڕابێنی لەسەر فەرزەکان و پەیڕەوی ئەو کارانە بکەی، کە باو باپیرانت و پیاوچاکانی ئال و بەیت لەسەری بوون، چونکە ئەوانە ئەوەی باش بووە بۆیان، پشتگوێیان نەخستووە وەك ئێستەی تۆ و بیرکردنەوەیان وەك ئێستەی تۆ، ئەوجا گەڕاونەتەوە بۆ زانیاریی خۆیان و وازهێنان لەو کارەی لە سەریان فەرز نەبووە، دەبێ تۆش وەك ئەوان زانا بیت، هەموو کارێك بە زانست و بیرکردنەوە ئەنجامبدە، نەکەی دوای کاری گوماناویی بکەوی، خۆت لەکاری ئاژاوە و دووبەرەکیی بدەی ! هەمیشە سەرەتای کارت و پێشەوەی ڕوانینت لەو کارانەدا، داوای هاوکاری لە خودای خۆت بکە و مەیلت لای ئەو بێت، کە تەوفیقت بدات و ماوەت نەدات کاری نزیك لە تەمومژ و لەناو کاری گوماناوییت بهاوێ، بتداتە دەستی سەر لێشێواویی و ونبوون، ئەوکات، کە دڵنیا بوویت، کە دڵت پاك و بێ چڵکە و ترست لە خودا هەبوو و فیکرت تەواو بوو و هەموو لایەنێکی کۆکردووەتەوە و هەموو ویست و مەبەستت یەك بوو، ئەوکاتە بە وردیی بیر بکەرەوە و تێ بفکرە لەوەی من بۆم ناردوی، بۆم مانا کردوی و شیمکردووەتەوە بۆت، ئەگەر تۆ بەم شێوەت بۆ ڕیك نەکەوت و بە ئارەزووی خۆت کار نەهاتە پێشەوە و ماوەی بیرکردنەوە نەبوو و تەماشاکردنی کەم بوو، ئەوە بزانە تۆ هەنگاوی کوێرانە ئەهاوێی و خۆت ئەخەیتە تاریکستانەوە، خۆ ئاییندپەروەریش نابێ هەنگاوی هەڵە و تێکەڵ و پێکەڵ بکات و دەست هەڵگرتن زۆر باشترە، زۆر بە وردیی و باشیی لە ڕاسپاردەکەم حاڵی ببە و تێبگە کوڕی خۆم !.. ئەوەش بزانە خاوەنی مردن، خاوەنی ژیانیشە، داهێنەر و دروستکەر، مەرگهێنەریشە، لە ناوبەر و فەوتێنەرە و دوبارە دروستکاریشە، دەردهاوەر و شیفابەخشیشە، ئەو دنیا هەرگیز سەقام گیر نابێ، تەنها لە سەر ویستی خودا نەبێ، ئەویش خۆشیی و ناخۆشیی و پاداشت و تۆڵەی هەیە، لە زیندوو بوونەوەی دوبارەدا، یان هەرچی خۆی ئارەزوو بکا، کە زانست پێی نییە، هەر کارێك لەلات ئاڵۆز بوو و نەتزانی چی بکەیت، ڕاڤەی هەڵەی بۆ مەکە، بیسپێرە بە نەزانینی خۆت، چونکە یەکەمجار بە نەزانیی

**دروستكراوی، لە پاشان فێركراوی و زانیوتە، زۆر شت هەیە تۆ لێی بێئاگای و ڕاوبۆچونت سەرگەردان و وێڵە، چاو ڕێشكەو پێشكە ئەكات، پاشان بە جوانیی دەیبینی، توند خۆت وابەستە بكە بەو كەسەی، كە دروستی كردوی و ڕۆزی داوی و بەم شێوە ڕاوەستاوی كردوی، تەنها و تەنها بەندایەتی بۆ ئەو بكە و بەس، هەر مەیل و دڵت بۆ لای ئەو بێ و ترست تەنها لەو بێت.**

**ڕۆڵە گیان... ئەوەش چاك بزانە هەتا ئێستا، كەس نەیتوانیوە وەك پێغەمبەری ئێمە(صلی الله علیه وسلم)، باسی خودای بەرز و پاك بكات، تۆش ئەو بكە بە چاوساغی خۆت و پێی ڕازیبە پێشپارێز بێ و بۆ ڕێگەی ڕزگاری پێشەوا بێ، منیش كەمتەرخەم نەبووم لە ئامۆژگاریی و پەروەردە كردنت، تۆ خۆت بۆ خۆت بە قەدەر من، هەرچەند زۆر خۆت ماندوو بكەی، كارت بۆ خۆت نەكردووە.**

**كوڕم! ئەوەش باش بزانە، ئەگەر خودا هاوەڵی هەبوایە، ئەوە نوێنەری دەهات بۆ لات و بەشێك لە دەسەڵات و شكۆی ئەوت بۆ دەرئەكەوت و كردار و سیفاتی ئەوت ئەزانی، بەڵام ئەو خودایە تەنهایە و یەكە، وەك خۆی فەرموویەتی و باسی خۆی كردووە، كەس نییە هاودژی لە دەسەڵات و مەزنایەتیی و هەرگیز لە دەسەڵات لانابرێ، هەمیشە و بەردەوام دەسەڵاتداری یەكەم بووە لە پێش شتەكان، بە مانای ئەوەی یەكەمیەتی بۆ دانەنراوە، كۆتایی هەموو شتەكان بێ كۆتایی خۆی، زۆر لەوە گەورەترە، كە خوایەتیی بە دڵ و چاوی ئێمە دیاری بكرێ.**

**كە ئەوەت زانی، ئەوجا كردارت بە شێوەیەك بێ، كە خەڵكی بچووكی وەك تۆ ئەنجامی ئەدا، خۆی بۆ لای پەروەرەندەی خۆی، هەمیشە لە فەرمانی دابێ و ترسی هەبێ لە تۆڵە و سزای و ڕق و تووڕەیی، ئەو خودا هەمیشە فەرمانی بە چاك پێداوی و قەدەغەی خراپەی لێ كردوی.**

**كوڕی من...! ئاگادارم كردوی دنیا و حاڵ و باڵی نەمان و ئازوگویازی[٨] و باسی قیامەتم بۆ كردوی، ئەوەی دانراوە بۆ نیشتەجێكانی و بۆ هەردوو لایان، نموونەم بۆ باس كردوی، بۆ پەند و ئامۆژگاریی لە دنیا و ترست لە قیامەت هەبێ، وێنەی دنیا و ئەزموونەكانی دنیا وەك كۆمەڵێكە لە سەفەردابن، شوێنی حەسانەوەیان بە دڵ**

---

[٨] ئازوگویاز: گواستنەوە

نـەبێ، لەبـەر زبریـی و بێئـاویی و وشکەسـاڵیی و گرانیـی و بـە دڵیـان نـەبێ، لـە جێگەیەکی تر شوێن و مەنزڵیان بۆ ئامادە کرابێ، کە زۆر خۆش و پڕ لە خێر و بێر و بـاخ و باخـات و لەوەڕگـە و هـەموو جـۆرە میـوە، لەبـەر خۆشـی شـوێنی تازەیـان هــەموو شــتیان لــە ناخۆشــیی و قورســیی ســەفەرەکە لەبیرچــووە، لەدۆســت و خۆشەویستانیان دووركەوتنەوە، کە بـەجێیان هێڵاوە و لـە بیرنـەماوە، ناخۆشـیی و مانـدوو بـوونی سـەفەریان فـەرامۆش کـردووە، ئـەو هـەموو ژیـان و ژیـوارە زبـر و سەختەیان لەبیر نەماوە، لەبەر فراوانیی شوێنی نوێیان و هەواری تازەیـان و هـەموو ژیان و ئازاریان سارێژ بووە، بیرناکەنەوە لەژیواری ڕۆژانە و لە قەرزاریی، هـیچ شـتێ نییە خۆشتر لەم جێگەیـە لـە شـوێن و گـەڕەك و شـارەکەیان، نموونـە و وێنـەی ئـەو کەسەی، کە بـەدنیا خەڵەتاوە و تووشـی فێڵەکانی بـووە، وەك ئـەو کۆمەڵـە وایـە لـە شوێنێکی ئاوەدان و هەرزانیی و پڕ لە خۆشیی و دابینکردنی گشت ئارەزووەکان، ئـەم شوێنە خۆشەیان پێ ڕەوا نـەبینن و دوریان بخەنـەوە بـۆ شـوێنێکی وشـك و گـران و سەخت، هیچ شتێ نییە ئەوەندە ئازاریان بدات، لەوە ناخۆشتر لەو شوێنە خۆشە بۆ ئەم شوێنە ناخۆشە بەکتوپڕیی، بەزۆر پەلکێش بکرێن بۆ شوێنی تازەیان.

کوڕی مـن... دەبـێ خـۆت بکەیتـە تـەرازوو بـۆ کێشانەی نێـوان خـۆت و غـەیری خۆت، هەرچی بۆ خۆت پێ باشە و خۆشـە، بـۆ غەیریـشت پێـت خـۆش بـێ، هەرچـی پێت ناخۆشە، بۆ خۆت بۆ غەیریشت پێـت نـاخۆش بـێ، هـەرگیز زۆرداریـی و سـتەم مەکە، کە پێت ناخۆشە خەڵك ستەمت لێبکا، چاکە بکـە وەك حـەزت لێیـە چاکەت لەگەڵ بکرێ، لە بەرچاوت قێزەون بێ، ئەوەی بۆ خەڵك بە قێزەونـی ئـەزانی، خـۆت بە چی ڕازیت، با بۆ خەڵکیش ڕازی بـی، گفتوگـۆ مەکـە لـە سـەر شـتێ، کـە نـایزانی، هەر چەنـد کەمیش بزانی، ئەوەی حەزت لێی نییە بە دەمتا بێـت مـەیڵێ، بـە قـەدەر ئەوەی حەزت لێ نییە، کە خەڵك ئەیڵێ.

ئەوەش باش بزانە خۆ بە چاکزانین و لـە خۆبـایی‌بوون، هەمیـشە دژی ڕاسـتییە، نەخۆشیی ژیرییە، هەوڵ بدە و خۆت ماندوو بکە لە کـاری خـۆت و خـۆت مەکـە بـە خەزنە و گەنجینە بۆ کەس، کە ڕایەکت گرتەبەر زیـاتر لـە خواترسـبە، دەبـێ بزانـی لەبەر دەمت ڕێگایەکی زۆر هەیە، ناخۆشیی زۆرت لەبەرە، دەبێ بە چاکیی و باشـیی ئەو ڕێگەیە ببڕیت، بە ئەنـدازەی ئـەو ڕێگـە تێـشووت پـێ بـێ، نابـێ کۆڵەپـشتت زۆر

قورس بێ، له سەر پشتی خۆت بە ئەندازەی توانای خۆت بار هەڵبگرە، قورسیی بارەکەت مایەی ئازار وماندوو بوونی زیادەیە، ئەگەر ڕێکەوێ هەژار و کەمدەست دەسکەوێ، کە هەندێ شتومەکت بۆ هەڵگرن و لەولاوە پێت بدەنەوە بە هەلی بزانە، با بۆت هەڵگرن و خۆشت چەندت پێکرا، با بەخۆت بێ، چونکە لەوانەیە لەوێ دەست نەکەوێتەوە، ئەوەش بە هەل بزانە ئەوەی داوای (وام)ت لێ ئەکات و تۆش لە دەستە بیدەرێ، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی تەنگانەدا ئەو قەرزە فریات بکەوێ، ئەوەش بزانە لەبەر دەمت پلە و سەختیی و لێرەواری بەرز لە بەردەمتە و سەرکەوتن زۆر زەحمەتە، بارسووك حاڵی باشترە لە بار قورس، ئەوەش به سستیی ڕێ ئەکات، حاڵی خراپترە لەو کەسەی بە پەلە ئەڕوا، ئەوەش باش بزانە نیشتەجێت لەو شوێنە، یان بەهەشت یان ئاگرە، لە پێشەوە تەتەرێ ڕەوانە بکە، زۆر شتی پێبدە بۆ ئەوەی ماڵەکەت بۆ ڕێکبخات، هەتا خۆت ئەڕۆی، چونکە لەوێ یاریدەدەر و هاوکاریی نییە لەگەڵت ماندوو بێ، جگە لە خۆت و کردەوە و کۆششی خۆت نەبێ، ماوەی گەڕانەوەشت نییە بۆ دنیا، هەتا هەندێ شتی باش لەگەڵ خۆت بەری، ئەوەش بزانە درووستکاری گەنجینەکانی زەوی و ئاسمان خۆی ماوەی داوی، کە داوا بکەی و بەڵێنی پێداوی، کە داوا و نزات قەبووڵە، خۆی فەرمانی داوە، کە داوا بکەی و ئەویش پێت ببەخشێ، داوای بەزەیی بکەی، ئەویش ڕەحمت پێ بکات، لە نێوان خۆی و تۆدا دەرگاوانی دانەناوە، هەتا دەست بەڕووتەوە بنێ و بڕیاری نەداوە، کە واستە بەکاربێنی، هەتا واستەت بۆ بکات، دەرگای گەڕانەوە و پەشیمانیی لێ نەگرتووی، پەلەش ناکات لە تۆڵە و سزای نزیك و، شەرمەزارت ناکات بە پاشگەز بوونەوە، ئابڕووت نابا لەو شوێنە، کەحەق وایە ئابڕوت بەرێ، داوات لێ ناکات لە پەشیمانیدا، زۆر خۆت ماندوو و نارەحەت بکەی، زۆر بگرە و بەردەت لەگەڵ ناکا لە سەر تاوانەکانت و چەندوچوونی نییە، هەرگیز بێ هیوا و بێ ئومێدی نەکردوی لە بەخشندەیی و بەزەیی خۆی، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو گەڕانەوە و دەستهەڵگرتن لە تاوان و گوناح بە چاکەی داناوە بۆت، گوناحێك بە یەك لە سەرت نووسراوە و چاکەت بە دە قات، لەگوناح ڕێگەی گەڕانەوەی کردووەتەوە، هەر لەگەڵ یەکەم بانگکردن گوێبیستی تۆیە بە ترس و لە سەرخۆش داوا بکەی ئەو هەر ئاگادارە، کە بە هێواشی پێویستی خۆتی بۆ باس دەکەی و بە نهێنی پێی دەڵێی، با لە دەروونی

خۆشت بێ، سکاڵا و نزای خۆت و ئازارەکانت پێش ئەوە تۆ باسی بکەی، ئەو ئاگادارە و پێی خۆشە هاوکاریت بکا بۆ لادان و لابردنی، پرسیاری لێ بکە، کە ڕەحمەت پێ بکات بە ئەندازەیەك، کەکەس ناتوانێ لە خەزنەی ئەوی زۆرتر لابێ و بەشت بدات، لە هەموو ڕوویەکەوە: تەمەنی زیاد، لەشساغیی، ڕۆزی فراوانی، ئەوەتە هەموو کلیلی خەزنەکانی داوەتە دەست خۆت، کە ڕێگەی داوا کردنی لێ نەبەستوویی، هەر کات بتەوێ ئەتوانی بەداوا و نزاو پاڕانەوە، دەرگای نیعمەتەکانی لەسەر خۆت واز بکەی، ڕێژنە بارانی ڕەحمەتی بەسەر خۆتا ببارێنی، نەکەی هەرگیز گیرابوون بە دوور بزانی، چونکە لای بەخشندەیی پەیوەندە بە نیازەوە، بۆیە هەندێ جار دوای ئەخا، هەتا زیاتر و گەورەترت بداتێ، زۆر جار وارێك ئەکەوێ داوای کارێ ئەکەی و بۆت درووست نابێ، بەلاّم لە لایەکی دیکەوە دوور، یان نزیك لە داواکەی خۆت زیاترت بۆ دێ و لەوەی خۆت، کە بۆت نەکراوە، باشترت بۆ ئەنجام دەدرێ، زۆر جار تۆ خۆت نازانی لە داواکەت تیاچوون و زیانی بۆ خۆت تێدایە، ئەگەر بۆت قەبوڵ بکرێ، لەبەر ئەوە، با داواکەت بۆ شتێ بێ سوودی تۆی تێدا بێ و زیان و ئازاری نەبێ و پەرچەکرداری نەبێ بۆت، مەرج نییە سامان بۆ تۆ، تۆ بۆ سامان بی، بزانە تۆ بۆ ئەو دنیا درووستکراوی نەك بۆ ئەم دنیا، بۆ نەمان نەوەك بۆ مان، بۆ مردن نەوەك بۆ ژیان، بۆ هەواری کەمماوە و کەمژیان و سەفەر بۆ قیامەت، تۆ نێچیری مەرگی، کەس لە دەستی دەرباز نابێ و هەر ئەبێ دەستگیر بی، ئاگاداربە نەوەك لەکاتی ناوەخت و خراپ لە سەرت حازر بێ، لەوانەبیت خۆتی لێ پاشگەز بکەی و فریای نەکەوی، مەرگ ماوەت نەداو خۆت بەدەستی خۆت بخەیتە چاڵەوە.

## باسی مەرگ

ڕۆڵەی من...! زۆر یادی مردن بکە، یادی ئەو حاڵە بکە، کە بەرە و ڕووی دەبیتەوە و دوای مردن بەسەرتدێ و تووشی دەبی، بۆ ئەوەی، کە هات تۆ ئامادەیی تەواوت بۆی هەبێ، هێز و توانای خۆتت بۆ ئامادە کردبێ، نەوەك کتوپڕ سەرت لێدا و تۆ سەرت لێبشێوێ، نەکەی تۆش وەك دنیاویستەکان، کەوا دەزانن نەمرن تێیدا و ڕاوڕاوێنی بۆ ئەکەن و بازی بۆ ئەدەن، چونکە ئاگادار و هۆشیاریی پێداوی و هەواڵی مردنی بۆ داوی و هەموو خراپە و گەنییەکەی بۆ باسکردووی، بۆی ڕوونکردویتەوە،

کە دنیاپەرست لە گەلێك شەڕکەر و وەڕەکەر و دڕندەی گۆشتخۆر و بە پەلامار، نەك بۆ تۆ لە یەکتر ئەوەڕن و هێرش دەبەن، زۆرداری زۆر ئەخوا، گەورە بچووك دەسگیر ئەکات و زاڵە بەسەریا، کۆمەڵە ئاژەڵێکە هەندێ پێوەنکراوە، هەندێ بەرەڵایە و عەقڵ و فامی لەدەستداوە و ڕێی نادیاریان گرتووەتە بەر، لەوەڕیان دەرد و دەغەزارییە لە شیوی لێرەوار و سەخت و ڕەق، کە شوانیان لەسەر نییە بتوانێ کۆیان بکاتەوە، بە چاکیی لەوەڕگەی باشیان بۆ پەیدا بکات و تێیدا بلەوەڕێن، دنیا کوێرانە دەستی گرتوون، پەلکێشی کردوون بۆ خراپە و سەرپۆشی لەسەر چاویان بەستووە، بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕاست نەبینن، سەرلێشێواو و سەرگەردان و چەواشەن، لە نیعمەتەکانیدا خنکاون، پەنا بەخوا بە پەروەردگاری خۆیانی دەزانن، ئەوان یاری و گەمە بە ئەو ئەکەن، ئەمانیش یاری و گاڵتە بەو دەکەن.

## نەرم و سووك داواکردن

ئەوە کەمکەم تاریکیی نامێنێ و کەژاوە و کاروان نزیکە بگاتە هەواری تازە، ئەوەی کەمێ پەلە بکات لەوانەیە زوو بگاتە مەنزڵ.

ئەوەش چاك بزانە ئەوەی وڵاخی سواری شەو و ڕۆژ بێ، زوو ئەگاتە بەرۆ، بەڵام ڕاوەستاو و بێ لڤین بێ و ماوەکە بە هێمنیی و ئارامیی ببڕێ، بزانە بە یەقین ناتوانی هەموو ئاواتەکانت بەدەست بێنی، ناشتوانی خۆت لە ئەجەل کەنار بکەی، تۆش هەمان ڕێبواری ڕێگەی پێشینی خۆتی، کەمێ داواکاریی کەم بکەرەوە و هەوڵ و پەیداکردنت با جوان بێ، زۆر کاسپیی و بازرگانی تووشی تاڵانیی دەبێ، ئەوە نییە، کە هەموو کاسبکارێك ڕزقی زۆری هەبێ، ئەوەی بە نەرمیی و هێواشیی کاسپی بکات بێبەش بێ، دەبێ زۆر بە وردیی خۆت بپارێزی لە سووکیی و بەدناویی، با زۆر بە چاکیی دەستت ڕاکێشێ بۆ دەسکەوتی زۆر، چونکە هەرگیز قەرەبووی ئابڕو چوونت بۆ نابێتەوە، نەکەی خۆت بکەی بە بەند و کۆیلەی کەسیتر، کە خودا بە ئازادیی درووستی کردووی، هەرگیز ئەوە خەیر نییە، کە بە شەڕ دەستت بکەوێ، ئەو ئاسانە ئاسان نییە بە قورسیی دەسکەوێ، نەکەی زۆر پەلە بکەی بە وڵاخی سوارییەکەت و باری تەماع، نەوەك بتخاتە چاڵاوی فەوتان و تێدا چوون، ئەگەر بۆت بکرێ، با لە نێوان تۆ و خودا کەسێك نەبێ، کە نیعمەت و بەخشندەیی هەبێ بۆت،

چونکە تۆ ڕزق و ڕۆزیی و بەشی خۆت، هەر دەست ئەکەوێ، ئەو کەسەی لە خوداوە دێت، زۆر گەورەترە لەو زۆرەی لە خەڵکەوە دێت، هەر چەندە هەر خودا ناردویەتی.

## هەندێ سپاردەی دیکە

بە فریای خۆت بکەوی لە بێدەنگیی، کاری ناپەسەندت نەبێ زۆر باشترە، لە هەوڵی بەدەست هێنانەوەی ئەوەی لەدەستت دەرچووە، ئەوەش لە قسە و وشە و گفتوگۆت، پاراستنی ئەوەی لەناو کونە و خەروارەکەتدا هەیە، بە توند گرێدانی دەمیان و پاراستنی ئەو شتەی لەدەستت دایە، لای من زۆر خۆشترە، لە داواکردنی شتێ لە دەستی خەڵکی دیکە، تفتوتاڵیی نائومێدیی، زۆر چاکترە، لە سواڵکرن لە خەڵك، پیشەی بەرێز لە پاکیی و چاکیی، باشترە، لە سامانی زۆر لەگەڵ ناپاکیی و ناپەسەندیی، مرۆڤ خۆی باشتر نهێنی خۆی ئەپارێزێ، زۆر کەس هەیە هەنگاوی زیانی خۆی دەهاوێ ! هەر کەس زۆر بڵێ بێجایی زۆر ئەڵێ، ئەوەش بیربکاتەوە و ببیێژێ ڕوون ئەبینێ، هاوڕێی چاکان بکە لەوان دادەنرێی، دووربە لە پیاو خراپان، دوور ئەبی لە خراپەی زۆر گەن و پۆخڵەتیکەی حەرام، ستەم لە بێدەسەڵات خراپترین ستەمە، ئەگەر نەرمیی توندوتیژیی تێدابێ توندوتیژییەکی نەرمە، زۆر جار دەرمان دەرمە، درم دەرمانە، ڕێکەوت ئەبێ ئامۆژگاری نادڵسۆز سودمەندە، زۆر جاریش دەبێ ئەوەی ئامۆژگاریت ئەکات ناپاکە.

نەکەی هەرگیز و هەرگیز پشت ببەستی بە ئاوات و ئومێدی زۆر دوور، چونکە کوتاڵ و سەرمایەی گەمژە و گێلەکانە، عەقڵیش فێربوونی ئەزموون و تاقیکراوەکانە، باشترین شتێك، کە تاقیکرابێتەوە ئەومیە ئامۆژگاریی و پەندت دادات، هەڵەکان بقۆزەوە پێش ئەوەی هەناسەت دەربچێ و بخنکێی، هەموو داواکارێك دەسکەوتی نابێ و هەموو بزرێك ناگەڕێتەوە، گەندەڵیی لەناوبردنی تێشووە و لەوە گەندەڵتر لەناو بردنی تێشووی ئەو دنیایە، هەموو کارێك کۆتایی هەیە، ئەوەی قەدەری تۆیە هەر بۆت دێ، بازرگان لە ناو مەترسیدایە، زۆر کەم بەرەکەتی لە زۆر زیاترە، هاوکاری نەفسنزم باش نییە، هاوکاری بەدگومان بێسوود و بێ نرخە، لەگەڵ زەمانە ئاسان بەو گونجاوبە، هەتا وڵاخی بارەکەت بێزییان و هێمن بێت، هیچ کاری

له دەست مەدە، به تەمای لەوە زیاترمەبە، نەكەی سواری وڵاخی تووڕە و سەركەش بیت، لەكاتی دەنگوەرگرتن له براكەت، تۆ دەستپێشخەربە بۆ پەیوەندیی و لە پشت تێكردنی، تۆ زیاتر نەرم و نزیكبەو لەكاتی ڕژدیی و دەست قوچانی، تۆ دەسەنەت زیاد بێ، له كاتی دوورەپەرێزیی ئەو، تۆ نزیكبە، هەتا ئەو تووڕە و توند بێ، تۆ نەرم و نیانبە و له كاتی كەتنیدا به هانەی بۆ بدۆزەرەوە، هەتا ڕادەیەك به بەندەی خۆیت بزانێ و خاوەن نیعمەت و وەلی ئەمری تۆیە، بەڵام دەبێ زۆر هۆشیار و بەئاگا بیت، ئەوانەی پێشوو نەكەی له جێگە خۆی نەبێ و شایستە نەبێ، یان لەگەڵ كەسی نائەهل و ناپەسەند بیكەی، نەكەی دوژمنی دۆست بكەیتە دۆست، ئەوكاتە دۆستت له دەست دەدەی، تۆ ئەبێ به دڵسۆزیی ئامۆژگاریی و پەندی براكەت بدەی به چاكە، یان به خراپە ڕقی خۆت بخۆرەوە و كاری پێمەكە، من بۆ خۆم ڕقخواردنەوەم زۆر لا شیرین بووە، سەر ئەنجام و زۆر به لەز هاتووەتەوە بەرچاوم، نەرمبە لەگەڵ ئەوەی زبرە لەگەڵت، چونكە به نەرمیی تۆ نەرم ئەبێ، بەرامبەر دوژمن چاكەت هەبێ، چونكە یەكێكە لەو دوو جۆرە سەركەوتن و گەیشتنە به ئامانج، ئەگەر ویستت جیا ببیتەوە لە براكەت بەشی ئەوەندە بهێڵەوە، كه بتوانی دووبارە پەیوەست بیت پێیەوە، ئەگەر ڕۆژێ ئەوەت به باش زانی، هەر كەس ئومێدی چاكەی لێ كردی ئومێدەكەی جێبەجێ بكە، نەكەی مافی براكەت بخۆی به پشت بەستن به برایەتیی، چونكە ئەوە برایەتیی نییە به ناوی برایەتییەوە حەقی بخۆی، نەكەی كارێ بكەی ماڵ و خێزانت ناڕەحەت بن بەدەستەوە، ئەو كەسەی مەیلی نییە بۆت، تۆش خۆتی لێ نزیك مەكەرەوە، هەوڵبدە چەندێ براكەت حەزی له دووركەوتنەوەمیە، تۆش زیاتر حەزت له نزیكیی بێ، یان چەندە ئەو حەزی له ناحەزیی تۆبێ تۆ زیاتر لەو حەزت له چاكە بێ، ستەم لەو كەسەی ستەمت لێ ئەكات به گەورە مەزانە، چونكە ئەوە زیانە بۆ ئەو و سوودە بۆ تۆ، پاداشتی ئەوەی دڵخۆشت ئەكات ئەوە نییە تۆ دڵی عاجز بكەی.

كوڕی من...! باش بزانە ڕۆزیی دوو جۆرە، یەكێك تۆ له شوێنی و یەكێ ئەو له شوێنی تۆیە، ئەگەر تۆش بۆی نەڕۆی ئەو هەر دێت بۆ لات، زۆر شورەیی و ناشیرینییەكانی هەژاریی و سەرنەوی كردن و لوتبەرزیی كاتی ساماندارێی ئەوەی له دنیا بۆت دەمێنێتەوە، ئەو كارەیە كه شوێنەوارەكانی هەمیشەت ڕێكدەخات، ئەگەر

ویستت خۆت سەغڵەت بکەی بۆ ئەو شتەی لە دەستتداوە، ئەبێ زیاتر بۆ ئەوە بێ، کە بە دەستت نەگەیشتووە، هەمیشە بۆ زانینی پاشەڕۆژ و پێشبینی نەهاتوو لە بەها و شێوەی ڕابوردوی پەند وەربگرە، چونکە شتەکان هاوشێوەی یەکن و پارچەیان بۆ یەکدی ئەگونجێ، نەکەی لەو کەسانە بی، کە پەند وەرناگرن، هەتا ئێشیان پێ نەگەیەنێ، ئینسانی بە ئەدەب پەند وەردەگرێ و ئاژەڵ بە لێدان، لە خۆت بکەرەوە و دارنە خەمی داهاتوو، لەمەولا بە توانستی ئارامیی و خۆڕاگریی و بڕوای پتەو و تەواو هەر کەس لە ناوەڕاستی ڕێگە لایدا ستەمکارە لە خۆی، یار و یاوەری باش هاوپشتە، دۆست ئەوەیە لە پاشملە دۆست بێ، حەزی زۆر جۆر بکە لە کوێریی، زۆر کەسی دوور هەیە زۆر لە نزیك نزیکترە، زۆر نزیك هەیە لە دوور دوورترە، غەریب و نامۆ ئەو کەسەیە دۆستی نییە، هەر کەس لە ڕاست لایدا ڕێگەی خۆی تەنگ دەکاتەوە، هەر کەس قەدری خۆی زانی قەدری زیاتر ڕادەگیرێ، پتەوترین پەیوەست ئەو پەیوەستەیە لە نێوان تۆ و خودادا هەیە، هەر کەس بێ موبالات و نادەربەست بوو لە ئاستت، ئەوە دوژمنە لەگەڵت، زۆر بێ ئومێدیی لەکامیابی باشترە، ئەگەر هەڵپە کردنی تیاچوون بێ، نابێ هەموو شوێنێکی شەرمگە دەرکەوێ و نابێ هەلێك دەستکەوێ، زۆرجار چاوساغ هەڵ ئەکەوێ و نوچ دەدا و کوریش باش ڕێگە ئەبڕێ، بۆ کاری خراپ و نادرووست پەلە مەکە، چونکە هەر کات بتەوێ ئەتوانی پەلە بکەی بۆی، دووریی لە نەفام هاوتایە بە ڕەفیقی چاك، هەر کەس بێ خەم بوو لە زەمانە، زەمانە پەندی پێدا دەدا، هەر کەس زەمانە گەورە ڕابگرێ گاڵتەی پێ ئەکات، ئەوە نییە هەر کەس تیری تەقاندبێ بیپێکێ، کەی گەورەی وڵات گۆڕا، زەمانە گۆڕاوە.

پرسیاری هاوڕێ پێش کەوتنە ڕێ، پرسیاری هاوسێ پێش وەدەست هێنانی خانوو، هەوڵبدە زۆر دووربی لەگێڕانەوەی قسەی گاڵتەوگەپ و پێکەنین، با لە خەڵکەوە بیشی گێڕنەوە.

## ڕاوبۆچوون دەربارەی ژن

نەکەی ڕاوێژ بە ژن بکەی، چونکە ڕاو بۆچونیان کەم و کورتە[9] و عەزمیان کزە، هەوڵبدە بە هۆی چارشێوەوە چاویان لێ بپارێزی، چونکە سەرپۆش بۆیان زیاتر دەیانپارێزێ، ئەوەش بزانە دەرچوونیان خراپتر نییە لە هێنانی کەسانێ، کە جێگەی باوەڕ نین بۆ لایان، ئەگەر بتوانی تەنها خۆت بناسن ئەوە بەو شێوە کار بکە، ئەوەندە کار مەدەرە دەستی، کە لە توانای خۆی دەرچێ، چونکە ژن ڕەیحانەی بۆنخۆشە، پاڵەوان و قارەمان نییە، ڕێزگرتنی زیاد لە کێشی خۆی لێ مەگرە، نەوەك تەماع بکات واستە بۆ کەسی تر بکات.

هەرگیز نەکەی غیرەی لەگەڵ بکەی، جگە لە شوێن و کات و کەسی شایستەی غیرە، چونکە ئەو دڵپیسیی و غیرەیە، ڕاستیش نەخۆش ئەخاو پاك و پاکیزەش دەخاتە جێگەی گومان و دڵەڕاوکێ، هەموو ئەو کەسانەی لە بەردەستت کار ئەکەن سەر گەرمیان بکە، هەر کەس کاری خۆی و باری خۆی، چونکە ڕێگرە لە پشتبەستن بە یەکتر و ئەم بەتەمای ئەو، ڕێزی تەواوی هۆز و خێڵی خۆت ڕابگرە، چونکە ئەوانە ئەو باڵەن، کە پێی ئەفڕی و ئەو نەژادەیە، کە دەچیتەوە سەری و ئەو دەستەیە، کە هەوڵی پێ ئەدەی و دەستی پێ ئەوەشێنی.

## نزاو پاڕانەوە

وەی ئیتر ئەوە سپاردمی بەخودا، خۆت و دین و دنیات، داواکارم لە خودا، کە چاکت بۆ بکا، ئێستە و لەمەولا و دنیا و قیامەت، ئەگەر خودا ویستی بێ.

---

[9] ئەم قسەیە پێچەوانەی کردەوەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، چونکە پێغەمبەر بە ڕاوبۆچونی (أم سلمه)ی خێزانی کردوە لە سوڵحی حودەیبیە، ئەوە بو ڕاو بۆچونی (أم سلمة) هەمو سەحابەی لەسەرپێچی ڕزگارکرد. بڕواش ناکەین ئەمە ڕاو بۆچونی ئیمام عەلی بێت، بەڵکو بە زمانی ئەو هەڵبەستراوە . (بلاّوکار)

( ٣٢ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

تۆ ئەزانی چیتکردووە، یەك نەوەت لە خشتە بردووە و فەوتاندووتە، بە زۆریی چەواشە و فێڵت لێکردوون، بەم یاخیبوون و سەرکەشییەت لەناو شەپۆلی دەریای خۆتت هاویشتوون، تا ڕێگەگەلێك دایپۆشیوون، لەناو شەپۆل وگێژاودای، کارە گوماناوییەکان نوقمی کردوون، نازانن بۆ کوێ لێبخوڕن، جارێ بۆ پێش و جارێ بۆ دواوە دەگەڕێنەوە، هەندێ بۆ پێشەوە و هەندێ جاریش بۆ دواوە دەگەڕێنەوە، هەموویان پشتبەستوون بە کرداری خۆیان، جگە لەوانە، کە دەگەڕێنەوە بۆ ڕاستیی لەو ژیر و چاوڕۆشنانەی ڕاستیپەروەر، ئەوانە زوو فریا کەوتن، کە تۆیان ناسی، جیابوونەوە و بەلەز گەڕانەوە بۆ لای خودای خۆیان و دەستیان هەلگرت لە هاوکارییت، چونکە تۆ ڕێبازی سەخت و گرانت پێ دەبڕین و لە ڕاستەڕێگەت لادابوون، کەواتە ئیتر لە خودا بترسە مەعاوییە...! بە خۆتا بچۆرەوە، ڕێسمە و ڕەشۆت لە دەستی شەیتان وەرگرەوە، ئەو دنیا تا سەر بۆ تۆ نامێنێ و قیامەت زۆر نزیکە بۆت، ئیتر سەلام.

( ٣٣ )

## نامەیەك بۆ قوسەمی کوڕی عەباس کە لە مەککە کارگێڕی بوو

ئەوجا پاش ئەوانە... حەز ئەکەم بزانی، کە من چاوم لە هەرێمەکانی ڕۆژئاوایە، کە ئاگاداری کردووم ئەمساڵ بۆ کاروانی حەج هەندێ کەسی ئەهلی شامی ڕەوانە کردووە، کە بەڕاستیی پەردە لە سەر چاویانە و کەڕوکاسن و کوێریی سەر دڵی گرتوون، ئەوانە داوای حەق بەکرداری ناحەق ئەکەن، فەرمانی بەندەی دروستکراو جێبەجێ ئەکەن بۆ بێفەرمانیی خودای دروستکار، ئەیانەوێ گوانی دنیا بدۆشن و شیری لێ وەربگرن و ئاڵۆگۆڕیان کردووە بەئایین، حازر ئەکرن بە دوا ڕۆژی پیاوچاکان و لەخودا ترسان، تەنها چاکەکار چاکەی دەست ئەکەوێ و پاداشتی شەڕ و خراپە تەنها بۆ شەڕخوازە، بەو هێزەی لە دەست هەڵدەستێ بە عەزموجەزمی توندوتۆڵ و ئامۆژگاریی و ژیر و زیرەکیی، شوێنکەوتووی گوێ بە

فەرمانی پێشەوای خۆی، نەکەی کارێ ئەنجامبدەی پێویستت بە عوزرخوایی هەبێ و لەکاتی سەرکەوتن و ناز و نیعمەت لە خۆبایی و لە کاتی جەنگ و هەرادا ژێرکەوتوو بیت، لەگەڵ سەلام.

( ٣٤ )

## نامەیەك بۆ محەممەدی کوڕی ئەبوبەکر، لەوکاتەی کە توڕە بووە لەسەر لابردنی و ناردنی مالیکی کوڕی ئەشتەر بۆ شوێنەکەی و مردنی مالیك لە ڕێگەدا، پێش ئەوەی بگاتە میسر

وام بیستووە کە تووڕە بووی لە ناردنی ئەشتەر بۆ سەر کارەکەی تۆ، مـن ئـەوەم نـەکردووە لەبـەر ئـەوەی تـۆ سـستیت کردبـێ، لـە هـەوڵی بەرچاو، یـان چـاوەڕوانی زیادەهـەوڵ، ئەگـەر ئـەو کـارەم لێ وەرگرتبیـت و لـە دەسـەڵات لامـدابی، ئـەوە کـاری سووکتر و باشـتر و کـەم ئـەرکترم بـۆ دانـاوی، خـۆت زۆر بەدڵتـە و حـەزت لێیـە، ئـەو پیاوەی، کە کاری میسرم پێسپارد، پیاوێکی دڵسۆزی ئێمە بوو، زۆر توند بوو لە سـەر نەیارەکانمان و بەڕاستیی ڕقـی لێیـان بـوو، خـودا بـەزەیی پێـدا بێتـەوە، ڕۆژی خـۆی تەواو کردبـوو بـە مـەرگی ئاسایی خـۆی گەیـشت، ئێمـەش لـەو ڕازی بـووین و خـودا ڕەزامەنـدیی خۆی پێبدا و پاداشتی شایستەی بداتەوە.

کەواتە تۆش خۆت و سوپاکەت لە دەست ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەسـتە، هـەنگاوت لە سـەر ڕوونـاکیی و ڕۆشـنبیریی بێـت، خـۆت هەڵبکە و گـورج بکـەرەوە بـۆ جـەنگی ئەوەی شەڕت پـێ دەگێـڕێ، هەمیـشە بانگەوازخوازبـە بـۆ لای خـودای پـەروەردگار و زۆر زیاد داوای یارمەتیی لە خودا بکە، ئـەو ئەگاتـە فریـات و بـە تـەنگ مەبەسـتەوە دێت، یارمەتیی و هاوکارییت ئەکات بۆ کاری خۆت، ئەگەر خودا حەز بکا !.

( ٣٥ )

## نامەیەك بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پاش کوشتنی محەممەدی کوڕی ئەبو بەکر لە میسر

ئەوجا پاش ئەوە... میسر گیراوە و محەممەدی کوڕی ئەبوبکر خودا ڕەحمی پێبکا شەهید بووە، ئێمە لای خودا داوای ئەجر و پاداشت ئەکەین بۆی، کوڕێکی دڵسۆز و مەرد بوو، کارگێڕێکی کارگوزار و چالاك بوو، شیرێکی بڕندە بوو و پایەیەکی قایم بوو، من زۆرم هەوڵدا، کە خەڵك ڕەوانە بکەم بگەنە فریای پێش ڕوودانی کارەساتەکە، هاوارم کرد بە ئاشکرا و نهێنیی، یەکەم جار و دووبارەم کردەوە، بەڵام هەندێ بە نابەدڵیی و هەندێ بەدرۆ خۆی کردە نەخۆش و هەندێ بە بەزیوویی پاڵی دایەوە، داواکارم لە خودای بەرز و بێهاوتا لە برینی ئەوانە دەرگای بە پەلە و زووم لێ بکاتەوە، قەسەم بەخودا، لەبەر ئەوە نەبوایە، کە حەزم لە شەهیدبوونە ڕووبەڕووی دوژمن و دڵنیابوونم لەمردن، حەزم ئەکرد لەگەڵ ئەمانە تەنها ڕۆژێ نەمێنمەوە و بەم جۆرە کەسانە ڕوو لە دوژمن نەکەم.

( ٣٦ )

## نامەیەك بۆ عەقیلی کوڕی ئەبو تالیبی برای کە سوپای بۆ ڕەوانەکردووە و وەڵامی داوەتەوە

ئەوجا سوپایەکی زۆرم بۆی ڕەوانە کرد، لە باوەڕداران کاتێ بەوەی زانی چاکی لێهەڵکرد بۆ ڕاکردن و ملی شۆڕ کرد بە پەشیمانیی، بەڵام لە ڕێگەدا پێی گەیشتن، نیوەی ڕێ بوو خۆر بەرەو بچووك بوونەوە دەڕۆیشت، کەمێ بە یەکداهاتن و نەهاتن ! وابزانە کاتژمێرێك بوو تف لەدەمیدا وشك بوو، کەمی مابوو بخنکێ، کە دەست خرایە ملی، بە حاڵ گیانی تێدا مابوو، زۆر بە سەختیی گیانی مابوو دەرچێ، لەبەر ئەوە واز لە قوریش بێنە با پەلەقاژەی گومڕایی خۆیان بکەن و بە دوای ڕێگەی وندا ڕاوڕاوێن بکەن و هاتووچۆیان بێت، لە دووبەرەکیی و ئاژاوەدا، سمکۆڵانیان بێت لە سەر لێشێواویدا، چونکە ئەوانە کۆدەنگن لەسەر بەربەرەکانی من، بە هەمان شێوەی

شەڕ و جەنگیان لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێش من دەردی خودا لە جیاتی مندا پاداشتیان بداتەوە بەو شێوەی، کە شایستەن، چونکە ئەوانە نزیکیی و خزمایەتیی منیان پساند و تالانی دەسەڵاتی کوڕی دایکی خۆمیان لێکردم.

لەبارەی پرسیارت کردووە، کە شەڕ بکەین لەگەڵیاندا؟ ئەوە من بیروڕام وایە شەڕ لەگەڵ ئەوانە بکە، شەڕیان لا حەڵاڵە، هەتا ئەگەمە بارەگای خودای خۆم، هەرگیز بە زۆری خەڵك لە دەورم سەربەرز نابم، بە بڵاوەکردنیشیان تووشی هەست بە بێکەسیی ناکەم، گومان نەبەی (کوڕی باوکت)! هەرچەند خەڵکی دەور و بەری ڕوخاو، بە زەبوونیی پاڕانەوە و لالانەوە، سەر بۆ ستەم نەوی بکات و بە لاوازیی و ئاسانیی ڕەشوەی خۆ لە دەست بدات، پشتی نەوی بکات بۆ سواری کەژاوەی ئەوانە، بەڵام وەك برادەری خێڵی تەمیم ئەڵێ: ئەگەر پرسیارت ئەوەیە، کە من چۆنم، من خۆڕاگرم لە سەر نەهاتیی زەمان و توندم، زۆرم پێ گرانە خەم و خەفەت لە ڕوما ببینی، نەوەك دوژمن شادو دۆست غەمبار بێ.

( ٣٧ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

پاکیی و بێگەردیی تەنها بۆ خودا، ئای تۆ چەند وابەستەی بە ئارەزووە ناپەسەندەکانتەوە، چەندە سەرگەردان و وێڵی هەوەسەکانی خۆتی، لەگەڵ هەوڵی بێوچانت بۆ ونکردنی ڕاستییەکان و ڕەدکردنەوەی هەموو بڕوانامەکان، کە خودا خۆی داوای کردووە و بەڵگەی درووستە بۆ خەڵکیی، ئەوە باش ئاگاداربە ئەو هەموو بڕوبیانووەی هەتە بۆ بکوژانی عوسمان، ئەوە تۆ یارمەتی عوسمانت ئەدا بۆ یارمەتی خۆت بووە، نەك بۆ ئەو، ئەو کاتەی ئەو پێویستیی بە هاوکاریی و یارمەتیی تۆ بوو، لات چۆڵکرد و یارمەتیت نەدا، ڕێزو سەلام.

( ٣٨ )

## نامەیەك بۆ ئەهلی میسر كە ئەشتەری كردە فەرمانڕەوایان

لە بەندەی خودا عەلی میری باوەڕداران بۆ ئەو نەتەوەی ڕقیان بۆ خودا بوو، كە بێفەرمانیی دەكرا لە خاكی خۆیدا و حەقەكانی داگیرا و ستەم و مل هوڕیی چادری خۆی هەڵدا لەسەر چاك و خراپ، دانیشتوو و كۆچبەر و ڕێبوار، شوێنێكی ئارامی تێدا نییە، كە پشووی تێدا بدرێتەوە بۆ حەسانەوە، خراپەش كەس خۆی ناكا بە خاوەنی قەدەغە كردنی.

ئەوجا پاش ئەوە، ئەوە من بەندەیەكی خودای بەرز و بێهاوتام نارد بۆ لاتان لە وانەیە، كە لە ڕۆژی ترس و هەڵادا خەوی نییە، ترسنۆك نییە ڕووبەڕووی دوژمن و لە ناڕەحەتیدا لە ئاگر سوتێنەرترە بۆ پیس و نەفسنزمەكان، ئەویش مالیكی كوڕی حارسە برای هۆزی مەزحیج، گوێبیستی بن و بە فەرمانی بكەن، لەو كارانەی، كە لەگەڵ حەق و ڕاستیدا جووتە، چونكە شێرێكە لە شێرەكانی خودا، تیژە، كول نییە دەمی و كاتی بەكارهێنانی نەبڕ نییە، هەر كات فەرمانی پێدان بە كۆبونەوە و هێرش بردن بە فەرمانی بكەن و پێی وتن دانیشن ئێوەش دانیشن، چونكە پەلاماری و پاشەكشەی و پێشچوونی و گەڕانەوەی، تەنها بە فەرمانی منە، بۆ ئێوەم باشتر زانیوە هەتا بۆ خۆم، چونكە دڵسۆزتانە و ئازا و نەبەرد و بەهێزە و دوژمنشكێنە.

( ٣٩ )

## نامەیەك بۆ عەمری كوڕی عاس

ئەوجا... تۆ ئاینی خۆت كردووە بە پاشكۆی دنیای كەسێك، كە یاخیبوونی دیار و ڕوونە، نهێنیی و شاراوەی بێپەردەیە، مەردی جوامێر لە دیوەخانیدا شەرمەزار دەبێ، پیاوی بە حیلم و حەوسەڵە بە تێكەڵیی لەگەڵیدا گێل و گەمژە دەبێ، ئەوە تۆش شوێنپێت هەڵگرتووە و بە تەمای چاكە و بەخشینی ئەوی، وەك سەگ دوای شێر بكەوێ و لەمۆزی بلێسێتەوە، پەنا بەرێ بۆ چنگ و نینۆكی و كلكەلەقە و چاوەڕوانی پارچەیەك لە خۆی زیاد لە نێچیرەكەی بۆ فڕێ بدا، ئەوجا بە دەستی خۆ دنیا و ئاخیرەتی خۆت دۆڕاندووە، خۆ ئەگەر ڕێگەی ڕاستیی و درووستیت

بگرتایه ئەوەی مەبەستت بوو دەستت دەكەوت، ئەوەش بزانە ئەگەر خودا كردی و سەركەوتم بەسەر تۆ و كوڕی ئەبوسوفیاندا، پاداشتان دەدەمەوە لە ئاستی كردەی پێشینەتان، خۆ ئەگەر ئێوە منتان دەستەوسان كرد و شكاندتان، ئەوەی خودا بۆی ئامادە كردوون لە ترس و تۆڵە خراپترە بۆتان، لەگەڵ سەلام.

( ٤٠ )

## نامەیەك بۆ هەندێ لە كارگێڕەكانی

ئەو جا پاش ئەوە...، وەك بۆم دەركەوتووە و پێمگەیشتووە كارێك لە ئێوە، ئەگەر ئەوەت كردووە، ئەوە بزانە، كە خودای خۆت لە خۆت عاجز و توڕە كردووە، بێفەرمانیی پێشەوای خۆت كردووە و دەسپاكیی و نهێنیپارێزیی خۆت لە دەستداوە و بە گەزەندە لێت داوە، وامبیستووە ئەو زەوییەی لە ژێر پێتایە ڕووتت كردووەتەوە و ئەوەی لەبەر دەستە خواردووتە، كەواتە هەر بەزوویی حسابی خۆتم بۆ ڕەوانە ئەكەی، ئەوەش بزانە لێپرسینەوەی خودا زۆر سەختتر و گرانترە لە حسابی خەڵك، لەگەڵ سەلام.

( ٤١ )

## نامەیەك بۆ عەبدوڵڵای كوڕی عەباس

ئەوجاو پاش ئەمە...، ئەوە بزانە من تۆم كردووە بە هاوبەشی خۆم لەم ئەمانەتەی لە سەر شانم داناوە، تۆم داناوە بە بەرگی سەرەوە و ناوەوەی خۆم، لەئال و بەیتی خۆم پیاوێك نییە لە تۆ زیاتر جێگەی باوەڕم بێ، تۆش بۆ دڵدانەوە و پرسە و سەرخۆشیی و جێبەجێ كردنی سپاردە بۆ لای من، بەڵام كە تەماشات كرد چەرخ و زەمەن لەسەر كوڕە مامت زبر و قورس و ناخۆشە، دوژمن ڕقی ئەستوور و شێرگیر بووە و دەستپاكیی و ئەمانەتی خەڵك سەری شۆڕكردووە، ئەم میللەتە تووشی ئاژاوە و ناكۆكیی بووە و پشتی چۆڵ بووە و سست بووە، ئا لەو كاتەدا تۆش سەری گۆچانت لە من ڕەواندووەتەوە و پەیمانشكێن بویت، خۆت جیاكردەوە لەگەڵ جیاخوازان و خۆت دوورخستەوە لەگەڵ بەزیوەكان و ناپاكییت كرد لەگەڵ ناپاكان،

ئەو کات نە توانیت دڵی ئامۆزاکەت بدەیتەوە، نە توانیت پارێزگاریی ئەمانەتەکە بکەی، من وام بۆ دەرئەکەوێ تۆ ئەو غەزا و جیهادەت بۆ خودا نەبووە، زۆر پابەند نەبووی بە بورهان و بەڵگەکانی پەروەردگارت، پێ دەچێ ویستوتە فێڵ لەم میللەتە بکەی و دنیایان لە دەست وەربگری، نیازت وا بووە غافلگیریان بکەیت و خەراج و باج و دەستکەوتی میللەت بۆ خۆت داگیر بکەی، لەو کاتەی کە فورسیی بارودۆخەکە زاڵبوو بە سەرتا و خیانەت و ناپاکیی پێ کردی، زۆر پەلەتکرد بۆ گەڕانەوە و هەڵگەڕانەوە، بە پەلە باز و هەنگاوت هاویشت، بە تاڵان ئەوەی دەستت بە سەرا گەیشت بردت و پایەماڵت کرد، لەو سامانە، کە دەبوو پارێزراو بێ بۆ بێوەژن و هەتیوەکانی ئەم میللەتە، وەك گورگی برسی و لاوازی تیژڕەو پەلاماری کارژۆڵەیەکی زامدار ئەدا و دەستشکاوە و توانای دەرباز بوونی نییە، ناوتە بە کۆڵتەوە بەرەو حیجاز، بە دڵی خۆش و گوشاد و فراوان، لەبەر چاوت سووك و هیچە، هەست بە ئێش و ئازار و بەگوناح و تاوان ناکەی، وا پێدەچێ (خودا باوك بۆ غەیری تۆ نەهێڵێ) بە گورگەلۆقە و زۆر بەلەز بەرە و ماڵ و خێزانت میراتی باوك و دایکت دەبەیتەوە ! ئەی (سوبحانە الله) ئەوە باوەڕت بە زیندوو بوونەوە نییە؟ ئەوە ترست لە پرسینەوەی ڕۆژی حیسابت نییە!؟.

ئەرێ کابرای (ئەوسا)! دانراو و ژمێراو لە خاوەن عەقڵ و فام و ژیرەکان، چۆن بەر دڵت ئەکەوێ و نۆشی ئەکەی، ئەو خواردن و خواردنەوەیە، لەو سامانە، کە خۆت باش دەزانی تیکەی حەرامە ئەیخۆی، حەرام ئەنۆشی، کەنیز و کارەکەر ئەفرۆشی و ژن مارە ئەکەی لە ماڵی هەتیو و هەژار و باوەڕدار و موجاهیدەکان، ئەوانەی ئەو سامانەیان کۆکردووەتەوە و ئەم وڵاتەیان پاراستووە !؟.

کەواتە دەبێ لە خودا بترسی و ئەو ماڵ و سامانە بگێڕیتەوە بۆ خاوەنەکانی، خۆ ئەگەر ئەوە نەکەی و خودا دەستم بگەیەنێ بە سەرتا، کارێکت پێ ئەکەم کە لای خودا عوزر و بەهانەم هەبێ و بەم شمشێرە لێت دەدەم، کە لە هەر کەسمداوە چووەتە دۆزەخ.

سوێندم بە خودا، ئەگەر حەسەن و حوسەین ئەو کارەی تۆیان کردبایە، هەرگیز لەبەر خودا سەرفەنەزەرم لێ نەدەکردن و لێیان نەدەبوردم، هەرگیز ماوەم نە ئەدان لەدەستم دەرچن، هەتا ئەو حەقەیان لێ وەرنەگرمەوە، ئەو ستەمەی کردویانە

لەكۆڵ نەكەمەوە.

حەز ئەكەم ئەوەش بزانی قەسەم بە خودای پەروەردگاری هەموو جیهان، هەرگیز حەز ناكەم ئەوەی تۆ بردووتە بە حەلاڵیش ماڵی من بێ و بە میرات جێی بهێڵم بۆ پاش خۆم ! لەو چێشتەنگانە خۆت بلەوەڕێنە و خۆت دوور بگرە، وا بزانە بە ئاواتی خۆت گەیشتووی و لە ژێرگڵدا خۆت حەشارداوە، هەموو نامەی كردارەكانت نیشاندراوە و ستەمكار هاوار و ناڵە ئەكات و داخ و خەفەت داگیری كردووە، ئەوەی ماڵی موسڵمانی فەوتاندووە داوای گەڕانەوەی ئەكات، (ئەو كاتە كاتی دەربازبوون نییە)، لەگەڵ سەلام.

(٤٢)

## نامەیەك بۆ عومەری كوڕی ئەبو سەلەمەی مەخزومی، كە كارگێڕی بوو لە سەر بەحرەین و بەر كەناری كرد و لە جێگەی نەعمانی كوڕی عەجلانی زورەقی دانا

لەپاش ئەوە... من نەعمانی كوڕی عەجلانی زورەقیم لەسەر بەحرەین داناوە و دەستی تۆم لەسەر كار لاداوە، بێ ئەوەی كە ناتەواویی و زەمی تۆی تێدابێ و هیچ جۆرە گلەیی و ڕەخنەم لێت نییە، تۆ بە جوانیی سەركاریی و ڕاپەڕاندنی ئیشەكانت ئەنجامداوە، دەستپاكیی و ڕاسپاردەت جێبەجێ كردووە، وەرە بۆلامان بێ ئەوەی جێگەی گومان وگلەیی بیت و بە هیچ شێوەیەك تاوان و كەتنت لە سەر نییە، هەرگیز گوناح نادرێتە پاڵت، تەنها لەبەر ئەوە نیازی چوونم هەیە بۆ ستەمكارانی شام و حەزم لێیە تۆم لەگەڵ بێ و ئامادەبیت، چونكە تۆم لەو كەسانە داناوە، كە هاوڕاز و هاوكارم بی و بە هۆی تۆوە سەركەوتن وەدەست بێنم لە جیهادی دوژمنشكێنیی و چەسپاندنی پایەی ئایین، گەر خودا حەز بكات !.

( ٤٣ )

## نامەیەکی بۆ مەسقەلەی کوڕی هوبەیرەی شەیبانیی کە کارگێڕی بوو لەسەر خوڕە

هەندێ شتم پێگەیشتووە لە تۆوە، ئەگەر ئەو کارەت کردبێ، ئەوە خودای خۆت لە خۆت تۆراندووە و پێشەوای خۆت توڕە کردووە، ئەوەش ئەوەیە، کە دەستکەوتی موسڵمانان، کە بە نووکی ڕم پەیدایان کردووە و خوێنیان لە سەر ڕژاندووە، دابەش دەکەیت بەسەر ئەوانەی کەسوکاری خۆت لە ئەعرابەکانی هۆزەکەت، دەی باش بزانە سوێندم بەو کەسەی دانەی دوو لەت کردووە و سەوزی کردووە و گیانلەبەری داهێناوە و درووستکردووە، ئەگەر ئەوە ڕاست بێ لەسەر من پێویست بووە، کە کەمیایەتیی بە تۆ بکەم و تای تەرازووت لە لام سووك بکەم، چونکە نابێ تۆ یاریی بە حەقی پەروەردگارت بکەی و نابێ ئاوەدانیی دنیات بە وێرانکردنی قیامەت بکەی، ئەو کاتە تۆ لەوانە دەبیت، کە کردوکۆششیان هەمیشە زیانداره، ئەوەش ئاگاداربە مافی ئەوەی لای تۆیە، ئەوەی لای منە لە موسڵمانان لە دەستکەوتی جەنگ وەك یەکە، دێتە لای من و لە منەوە دابەش دەبێ، لەگەڵ سەلام.

( ٤٤ )

## نامەیەك بۆ زیادی کوڕی باوکی، کە مەعاوییە نامەی بۆ نووسیوە کە بە فێڵ ئەیکاتە برای خۆی

وەکو بۆم دەرکەوتووە مەعاویە دەیەوێ لە خشتەت بەرێ و عەقڵ و هۆشت لە دەستبدا و ورە و وزەت دابەزێنێ، نەکەی بەگوێی بکەی و لەو کارە مەترسیدارە بە دووربە، ئەوە کاری شەیتانە بۆ خەڵەتاندن، لە پێش و پاشەوە پەلاماری ئینسان دەدا و لە ڕاست و چەپەوە بۆی دێت، دەیەوێ غەفڵەتی بقۆزێتەوە و عەقڵی داگیربکات و تاڵانی بکا و سوود لە سادەیی و پاکیی مرۆڤ وەربگرێ، حەز ئەکەم ئاگادار بیت، کە ئەبوسوفیان لەکاتی عومەری کوڕی خەتاب قسەیەکی لەدەم دەرچووە، وەکو ڕاوە و خەیاڵ وایە، جۆرێکە لە دەرکێشانی شەیتان، کە لە مرۆڤی دەردەهێنێ، بەو قسە بێ

مانایە نەسەب درووست نابێ و میراتی پێ وەرناگیرێ، ئەو کەسەی بەم قسەیە بخەڵەتێ، وەك ئەو بزنەیە لەگەڵ ڕان و مێگەلی خەڵکیی، کە دەچێتە ناو خواردنەوە، هەر دەری ئەکەی و هەر دێتەوە، یان وەك زەنگ و جامەکە هەڵبەسرابێ بە بارەوە و هەر تەقە و ڕەقەی هەیە و بەس، کاتێ زیاد نامەکەی خوێندەوە، وتی: ئەوە شایەتییە بە خودای کەعبە !، ئەو قسەیە هەر لە دڵیدا بوو، هەتا مەعاوییە کردییە برای خۆی.

(٤٥)

## نامەیەك بۆ عوسمانی کوڕی حەنیفی ئەنساریی کە کارگێڕی بوو لە سەر بەسرە، کە بەشداری ئاهەنگی کردووە

ئەوجا پاش ئەوە... کوڕی حەنیف ئەوەم پێگەیشتووە، کە کابرایەك لە بەسرە و لە گەنجەکانی بانگهێشتی کردوی بۆ نانخواردن و شایی و تۆش زۆر بە پەلە هەنگاوت ناوە بۆی، خۆشترین خواردن ئامادە کراوە بۆت لە هەموو جۆرێ، تیانجە و دەوریی پڕ لە خواردنت دێتە بەردەست، لام وایە ئاگادار نەبیت، کە ئەو خەڵکەی تۆی بانگکردووە بۆ شایی کەسانێکن، کە هەژاریان لە سەر خواردن دەرئەکەن و دەوڵەمەند و ساماندار بانگ ئەکەن، زۆر باش تەماشای ئەوەی، کە ئەیکرمێنی لەم خەزوبەزە، ئەوەی گومانی لێ ئەکەی و بەلاتەوە باش نییە و نازانی چۆنە، هەڵیبێنەوە و تفی بکەرەوە، ئەوەش کە بە ڕاستی ئەزانی پاکە لە هەموو ڕوویەکەوە بەشی خۆت سوودی لێ ببینە، ئاگاداربە هەموو شوێنکەوتوویەك پێشەوای خۆی هەیە و پەیڕەوی کاری ئەو ئەکات و لەسەر ڕۆشنایی زانستی ئەو ڕێگە دەرئەکات، ئەوەش بزانە پێشەواکەی تۆ لەم دنیایەی خۆی بە دوو دەستی جلی شڕ و پوترکاو و لە خۆراکێش بەدوو پەل نانەڕەقەی بەسە !.

ئەوەش ئاگادارم، کە ئێوە ناتوانن بەو قەدەرە ڕازی بن، بەڵام داواکارم هاوکاریی من بکەن، بۆ دوورەپەرێزیی، بۆ خۆڕاهێنان لەسەر ناخۆشیی، بۆ نەکەوتنە ناو هەڵەی زەق و دیارەوە، پێتان بڵێم قەسەم بەخوا، لەو دنیای ئێوە خاوەن زێڕ نیم و هیچ شتم زەخیرە نەکردووە بۆ پاشەڕۆژ و بۆ بەرگی دڕاو، جلی تازەم هەڵنەگرتووە،

بەڵێ، ئەوەی لەدەستماندا بوو تەنها (فەدەك) بوو لە ژێر ئەو ئاسمانەدا، كەچی خواستی هەندێ كەس ئەوەشی پێ ڕەوا نەبینین و هەندێ كەسیش بێ منەت بوو لە ئاستی من، كاری خودا هەمووی باشە و تەنها ئەو دادوەرە، ئەمن چیمداوە لە (فەدەك) و غەیری (فەدەك) و گیان، سبەی لەناو گڵ و گۆڕ و لە تاریكیدا هەموو شت ونەو هەواڵ نییە، چاڵێكە ئەگەر بتەوێ فراوانی بكەی و هەر دوو دەستی گۆڕ هەڵكەن گەورەی بكات بە پەلە قوڕ و بەرد تەنگی ئەكاتەوە و كون و كەلەبەری هەموو ئەگرێ بەو خۆڵەی لێی فڕێدراوە، ئەوەی من زۆرم پەسەندە نەفسی خۆم ڕام بكەم لە سەر تەقوا، بۆ ئەوەی ڕۆژی ترسی گەورە ئارام و هێمن بێ و لە كەناری پردەكە هەڵ نەخلسكێ، ئەشتوانم و ڕێگەم هەیە بۆ هەنگوینی پاڵفتە و كاكڵە و پوختەی گەنم و بەرگی چنراوی ئاوریشم، بەڵام نەخێر، ئەوە زۆر دوورە لەمنەوە، كە هەواوهەوەس زاڵبێ بە سەرما و من ڕامكێشێ بۆ چاوچنۆكیی و بە شوێن خواردنی خۆشدا بگەڕێم، لەوانەیە لە حیجاز، یان یەمامە كەسی واهەبێ نەزانێ نانی نەرم چۆنە، هەرگیز تێری بەخۆیەوە نەدیبێ ! دەی توخودا ڕاستە من خۆم تێر بم و دەوروبەرم برسیبێ و قرچەی هەناوی بێ لە تینوان، منیش وەك ئەم شاعیرە ئەڵێ:

(ئەوەت بەسە بۆ سكەڕۆی و زۆر خۆریی، كە خۆت تێر و تەسەل و دەوروبەرت سكیان قوڕەی بێ بۆ پێستی كەللەو پاچە).

ئایا ڕاستە من قەناعەتم هەبێ، كە میری باوەڕدارانم و هاوبەشییان نەكەم لە نەهامەتیی زەمانە، یان هەر نەبێ نموونە پەیڕەو بم لە زبریی ژیاندا؟ من بۆ ئەوە درووست نەكراوم خۆم خەریك بكەم بە خواردنی خۆش و بەلەزەتەوە، وەك حەیوانی دابەستە هەموو هیوای ئالفی خۆشە، یان وەك ئاژەڵی بەرەڵڵا، هەمیشە ورشەوگڵمەیەتی بۆ پڕكردنی ورگی و قەڵەویی هەناوی، لە هەموو جۆرە ئاڵف و پاكژێك، هەمیشە هەر مشەی بێت مشەی بێ، چی پێ بكرێ، یان دەستم لێ بەرەڵڵا كردبێ و پشتگوێ كرێم و هەر یاریی و گەمە بكەم، گوریس و پەلی سەرلێشێواویی ڕاكێشم، یان ڕێگەی چەواشە بگرمە بەرخۆم و سەرگەردان بم، هەمیشە وا ئەزانم هەیە لە ئێوە پێم دەڵێ: ئەگەر ئەمە ژەمی عەلی كوڕی ئەبوتالیب بێت، چۆن ئەتوانێ جەنگی هاوشان بكات و زۆرانبازیی بكات لەگەڵ پاڵەوان و ئازاكاندا.

كەمێ ئاگادار بن ئەوە بەو جۆرە نییە ! نابینی داری دێم و وشكانیی زۆر ڕەقتر

و بەهێزترە، داری بەرئاوی ئاو و زۆنگ، هەمیشە شین، زۆر ناسکترە خەڵف و گەڵا و دارەکەی، ئەو دارودەوەنە شینبووەی بەر باران، زیاتر ئاگر ئەگرێ و بۆ سووتاندن چاکتر و باشترە و درەنگتر ئەکوژێتەوە.

مــن لــە نزیکــی پێغەمبــەر (دورود لــە گیــانی پــاکی و ئــال و یــارانی) وەك، داربەیەکەوەســەوزبوو، وایـن، وەك قـۆڵ و بـازوو وابـووین، بـە خـودا ئەگـەر هـەموو عەرەب گەلەکۆمەکێ بکەنە سەرم بۆ شەڕ، هەرگیز پشتیان تێ ناکەم، ئەگەر هەل هەڵ بکەوێ بۆ پەڕاندنی ملیان بە پەلە ئەنجامی دەدەم، هەوڵیش ئەدەم، کە زەوی پــاك بکەمــەوە لــەم کــابرا ســەربەرەوخوار هەڵگەڕاوانــە و ئــەو لاشــە و لاکــە سەرەوژێرکراوانە، هەتا ئەو خۆڵ و گڵە جیا بێتەوە لە گەنمەکە و دەغڵودان لە یەك پاك بێتەوە، دنیای بێفەڕ بڕۆ لەبەر چاوم ونبە ! ڕەشۆ و هەوسارم دامالیوە لە سەرت لە چنگ و نینۆك و کەڵبەت خۆم ڕزگار کردووە، دەرباز بووم لە تۆڕ و داوەکانت و زۆر چاك خۆم ئەپارێزم لە چەم و چاڵ و شەقاوەکانت، دەزانی لە کوێت داناون ئەوانەی چەواشەت کردوون، هەڵت خەڵەتاندن لە چەرخە کۆنەکان کوان لە کوێن گەلان و نەتەوەکان، کە بە بەرق و باق و جوانکارییەکانت تووشی ژاوەژاوەت کردوون؟ ئەگەر نازانی ئەوەتان لە گۆڕەکانیاندا دەستبەسەر و لاترەکی گۆڕەکان لە باوەشی گرتوون و توند گوشاردوونی، بە خودا ئەگەر زەلامێکی بەرچاو بویتایە، یان چوارچێوەیەکی بەردەست بویتایە، داری حەدی شەرعییم لێ دەدای، لەسەر ئەو خەڵکە، کە فریوت داون و هەڵتخەڵەتاندن، بە ئومێدی پووچ و بێکەڵك و لەسەر ئەو میللەتانەی لەناو زیندان و چاڵت هاویشتوون، لەسەر ئەو شا و میرانەی لەناوت بردوون، بەو شێوە داتڕزاندوون و تەفروتونات کردوون، بۆ سەر چەشمەیان دەبەی و ئاویان نادەیتێ و ماوەیان نادەی، زۆر زۆر دوورە ! هەر کەس پێی کەوتە ناو قوڕولیتەکەت هەڵئەخلیسکێ و نووچ ئەدا، هەر کەس کەوتە ناو شەپۆلەکانت دەخنکێ، هەر کەس پشت هەڵکا لە تۆڕ و داوەکانت ڕزگاری بووە، سەرکەوتوو و سەلامەت ئەو کەسەیە، ئەگەر شوێن پەچەکەی تەنگ بوو مەبەستی نەبێ و گوێ نەداتێ، ئەو دنیایەش لای وەك ڕۆژی بەسەرچوو وابێ.

دەی لە بەرچاوم ونبە ! دوور بکەوە، قەسەم بە خودا، خۆم سووك و بێنرخ ناکەم، هەتا تۆش سووك و بێنرخم بکەی و ملت بۆ شۆڕ ناکەم، هەتا تۆش جڵەوم

ڕاکێشی.

ئەوە سوێندم بە خودایە، (جگە لە دەرهاویشتەی ئیرادەی خودا) دەبێ خۆم وا ڕابێنم و ڕا بکەم نەوەستم، چاویشم بکەوێ بە کولێرەیەکی ڕەق بۆی بشێتەوە، ئەگەر دەستی کەوت و خواردی، خۆی بکەمە پێخۆرم، بۆ هەمیشە واز بێنم چاو وەك کانیی ئاوی ڕۆچوو بێ و فرمێسکی پێ نەمێنێ، ئەرێ کە ڕانەمەڕ سکی تێر ئەبێ و پاڵ ئەداتەوە بۆ کاوێژ، بزنەکان لە لەوەڕگە تێر گیا دەخۆن و لە پەچە و پاکژە لێی پاڵئەکەون، عەلیش بەو شێوەیە بخوا و تێر بێ و پشوو بدات و بخەوێ؟ بەو شێوە بێ عەلی چاوی فێنکە، پاش ئەو تەمەنە درێژە لاسایی و ڕێ و شوێنی بێزمانە بەرەلاکان بکەوێ و ئاژەڵەکانی ناو لەوەڕگە.

بەختیاریی و خۆشبەختیی بۆ ئەو کەسەیە، کە ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەکات، ئەرکی خودا بە جێ دەگەیەنێ، لەشی ڕادێنێ لە سەر درك و داڵەکانی دنیا، شەو خەو لە خۆی ئەتۆرێنێ، کە خەو زۆری بۆ هێنا، لە سەر خاکەکە ڕائەکشێ و لەپی خۆی ئەکاتە سەرین و پشتیی، لەگەڵ دەستەیەك هەمیشە چاویان بە خەبەرە لەترسی ئەو دنیا، تەنیشتیان لەسەر جێگە دوور ئەخەنەوە و پاڵنادەنەوە، دەمیان هەمیشە لە جوڵەدایە بەیادی خودای خۆیان، بەهۆی ئەم کارانەوە گوناحیان هەموو شۆراوەتەوە، (أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ... ئەوانە حیزبی خودان و حیزبی خودا سەرکەوتووە).

کوڕی حەنیف..! تەقوای خودا بکە و لەخودا بترسە، کولێرە و خەپلەکانت دوور بکەونەوە لێت، هەتا ڕزگاریی و دوورکەوتنت لە ئاگر ببینی.

(٤٦)

## نامەیەك بۆ یەکێ لە کارگێڕەکانی

ئەوجا پاش ئەوە، تۆ لەو کەسانەی، کە دامناوی بۆ جێبەجی کردنی ئەرکی ئاینداریی، ڕیشەکێشکردنی تاوانبار و گوناحبارانت پێ ئەکەم، کونوکەلەبەری مەرزە مەترسیدارەکانت پێ ئەگرم، تۆش پشت و پەنات بە خودا هەبێ بۆ هەر کارێك، کە بەلاتەوە گرنگە، تیژیی و نەرمیی تێکەڵ بکە، ئەگەر نەرمیی چاك بوو نەرمبە،

توندوتیژیی بەکاربێنە، هەر کات زانیت کار بە توندوتیژیی جێبەجێ دەبێ، باڵی بەزەیی و خۆشەویستیی بۆ بەردەستەکانت شۆڕ بکەرەوە، بەدەم و ڕووی گەش و خۆشەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکە، نەرم و نیان و لەسەرخۆبە و بە یەکسانیی تەماشایان بکە، بۆیان بڕوانە بە ئاماژە و سەلامکردنەوە، بۆ ئەوەی خاوەنفیزەکان بە تەمای ستەم نەبن و لاواز و بێدەسەلات، بێ ئومێد نەبن لە داد و یەکسانیی و بەرامبەریی، لەگەڵ ڕێز و سەلام.

( ٤٧ )

## وەسیەتنامەیەك بۆ حەسەن و حوسەین

## ئەو کاتەی کوڕی مەلجەم نەفرەتی خوای لێبێت لە ئیمامی عەلیدا

بۆ لەخواترسان و تەقوا ڕاتان ئەسپێرم و بەدوای دنیادا مەڕۆن، هەر چەند داواتان بکات، خەفەت مەخۆن بۆ شتێ لە دەستتان دەرچووە، حەقوێژبن، کار بۆ ئەجر و پاداشت بکەن، دوژمنی زۆرداربن و هاوکاری داماوبن، وەسیەتتان بۆ ئەکەم ئێوە و هەموو کوڕ و ماڵ و ئەهل و عەیال و ئەوەی ئەم نامەی پێ ئەگا، کە بەردەوام تەقواتان هەبێ و کاروبارتان ڕێکبێ، نێوانتان چاك و پاك بێ، لە باپیری ئێوەم بیستووە درودی خودا لەگیانی پاکی، ئەیفەرموو: (صلاح ذات البين أفضل من عامة الصلاة والصيام... چاك کردنی نێوانتان لە گشتیی نوێژ و ڕۆژوو چاکترە).

دەخیل ئێوە و خودا، لەگەڵ هەتیو باشبن، دەمیان بێ زەم نەکەن، لەناو کۆڕ و ئەنجوومەنتان سووکایەتیان پێ نەکەن، دەخیل ئێوە و خودا، لەگەڵ هاوسێ و دراوسێ چاك بن، چونکە ئەوە ڕاسپاردەی پێغەمبەرتانە(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەندە داوای ئەکرد بۆ چاکەیان، وامان دەزانی میرات لە یەکدی دەبەن.

ئامان سەد ئامان ئێوە و قورئان، کەس پێشتان نەکەوێ لە کار پێ کردنی، دەخیلتان بم بۆ نوێژ، ئەوە پایە و کۆڵەکەی ئاینە و دەخیل مزگەوت فەرامۆش نەکەن، بە چۆڵیی ئەو ماڵەی خودا نەبینن !! ئەگەر پشتگوێ خرا بە چاوی ڕێزەوە تەماشاتان ناکرێ.

ئامان و دەخیل بۆ جیهاد، بە ماڵ و سامان و گیان و زمان لە ڕێگەی خودا،

هەمیشە ڕوو لە یەك و بەخشندە بۆ یەك و پەیوەند و پەیوەست بە یەکەوە بن، نەك دووریی و لە یەك جیابوونەوە و یەکتر بڕین، هەرگیز فەرمان بە چاکە و نا لە خراپە تەرك نەکەن، چونکە ئەگەر وازتان هێنا لەوانە، خراپ و گەندەڵەکان دەبینە سەردارتان، ئەوکاتە دوعا و نزاتان قەبوول نابێ.

ئەوجا ئەفەرموا: نەوەکانی عەبدولموتەللیب !، نەکەن دەستان بچێ بە خوێنی موسڵمانانندا، بە بیانوی ئەوە بڵێن میری باوەڕداران کوژراوە، بەکوشتنی من تەنها بکوژەکەم بکوژنەوە، باش ورد ببنەوە، ئەگەر من مردم بەم پێکانە، وەك من بپێکن یەك بە یەك، گەمە و گاڵتە و بێ ڕێز ی نەکەن بە کابرا، لە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم)بیستووە، ئەیفەرموو، نەکەن بێ حورمەتیی بە هیچ گیانلەبەرێ بکەن، هەتا بە سەگی هاریش.

( ٤٨ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

دەبێ بە ڕاستی بزانی، کە لاساریی و یاخیبوون، دین و دنیای ئینسان پایەماڵ ئەکات و ئەیفەوتێنێ، ناتەواویی و کەموکوڕییەکانی بۆ ئەو کەسەی بە دوای عەیب و عاریدا ئەگەڕێ و دەرئەخا و ڕوون دەکاتەوە، تۆ خۆت باش ئەزانی ناتوانی ئەو قەزاوقەدەرەی ڕوویداوە بەدواداچوونی بۆ بکەی، هەندێ کەس هەوڵی ناحەقیان دابوو، دەستدرێژییان لەسەر حەقەکانی خودا کرد، خوداش ئەوانی بەدرۆ خستەوە، هۆشیاربە و بترسە لەو ڕۆژە، خەڵك کەڵك لە چاکەکرداری خۆی ئەبینێ و پەشیمانە لەپەلکێشی شەیتان لە سەری، بەلام ئەم شوێنی نەکەوت، ئەوەم لاگرانە داوا ئەکەی، کە قورئان ناوبژیی بکات، تۆ ئەهلی قورئان نیت، ئەمەش وەلامی تۆ نەبوو، بەلام ئێمە وەلامی قورئانمان دایەوە و گەڕاینەوە بۆ فەرمانی قورئان، سەلام.

( ٤٩ )

## نامەیەکی دیکە بۆ مەعاوییە

پاش ئەوانەی پێش، ئەو دنیایە خەڵکی بەخۆیەوە گیر کردووە و سەری پێ ناونەتەوە، لە لایەکی تر هەر کەس دنیاویست بێ و شتێکی لێ دەسکەوێ، دەرگایەکی دیکەی لێ ئەکاتەوە بۆ شتێکی تر، لەوەی پێشوو زیاتر دڵبەندی بێت و حەزی لێی بێ، هەرگیز دنیاویست بە شتێك قانیع نابێ و داوای شتی تر ئەکات، کە وەدەستی نەهێناوە، ئەوەندەی زانی هەمووی بەجێ هێشت، ئەوەی گرێیدا بۆی هەڵوەشاندەوە، خۆ ئەگەر پەند لە پێشینەکەت وەربگری ئەوەی پاشەوەت بۆ دەمێنێ، سەلام.

( ٥٠ )

## نامەیەك بۆ فەرماندەی سوپاکانی

لە بەندەی خودا عەلی میری باوەڕداران...، بۆ یارانی چاك لە سنوورەکان، ئەوجا پاش ئەوە... ئەوەی لە سەر فەرماندەی سەردار پێویستە، ئەوەیە خۆی لێ نەگۆڕێ بەرامبەر بە ژێردەستەکانی، بە هۆی ئەو زیادە دەسەڵاتەی پەیدای کردووە و ئەو زیادە ڕێزەی، کە پێی دراوە نەبێ بە هۆی ئەو بەشەنیعمەتەی خودا پێیداوە زیاتر لە بەندەکانی خودا نزیکی بکاتەوە، زیاتر بەزەیی و خۆشەویستیی بۆ برا هاودینیەکانی هەبێت، ئەوەش ئاگاداربن لای من بۆ ئێوە مافێك هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە هیچ نهێنیی و شاراوەی جەنگ لە ئێوە ون نەکەم، هیچ فەرمانێك، جگە لە فەرمانی خودا لە ئێوەی ون نەکەم و نەیپێچمەوە، هیچ ماف و پێویستییەك لە ئێوە دوا نەخەم، کەمتر لەوەی بڕیاری لەسەر دراوە ڕەوانە نەکەم، هەمووتان بەرامبەر بە حەق وەك یەك یەکسان بن، ئەگەر بەم شێوازە کارم کرد، ئەوە بۆ خودا لە سەر ئێوە نازونیعمەت پێویستە، منیش لەسەر ئێوە فەرمانبەرداریی پێویستە، لە هیچ داواکردن و بانگکردنێك سستیی و بێگوێیی نەکەن، خۆتان لە جەنگ و مەرهەڵەکاندا بهاون بۆ حەق، ئەگەر بەم شێوە ڕاست نەبن لای من، کەس بە ئەندازەی ئەوەی لارولاسارە سووك و بێ نرختر نییە، ئەوجا سزای توندی دەدەم،

لای من بۆ ئەو کەسانە مۆڵەت و خۆدەربازکردن نییە، ئەوەش لە میر و سەردار و فەرماندەکانتان وەربگرن، هەرچی کارەکانی خودا بە چاکیی ئەنجامبدات لە لایەن ئێوە ئەنجامی بدەن.

( ٥١ )

## نامەیەك بۆ ئەو كارگێڕ و كاربەدەستانەی كە زەكات و خەراج كۆ ئەكەنەوە

لە بەندەی خودا عەلی میری باوەڕداران بۆ یارانی خەراج و باج، ئەوجا پاش ئەوە...، هەرکەس لە ئێوە نەزانێ بەرە و ڕووی سەر ئەنجامێك دەبێتەوە، هەرگیز ناتوانێ کارێ بکات بۆ ڕەوانەی ترسی پاشەڕۆژی خۆی، ئەوەش باش بزانن ئەو کارەی پێتان سپێراوە زۆر ئاسانە، بەڵام زۆرپاداشت و کرێی زۆر گەورەیە، ئەگەر لەوەی، کە خودا (نا)ی لێ کردووە لە بارەی بێفەرمانیی و دوژمنکاریی لە ڕووی سزا و تۆڵەوە بڕیاری داوە نەبێ، تەنها پاداشتی خۆپاراستنی لێی بوایە، هیچ بیانوویەك نییە بۆ دەست هەڵگرتن لە داواکردنی، ئاگاداربن هەمیشە بە داد و ئینسافەوە لەگەڵ خەڵك بن و بە ئارامیی کار و پێویستییان بۆ جێبەجێ بکەن، ئێوە ڕازگری گەنجینەی خەڵکن، ئێوە بریکاری میللەتن و نوێنەر و پێشەوایانن، کەس بێبەش نەکەن لە پێویستیی و داوای کەس پشتگوێ مەخەن، بۆ کۆکردنەوەی باج، جلی زستانە و هاوینە بە خەڵك مەفرۆشن، ئەو وڵاخەی، کە لە ژێر بارياندايە و بەندەکانیان پێ مەفرۆشن، هەرگیز قەمچی مەدەن لە کەس لەبەر درهەمێك، دەست نەدەن لە ماڵی کەس، نوێژکەر یان پەیمانپێدراو مەگەر ئەسپێك، یان چەکێك کە دوژمنکاریی پێ بکرێ لە سەر ئیسلام، چونکە نابێ موسڵمان ماوەی ئەوە بدات، کە لە دەستی دوژمنی ئیسلامدا بێ و بە هۆیەوە دەسەڵات لە سەر ئیسلام پەیدا بکات، هەرگیز ئامۆژگاریی و دڵسۆزیی دوامەخەن لە خۆتانەوە بۆ خەڵك و سەربازەکان، هەمیشە ڕەوشتبەرزبن و خەڵکەکەش هەمیشە لە یارمەتی دوانەکەوێ، ماوە مەدەن ئاینی خودا بێ هێز بێ، ئەوەی خودا لە سەرتانی داناوە ئەنجامی بدەن،

خـودا خـۆی داوای كـردووه لـه ئێمـه و لـه ئێـوه، كـه سوپاسـگوزار بـین بـه‌كردار، بـه‌ڕه‌فتار، بـه‌هێز و توانـا یارمـه‌تیی و هاوكـاریی بـۆ خـودا بكـه‌ین، هـیچ هێـز و ده‌سه‌ڵات و بۆ كه‌س نییه، جگه له خودا.

( ٥٢ )

## نامه‌یه‌ك بۆ فه‌رمانده‌ی سه‌ربازه‌كان له‌باره‌ی مانای نوێژه‌وه

ئه‌وجا پاش ئه‌وه...، نوێژی نیوه‌ڕۆ بكه‌ن بۆ خـه‌ڵك، هـه‌تا سـێبه‌ری خـۆر لائـه‌دا له په‌چه‌ی بزن، نوێژی عه‌سریان پـێ بكـه‌ن، كـه خـۆر گـه‌ش و ڕوون و زینـدووه، لـه به‌شێكی ڕۆژ، هه‌تا ڕۆژ دوو فه‌رسه‌خی تێ ئه‌په‌ڕێ، نوێژی مـه‌غریب كـاتێ ڕۆژوه‌وان ڕۆژوو ئه‌شكێنێ و حاجی له عه‌ره‌فات ئه‌جوڵێ، نوێژی شـێوان ئـه‌و كاتـه‌ی زه‌رده ون ئه‌بێ، هه‌تا سێیه‌كی شه‌و، نوێژی به‌یانیی له‌و كاته‌ی خه‌ڵك ده‌موچاوی هاوڕێی خۆی ئه‌ناسـێ، نوێـژه‌كانتان بـه‌گوێره‌ی توانـای لاوازه‌كـان بـێ، هـه‌وڵی قورسـكردنی نوێـژ مه‌ده‌ن و مه‌بنه هۆكاری تێكدانی نوێژی ئه‌وانه‌ی له دوای ئیمامـه‌وه نوێژده‌كـه‌ن، بـه درێژكردنه‌وه‌ی نوێژ زه‌حمه‌تیان مه‌خه‌نه سه‌ر.

( ٥٣ )

## نامه‌یه‌ك بۆ ئه‌شته‌ری نه‌خه‌عیی
## كه ناردی بۆ میسر و كاری محه‌ممه‌دی كوڕی ئه‌بوبكر تێك چوو
## ئه‌م نامه‌یه درێژه و پڕ له مانا و مه‌به‌سته
## وه ناوی خودا كه ده‌هه‌نده و دلۆڤانه

ئه‌مه فه‌رمانی ئێسته‌ی به‌نده‌ی خودا عه‌لی میری باوه‌ڕدارانـه، بـۆ مـالیكی كـوڕی حارسی ئه‌شته‌ر، كه كاری میسری پێ سپارد و فه‌رمانی پێدا، بۆ كۆكردنه‌وه‌ی زه‌كـات و خــه‌راج و جیهـادی دوژمنــی ده‌ڤه‌ره‌كـه و چاكـسازیی و پاكـسازیی دانیـشتوانی و ئاوه‌دانی وڵاته‌كه، فه‌رمانی داوه‌تێ به ترس له خودا و خۆپارێزیی و فـه‌رمان بـه‌جێ گه‌یانـدنی و جێبـه‌جێ كردنـی فه‌رمانـه‌كانی لـه قورئانـدا، بـه فـه‌رز و سـوننه‌ت، كـه كـه‌س به‌ختـه‌وه‌ر نابـێ، مه‌گـه‌ر بـه شـوێنكه‌وتن و پـه‌یڕه‌ویی لێكردنـی و هـه‌موو

داماویی و کەساسیی لە ڕەدکردنەوە و ئینکارکردنی و فەوتانی تێدایە، فەرمانی پێدراوە بە یارمەتیی و هاوکاریی خودای پاك و بێگەرد، بە دەست و دڵ و زمان، چونکە ئەو خودایە، کە هەموو شکۆ و بەرزیی شایستەی ئەوە، خۆی کەفیلی ئەو کەسەیە بۆ یارمەتیی، کە یارمەتی خودا بدات و بەرز ڕایئەگرێ، ئەوەی خودا بە بەرز بزانێ و فەرمانی پێداوە، کە نەفس و ئارەزووی خۆی بکوژێ، بۆ ئەوە پەلاماری هەوا و ئارەزوو نەدات، ئەو کاتەی خۆشی بۆ ڕابواردن پەلکێشی ئەکات، چونکە نەوس هەموو خراپەیەك بە پیاو ئەکات، مەگین ئەوەی خودا بەزەیی پێدا بێتەوە، ئەوجا باش بزانە ئەی مالیك، من تۆم ناردووە بۆ وڵاتێك، کە پێش تۆ دەوڵەت و فەرمانڕەوایان هەبووە، بە داد یان بە ستەم، ئەو خەڵکەی ئەوێ چاویان بڕیوەتە تۆ، بزانن تۆ چۆن ڕامیاریی ئەکەی لە نموونەکانی پێش خۆت و ئەوەت پێ دەڵێن، کە تۆ بەوانت وتووە، بەڵگەی چاکیی و پاکیی ئەوەیە، کە خودا پاداشتی بۆ داناوە و لە سەر زمانی خەڵکەبەندەکانی خۆی.

ئەبێ چاکترین و باشترین گەنجینەکانت کاری چاکە بێت، با دەسەڵاتت بەسەر نەفسی خۆتدا هەبێ، زۆر دوور و ڕژدبە لەو کارانەی، کە بۆت نەشیاو و نادرووستە، چونکە ئەو دووریی و ڕەزیلییە باشترین ئینسافە، لە نەفسەوە بۆ ئەو شتەی حەزی لێ بێ، یان ڕقی لێ بێ، با هەمیشە دڵسۆزییت هەبێ بۆ خەڵکیی و خۆشەویستیی بۆیان و نەرمیی لەڕوویاندا ڕەوشتی هەمیشەییت بێ، نەك وەك گیانداری دڕندە بیت بۆ هەلی خواردنیان بگەڕێی، چونکە ئەوە دوو جۆرن: یان برای ئاینیی تۆن، یان هاوشانت لە ئەرك و مافدا و جاربەجار لەوانەوە هەڵە و تێکەوتن ڕوو ئەدا و بیماریی و نەخۆشیی تووش دەبن، ڕوداوی هەڵە یان قەسدی لەسەر دەستیان ئەقەومێ، تۆش لەبەرامبەردا لێبوردن و لێخۆشبوونیان پێ بدە، وەك ئەوەی، کە حەزت لێیە و خوداش لە سەری لە تۆ گەورەترە، خودا خۆی فەرمانیداوە، کە دەبێ دەربەستیان بیت و بە پەرۆش بیت بۆیان، کە تێکەڵاو و هاوژیانی لەگەڵیان.

نەکەی ئیعلانی جەنگ لەگەڵ خودا بکەی، چونکە تۆ دەسەڵات و توانات بەسەریدا نییە، کە تۆڵەت لێ وەرگرێ و نابێ بێ منەت بی لە لێخۆشبوونی و لێبوردنی، هەرگیز پەشیمان نەبی لە لێبوردن و دڵخۆش نەبی بە ئازار و ئەشکەنجە، یان هەرگیز پەلە نەکەی لە سزای ڕوداوێك، کە ماوەت هەبێ بۆ خاوبوونەوەی ڕق و

تۆڵـەت، نەکـەی خـۆت بـە دەسـەڵاتدار بزانـی بـە سـەر ملیانـەوە، وابزانـی دەبـێ گوێلەمستی تۆ بن، چونکە ئـەو حاڵەتـە جۆرێکە لـە گەنـدەڵیی و پـۆخڵیی لە دڵ و دەرووندا و ئاین و بـاوەڕ لاواز ئـەکات و دەسـەڵات دادەبـەزێنێ و دەوڵـەت لـەگۆڕان و تیاچوون نزیك دەکاتەوە، ئەگـەر بەرێکەوت لـە کارێـك دەسـەڵاتی خـۆت بەگـەورە و خێر و لە خۆبایی هاتە بەرچاو، تەماشای گـەورەیی دەسـەڵاتی خـودا بکـە و توانـای بەسەر تۆدا زیاد لەدەسەڵاتی تۆ بەسەر خۆت و ئەو بیرکردنەوەیە، ئەوگەورەیی و لە خۆبـایی بوونـەت دا ئەبـەزێنێ و دەتپـارێزێ لـە سەرکەشـیی و ڕق و تـوڕەیی و لـە خۆدەرچـوون، ئـەو ژیریـی و عەقڵـە، کـە کـەمی مـابوو لـە دەسـتت دەرچـێ، بـۆت دەگەڕێتەوە، ئەوە خودایە، کە هەمیشە لووتی دەسەڵاتدار نەوی ئـەکات و هـەموو لـە خۆبایی خاو ئەکاتەوە و دادەبەزێنێ.

ئەگـەر جـارێ ئـەو دەسـەڵات و شـکۆ و گەورەییـەت کـاری کـردە سـەر هەسـت و سـۆزت و بـەرەو لـە خۆبـایی و دەرچـوونت ببـا لـە بـەرگی خـۆت، ئەوکاتـە بـیر لـە گـەورەیی و بـەرزیی و دەسـەڵاتی خـودا بکـەرەوە لـە سـەرتەوە و توانـا و دەسـەڵاتی بەسەرتا، کە خۆت توانات نییە و ئەو کاتە نزمت ئەکاتەوە و بەرەو ژێر دەتـچۆڕێنێ و ئـەو توندوتیـژیی و زبرییـەت لـەبیر دەباتـەوە و ئـەو کەمـەژیریی و عەقڵـەت بـۆ دەگێڕێتەوە، نەکەی خۆت بخەڵەتێنی و خۆت نزیـك بکەیتـەوە لـە گـەورەیی خـودا و خۆت بچوێنی لە شکۆ و دەسەڵات بە خودا، چونکە خودا هـەموو کەسێك لـەو جـۆرە نەوی ئەکات و ئەوەی فیزی کرد خودا نزمی ئەکات.

هەمیـشە بـە ئینـسافبە بەرامبـەر بـە خـودای خـۆت و خـەڵکی بەردەسـتت و بـە تایبەتی کەسانی نزیکت و ئەوانەی خۆشت دەوێن لە ڕەعیـەت، چونکە ئەگـەر ئـەوە نەکـەی سـتەمت کـردووە، ئـەوەش سـتەم بکـات لـە بەنـدەی خـودا، خـودا بـۆ خـۆی دوژمنایەتیی ئەکات نەك خەڵك، هەر کەس خودا دوژمنـی بـوو هـەموو بڕوبیـانووی بەتاڵ و پوچە و شەڕ لەگەڵ خودا هەتا هەتایە پەشیمانی لە دوایە، هـیچ شـتێك بـە قـەدەر سـتەم هۆکـاری نـەمانی نیعمـەتی خـودا نییـە، زۆر زوو هـاتنی ئـازار و بـەڵای خودایە بۆ سەری، چونکە خـودا نـزای دامـاو و ڕەنجبێـوەر زۆر زوو وەرئـەگرێ و بـە وردیی چـاودێری سـتەمکارانە، هەمیـشە خۆشـترین کـارت ناوەنـد بێـت و میانـە لـە حەق و ڕاستیدا و داد و ئینسافت گشتیی بێ، مەبەست تەنها ڕەزامەنـدیی خـودا بـێ،

ڕقی خەڵکی ڕەش و ڕووت، ڕەزامەنـدیی خـەڵکی تایبـەت و بـاڵاش کـەم ئەکاتـەوە و ڕقی دەوروبەر و دەستە و دائیرە بێ زیانـە، ئەگەر خەڵکە جەماوەرەکە ڕازی بـوو، مەسرەفی هیچ کەس لە خەڵکە گشتییەکە ئەوەندە قورس نییە لە سەر دەسـەڵاتدار و گەورە بە ڕپرس لە هەرزانیدا و کەمترین هاوکاریی لـە لێقەومانـدا و ناخۆشـتر بـۆ دادپەروەریی زیاتر داواکار و کەمتر سوپاس لە وەختی بەخشینیدا و سـسترین عـورز و بەهانە لەکاتی نەداندا و کەمتر ئارامیی لەکاتی نارەحەتییدا لـە چاو دەوروبـەر و نزیك و خزم و دەست، لەگـەڵ ئـەوەش پایـە و کۆڵەکـەی ئـایین و کۆمـەڵی ئیـسلام و موسـڵمان و پـشت و پـەنا و کەرەسـتەی بـەرگریی لـە دوژمـن، تـەنها خـەڵکی ڕەش و ڕووتە گشتییەکەیە، لە ناو هـەموو میللەتـدا دەبـێ هەمیـشە ڕووی گـەش و مـەیل و سۆزی دڵت لای ئەوان بێ بۆ ڕۆژی تەنگانە و لێقەومان.

فەرمانـداری داد دەبـێ دووربـێ لـەو کـەس و گروپانـە، کـە هـەڵت ئـەنێن بـۆ ئازاردانی خەڵك و بە چاوی گومان و ڕقەوە تەماشایان بکـەی و بـە قـسەیان نەکـەی، کە عەیب و عار و کەموکوڕیی خەڵکێکت بۆ باس ئەکەن، والی لە هەموو کەس زیـاتر عـەیب پـۆش بـێ، ئـەو کـەموکوڕیی و شـورەییانە، کـە نادیـارن هـەوڵی دەرخـستنیان مەدە، بەڵکو دەبێ کۆمەڵ پاك بکەیتەوە لێیان، هەمیشە کاری شەرمەزاریی بشارەوە، خودا عەیب و عاری تۆش لەخەڵك ئەشارێتەوە.

هـەوڵ بـدە گرێـی دڵـی خـەڵك خـاو بکەیتـەوە، ڕق و کینـەی دەروونـی خـەڵك بشۆرەوە و هەوڵ بدە هۆکاریی و دوژمنداریی بنبڕ بکەی و گوێی خۆت کپ بکـە لـەو قسە و قسەلۆکەی بۆت دەگێڕنەوە و خۆشباوەڕ مەبە بـە قـسەی ئەوانـەی قـسەت بـۆ دەگێڕنەوە، چونکە قسەهاوەر هەمیشە بوختانکەر و دووزمانە و هـۆی دووبەرەکییـە و خۆی بەدڵسۆز نیشان دەدات، ڕاوێژ مەکە بە پیاوی ڕژد و ڕەزیل لە کـاتی بەخـشین و دەستگوشادیدا، چونکە بە هەژاربوون ترس دەخاتە بەردەست، پـرس و ڕاش مەکـە بە ترسنۆك، لاوازت ئەکات، پرس و ڕاوێژ مەکـە بـە تـەماعباز و چاوچنۆك، چـونکە شەڕت بۆ درووست ئـەکات و تـۆش تووشـی چاوچنۆکیی ئـەکات، لەڕێگـەی سـتەمەوە ئـەو سـێ سـیفەتە: ڕەزیلیـی و ترسـنۆکیی و تـەماعبازیی شـتێکی خراپـە، تووشـی گومانی خراپت ئەکات لە بەردەم خوادا.

خراپترین وەزیـر و ڕاوێـژکارانت ئـەو کەسانەیە، کە پـێش تـۆ وەزیـر و گزیـری

پیاوخراپ و بەرکار بووە، لە وانەیە هاوبەش بوون لە گەندەڵیی و خراپەکارییدا، نەکەی ئەوانە بکەیتە دەمڕاست و کاربەدەست و داوێن و بەرماڵت، چونکە ئەوانە پەروەردەی دەستی گوناحبار و گەندەڵ و خراپەکار بوون، داردەستی ستەمکار بوون و برادەری ملهوڕ بوون، تۆش دەبیتە نەفەرێ لەوان و میراتگری باش ئەبی بۆیان، لەوانە دەبی بۆچونیان و کرداریان وەکو ئەوانە و تاوان و گوناهیان ئەنجام نەداوە، لەوانەی هاوڕازی زۆردار نەبوون لە زۆر و ستەم و تاوانیان وەك ئەوان نەبووە، ئەوانە بکەرە هاودەم، باریان سووکە و بە ئاسانیی هاوکارت دەبن و زیاتر خۆشەویستیی و دڵسۆزیی و مەیلیان بۆت دەبێ و ئالوودە و دەستەمۆی غەیری تۆ نەبوون، زیاتر ئەوانە نزیك بکەوە بۆ کۆبوونەوەی تایبەت و ئاهەنگ و پرس و ڕاگۆڕینەوە، ئەوجا کامیان لەسەر حەق، قسەو گفتی تاڵ و حەق ورەق بوو، ئەویان زیاتر پەیرەو بکە و نزیکیکە لە خۆتەوە، یان کامیان کەمتر هاوکارت دەبوو لەو کارەی خودا پێی خۆش نەبوو بۆ دۆستی خۆی، ئەوە زۆر دەگونجێ لە ئارەزووتەوە.

بە توندیی پەیوەستبە بە خەڵکی پاك و چاك و ڕاست و ڕایان بێنەو فێریان بکە، کە مەدح و سەنا و پێدا هەڵدانت نەکەن و ئەو کارەی نەتکردووە، یان کردووتە و بێ بایەخ بە گەورەیی نیشان نەدەن لەبەر چاوت، ناحەق لە بەرچاو بگۆڕن، چونکە هەمیشە پێداهەڵدان و ڕازانەوە دەبێتە مایەی لەخۆگۆڕان و نزیکخستنەوە لە فیز و فووکردنە خۆ، نەکەی هەرگیز چاك و پاك و خراپ و ناپاك وەك یەك بێ لات، چونکە ئەوە هۆکارە بۆ ئەوەی چاکەکار چاکسازیی نەکات و خراپەکار خراپە زیاتر بکات، هەریەکەیان بەو خووڕەوشتە مامەڵە بکە، کە بۆ خۆیان دارشتووە، ئەوەش چاك بزانە هیچ کارێك لەوە باشتر نییە، کە سەرداری خەڵك گومانی چاکی هەبێ بەرامبەر بە خەڵك، لە پاداشتی ئەوەش چاکەی زۆریان لەگەڵ بکات و ئەرك و پێداویستیی لەسەر کەسەکانەوە سەرشانیان سووك بکات، لە بێکار و سوخرەی بێ مزە و کرێ و کارێ، کە لە توانایاندا نییە، بە زۆر و هەڕەشە پێیان ئەنجام نەدا، بەو کارەت بۆ تۆ هەمیشە گومانی چاکەت لێ دەکرێ لە لایەن خەڵکە ژێر دەستەکە، کە ئەوە و ئەو گومانە باشە زۆر ماندوو بوونت لە سەر کەم دەکاتەوە، ئەو کەسەی، کە زۆر لات پەسەندە و گومانی چاکەت هەیە ئەو کەسەیە لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانت بە چاکیی دەرچووە، هەر وەك ئەو کەسەی دەرنەچووە لە

تاقیکردنەوە، دەبێ جێگای گومان و ترسی تۆ بێ، هەر خووکردەیەکی پێشینەی ئەم میللەتە هەڵ مەوەشێنەوە، کە خەڵك پێی ڕاهاتووە و فێری بووە و خەڵك دەقی پێوە گرتووە و مایەی چاکەی ناو کۆمەڵە، خۆشت کردارێك دامەهێنە و دامەمەزرێنە، کە زیاتر لەو کردەوە چاکانە بدات، ئەو کات ئەجر و پاداشت بۆ ئەو کەسەیە، کە دایهێناوە و تۆڵە و سزاش بۆ تۆیە، کە لە ناوت بردووە و وازت لێ هێناوە، هەمیشە بۆ زیاتر شارەزایی و فێربوون، دانوستان لەگەڵ زانا و دانا بکە و کۆڕ و کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ جوامێر و شارەزایان بکە، لە ڕێگەی ئەم دوو تاقمەوە بۆت دەرئەکەوێ چی باشە بۆ کارسازیی وڵاتەکەت و خەڵك ڕاهاتن بە چاکیی و پاکیی گەل و خەڵکەکەی پێش تۆ و ئێستەی تۆش، ئەوەش فێربە، کە خەڵك چین چین و نەوۆم لە سەر نەوۆمە، هەندێ بە هەندێ چاك دەبێ و باش ڕادەگیرێ و هیچ چین و توێژێك بێ منەت نییە لە چینی تر، بەم شێوە هەندێ سەربازی خودان و هەندێ نوسەر و خەڵك و ڕەشایی میللەتن و هەندێ دادوەری دادپەروەرن، هەندێ کارگەری بە ئینساف و نەرم و نیانن، هەندێ کۆکەرەوەی باج و خەراج و زەکاتی پەیمانپێدراو و موسڵمانن، هەندێ بازرگان و خاوەن پیشە و سەنعەتکارن و هەندێ چینی خوار و هەژار و کەمدەرامەت و بێ ماڵ و حاڵن و هەموو ئەوانە خودا بەشی دیاری کردوون و هەریەکەیان مەرز و سنووری بۆ دانراوە، کە خودا و کردەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ئێمەی سپاردوە و دەبێ پارێزگاریی لێ بکەین.

جەنگاوەر و سەربازی خودا بە ئیزنی خودا قەڵا و دژی قایم و مەحکەم و پتەوی میللەتەکەیە، جوانیی و ڕازاوەیی و شکۆی سەرداران بەوانەوەیە و بەرز ڕاگرتنی ئاین بەوانە و پاراستن و چاودێریی ئاشتیی و ئاسایش لەوانەوەیە، ڕەعیەت و خەڵکی سادە بەوانەوە ژیانی ئاسودە و هێمن و ئارام دەگوزەرێنن.

ئەوجا... ئەو سەربازانە بە چی دەژین و ژیان و ژیاریان بۆ دابین دەکرێ، بەو بەشەی خودا بۆی تەرخان کردوون لە داهات و دەسکەوت، کە ڕێگەی جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی خودا ئاسان و سانا دەکات و بەسەر دوژمن سەردەکەون و دڵنیان، کە پێویستیی خۆیان و ماڵ و ئەهل و عەیالیان جێگەی دڵنیایی و ئارامییە و لە سەرەوەی پێویستیی ئەوانەوەیە.

ئەوجا... مانەوەی ئەم دوو توێژە دەوامی نابێ، مەگەر بە چینی سێیەم، کە داوەری دادپەروەر و کارگێڕی ڕاستڕەو و نوسەر و فەرمانبەری پاکن، کە قەزا و حوکمی باش و چاك دەکەن بەپێی شەرع لە دادگادا، کە پارێزگاریی لە چاکە و سوودی کۆمەڵە بەگشتیی و بە تایبەت.

ئەوجا... کاری ئەمانەش تەواو نابێ، مەگەر بە کڕین و فرۆشتن و بازرگانیی و پیشەکانی پێویستی کۆمەڵ و هەر کەس کاری خۆی و باری خۆی بە پاکیی و چاکیی و دڵسۆزیی بکات بۆ بازاڕی گەرم و ئاوەدان و کار و کاسبیی حەڵاڵ و زەلاڵ و بە ئینساف، کە تەنها ئەم چینە دەبنە پایە بۆی.

ئەوجا.. توێژی خوارەوە و سڤیل و کەمدەست دێت، کە زیاد لە هەموان پێویستە هاوکاریی و دەستگرۆیی بکرێن و لەسەر هەموو خاوەن سامانێك بۆ خودا پێویستکراوە یارمەتیی ئەوانە بدات، لەسەر سەردار و ڕابەریش پێویستکراوە ئەوەندە هاوکارییان پێ بکات، کە ژیانییان بە باشیی بگوزەرێ، هەرگیز والی دەرناچێ لە ئەرکی سەرشانی، هەتا ئەوەی خودا لە سەری داناوە ئەنجامی نەدا و بەبێ گرنگیدان بەم بەشەی میللەت و داوای هاوکاری لە خودا و خۆگرتنی والی لەسەر دانگرتن بە حەق و ڕاستیی و ئەرکی سەرشانی قورس یان سووك.

کەواتە دەبێ تۆ هەمیشە بۆ سەرکردەی سەربازەکانت کەسانێك دابنێی، کە دڵسۆزی خودا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و پێشەواکەت بن، کراس و گیرفان و باخەڵپاك و خاوێن و بە فام و عەقڵ و ژیر و تەگبیربن، درەنگ ڕقیان هەستێ، زۆر زوو خاو ببنەوە و بیانوو و عوزری خەڵك وەرگرن لە ڕووی هەژار نەرم و سادە و دوور و بەرز بن، لە زۆردار و ستەمکار لەوانە بن توندوتیژیی کاری دژی پێ نەکات و لەوانەش چوار مشقی پێنەدا لە کارەکانی و بێ خەم لە ئاستیدا، هەمیشە لەگەڵ جوامێر و ڕەسەن و بە ئەسڵوفەسڵ بژی و زیاتر لەگەڵ بنەماڵە و چاکەخواز و پێشینەپاك و چاك و باش بن.

ئەوجا.. کەسانی فریادڕەس و دەروون بەرزو دڵ گوشادبە، کە جگە دەست گوشادی ئازاو دلێر و نەبەردو لێبووردە بی، کە ئەم جۆرە ڕەوشتە کۆی هەموو سەخاوەتەو هەموو بەشەکانی چاکە ئەگرێتەوە، ڕەوشتە بەرزەکان لەم جۆرە ڕەفتارە کۆ ئەبێتەوە.

ئەوجا بەسەریان بکەوە هەمیشە وەك باوك بۆ کوڕی خۆی و دایك بۆ نەوەی خۆی، دەبێ ئەو کارەی کە ئەوانت پێ بەهێز کردووە بە زۆر بزانی و منەتیان بەسەردا بکەی و هیچ دڵدانەوەیەك با کەمیش بێ بە کەمی مەزانە، ئەو کەمە دڵدانەوە و خۆشەویستییە دەبێتە هاندەر بۆیان، کە بە گومانی چاك و دڵسۆزیی تۆ حساب بکەن، نەکەی بەسەرکردنەوەی کارە ناسکەکان نەکەی، بە پشتبەستن بە بەسەرکردنەوەی کارە گرنگ و گەورەکان، چونکە کەمێ بەسەرکردنەوەی ناسك جێگەیە ئەگرێ و سودمەند دەبێ و هەریەکە لەکاری گەورە و بچووك جێگەی خۆی هەیە، خەڵك پێویستی هەیە پێی، دەبێ چاکترین سەرباز کە خۆشت ئەوێ لەو فەرماندە و سەرکردە بن کە لەگەڵ سەربازەکان چاك و باش و هاوڕێن و بە هەمیشە دەستیان بۆ یارمەتیی و دڵدانەوە باشن و چاوی هاوکاریی و یارمەتیی بۆ خێزان و کەسوکاریان بە چاکە و پاداشتە، بۆ هەموو ئەهل و خزمیان هەتا خەمی یەکەم و کۆتاییان تەنها جیهاد بێ دژی دوژمن، هەتا تۆ دڵسۆز و چاکەکار بی بۆیان ئەوانیش چاك و دڵسۆز دەبن، دەبێ فێنکی چاو و خۆشدڵ تەنها لە سەر داد و یەکسانی ناو وڵات بێ، دیاریی خۆشەویستیی ناو کۆمەڵ بێ، خۆشەویستیی لەناو خەڵك بە پاکیی دەروونیانە بەرامبەر بە فەرماندەی خۆیان، ئەوەش بە پاراستنی سەرکردە ڕاستەوخۆکانە لەسەریان و قورس نەکردنی شانیان و نەبوونی کەمتەرخەمیی لە یارمەتیی و موچەکەیان، هەوڵی بەردەوام بدە کە ئاسۆی ئۆمێدیان فراوان بێ و زۆر مەدح و سەنا و قەدر و پێزانین نیشان بدە لە ئاستیاندا و نەبەرد و ئازایەتیی و ورەیان هەمیشە هەژمار بکە و دانی پێدا بنێ، چونکە ئەو باسکردنی نەبەردییە ئازاتریان دەکات و ترسنۆك دەکاتە ئازا، ئەگەر خودا ویستی، ئەوە بەدرێژیی ئازایەتیی هەر یەکەیان بزانە کەی و لەکوێ و چۆن، ئازایەتیی کەس مەدە پاڵ کەسێکی تر و ئاستی ئازایەتیی و نەبەردییش کەم مەکەرەوە و بێ نرخ و بەهای دابنێی، بۆ گەورە سەردارەکانت کاری بچووك گەورە بکە و نرخی بۆ دابنێ، هەروەها کەسانی زۆر خوارەوە، نەکەی ئازایەتیی و ماندوو بوون و کارامەییان بەکەم بزانی، ئەو کارانەی سەرشانت قورس ئەکات و خەریکە توانات دەبڕێ، حەواڵەی خودا و پێغەمبەریان(صلی الله علیه وسلم) بکە و ئەوەش کە سەرت لێی دەرناچێ پەیڕەوی فەرمانی خودا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ی بۆ بکە، چونکە خودا خۆی

ڕێنومایی کەسانی دۆستی خۆی ئەکات.

(ياأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ! بەر فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بن، هەر کاتێکیش لەسەر شتێ لە نێو خۆدا پێك نەهاتن ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خواو پێغەمبەر بکەن، ئەم کارەتان باشە و ئاکامی چاکتری هەیە).

هەناردنی کاری سەخت و دژوار بۆ لای خودا ئەوەیە، کە بە پێی ئایەتی بێ تەئویل کاربکەییت و ناردنیش بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ئەوەیە پەیڕەوی ڕەوشت و ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئەوانەی کۆکەرەوەیە نەك دوو بەرەکی.

بۆ داد و قەزا و فەرمانی شەرع باشترین کەس دەست نیشان بکە، کە خۆت جێگەی متمانەتە و تەنگاو نابێ بەسەر کێشە و ئاژاوەی نێوان هاودژەکان و سەری لێ ناشێوێ و ژاوەژاوی خاوەن داوا و مەسەلەکان تووشی هەڵە و هەڵچوونی ناکات بۆ گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی، ئەگەر بۆی دەرکەوت تووشی شۆك و سەرسوڕمانی ناکات، گەردنی درێژ ناکات بۆ تەماع و چاوچنۆکیی، بە تێگەیشتنی کەم قایل نابێ، هەتا بە تەواویی تێ نەگا، لە هەموو کەس زیاتر دوورە لەکاری گوماناویی نادرووست و لە هەموو کەس زیاتر پابەندە بە بەڵگە و دەلیلی ڕاست و ڕەوان و لە هەموو کەس زیاتر بە سەبر و خۆگرە، دووبارە کردنەوەی گوتاری داواکار و داوا لێکراو و دۆزینەوەی ڕاستیی ڕوداوەکە و سەرەداوی کێشەکە لە هەموو کەس زیاتر توند بێ، ئەگەر حوکمەکە ڕوون بوو بە مەدح و سەنا و پیاهەڵدان و لە خۆبایی نابێ، هاندان و هەڵدان لە ڕێگەی ڕاستیی لانادا، ئەوانە زۆر کەم و دەگمەنن ! لەگەڵ ئەوەش فەرمان و حوکمی دادوەرەکان بەسەر بکەرەوە و لە هەموو کەسەکان ئاگاداربە لە موچە و جێبەجێ کردنی پێویستیەکانیان، بێ خەم و خەیاڵیان بکە، کارێ بکە پێویستیان بە خەڵك نەبێ و ئیحتیاج و موحتاج نەبن و کەموکوڕیی ماڵیان لابەرە، ئەوەندەش ڕێز و قەدریان بگرە کە پەراوێز و دەوروبەرەکەت هەرگیز بە تەمای نەبن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە پیاوانی خۆت خەیاڵی لە ناوبردن لەسەر خۆیان لابدەن، ئەم خاڵەی سەرەوە زۆر بە وردیی پەیڕەو بکە و بیری لێ بکەرەوە، چونکە ئەم

ئایینە لە دەستی ناپیاو و ناپەسەند دیل بووە، بە ئارەزوو کاریان تێدا کردووە و دنیایان پێ پەیدا کردووە.

ئەوجا... ورد و زانایانە چاودێریی کارگێڕیی ناوچەکانت بکە و بەسەریان بکەرەوە بە تاقیکردنەوە و هەڵبژاردن دیاریان بکە و کاریان پێ بکە، نەك لەبەر ئەوە نزیك و دۆست و خۆشەویستن بۆ تۆ، یان هەر بە گۆترە و بێ ئەزموون و تاقیکردنەوە و پرسینەوە، چونکە ئەم دوو جۆرە دامەزراندنە کۆی سەرجەم ستەم و تاوان و ناپاکییە و لەناو ئەوانەی دەستنیشانیان ئەکەی بۆ جێگە و شوێنی گرنگ، خاوەن ئەزموون و تاقیکراوە و بە شەرم و حەیا و لە خانەوادەی ڕەسەن و بنەچەی چاك و پاك و ڕەسەن بن و ڕابردوو پاکیی پێشوویان لەبەرچاو بگرە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە بە ئەمەك و بەڕەوشت و خاوەن شەرەف و ناموسن و زۆر کەم سەر لە بەری تەماعن و هەمیشە پاشەڕۆژیان لە بەرچاوە و تەماشای ڕابردوو ئەکەن بۆ داهاتوو، لە بارەی موچە و ئازووقەوە زۆر دەست گوشادبە بۆیان و ماوەی ئەوە نەدەی کەمدەرامەت و کەمدەست بن، کە ئەوە هۆکاری پاکڕاگرتنی خۆیانە لە ئەنجامدانی کاریان و کەمتر دەستی ناپاکیی دەبەن بۆ ئەو شتەی کە لەبەردەستیانە، جگە لەوەش بەڵگەی یاساییە بە دەستەوە، ئەگەر پێچەوانەی تۆ ڕەفتاریان کرد، یان ناپاك و دەستپیس بوون، هەمیشە لەژێر چاودێریی ڕاستەوخۆی خۆت بن، چاوی باوەڕپێکراوی ڕاستگۆیان لەسەر دابنێ، چونکە بەو جۆرە هەمیشە چاودێرییە لە سەر کاروباریان و دەبێتە هۆکاری ئەوەی ئەوان هەست بە لێپرسینەوە بکەن و دەستپاکیی ڕەچاو بکەن و هەمیشە نەرم و دڵسۆز بن بۆ میللەت و ڕەعیەت.

زۆر بە وردیی تێبینی بکە لە دانانی هاوکارانی نزیکت، ئەگەر کەسێك لەوانە دەستی بۆ ناپاکیی درێژ کرد کە سەری لای خۆتە و بەڵگەگەلێك کۆبوویەوە و بە هۆی هەواڵگیریی چاوەکانی خۆتەوە بەو جۆرە زانیاریانە پێویست بەشاهید و بەڵگەکە نابێ، ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە ئازار و ئەشکەنجەی دەدەی، چ لە بەدەنی و چ لە سامانی و هەرچی بردووە لێی وەردەگریتەوە، ئەو کاتە کە سزای ناپاکیی و سەرشۆڕیی ئەدەیت و نازناوی ناپاك و دەستپیسی لێ ئەنێی و سنگی شورەیی لە ملییەوە دەکەی، جێگەی باوەڕ دەبی زۆر گرنگی بدەی بە خەراج و باج و زەکات و دەسکەوتەکانی لە ڕێگەی گرنگیدان بە کاربەدەست و پەیوەندەکانی، چونکە باشیی و

چاكيى ئەم بەشە و چاكيى و پاكيى پەيوەندداران دەبێتە هۆكارى بەهێز بۆ چاكيى و پاكيى هەموو بەشەكان و چاكسازيى و پاكسازيى نابێ مەگەر لە ڕێگەى ئەمەشەوە، چونكە هەموو خەڵك دەبێتە خێزان و ماڵ و مناڵى باج و كاربەدەستانى.

هەروەها دەبێ زۆر بە گرنگيى و دڵسۆزيى هەوڵى ئاوەدانى زەوى بدەى، زياتر لە خەراج و باج كۆكردنەوە، لەبەر ئەوە خەراج بە ئاوەدانيى خاك و زەمين زۆر دەبێ، هەر كەس داواى باج بكات بە بێ ئاوەدانى زەمين، وڵاتى وێران و كاول كردووە، خاك و خەڵك لەناو چوون و هەرگيز ئەو وڵاتە كارى ڕاست نابێ، دەبێ زۆر هۆشيار بيت، ئەگەر خەڵك و دانيشتوان هەستيان كرد بە قورسيى باج، يان هاتنى كارەساتێكى ئاسمانيى، يان وشكبوونى جۆگە و ڕوبار، يان وشكەساڵيى و بێبارانيى، يان فەوتانى تۆمە بەهۆى لافاو و شۆرەكات و لە ناوچوونى كشتوكاڵ، يان لەبەر بێ ئاويى و وشكبوون، لەم هەموو حاڵەدا دەبێ زۆر دەستت سووك بێ و زياد لە توانای گەشتيار و جوتيار دانەنێى، چونكە ئەوە دەبێتە يارمەتيى بۆ ئاوەدانكردنەوەى وڵاتەكەت و جوانكردنى زەمەنى فەرمانڕەواييت، جگە لەوەى بە جوانيى و چاكيى مەدح و سەنات بۆ خۆت زياد كردووە و ئەتوانى خۆت هەڵكێشى كە ميوانداريى دادت كردووە و بە ئينسافەوە مامەڵەت لەگەڵ كردوون و دادپەروەريى بڵاو دەبێتەوە و ئەو هێز و توانا زەخيرەيە بۆ تۆ لە تەنگانەدا كە لە ساڵى قاتوقڕيى و گرانيى بارى شانيانت سووك كردووە، لەناو ميللەت متمانە پەيدا ئەكەيت و دەبيتە جێگەى باوەڕيان، كە هەميشە لە ناخۆشيدا هاوبەشيان دەكەى و ئەگەر بەڕێكەوت كارى قورست دا بەسەرياندا زۆر بەدڵفراوانيى و خۆشيى ئەنجامى دەدەن، ئەوەش لەبەر ئەوەيە ئاوەدانيى هەموو بارێك هەڵئەگرێ، كە تۆ لەكاتى ناسكيى و ناخۆشييدا ئەرك كەم بكەيتەوە، وێرانيى و كاوليى زەوى لەوەدايە كە خەڵكە هەژار و سڤيلەكە بەسراوە بە زەمين و خاكەوە، بێ دەرامەت و بێ بەرهەم و بێ دەسكەوت بن و كاربەدەستيش هەر خەمى كۆكردنەوەى بێ و ملى درێژ بكات بۆ ئەو كەمە بەرهەمە، بەشى خۆيان ناكات كەدەبێتە هۆكارى گومانى خەڵك كە ئەم گەورە بە تەما نييە لەسەر كار بمێنێ، بۆيە بەو شێوە ئازارى خەڵك ئەدا و بێ بەزەييە و سوودى لە ئەزموونى فەرمانڕەوايى وەرنەگرتووە.

ئەوجا... وەرە زۆر بە وردبى چاودێريى دەسگا و دەفتەر و نوسەرەكانت بكە،

ورد تەماشاکە کامیان زۆر چاکە و پاکە کاری پێ بدە و نامە و پەیام و نوسراوت و نهێنیی و رامیاریی و بەرنامەکانت، بەو کەسە راپەڕێنە کە زۆر شارەزایە و نهێنیپارێزە و دەروونبەرزە، بەڕەوشتە، لەو کەسانەیە یارمەتیی زۆر، لەخۆبایی ناکات و لە ناو کۆڕ و کۆمەڵدا حەق بە خۆی بدات، قسەی بەسەر قسەتدا زاڵ بکات و خۆی بە زیاتر لە کێشی خۆی نیشان بدا و دەبێ گێل و گەمژە و نەفام نەبێ کە شتی بە سەردا تێ پەڕێ و هەندێ لە نوسراوەکانی کاربەدەستە گەورەکانت لێ وەشارێت و لای خۆی دایبنێ، بێ ئاگاداریی تۆ وەڵامی راست و درووست لە تۆ پەنهان بێ، دەبێ باش بزانی چی لە تۆ وەرئەگرێ و چی ئەنێرێ و ئەبەخشێ، ئەو گرێبەست و پەیمانەی داوتە بە نامەی بێ ئاگاداریی تۆ، لاواز و کەمنرخ نەکات و نابێ بێ توانا و دەستەوسان بێ لە دانی رای پەسەند و بەسوود لەکاتی هاتنە پێشەوەی کارگەلێك کە ئاڵۆزیی تێدابێ، کێش و توانای خۆی بناسێ و نە زیاد و نە کەم پەلامار نەدا، چونکە ئەو کەسەی خۆی نەناسێ خەڵکیش زیاتر ناناسێ.

ئەوجا... با ئەزموون و تاقیکردنەوەت بۆ ئەو نووسەرانە تەنها لە سەر زیرەکیی و سەرناسیی خۆت نەبێ و تەنها پشت نەبەستی بە بێدەنگیی و متمانەی نێوان لە تۆ و ئەو، چونکە مەردم هەمیشە لە سەرناسیی گەورەی خۆیان شارەزایی پەیدا ئەکەن و خۆیان بەو شێوە رادەهێنن بە هۆی رووپامایی و خزمەتگوزاریی رێکوپێك و ئامادەیی لە بەرچاو و دڵ، بەڵام لە پشت ئەو حاڵە، نە دڵسۆزی و نە دەستپاکیی بوونی نییە، دەبێ تاقیان بکەیتەوە بەکارکردنیان لای پیاو باشان، پێش تۆ کام زۆر باش ناوی هەبوو لە ناو خەڵك، کامیان پاك بوو ئەوە دابنێ، ئەوەش نیشانەیەکە پەیڕەوی فەرمانی خودات کردووە، ئەوەش بکە، بۆ هەر فەرمانگەیەك لەکارەکانت بەرپرسێك نیشانە بکە، هەر لەخۆیان کە چالاك بێ، کاری گەورە دەستەپاچەی نەکا، کاری زۆر ئەملاولای پێ نەکا، هەر کەموکوڕییەك لە سەرێکەوە هەبوو، تۆ خۆت لێ گێل کرد خراپەی ئەستۆت ئەگرێتەوە.

ئەوجا... زۆر گرنگی بدە بە بازرگانیی و بازرگانەکان و پیشە و پیشەوەران، هەمیشە راسپاردەی باشیان بکە، چ ئەوانەی نیشتەجێ دەبن و چ ئەوانەی کاڵای دەرەوە بردەوهاوردە دەکەن و چ ئەوانەی بە لەش و ماندووبوونی خۆیان کار ئەکەن، ئەم جۆرە کارگەرانە هەمیشە کەرەستەی سوود و قازانجن و هۆکاری لە

بەردەستبوونی کەلوپەل و ئامێری پێویستن، کە لە دوورەوە بۆ وڵاتی دەهێنن، لە وشکانیی و دەریاوە، لە دەشت و کەژ و کۆسارەوە، کە جگە لە شارەزایانی ئەم شوێنانە خەڵکی تر توانای ئەنجامدانی نییە، ئەوانە کارمەند و شارەزای ئەو شوێنە بوون و کەس ناتوانێ بە ئاسانیی وەك ئەوان کەسابەت بکات، جگە لەوەش ئەوانە کۆمەڵە کەسێکی هێمن و ئارام و ڕامن، ترسی پیلانیان لێ ناکرێ، برای ڕاستن، ترسی زیانیان لێ ناوەشێتەوە، زۆر بە چاکیی سەرپەرشتیی و سەردان و هەواڵپرسینیان بۆ بکە و شوێنیان لای خۆت بۆ تەرخان بکە و بەسەریان بکەرەوە، لە وڵاتەکەت و دەوروبەر و مەرزەکەت.

ئەوەش بزانە، لەگەڵ ئەوانە، زۆریان زبر و تیژن لە مامەڵەکردن و گفتاری بێ تام و بێ مانا و ڕەزیلیی و دەستقوچاویان پێوە دیارە، زۆر بە ناشیرینیی و لە شاردنەوەی قووت و زەوادی میللەت و حەشاردانی کەلوپەلی پێویست و دڵخوازی میللەت و زۆریان نارەوان لە کڕین و فرۆشتن و ئەوەش دەرگایەکی تەنگەبەرە و بۆ ڕەشایی میللەت و عەیب و شورەییە بۆ کاربەدەستی باڵا، ئەبێ زۆر ئاگادار بی لە شاردنەوەی کەرەستەی پێویستیی ڕۆژانەی خەڵك و ماوەی تەماعبازیی بازرگانەکان نەدەی، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) زۆر بە توندیی قەدەغەی کردبوو، با هەمیشە مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بە شێوەی چاوتێریی و دەرونبەرزیی بێ و بە ترازوو و شایەتی ڕێك و بێگرێ بێ و نرخەکەش قورس نەبێ لە سەر هەر دوولای کڕیار و فرۆشیار، پاش ئەوە هەر کەس نزیك کەوتەوە لە شاردنەوەی قووتی گەل، پاش ئەوەی تۆ ئاگادارت کرد بە توندی سزای بە سەردا بسەپێنە بەپێی تاوان و کەتنەکەی، نەك زیادەڕەویی بکەی لە سزادانداا.

ئەوجا... توبی و توو خودا !، زۆر ئاگاداری چینی خوارەوە و توێژی هەژاربە، ئەوانە کە فێڵ و گزیی و دزیی نازانن و مسکێن و داماون و لانەواز و کەمدەرامەتن و لات و بێ سامانن و کەمئەندام و کەساس و پەککەوتەن و کەنەفتی ماڵەوەن و نەخۆش و دەرداری درێژخایەنن، چونکە ئەم چینە هەژارە هەیانە ڕووهەڵماڵاوە و توانای سواڵ و دەروەزەی هەیە و هەیانە موچە و دەرماڵەی کەمیان هەیە و بەشیان ناکات و ڕوویان نایە دەروەزە و سواڵ بکەن، ئەوانە بە چاکیی پارێزگاری لێ بکە بۆ ئەو کارەی خودا لە ئەستۆی داناوی، پاسەوان و پارێزگاری بیت و مافیان لە سەر

**گەورە و سەردار داناوە و بەرپرسیاری کردوون لە چاودێریی هەمیشە و هەمەلایەنە، ئەوانە لە بودجەی (بەیتولمال) بەشی دیاریان بۆ دیاری بکە و لە بەرهەمی زەوی پوختی موڵکی ئیسلام بەشیان بدە، هەر وڵاتێك بۆ شوێنی خۆی جیاوازیی نییە لە دوور و نزیکیی، هەموو بەشی هەیە و تۆش بە پێی پێویست هاوکارییان بکە و هەریەکەیان مافی خۆی پێ بدە و فەرق و جیاوازیی نەکەی، نەکەی لە خۆبایی سەرگەرمت بکات و بەکارە مەزن وگەورەکان کارە بچووکەکانت لە بیر بچێ، ئەو کات بیانوت نییە و هیچ بەهانەیەکت لێ قەبوڵ ناکرێ.**

**نەکەی گرنگیی و بەسەرکردنەوەت کەم بێت لە سەر ئەم چینە و بەفیز و خۆبەزلزان بیت و ڕووی خۆتیان لێ وەرگێڕی، هەمیشە چاوت لەوانە بێت کە زۆر لە ناو کۆڕوکۆمەڵ دەرناکەون و خوانەکردە بە چاوی سووك تەماشایان بکەی و پیاوەکان و دەوروبەر و پارێزەرەکانت، سووکایەتییان پێ بکەن، بەڵکو زیاتر و زیاتر ئەوانە لەبەرچاوت بن و بەسەریان بکەرەوە لە نزیکەوە، هەتا ئەوان زیاتر بێ نەفس و خاوەن دەروونی بەرزبن، تۆ زیاتر لێیان نزیکبە و ڕاسپێرە بە پیاوەکانت کاروبار و ژیان و ژیاری ئەوانەت بخەنە بەرچاو و ئاگادارت بکەن لە کاروبارییان، کارێ بکە لای خودای خۆت بیانوت هەبێ و عوزری ڕاستییت هەبێ بۆ کاتی پرسینەوەکە، بە حزوری خودا گەیشتی ئەم توێژە لە هەموو بەشەکانی تر پێویستییان بە داد و ئینساف و هەیە، هەر لە ئێستاوە بیانوت هەبێ بۆ ئەو ڕۆژەی کە خودا پرسیارت لێ ئەکات، زۆر بە تەنگ هەتیوو و بێ کەس و داماو و پیر و کەنەفتەکارەکانەوە بە، ئەوانە بێ چارە و بێ دەرمتان و بێ سەرچاوەی ژیانن و توانای پاڕانەوە و سواڵ و دەروەزە نین، ئەم کارە لەسەر فەرمانەدەکان زۆر قورسە (هەر چەندە هەموو حەق قورسە) ! بەڵام خودا سووك و سانای کردووە بۆ ئەوانە کە حەزیان لە بێومیی و بێبەڵایی هەیە، خودا ئەوانە بەڕاست ئەزانێ کە چاویان لەم جۆرە چین و توێژە هەیە و ئەوەش بەڵێن و پەیمانی خودایە بۆیان، هەمیشە لە دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوەکانت پانتایی فراوان دابنێ بۆ ئەو کەس و خەڵکەی خاوەن کێشە و پێویستین لە کاتی خۆت، شوێن و جێگەی دیاریان هەبێ و تایبەت بێت بە خۆیان و بۆ خۆت گوێبیستی داواکاریەکانیان دەبیت و ئەوجا لەگەڵ کۆڕی گشتیی بەشداریان بکەیت، لەو شوێن و کۆڕانەدا کەمفیزیی و نەوزاش و نەرمیی**

خۆت نیشان بدەی بۆیان، خودا تۆی بۆ ئەوە درووستکردووە، ئەو کارەش بە سەربازەکانت ڕاسپێری بە هەمان شێوە بۆ دەوروبەر و پاسەوان و شورتە و سوپاکەت، کارێك بکە ئەگەر کەسێك ویستی قسەت لەگەڵ بکات دەم و زوبانی بەیەکدا نەیەت و تێك نەچێ و نەجۆڕێ، چونکە لە پێغەمبەرم(صلی الله علیه وسلم) بیستووە لە زۆر شوێن و جێگەدا، هەرگیز هیچ نەتەوەیەك پیرۆز نابێ ئەگەر هەژار و داماو مافی خۆی وەرنەگرێ لەدەسەڵاتدار و خاوەن هێز بێ ترس، دەبێ تورە بوون و گرژی و بێ توانایی دەربڕین هەستی خۆیان زۆر بە نەرمی وەرگری و قەبووڵت بێ گرژی و تووڕەیی و لالوتیان و تەنگەتاوی دوورخەرەوە لە خۆت و بەدەم و چاوی گەش و زمان شیرین لەگەڵیان بدوێ، خودا بۆ خۆی هەموو دەرگا و دەلاقەکانت لێ دەکاتەوە و بەزەیی خۆی بەسەرتا دەبارێنێ و پاداش و خێر و حەسەنەت بۆ دەنووسێ، کە فەرمانی خودات ئەنجامداوە، ئەوەش کە دەیبەخشی بە دڵێکی ئارام و ڕازیی و خۆشیی جێبەجێی بکەیت و ئەگەر بۆت نەکرا بە هەر هۆیەك بێ، بە قسەی خۆش و ڕستەی جوان و کورت و پڕمانا وەڵامیان بدەرەوە و عوزرخوایی پەسەندیان بۆ بهێنەرەوە، کە باوەڕی پێ بکەن، کە ئەوانەت ئەنجامدا و سەرکەوتوو بوویت کار و کردار و ڕەفتارێکی زۆر چاوەڕوانە ئەنجامی بدەی، سستیی نەکەی، گورج و بە پەلە دەستی بدەرێ و شانی لێ قایم بکە، کە ئەمانەیە: وەڵامی ڕوون و بێ پێچ و پەنا و بێپەردە بدەرەوە بەتایبەتی ئەو پرس و کێشە و کارانە کە نووسەرەکانت توانایان نییە لە سەری و بە پەلە پێویستیی ئەوانەی دیدارت ئەکەن جێبەجێ بکە و ماتڵیان مەکە لەگەڵ هاتنیان بۆ لات و کارێ بکە دەوروبەر و پەراوێزەکانت تووشی شۆك بکەی لە زوو جێبەجێ کردنی ئەو پێویستیانە، چونکە سروشتی ئەوانە حەزیان لە سستیی و کەمتەرخەمیی و بێ منەتیی هەیە بە زۆریی، هەر ڕۆژە کار و باری خۆی تێدا ئەنجامبدە و دوای نەخەی، چونکە هەر ڕۆژە کاری خۆی هەیە، بۆ نێوان خۆت و خودا کاتی باش دیاری بکە و زۆر زیاتر بێ و لە هەموو کاتەکان زیاتر بۆ خودا بێت، هەرچەند هەموو کات دەبێ هەر بۆ خودا بێ، ئەگەر نیازپاکیی و کارچاکیی میللەت و هاوڵاتی تێدا بێخەم و خەیاڵ و ستەم بێ !، بۆ ئەم مەبەستەش کاتی تایبەت بۆ بەندایەتیی خودا و چاك ئەنجامدانی بنەماکانی ئاینەکەت، جێبەجێ کردنی فەرزەکانە، کە تایبەت بۆ خودایە، کەواتە دەبێ

ببەخشی بە خودای خۆت و هەموو ئەندامەکانی لەشت لە شەو و لە ڕۆژتدا و هەرچی زیاتر لە خودات نزیك دەکاتەوە بە تەواویی بێ کەم و کورتیی بە قەدەر توانای لەش و هێز و وزەت، هەر کات پێش نوێژیت کرد بۆ خەڵك کاری خەڵك هەراسان مەکە و کەموکوڕیش مەکە، ئەو خەڵکە هەیانە نەخۆشە، دەردەدارە، ئیش و هەرمانی جێ هێڵاوە و هاتووە بۆ نوێژ، من بۆ خۆم پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا (درودی خودای لە سەر بێت) ئەو کاتەی منی هەنارد بۆ یەمەن چۆن نوێژیان بۆ بکەم؟ فەرمووی: (وەك بێ تواناتر نوێژیان بۆ بکە و خاوەن بەزەیبە بۆ موسڵمان).

ئەوجا و پاش ئەو هەموو ئامۆژگارییە، نەکەی خۆت بشاریتەوە لە ڕەعیەتەکەت و درەنگ دەرکەوتن لە ناو جەماوەر لە لایەن سەرۆك و گەورە بەرپرسەوە، بەشێکە لە تەنگەنەفەسیی و تەنگەتاویی و ناشارەزایی لە کارگێڕییدا، چونکە ئەو خۆشاردنەوەیە میللەت بێ بەش ئەکات لە ئەنجامدانی کارەکانیان و بیانووە بە دەست (خەدەم و حەشەم) و دەبێتە هۆی بچووککردنەوەی گەورە و گەورە کردنی بچووك و جوانیی تەڵخ ئەکات و تەڵخیی ناشیرین و ڕاست و چەوت تێکەڵاو دەبێ، خۆ گەورە پیاو مرۆڤە و ئاگادار نییە چی شاراوەتەوە لە میللەت و خەڵك و لەسەر حەقەکان نیشانە دانەنراوە کە ڕاستیی لە ناڕاست جیا بکاتەوە، تۆش لە دوو کەس دایت ! یان کەسێکی دەروونگوشاد و دەستبڵاو لە ڕاستیی و درووستییدا، کەواتە بۆچی خۆت حەشار ئەدەی لە ئەنجامدانی ئەرکی خۆت، چ بەخشین و پاداشت بێ و چ کارێکی جوامێریی و مەردایەتیی بێ، ئەنجامی دەدەی، یان ئەوەتە ئالوودە بوویت بە ڕەزیلیی و دەستقوچان، ئەو کاتە کە خەڵك زانی تۆ زۆر ڕەزیل و ڕژدی خۆیان بێ ئومێد ئەبن لە بەخشندەییت، لەگەڵ ئەوەش زۆر بە پێی پێویست خەڵك لە سەر تۆ قورس نییە و ئاسانە، چونکە ئەو کارانە یان سکاڵای ستەمە لە کەسێ کراوە، یان داوای جێبەجێ کردنی حەقێکە.

ئەوجا... ئەوەش دەزانی هەموو والی و خونکارێك کەسانی تایبەت و کارگوزاری بەردەست و بەرماڵە و پشتماڵەی هەیە، ئەوانیش خودا ئەزانێ چەندە خۆپەرست و مشەخۆر و بەرماوەخۆر و چاوچنۆکن و زۆریان بەشی ئینساف نازانن لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، دەبێ تۆ ئەو هۆکارەی دەبێتە مایەی ئەو حاڵەتە بە گورجیی و

توندیی ڕیشەکێشی بکەی و بزانە ئەوانە لەکوێوە بێدادیی دەکەن، نەکەی زەوی و زاری خەڵك کە کاری لە سەر ئەکەن ببەخشی بە کەسانی دەوروبەری خۆت و خزم و نزیك و پیاوە تایبەتەکانی خۆت، نابێ وا نیشان بدەی کە ئەوانە ئەتوانن باخ و ڕەز و بەراوی نزیك ئاو و بە کەڵك داگیر بکەن و تۆش بێ دەنگ ئەبی، چ پیت و نەرمیی و چاکیی زەوی و چ لە نۆرە ئاو، خۆ کردن بە هاوبەش کە بار بن بەسەر خەڵکەوە و سوود و قازانجی بێ ماندوو بوون کۆبکەنەوە بێ ماندوو بوون و تۆش بێ خەبەر لەو گەندەڵییە و سزا و تۆڵەی خوداش لەسەر تۆیە و هەمووی عەیب و شورەیی هەر دوو دنیا بۆ تۆیە، حەق لە سەر کێ بوو بێ وەستان جێبەجێی بکە، جیاوازیی دوور و نزیك مەکە، ئەو کارەش بە خۆڕاگریی لەسەر حەق و تەنها لەبەر خودا، بە تایبەتیی ئەگەر پەیوەست بوو بە خزم و نزیك و پیاوی خۆتەوە، خۆت ئۆباڵی کارەکە لە گەردن بگرە، هەر چەندە قورس بێ، بۆ پاشەڕۆژی خۆت باشە، ئەگەر بۆت دەرکەوت کە خەڵك گومانی هەیە لە ستەمێك، گەندەڵییەك، بێدادییەك، بە ئاشکرا و بە ڕاشکاویی و بێ پەردە بۆیان ڕوون بکەرەوە، حەق وەك سفرە لە بەردەم خەڵکدا ڕابخە و گومان و دوو دڵییان بشۆرەوە بەو پەردە هەڵگرتنە، ئەوەش جۆرێکە لە ڕامیاریی و گیانی وەرزشکاریی لە خۆتەوە بۆ خۆت و نەرمیی و دادیشە بۆ میللەت و بیانوو و بەڵگەشە بەدەستەوە، کە خەڵك لە ڕاستیی و درووستیی و دادپەروەریی ڕابهێنی.

نەکەی هەرگیز دەست بنێی بە ئاشتییەکەوە کە دوژمن داوای بکات و ڕەزای خودای تێدا بێ، چونکە ئەو ئاشتییە پشوویەکە بۆ سەربازەکانت و حەسانەوەیەکە بۆ خەم و گرفتەکانت و هێمن و ئارامبوونەوەیە بۆ وڵاتەکەت، بەڵام زۆر وریا و ئاگادار و هۆشیاربە لە دوژمنەکە پاش ئاشتییەکە، لەوانەیە ئەو دوژمنە خۆی نزیك بکاتەوە بۆ پەلاماری لەناکاو و سوود وەرگرێ لە کەمتەرخەمی تۆ، ئامادە و وریابە و هەموو دڵپاکیی و گومانی باش لەبەر چاوت تەمومژ بێت و جێگەی باوەڕ نەبێ، خۆ ئەگەر لەگەڵ دوژمنێکت پەیمانێکت بەست و بەڵێن و پەیمانت پێدا و ویژدانی خۆت نایە بارستە، زۆر بە پاکیی پارێزگاری لێ بکە و هەموو مەرجەکانی جێبەجێ بکە و گەردنی خۆت ئازاد بکە بە پاکیی و پاکنیازیی و گیانی خۆت بکە بە قەڵغان لە پێناوی ئەو بەڵێن و پەیمان وگفتەی کە داوتە، چونکە لەو ئەرکانەی خودای پاك و

بەرز کەدایناوە بۆ خەڵك و تاك و کۆمەڵ کە زۆر پابەندی بن لەگەڵ هەموو ناکۆکیی و هاودژیی و جیاوازیی ڕاو بیر و تەگبیرێکدا، لەوانە: دەستگرتن بە بەڵێن و پەیمان وگرێبەستنەوە، بە ڕادەیەك بێ باوەڕەکان پابەند بوون بە پەیمان لە ناوخۆیان جگە لە باوەڕداران کە نیازیان غەدر و پەیمانشکاندنە، چ ئەنجامێکی (بەد)ی هەیە، لەبەر ئەوە دەبێ تۆش زۆر بە توندیی پارێزگاری بکەی لە پەیمانی خۆت و هەرگیز هەوڵ نەدەی بۆ شکانی و پساندنی و فێڵ و تەڵەکە لە دوژمن مەکە، لەکاتی پەیماندا، لەبەر ئەوە کەس توانای نییە دەست ببات بۆ کاری خودا، (نا)ی لێکردووە و بە توندیی قەدەغە و حەرامی کردووە، مەگەر زۆر نەفام و ناپەسەند و لاسار بێ، خودا خۆی لەسەر زاتی خۆی داناوە پەیمان و بەڵێن و ئاشتیی و هێمنیی داوە بە بەندەی خۆی و لە ناو بەندەکانیش فەرمانی پێداوە، وەك بەزەیی و لوتفی خۆی و وەك قەدەغە و پەرژین لە دەوری خەڵکدا بە ئارامیی و دڵنیاییەوە لە سێبەریدا بژین و هەموو لایەکیش هەنگاوی بۆ دەنێن و زۆر دڵ نیان کە سەفەر ئەکەن بۆ لای، نابێ پۆخڵیی و گەندەڵیی و ناپاکیی و فێڵ و چەواشەکاریی تێدا هەبێ، ئاگاداربە پەیمانێك نەبەستی چاڵ و چۆڵ و گرێی تێدابێ و ڕوون نەبێ و کەموکوڕیی لە ڕستە و دەستەواژەی فرەمانا هەڵگرێ و هەرگیز پشت نەبەستی بەو جۆرە ڕستانەی تەمومژاوین و ڕاست و ڕەوان نین، (توریە، تقیە، تعریز) واتە (وشەیەك کە مانایەکی ئاشکرا و مانایەکی نادیاری هەبێت، نەزانی کامیان مەبەستە، تقیە مەبەست لەوەیە کە شتێك بڵێیت و لە دڵتا شتێکی تر هەبێت، تعریز بە کوردی دیوار لەگەڵ تۆمەو پاسار گوێت لێ بێت.. م.ع) و کە مەبەستی شاراوە و خۆلادان هەیە تێیدا، کە تۆ بەشێوەی تەئکید و دابەستن و توند گفتت لەسەر داوە، نەکەی نارەحەتیی و دەستکورتیی و تەنگەتاویی کارێك وا بکات کە پەیمان هەڵوەشێنیتەوە یەك لایەنە و بەناحەق، لەبەر ئەوە خۆگرتنت لەسەر ئەو نارەحەتییە کاتییە کە بە هۆی بەڵێن و پەیمانەکە لەسەرت دانراوە و ئەنجامەکەی بە فەرمانی خودا چاکەیە و زۆر باشترە لە شکاندن و هەڵوەشانەوەیەك کە ترست هەیە تۆڵەی هەبێ و خودا خۆی داواکار بێ لەسەرت و گەمارۆت ئەدا لە دنیا و لە قیامەتدا.

دوبارە دەخیل ! نەکەی خوێنی بەناحەق برژێنی، هیچ کارێك بە ئەندازەی

ڕژانی خوێنی بێ تاوان تۆڵەی قورس نییە و لەویش بارگرانتر نییە لەسەر شان و لەویش زیاتر هۆکار نییە بۆ لەناوبردنی نازونیعمەت و ژیانی خۆش و کۆتایی ماوە و مۆڵەت لە ڕژانی خوێنی بەناحەق و بێ سەبەب، خودای پاك و بەرز یەکەم پرس و لێکۆڵینەوە و تۆڵەی لە قیامەتدا لەسەر خوێنی ڕژاوە بەناحەق، نەکەی بۆ بەهێز کردنی دەسەڵاتی خۆت، خوێنی ناحەق بڕژێنی !، چونکە ئەو خوێنە زیاتر بێ هێزو لاوازت ئەکات، بەڵکو هەر لە سەر تەخت لات ئەبات و لە تۆوە دەیگوازێتەوە بۆ لایەکی دیکە، نە لای خودا و نە لای من بەهانە و بیانوو نییە بۆ کوشتنی دەست ئەنقەز، ئەوە خوێنی هەیە بە پێی شەرع.

ئەگەر تووش بووی بەهەڵە بەهۆی قورسیی قەمچیەکەت، یان شمشێرەکەت، یان دەستت و سیخوڕمەکەت، بە تاوانێکی لەم جۆرە، ئەوە بێ پەروا مەبە بە یەك زللە، سیخوڕمە، شەبازلە و لەوانە ژوورتر خوێنە و ناحەقە، خۆ بەرز نەگری و دەسەڵاتی بێ سنووری خۆت لەکار نێی و لەخۆبایی بیت و مافی شەرعیی و عورفیی کوژراوەکە نەدەی بەخاوەن حەقەکەیان، نەکەی لەخۆت بایی بیت و زۆر بە خۆت بنازی و زۆریش باوەڕت هەبێ بەو لەخۆباییبوونەت کە ڕاستە و حەزت لە پیاهەڵدان و مەدح و سەنا بێ، چونکە ئەوە باشترین هەل بە دەست شەیتان دەدا بۆ ئەوەی کاری چاکەکار و پیاوەتیی خەڵکی چاك لە ناو بەری، نەکەی منەت و شاباش بەسەر خەڵکی بەردەستی خۆت بکەیت و وا نیشان بدەی کە چاکەی زۆرت بەسەریانەوەیە و بازاڕتیژیی و زیادەگۆیی لەسەریان بکەی، لە هەر کارێکی باش کە ئەنجامی دەدەی، یان بەڵێن وگفت بدەی و جێبەجێی نەکەی، چونکە منەتکردن چاکە لەناو دەبا و بە زیاد زانینی هەر کارێك ڕووناکیی ڕاستیی ناهێڵێ و جێبەجێ نەکردنی بەڵێن و گفت ڕق و قینی خودا و خەڵك زیاد ئەکات، خودا ئەفەرموا:(خودا زۆر تووڕەیە کە ئێوە شتێك بڵێن بەو جۆرە کە وتووتانە جێبەجێی نەکەن).

هەمیشە خۆت دوور بگرە لە پەلە کردن لە کارەکانت، پێش وەخت، یان خۆخستن و خۆ دواخستن لەکاتی خۆیدا، یان موناقەشە و دانوستانی بێ سوود لەو کاتەی کە لایەنی ڕاست و ناڕاست ونە و نادیارە، یان سستیی و تەمبەڵیی و کەمتەرخەمیی لەو کاتەی ڕووی ڕاستیی ئاشکرا و دیارە، کەواتە تۆ دەبێ هەر کارێك لە شوێن و کات و زەمەنی خۆیدا ئەنجام بدەی.

هەرگیز نەكەی ئەو ئەرك و هەرمانەی كە بۆ هەموو خەڵك یەكسانە، تایبەت بدەی بە خۆت و خۆت بخەڵەتێنی و چاوی خۆتی لێ بنوقێنی، كە بۆ خەڵك ڕوون بوومەتەوە و پەردەی لە سەر لابراوە، ئەوە لە دەست تۆ نەماوە، لە خەڵكەوە بۆ خەڵكە و تۆ بێلایەنی تێیدا و پاش كەمێك بۆت ڕوون دەبێتەوە، تۆ لەوانەیە دوایین كەس بیت لە زانین و خەڵك فەرمانی خۆی دەدا لە سەرت، بە سودی ستەم لێ كراوەكە، لووت بەرزیی خۆت لە ژێر دەسەڵاتی خۆت ڕابگرە و هەڵچوون و تووڕە بوونت هەڵبگرە و دەستی زۆرت ڕابگرە و زبریی و تیژیی زمان بشارەوە، زۆر ئاگاداربە و خۆت بپارێزە لە بەرەڵلا كردنی زمانت، هەرچی بەدەمتدا بێ ببێژی و ڕقی خۆت بخۆرەوە هەتا دادەمركێتەوە ڕقەكەت، ئەو كاتە ئاگات لە خۆتە و ئەزانی چی ئەكەی، ئەوەشت بۆ ناكرێ هەتا زۆر گرنگی نەدەی بە ڕۆژی زیندوو بوونەوەت و گەڕانەوەت بۆ لای پەروەردگارت.

هەمیشە با لەیادت بێ چاكەكاریی فەرمانڕەواكانی پێشی تۆی دادپەروەر و فەرمووده و كردەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ی بەنرخ و ڕێزدار و ئاسەواری پێغەمبەری خۆمان(صلی الله علیه وسلم)، یان ئەركی سەپاو لە قورئاندا كە تۆش پەیڕەوی ئەوانە بكەیت، بۆمان باس كردوی، هەوڵ بدەی پەیڕەوی ئەوانە بیت كە بۆم باسكردوی، لەم پەیمانە من بۆ خۆم ڕیزبەندییم كردووە بۆ بەڵگە و بیانووی خۆم لەسەر تۆ، نەوەك تۆ لەسەر من، هۆكارێ بدۆزیتەوە لەو كاتەی هەوا و نەفست ڕابكێشێ بۆ كاری نەگونجاو، چونكە تەنها خودا لە خراپە دوورە و هەر خودا ڕێگە نیشاندەرە بۆ ڕێی باش.

لەو ئامۆژگاریی و پەندانەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆمی ناردووە، زۆر هانی داوم لەسەر نوێژ و زەكات و بەزەیی بە كۆیلە و كەنیزەكدا، منیش بە هەمان ئامۆژگاریی و دەق بە تۆ دەڵێم و كۆتایی دێنم بەم پەیماننامە، هەموو هێز و توانا بەدەستی خودایە و بەس، منیش داواكارم لە خودا بە فراوانیی گشت بەزەییەكانی و بە هەموو بەرزیی و مەزنیی و دەسەڵاتی كە هەموو ئاوات و ئامانجەكانم جێبەجێ بفەرموێ و لەسەر ڕێگەی ڕاستم ڕابگرێ و لەگەڵ تۆش بۆ هەر كارێ كە ڕەزایەتیی ئەوی تێدایە و عوزر و بەهانەم هەبێ لای خودا و لای خەڵك و زمانی خەیر و مەدح و سەنای بەندەكانی و ئاسەواری چاك و باش لە وڵات و هەموو ناز و نیعمەتەكانی و

چەندە جارەی جوامێریی و کۆتایی من و تۆش بە بەختەوەریی و شەهیدی بێت و هەمان مەیل و فەرمانیش بۆ لای ئەوە، سەلام و درودی زۆر لەسەر پێغەمبەر بێ.

( ٥٤ )

## نامەیەك بۆ تەڵحە و زوبەیر

### کە بە عەمرانی کوڕی حوصەینی خەزاعیدا ناردی

### ئەم نامەیە ئەبو جەعفەری ئیسکافی لە کتێبی مەقاماتدا باسی کردووە

ئەوجا و پاش ئەمانە... ئێوە باش ئاگادارن و پێ ئەزانن، خۆتان دەزانن تاوانی شاردنەوەی حەقتان لە ئەستۆیە ! کە من داوام لە خەڵك نەکردووە، بەڵکو خەڵك داوایان لە من کردووە، من بەڵێن و پەیمانم نەداوە، ئەوان داویانە و ئێوەش منتان ویستووە و پەیمان و بەڵێنتان بە من داوە، ئەو خەڵکەی پەیمانی بە من داوە لەبەر دەسەڵاتی زەوتکاریی و ستەمکاریی نەبووە، بۆ مەبەستی پلە و دەستبەجێ نەبووە و لەبەر پوول و دراویش نەبووە، ئەگەر بە ئارەزووی خۆتان دەستی بەڵێن و پەیمانتان بە من داوە، داوا ئەکەم بگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆتان، بەم نزیکانە و بە پەلە و ئەگەر بە زۆر و نابەدڵ بووە ئەوە ئێوە بەدەستی خۆتان بەڵگەتان داوەتە دەستی من، بۆ پرسینەوەکە، بە ئاشکرا بەڵێن ئەدەن و بەنهێنیی نیازی لاساریی و یاخیبوونتان هەبووە، ئەوەشم لا ڕوونە ئێوە لە کۆچبەران، زیاتر ماوەی خۆ دزینەوە و بە دڵ پەشیمانیی و پاشگەزبوونتان نییە، هەوڵ و پەلامارتان بۆ هاتنەناو بەڵێنە و ماوە هەبوو، کە لە ملی خۆتانی دەربێنن، پاش بڕیار و دانپێدانان، گۆیە ئێوە بەگومانن، کە من عوسمانم کوشتووە !، لە بەینی من و ئێوەدا خەڵك هەیە، کە خۆی دواخستووە لە خەڵکی شاری مەدینە، بە دەمەوە چوونی و یارمەیدانی و هەرکەس بەپێی دواکەوتن و نەچوونی بەدەم کارەکەوە، باری تاوان هەڵ دەگرێ.

کەواتە تکا ئەکەم لە هەردوو گەورە و پیر و دانا پەشیمان ببنەوە لە ڕاوبۆچوونتان، چونکە ئەوە لەکارە شورەیی و عەیبەکانی ئێوەیە، پێش عەیب و عار و ئاگری دواڕۆژ، ئەگەر نەگەڕێنەوە، سەلام و ڕێز.

( ٥٥ )

# نامەیەك بۆ مەعاوییە

ئەوجا پاش ئەمانە... ئاگاداربە خودای پاك و بێ هاوتا ئەم دنیای بۆ دنیایەكی دیكە داناوە، ئەم خەڵكەی بۆ ئەزموون و تاقیكردنەوە درووستكردووە، بۆ ئەوەی بزانێ بە كارایی، كە كاری چاك و پاك ئەكات و بۆ دنیای ڕووت درووست نەكراوین، بۆ هەوڵدان تەنها بۆ دنیا، فەرمانمان پێ نەدراوە، بەڵكو درووست كراوین بۆ ئەو تاقیكردنەوەیە و ئەوەش بزانە، كە خودا منی بە تۆ تاقی كردووەتەوە و تۆش بە من و هەریەكەمان بەڵگە و بورهانین بەسەر یەكەوە، بەڵام تۆ بازتداوە بۆ دنیاپەرستیی بە ڕاڤەكردنی ناڕاست بۆ قورئان، داوای شتێكم لێ ئەكەی، كە دەستی تاوانی منی تێدا نەبووە و نییە، زمانیشم تێوە نەگلاوە و بێ فەرمانی قورئانت كردووە خۆت و ئەهالی شام لەسەر من و بە ناو زاناتان هەڵناوە لەسەرم بدوێ و نەفام و فێڵبازەكەشت ڕاسپاردووە دوژمنكاریی من بكات و كەسی دەست بە كاروبارەوە نەیتوانی بەرگری لەو تاوانە بكات.

كە ئەوە ئەزانی لە خوا بترسە و بە خۆتدا بچۆرەوە و ئەوەندە هەوسار و ڕەشوەكەت شل مەكە بۆ شەیتان، ڕووی خۆت بۆ ئەو دنیا ڕابێنە، چونكە ئەوە ڕێگەی ئێمە و ئێوەشە، ئەبێ زۆر بترسی، كە خودا بە هۆی ناحەقیی و بێ دادیی كە لەگەڵ منی دەكەی، بەم زوانە خودا تووشی دڵەكوتە و دڵەڕاوكێت بكات، لە ڕەگەوە دوا بڕاوت بكات لە ئەسڵ و نەسەبدا، ئەوەش چاك ئاگاداربە سوێندم بە خودا، ئەو سوێندەی، كە بۆ خراپە نییە، ئەگەر خودا من و تۆی كۆكردەوە بە كۆمەڵێ قەزاوقەدەرەوە لە گۆڕەپانی جەنگ دەبم لەگەڵتان (حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ... هەتا خودا فەرمانی خۆی ئەدا لە بەینی ئێمە و ئێوە و هەر ئەوە فەرمانداریی چاك لە ناو فەرماندارەكاندا).

( ٥٦ )

## وتارێك كه ڕاسپاردەی دەكات بۆ شورەیحی كوڕی هانی كه پێشینەی شام بوو له سوپا

له ئێواره و بەیانی له خودای خۆت بترسه، دنیا گومڕاكەره و له سەر شانی خۆت سووكی بكه، به هیچ ڕوویەك لێی ئەمین مەبه، ئەوەش بزانه ئەگەر خۆت لانەدا له زۆر شتی دڵخوازی خۆت، له ترسی ئەوە نەكەویته بێ شەرعیی و كاری نەگونجاو، نەفس و هەوا و ئارەزوو هەڵت ئەگرێ و ئەتدات به چەندین كاری زیانبەخشدا، هەمیشه جڵەوگیریی نەفس و ئارەزووی خۆتبه، ماوەی سەركەشیی نەدەی بۆ هەنگاو و بازبازێن، بۆ جێبەجێ كردنی ڕق و كینەكانت، به توندیی لەغاوی بگره و بیشكێنه و بیگەڕێنەوە.

( ٥٧ )

## نامەیەك بۆ خەڵكی كوفه كه له مەدینەوە هات بۆ بەسره

ئەوجا... ئاگادارتان ئەكەم من لەم شوێنی خێڵە دەرچووم بۆلای ئێوە، به ستەمكار، یان ستەملێكراو، یان به چەتەیی و یاخیگەریی، یان لێم هەڵگەڕاوە و له فەرماندەرچوون كراوە لێم، من خودا ئەخەمە یادی ئەو كەسەی كه ئەم نامەی پێ ئەگا، زوو بگاته لام و حاڵی ببێ، ئەگەر لەسەر ڕێگەی ڕاست بووم هاوكارم بێ و ئەگەر به خراپم تێ ئەگا، داوای لێبووردنم لێ بكات و بڕوا بەڕێگەی خۆیەوە.

( ٥٨ )

## نامەیەك بۆ خەڵكی شارەكان
### هەواڵی ڕوداوی خۆی و خەڵكی سیفین باس دەكات

بۆ ئاگاداریتان سەرەتای كارەكه وابوو، ئێمه و ئەو خێڵە له خەڵكی شام بەیەكدا گژاین و له یەكماندا، ئەوەش ئاشكرایه خودامان یەكه و پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) یەكه و بانگەوازمان بۆ ئیسلام وەك یەكه، زیادەخوازیی ناكەین بەسەریانەوە،

لە باوەڕ بە خودا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئەوانیش نابێ بازاڕتیژیی و زیادەخوازیی بەسەر ئێمەوە بکەن، تەنها یەك کارە هەر دوو لە سەری پەیڕەو ئەکەین، مەگەر ئەو شتەی لە سەری ناکۆکین لە بارەی خوێنی عوسمانەوە، ئێمە بێ تاوانین و دەستمان تێیدا نییە و هەمیشە وتوومانە ! وەرن چارەی بکەین و دەرمانی بۆ بدۆزینەوە، با لەوە زیاتر ئاگری ئاژاوە و یاخیبوون بڵاو نەبێتەوە و ئەو خەڵکە ئارام بکرێنەوە و دامەزرێن بە ئارامیی و ئەو کاتە جستوجۆ دەکەین و دەگەڕێین بەدوای ئەو حەقەدا و هەموو بۆ هەموو کۆدەبین و بەهێزدەبین بۆ دانانی حەق لە شوێنی خۆی و بۆ شوێن و کەسی خۆی، لە وەڵامی ئێمەدا وتیان: نەخێر، ئێمە بە زۆر و ملهوڕیی حەقی خۆمان وەردەگرین ! نەهاتنە پێشەوە بۆ چارەسەری و خۆیان گرت، هەتا شەڕ و جەنگ هەڵگیرسا و گۆڕەپانەکان هەموو بوو بە شەڕگە و گڕوکڵپە و بڵێسەی هەموو شوێنی گرتەوە و گەیشتە قایمایی و توندوتیژیی، ئەو کاتەی کەڵبەی گیر کرد لە ئێمە و ئەوان و لۆزی لە ئێمە و لەوان توند کرد، ئەو کاتە وەڵامە پێشەوەکەی ئێمە، کە زووتر پێمان گوتن و ئەوان ئەو کات دایانە دواوە، ئەوجا وتمان باشە با وابێ و چووین بەدەم داواکەیانەوە، هەتا ڕادەی ڕوون بوونەوەی بەڵگەی ئێمە و بیانووی ئەوان و ئیتر بەهانەیان بڕێ.

ئەوجا... ئەو کەسەی کە ئەو بڕیاری لەسەر بوو خودا ڕزگاری کرد لە کەوتنە چاڵەوە، ئەوەی هەر بە کەللەڕەقیی و زۆربێژیی ملی نەدا، وەك گای سەپەڕ، یان گای بنەی بگێری خەرمان، ڕیزەکەی شکاند و هەڵی توڕاند و کەوتە مەشە و خودا پەردەی ڕەشی لەسەر ویژدانی داناوە و ئەو گەردەلوول و گێژەڵووکە لەسەر سەری ئەو دەسوڕێ.

(٥٩)

## نامەیەك بۆ ئەسوەدی کوڕی قەتبە، فەرماندەی حولوان

ئەوجا پاش ئەوە... ئەوەت پێ دەگەیەنم، کە گەوروسەرداری میللەت، ئەگەر ویستی ئەگۆڕا بەپێی ئارەزووی ئەو کاتە، زۆر بە توندی لای ئەدا لە دادپەروەریی، لەبەر ئەوە دەبێ کاروباری خەڵك لە ڕێبازی ڕاستیی و درووستیی وەك یەك بێ و یەکسان بن لات، چونکە ستەم جێی داد ناگرێتەوە، خۆت دوور بگرە لەو کارانە، کە

شێوە و نموونەکانت بەلاوە پەسەند نەبووە و خۆت تەرخان بکە بۆ ئەو ئەرکەی خودا لەسەری داناوی، ئومێدی پاداشت لەو بخوازە و تەنها لەو ترست هەبێ.

ئەوەش بزانە ئەم دنیایە خانەی بەڵا و ڕوداوی ناخۆشە، هەرکەس دەمـژمێرێك بێکار بێ لە دنیادا، ئەوە بێ ئیشییە لەم دنیا و مایەی خەم و خەفەتە، هیچ کارێك جێی حەق ناگرێتەوە و یەکێك لە حەقەکان پاراستنی خۆتە و سەرگەرم بوونت بەکاری خەڵك و بەردەست و ئەوانەی لێیان بەرپرسی، چونکە ئەوەی پێت دەگات زۆر بەنرخترە لەوەی بە تۆوە دەگاتە خەڵك، سەلام.

(٦٠)

## نامەیەك بۆ ئەو کارگێڕانە کە سوپا بەلایاندا تێ ئەپەڕێ
## لە بەندەی خودا عەلی میری باوەڕداران
## بۆ لایەنی پەیوەند بە تێپەڕینی سوپاوە لە بەشەکانی کاری کۆکردنەوەی باج و خەراج و کارگێڕانی وڵات

ئەوجا پاش ئەوە... ئاگادار بن کە سوپام ئامادە کردووە و سەرباز لای ئێوە گوزەر ئەکەن، ئەگەر خودا حەز بکا، هەر چەندە زۆر بەتوندیی ڕامسپاردن بە ئەرکی سەرشانی خۆیان، کە ئازاریان بۆتان نەبێ و خۆیان لادەن لە ئەرك و نارەحەتیی بۆتان، من گەردنی خۆم ئازاد کردووە لە ئێوە و لە ئەوان لە ئەرك و ئازار و پێشێلکاریی سوپا، مەگەر زۆر برسیەتیی زۆریان بۆ بهێنێ، ڕێگەی تێربوونیان نییە، مەگەر لەسەر ئێوە، سکاڵاتان بەرز بکەنەوە لەوانەی بە ناحەق ستەم ئەکەن و ماوە نەدەن نەفام و جەحێڵ و کەمعەقڵ دژایەتیان بکات و پەلاماریان بدەن لەو دەرهاویشتەی کە لەسەرەوە باسمکرد، من خۆم لەناو جەرگەی سوپادام، هەموو گلەیی و گازندەم بۆ بەرز بکەنەوە، هەرچی تووشی دەبن و خۆتان ناتوانن بەربەستی بکەن، خۆم چارەی ئەکەم و دەیگۆڕم بە یارمەتیی خودا، ئەگەر خودا حەز بکات.

(٦١)

## نامەیەك بۆ کومەیل کوڕی زیادی نەخەعیی
## کە کارگێڕی بوو لەسەر شاری هیت
## سەرزەنشتی ئەکات چۆن ڕێگەی داوە سوپای دوژمن بەلایدا گوزەربکا و داوای لێ ئەکات بۆ هێرش بردن لەسەری

ئەوجا پاش ئەوە... وازهێنان لەو کارەی، کە بە کەسێ سپێردراوە و خۆخەریك کردن بەکارێکەوە، کە کەسی تر جێبەجێی دەکات، ئەوپەڕی بێ توانایی و بێ دەسەڵاتیی و خۆدزینەوەیە و ڕاوبۆچونێکی لەناوبەرە، ئەو پەلامار و هێرشەت لە سەر خەڵکی قیرقیسیا و جێهێشتنی سەربازگەی خۆت، کە ئێمە پێمان سپاردوی و کەس نەبوو بەرگریی لێ بکات و بیپارێزێ و توانای گەڕانەوەی سوپای دوژمنیان نەبووە، ئەوە بۆچونێکی خەیاڵخاویی و پەرت و بڵاوە و ناجۆرە، تۆ بەم کارەت، کە شوێنی خۆت جێهێڵاوە و بۆ لایەکی دیکە چوویت، بە دەستی خۆت پردی پەڕینەوەت بۆ دوژمن درووستکردووە، پەلاماری یارویاوەرانت بدات و شان شلکردنە، کە لە پشتی تۆوە و بێ ترس و سڵەمینەوە و بێ ڕێگر و پاسەوان و قایمکردنی کونوکەلەبەر، دژی قەڵای دوژمنشکێن و مشتەکۆڵە لە لووت بەرزیی و نەمانی توانای بەرگریی لەو شارەی پاراستنی لە ئەستۆی تۆدایە، کە دەبێتە هۆی چۆڵکردنی شار لەبەرگریی و بە کەڵکی میریی خۆی نایە.

(٦٢)

## نامەیەك بۆ خەڵکی میسر لەگەڵ مالیکی ئەشتەر کە بوو بە والی

ئەوجا پاش ئەوە... لە ڕاستیدا خودای پاك و بێگەرد کە محەممەد(صلى الله عليه وسلم)ی ناردووە، بۆ ئەوەی ناردووە، کە ئاگاداری هەموو جیهان بکات بۆ خوداپەرستیی، شایەتحاڵ بێ بۆ پەیامی گشت پێغەمبەران(درودو سڵاوی خودایان لەسەر بێت)، کە تەشریفی چووە بۆ لای خودا، موسڵمانان پاش خۆی لەسەر فەرمانڕەوایی ناکۆکیی کەوتە نێوانیانەوە، قەسەم بەخودا، هەرگیز بەدڵمدا

نەهاتووە، کە نارەحەت بم وتووشی خەم بم، کە عەرەب ئەم جێنشینییە لە ئال و بەیت وەربگرنەوە و لەمنی دوور بخەنەوە.

لە پاش وەفاتی، ئەوەی منی شڵەژان پەلاماری خەڵك بوو بۆ فلان کەس و دەستی پەیمانیان بۆ ڕادا و من دەستی خۆم ڕاگرت، هەتا ئەوکاتەی، کە بۆم دەرکەوت پاشگەزبوونەوە و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام پەیدا بوو، هاواریان ئەکرد بۆ کوژانەوەی ئاینی محەممەد(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو منیش زۆر ترسم لێ پەیدا بوو، ئەگەر هاوکاری ئیسلام و ئەهلی نەکەم، بێگومان کەلێن و درز ئەکەوێتە ئاین، هەرەسی ئیسلام لام گەورەتر بوو لە لەدەستدانی سەرداری ئێوە، کە چەند ڕۆژێکی زۆر کەمە و دەڕوا و لەناو دەچێ، وەك تراویلکە نامێنێ، یان وەك هەور بڵاو دەبێتەوە و دەڕوا، ئەوکاتە بە مەجبوریی لە گەرمەی ئەو ڕوداوەدا هەستام بەم کارە، بۆ ئەوەی ناحەق بڕوا و نەمێنێ و ئاین سەقامگیر بێ و کەمێ پشووبداو لەو گێژاوەدا ڕزگاری بێ.

ئەوەش بزانن، بە خودا ئەگەر تووشیان بێم بە تەنیا و ئەوانیش پڕ لە زەوی بن هەموو، هەرگیز گوێم پێ نەئەدان و هەراسان نەدەبووم، خۆم لە چۆڵ و بیابان نەدەبینی، ئەوەش باش ئاگادارم، کە ئەوان گومڕا و ڕێونکردوون، منیش لەسەر ڕێبازو ڕێگەی ڕاست و ڕەوانم و بەرچاو ڕوونم، لە خۆم و خودای خۆم، بێگومانم و زۆریش حەزم بەگەیشتنە بە خودای خۆم و پاداشت وەردەگرم، زۆر بە چاکیی و پاکیی و ئومێدی زۆرم هەیە، ئەوەی منی نارەحەت کردووە ئەوەیە، کە سەرۆکی ئەم میللەتە نەفام و گەندەڵ و ناپاك بێ، لەسەر سامان و داهاتی خودابەخش، دەسەڵات و دەوڵەت پێکەوە بنێن و خەڵکی ئازاد بکەنە کۆیلە و بەندە و بەشەڕبێن لەگەڵ چاکان و پاکان و پۆخڵە و پیسەکان بکەنە کۆمەڵە و حیزب بۆ خۆیان، ئەوانەی ئێستە لاتان دەسەڵاتیان هەیە، هەیانە مەیی حەرامی خواردووەتەوە و داری حەدی لێدرا لە ئیسلامدا، هەیانە ئیسلام نەبوو هەتا خەڵات و بەراتی پێ نەدرا لەسەر حسابی ئیسلام، ئەگەر ئەمانە نەبوایە، هەرگیز گوێم نەئەدا بە هەڵنان و سەرزەنشتی ئێوە و خەڵك، هەڵنان و کۆکردنەوەی بۆ ئاژاوە و ژاوەژاو هەر چۆنێ ئێوە بوون منیش وازم دەهێنا و پشتگوێم ئەخستن، دەبوو زۆر ئاگادار بوونایە و سەرگەرمی پشتگیریی ئەوانە نەبوونایە، نابینن ئەملاوئەولاتان هەموو گیرایەوە و

كەوتە ژێر دەسەڵاتی دوژمن، شار لە دوای شار لە دەستتان دەرچووو و کەوتـە دەست نەیار، نزیکە ئێوەش داگیر بکرێن، وەرن وەك مـەرد خۆتـان بـۆ جیهاد کۆبکەنـەوە، خـودا رەحمتـان پێبکـا، دژی دوژمـن بجـەنگێن و خۆتـان دامـەکوتن بـە زەویـدا و سەرشۆڕیی قەبووڵ بکەن! بە داماویی و بێنرخیی بـژین ! ئەوکاتـە باروبەشـتان زۆر پەست و خوار بێ، میللەتی جەنگاوەر خەوی نییە، ئەگەر بخەوێ، دوژمنـی ناحـەوێ و بەخەبەرە، سەلام لە ئێوە.

(٦٣)

# نامەیەك بۆ ئەبو موسای ئەشعەریی کارگێڕ لە کوفە کە خەڵکی پەشیمان ئەکردەوە لە پەیوەندیکردن بە پێشەوا کە هانی خەڵکی ئەدا بۆ شەڕی بەناو جەمەل

لە بەنـدەی خودا عەلی میری باوەڕداران بۆ عەبدوڵڵای کوڕی قەیس:

ئەوجا...پێمگەیشتووە گوتەیەکی تۆ هەم لە قازانج و هەم لـە زیانتـە، هـەر کـات نوێنەرم گەیشتە لات، پالێمت بەگورجیی هەڵکە و پشتێن ببەستە و لـەکونی خـۆت وەرە دەرێ، کێـت لەگەڵـە بـانگی بکـە و ئامـادەی بکـە، کـە ئـەوەت کـرد بجوڵێ و کـار ئەنجام بدە، ئەگەر نەتتوانی و کەوتی، لە ئێمە دوور بکەوە، سوێندم بەخودا، لە هەر کوێ بیت، هەر پێت دەگات و هەرگیز دەست لە کۆڵت ناکرێتـەوە، هـەتا ڕۆنـی زەنـگ لـە کـەرێ جیـا نەکرێتـەوە و تێکـەڵ نـەبێ بـە تـواوە و بەسـتوت، هـەتا ئـەو چـوار مشقیەت لێ تێك نەچێ و ترس لە پاش و لە پێشەوە هـەبێ، ئـەوەش ئاسـان و خـۆش نییە بۆ جەنابت و بە ئومێدی پێی، ئەوە بەڵای گەورەیـە، حوشـتری دەسـتەمۆ بـاری لێ دەنرێ، وشتری قۆڕیش دێتـە بـەر بـار و دەشـتی تـەخت و چیای ئاسـان، عـەقڵ و ژیریـی خـۆت ببیـستە و کـاری خـۆت بـە دەسـتی خـۆت بـێ و بـەش و مـافی خـۆت وەربگرە، ئەگەر پێت خۆش نییە، برۆ وازبێنە و بـە خێـر نەچی و سـەرفراز نـەبی، ئێمە لە بری تۆ کارەکە تەواو ئەکەین، تۆ لـە خـەودایت، کـەس ناپرسـێ ئـەرێ فلان لەکوێیە؟ سوێندم بە خودا، ئـەوە حەقـە بـۆ حـەق خـواز و ڕاسـتگۆ و بـێ منـەتم لـە کاری بێ باوەڕان، سەلام.

## (٦٤)

## نامەیەك بۆ مەعاوییە لەوەڵامی نامەیەكیدا

ئەوجا پاش ئەوە... ڕاستە ئێمە و ئێوە وەك تۆ باست كردووە كۆك و تەبا بووین، بەڵام تۆ ئەزانی دوێنێ ئێمەی لە ئێوە جیا كردەوە!؟ ئێمە باوەڕمان هێنا و ئێوە بێ باوەڕ بوون، ئەمڕۆ ئێمە لەسەر ڕێبازی ڕاست و درووستین، ئێوەش خەڵەفاون و مسوڵمانتان باوەڕی بە نابەدڵ هێناوە و پاش ئەوەش بوو كەڵەپیاوەكانی ئیسلام هەموو لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوون بە هاوكار و حیزب، ئەوەشت باسكردووە، كە گۆیە من تەڵحە و زوبەیرم كوشتووە و من عائیشەم ئاوارە و دەربەدەر و شاربەدەر كردووە، لە نێو دوو شارە گەورەكە(بەسرە و كوفە)دا بەزیووم، ئەوە كارێكە لێت ون بووە، كێشەی تۆ نییە و عوزرخوایش بۆ لای تۆ نییە، ئەوەشت باسكردووە، كە لەگەڵ كۆمەڵی موهاجیر و ئەنسار دیدەنی مـن ئەكەی، بە ڕاستیی كۆچ ئەو ڕۆژە تەواو بوو، كە برات بە دیل گیرا، ئەگەر پەلەتە بۆ ئەو كارە، كەمێ پشوو بدە و خۆت ماندوو مەكە، چونكە ئەوەی ڕاست بێ، ئەگەر من دیدەنیی و زیارەتم كردی ئەوە زیاتر شایستەیە، كە خودا من ڕەوانە بكات بۆ لات، بۆ سزا و تۆڵە لە سەرت، خۆ ئەگەر تۆش هاتی بۆ دیدەنیی ئەوە وەك شاعیری خێڵی ئەسەد ئەڵێ: (بەرەو ڕووی بای گەرمی هاوین، كە دەدا بە ناو چاویدا و ئاوێنە بە تۆز و خۆڵی بیابان و بەناو تاشەبەرد و شیو و دۆڵی سەختدا زۆر بە تەنگەوە نیم، شمشێری خۆم لایە، كە گازو قەپم پێگرت لە باپیرەو خاڵ و كاكت لە یەك شوێندا).

تۆش قەسەم بە خودا، وا لێت تێگەیشتووم، دڵت لە بوخچەدا پێچراوەتەوە، هۆش و عەقڵ و ژیرییت لاوازە و بە ئاستەم نزیكە لێتەوە، وا چاكە پێت بڵێن: تۆ لەسەر پەیژەیەكی بۆ ملشكان چویتە سەری، بۆ تۆ نییە، دژی تۆیە، لەبەر ئەوە تۆ بە شوێنی ونبووی خۆت ناگەڕێی، ئاژەڵی غەیری خۆت دەبەیتە شەواژۆ، داوای كاری ئەكەی شایستە نیت بۆی و كانیی چەشمەی ئەو نیت، سەیرە و زۆر دوورە كردارت لە گوفتارت، زۆر نزیكی بە مامە و بە خاڵەكانت دەچی، كە لاساریی و بێ مێشكیی

**سەری پێ هەڵگرتن و بە دوداچوونی ناڕاست بێ باوەڕی کردن بە محەممەد(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو لە ڕمبازیی و لە شەڕگەدا لار بوونەوە، کە خۆت باش ئەزانی چۆن بەرگرییان لەگەورە نەبوو! هەوڵی پاراستنی شەرەف و ناموسیان نەبوو، بە لێدانی شیرگەلێك، کە هەرگیز لە شەڕگە نەبڕاون و سستیی و کولیی ڕووی تێ نەکردوون.**

**زۆر بێژییت زۆر کردووە لە بارەی بکوژانی عوسمانەوە، پێم باشە خۆت بهاویتە ئەو کارەی خەڵك ئەنجامی داوە، ئەو کاتە دادوەریی خۆت بکە لای من، منیش تۆ و ئەوان لەسەر کتێبی خودا دادگایی دەکەم، بەڵام وشیاربە ئەوەی داوای ئەکەی ئەوە فێڵی مندالێ لە شیر بڕینەوەیە لەسەرەتاوە، سەلام بۆ شایستەی سەلام.**

**( ٦٥ )**

# نامەیەکی دیکە بۆ مەعاوییە

**ئەوجا پاش ئەوە... حەق وایە ئیتر سوود لە ڕووناکیی وەربگری و بە چاوی بێپەردە تەماشای کارەکان بکەیت و شتەکان زۆر ڕوونن، بەو کارەی ئەنجامی دەدەی، بەسەر هەمان پلیکانەکانی پێشینەکانت سەر ئەکەوی، کە داوای پووچ و بێمانا ئەکەیت، خۆت هاویشتووەتە ناو درۆ و بوختان و خۆخەڵەتاندن و عەوامفریووی، کەوڵێکت لەبەرکردووە، کە زۆر لە تۆ بەرزترە و چەپاو و تالانیی و کارگەلێکت کردووە، کە زۆر دوورە لە تۆوە و نکوڵیی لەکارێ ئەکەی بە ئەندازەی خوێن و گۆشتی خۆت لەسەر ئەرکە، ئەوە پڕ بە گوێ و سنگت بووە و حاڵی بویت لێی، ئێ خۆ پاش ڕاستیی تەنها گومڕایی و ڕێونکردنە و پاش شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە تەنها سەر لێشێواویی و چەواشە هەیە.**

**ئاگادارت ئەکەم خۆت لابدە لە کاری گوماناویی و تەماویی، کە پەیڕەوی کردنی دەبێتە مایەی سەرگەردانیی، چونکە زۆر کات ئاژاوە و ڕووپۆشیی ڕاستیی ئەکات و سەرپۆشیی شاردنەوەی بە سەردا دەدات و بە تاریکیی، شەوارە بە چاو ئەکات و بینینی کورت ئەکاتەوە، ئەوەی ڕاست بێ نامەیەکم لە تۆوە پێگەیشتووە پڕە لە ڕێبازی فرووفێڵ و هونەری قسەی ڕووت، دوور لە ڕاستیی و نزیك لە ئاژاوە و دوورە**

له ئاشتی، سەرتاپا ئەفسانە و خەیاڵبازیی، کە زانستی تۆی تێدا نییە، هیچ جۆرە زانین و فام و ژیریی تۆی لە خۆ نەگرتووە، تۆ لەو نامەیەدا وەك کەسێك لەناو لیتە و قوڕ و چڵپاوێك هەنگاوی کوێرانە لە تاریکاییدا بنێیت، دەتەوێ خۆت بەرز بکەیتەوە بۆ شوێنێك کە دوورە لە تۆ پێی بگەی، نیشانە ڕێکە زۆر لە تۆوە دوورە، هەڵۆی چیانشین ڕێی تێناکەوێ و هاوشانە لەگەڵ ئەستێرە گەلاوێژە، پەنا بە خودا دوورە لە خوداوە، کە پاش من مەزنایەتیی موسڵمانان وەربگری، چ بۆ ئاودان و لە ئاو بردنەوە، بە سوود و قازانج و حەسانەوە، یان پەیمان و گرێبەستێ بکەیت بۆ سوودی ئەوان، هەر لە ئێستەوە خۆت پۆشتە بکەرەوە و بەخۆتدا بچۆرەوە، چونکە ئەگەر کەمتەرخەمیی بکەیت، هەتا مەردانی خودا دێنە سەرت، سەرت لێ دەشێوێ و سەرگەردان دەبی و ئەوەی ئەمڕۆ پێت دراوە لێت وەردەگیرێت و دەرگات لەسەر دادەخرێ.

( ٦٦ )

## نامەیەك بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەباس
## بە هەمان دەق کەمێ جیاواز لە پێشەوە باسکراوە

ئەوجا... بەندە زۆرجار دڵخۆش ئەبێ بەو شتەی، کە هەرگیز تێپەڕ نابێ لێی، دڵتەنگیش دەبێ بە کارێ، کە هەرگیز تووشی نابێ، لەبەر ئەوە دەبێ چاکترین شت لای تۆ لەم دنیایە وەرگرتنی خۆشیی و لەززەت و ڕەوینەوەی ڕق و کینە بێت، بەڵام دەبێ بۆ کوژانەوەی ناڕاستیی و بوژانەوەی حەق ئەوەت هەبێ.

( ٦٧ )

## نامەیەك بۆ قوسمی کوڕی عەباس کە کارگێڕی بوو لە مەککە

ئەوجا و پاش ئەوانە... دەبێ حەج لەگەڵ خەڵك بکەیت و بۆیان باس بکەیت و هۆشیاریان بکەیتەوە لە ڕۆژەکانی خودا، لە سەرەتای ڕۆژ و کۆتایی ڕۆژ، لەگەڵیان دانیشی، گفتی پرسیار و داواکاری خەڵك بدەیتەوە و نەزان فێر بکەیت و گفتوگۆ لەگەڵ زانا و دانا بکەیت، دەبێ نوێنەری تۆ بۆ خەڵك، تەنها زمانت بێ و دەرگاوان

**خۆت بیت بۆ خەڵك و تەنها ڕووی خۆت بێ، نەکەی خۆت وەشێری لە خاوەن ئیش و پێویستیی و پێداویستیی، ئەگەر خاوەن ئیش و کارت ماوە نەدا. و لەبەر دەرگات دەرتکرد، لە سەرەتای هاتنیان بۆلات هەرگیز سوپاسگوزار نابی، ئەگەر لە پاشان جێبەجێت کرد بۆیان، زۆر بە وردیی و شێنەیی تەماشای ئەو دەسکەوت و سامانە بکە، کە لە خوداوە بۆت هاتووە، دابەشی بکە تەنها لە خۆتەوە بۆ ئەوانەی شایستەن و پێویستییان بەم ماڵ و سامانە هەیە و سڤیل و کەمدەرامەتن و لە قاتوقڕیی و گرانیدا دەژین، تەنها بەر ئەوانە بکەوێ، کە لات و هەژار و کەمدەرامەت و داماون، لەوەی کە مایەوە ڕەوانەی لای ئێمەی بکە، هەتا ئێستەش وەك پێویست دابەشی بکەیت، بە دانیشتوانی مەککە بڵێ کرێ وەرنەگرن لەوانەی بە شێوەی کاتیی لەوێ دەژین، چونکە خودای پاك و بێگەرد ئەفەرموا: (ئەو (مەسجیدولحەرام)ەی، کە کردوومانەتە پەرستگە بۆ هەموو خەڵك، چ نیشتەجێ و چ غەوارە). نیشتەجێ ئەوەیە، کە هەمیشە لەوێ بن و غەوارەش ئەوەیە، کە لە دورەوە دێت بۆ حەج.**

**خودا لە سەر ڕێگەی ڕاست ئێمە و ئێوە لانەدات و بۆ ئەو کارەمان ببات، کە خۆی پێی باشە و لێی ڕازییە، لەگەڵ سەلام.**

**( ٦٨ )**

## نامەیەك بۆ سەلمانی فارسیی، پێش بوونی بە خەلیفە

**ئەوجا پاش ئەوە... ئەوە بزانە ئەم دنیایە وەك مار وایە، دەست لێدانی نەرم و شل و ناسکە، ژەهری کوشندەیە، ڕووی خۆت وەربگێڕە لەو شتەی مەیلت بۆ لای دەڕوا و پێت جوانە و ڕازاوەیە، چونکە کەمێ لەوە لەگەڵت دێت و لە خەم و خەیاڵیدا مەبە، لەسەر شانتی لابدە، چونکە باوەڕت هەیە لێت جیا دەبێتەوە، ئەو کاتە زۆر لێی بترسە، کە دڵت لەسەریەتیی و حەزی لێ ئەکەی، چونکە دنیاپەرست و هاوڕێی دنیا، هەتا زیاتر دڵبەندی بێ و بەرەو خۆشیی ببا بەرەو ڕووداوی ناهەمواری دەبا و دەیباتە ناو مەترسیی، یان لە شوێنی دڵخوازێك دایدەنێ کە ڕووی لە چۆڵیی و نامۆییە.**

(٦٩)

# نامەیەك بۆ حارسی هەمەدانیی

توند توند دەستت بگرە بە قورئانەوە، بە ڕاوێژکاری خۆتی بزانە و بە فەرمانی بکە، حەڵاڵی بە حەڵاڵ بزانە و حەرامی بەحەرام دابنێ، بڕوات بە ڕاستیی گێڕانەوەی پێشینەکانی هەبێ، پەند وەربگرە لە ڕابردوی ئەم دنیایە بۆ لەمەولای خۆت، چونکە وەك یەك دەچن، ئەوەی کۆتاییە پەیوەندە بە سەرەتاوە، هەردووکیان ڕوو لە نەمان و لەناوچوونن، هەمیشە خودا بەگەورە ناوبەرە و تەنها بۆ حەق و ڕاستیی ناوی بەرەو بە دەمتدا بێت و سوێندی پێ بخۆی و زۆر زۆر یادی مردن بکە و یادی پاش مردن و ئاواتی مەرگ نەخوازی، مەگەر هەتا بە تەواویی نەزانی ئەو کارە مردن دەهێنێ و گیانبەخشین هاوتایەتیی، نەك کاری سووك و بێمانا.

ئەبێ زۆر ئاگادار بیت، نەکەی نزیك بیت لەو کارەی خۆت لات پەسەندە و ڕای گشتیی خەڵك دژیەتی و زۆر دووربە و بترسە لەو کارەی بە نهێنیی کاری پێئەکرێ و شەرمەزارییە بە ئاشکرا، دووربە لە هەر کارێ ئەگەر لێی بپرسی سەرپێچی لێ ئەکات و داوای لێبووردنی هەیە بۆی، ئەگەر کردبێتی، نەکەی نامووس و شەرەفی خۆت بکەیتە نیشان بۆ تیری خەڵك و تانەوتەشەر و ئەوەی بیستووتە بۆ خەڵکی هەڵمەڕێژە، چونکە ئەوە هاوتایە بە درۆ و هەرچی خەڵك بۆت دەگێڕنەوە دوبارەی مەکەرەوە بۆیان، چونکە نیشانە و بەڵگەی نەفامیی و گەمژەییە، ڕقی خۆت بخۆرەوە و کاتی ڕقهەستانت ئارام و لەسەرخۆبە و پەلە مەکە و لەکاتی توانا و دەسەڵاتدا لێخۆشبوونت هەبێ و ئەو کاتە دەتوانی زۆر لێبوردنت هەبێ، هەمیشە بێومیی و ئاسوودە دەبی، ئەو ناز و نیعمەتەی خودا پێی داوی چاکسازیی و پاکسازیی لێ بکە و بەخێوی بکە و هیچ یەکێك لەو نیعمەتانە مەفەوتێنە کە لات هەیە، با هەمیشە ئاسەواری نیعمەتی خودات پێوە دیار بێ و بزانرێ کە هەتەو مەیشارەوە.

ئەوەش بزانە چاکترین باوەڕدار ئەوەیە بەخشندەتر و دەست و دڵگوشادتر بێ بۆ خۆی و بۆ ئال و عەیال و ماڵ و منداڵی خۆی، ئەوەش بزانە هەرچی پێش خۆت ڕەوانە بکەیت زەخیرەیە بۆ خۆت و هەرچی دوا بخەیت بۆ خەڵکت بەجێ هێڵاوە، نەکەی هەرگیز هاوڕێی ئەو کەسە بکەیت کە ڕاوتەگبیری لاوازە و کاروکرداری

نابـەجێی هەیـە، چـونکە هـاوڕێ بـەهاوڕێ بـەراورد دەکـرێ و لـە شـارەگەورە و قەرەباڵغەکانـدا نیـشتەجێیە، چـونکە نـشینگەی موسـڵمانانە، نەکـەی لەگـەڕەکی بـێ ئاگاو وشك و ناشارستانیی و زبر و بێ کەسوکار و دەرکـراو دابنیـشی، کـە دوورن لـە پەرستنی خودا، ڕای خۆت لەسەر هەموو شت دەرمەبڕە، تەنها لەو کـارە دەربـبڕە کـە مەبەستە بزانـرێ، دەخیـل زۆر دووربـە لـە هاتووچـۆی نـاو بـازاڕ و دانیـشتن لەسـەر دوکان و نشینگەی بازاڕ، چونکە بـازاڕ شـوێنی تـیری هـەردوو سـەرتیژی شـەیتانە بـۆ ڕوانینی حەرام و سـاباتی ئیبلیـسە بـۆ درووسـتکردنی گەنـدەڵیی و ئـاژاوە، لـە ژیـانی خۆت بۆ ئەوانە بڕوانە کـە تـۆ لەوان باشـتر ئـەژی، ئـەوە دەرگـای شـوکر و سوپاسـە بۆت، لە ڕۆژی هەینی سەفەر مەکە هەتا نوێژی هەینی نەکەیت، مەگەر بۆ جیهاد لە ڕێگـەی خـودا، یـان کارێـك کـە بەهانـەی شـەرعییت هـەبێ، لـە هـەموو کارەکانـت سـەرلەبەری فـەرمانی خودابـە، چـونکە بـەجێهێنانی فـەرمانی خـودا زیـادەی هەیـە بەسەر هەموو فەرمانەکاندا، لەگەڵ نەفسی خۆت فێـڵ بکـە و خـۆتی لـێ بـدزەوە بـۆ بەندایەتیی خودا و بیخەڵەتێنە، بەڵام نەرمبە لەگەڵی و زۆری لێ مەکـە، هـەوڵ بـدە کاتی زیادە و وەختی چالاکیی و بە ئاگایی لێ زەوت بکە بـۆ خوداپـەرستیی، ئـەوە بـۆ فەرزە دانراوەکان نییە، چونکە ئەبێ بە هـەر جـۆرێ بـووە ئـەنجامی بـدەیت لـەکاتی خۆی و بە دەستووری خۆی.

نەخەڵەتابیت مردن پـەلامارت بـدات، کـە تـۆ پـەلاماری دنیـا ئـەدەی و لـە خـودا یـاخی و بـێ فـەرمانیی بکـەیت و هـەرگیز دۆسـتایەتیی داوێنپـیس و شـەڕواڵپیس نەکەی، چونکە خراپـە پەیوەنـدە بـە خراپـەوە و درمـە، لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێك، هەمیـشە خـودا گـەورە و بـەرز ڕابگـرە و پیاوەکـانی لات خۆشەویـست بـێ و تـوڕە و ڕقاویی مەبـە، چونکە ڕق و تـوڕەیی سـوپای گـەورەی شـەیتانە و لەشـکری ئیبلیـسە، لەگەڵ سەلام.

(٧٠)

## نامەیەك بۆ سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنساریی، کە کارگێڕی بوو لە مەدینە، کە هەندێ لە دانیشتوانی چووبوون بۆ لای مەعاوییە

ئەوجا پاش ئەوە... وام پێگەیشتووە، کە هەندێ لە پیاوانی لای تۆ چوون بۆ لای مەعاوییە، بەدزیەوە خۆیان دەرباز کردووە، نابێ بە هیچ جۆرێ خەفەت بخۆی بۆ ژمارەیان و ئەندازە یارمەتییان بۆت، تەنها ئەوەت بەسە، کە ئەو گەندەڵیی و پۆخەڵییە لەناوتان نەماوە و دەرمانی نەخۆشیی کۆمەڵی ئێوەی کردووە، ئەوانە لە ڕاستیی و حەق ڕایانکردووە بۆ بەرەڵڵایی و گومڕایی و ڕێونکردن، ئەوانە دنیاپەرستن و بۆ دنیا ڕۆیشتوون و بە پەلە بۆ دنیا ڕایانکردووە، بە چاوی خۆیان داد و یەکسانییان بینیوە لێرە، بەڵام گوێبیستی بەڵێنێ بوون لەوێ، ئەوان ئەزانن، کە خەڵك لای ئێمە لە حەقدا یەکسانن و چوون بۆ زیادەخۆریی و خۆپەسەندیی، دەی با هەر دوور بن و بە پەن بن و سەرشۆڕ بن، ئەوانە بە خودا لە ستەم و زۆرداریی ڕایان نەکردووە و بۆ دادپەروەریی نەڕۆیشتوون، ئێمە ئومێدەوارین، کە خودا کارئاسانییمان بۆ بکات و قورسمان بۆ ئاسان بکات و سەخت و لێرەوارمان بۆ تەخت بکات، هەرواش ئەبێ، ئەگەر خودا مەیلی هەبێ، سەلامی خوات لێ بێ.

(٧١)

## نامەیەك بۆ مونزیری کوڕی جارودی عەبدیی، کە ناپاکیی کردبوو لە هەندێ کاری پێسپێراویدا

ئەوجا پاش ئەوە... پیاوچاکی باوکت منی هەڵخەڵەتان لەگەڵ تۆ و وام گومان برد، کە بە ڕێبازی ڕاستی ئەودا دەچی و هەمان ڕێگە پەیڕەو دەکەی، خۆ ئەگەر ئەوەی لە بارەی تۆوە بە من گەیشتووە، ئەگەر هەر چۆنێ بووە، داوا کارم ڕەشۆی خۆت نەدەیتە دەستی هەوا و ئارەزووەکانت، کارێ نەکەی زەخیرە و پاشەکەوتی ئەو دنیات کەم بکەیتەوە، دنیات ئاوەدان بە وێرانیی قیامەتت، بەشێك لە دین لێکەیتەوە بۆ خێڵەکەت، ئەگەر ئەوەی بە من گەیشتووە، ئەگەر ڕاست بێ، ئەوە نێرەحوشتری خەڵکی خۆت و قەیتانی نەعلەکەت زۆر لە تۆ باشتر و چاکترە، ئەو

كەسەی ئەم سیفەتەی تۆی هەبێ، بە كەڵكی دانان نایە بۆ پاراستنی مەرز و سنوور، یان كارئەنجامدان، یان بەرزكردنەوەی ڕێز و قەدر و حورمەت، یان لەكاری دەستپاكیی هاوبەشیی بكەیت، یان ترسی ناپاكییت لێ نەبێ، بەگەیشتنی ئەم نامەیە وەرە بۆ لام، ئەگەر خودا ویستی.

## ئەم كابرایە كە (مونزیرە)ی ناوە میری باوەڕداران لەبارەیەوە دەفەرمووێ:

ئەم كابرا زۆر لە خۆبایی و ئەم شانەو شانی خۆی ئەكات، لە كەوا و عەبای ڕەنگاوڕەنگیدا زۆر بە فیز و دەعیەیە، زۆر فوو ئەكات لە پێڵاو و قەیتانی كلاشەكانی و تۆزیان لێ ئەكاتەوە.

(٧٢)

## نامەیەك بۆ عەبدوڵلای كوڕی عەباس

ئەوجا و پاش ئەوە... وا بزانی ئەتوانی پێشی ئەجەلت بكەوی و ڕۆزیی دیاریكراوی خۆت نەخۆی !؟ ئەوەش بزانە زەمان و ڕۆژگار دوو ڕۆژە: ڕۆژێ بۆ تۆ، ڕۆژێ لەسەر تۆ، دنیا خانەی دەستاودەستە، ئەوەی لە سوودی تۆیە، هەر بەدەستت دەگا، چەندە بێ هێزو لاواز بیت و ئەوەی دژی تۆیە، ناتوانێ بە هێز و توانا دووری بخەیتەوە.

(٧٣)

## نامەیەك بۆ مەعاوییە

ئەوجا پاش ئەوە... ئەوە بزانە من زۆر دوو دڵم لە وەڵامەكەت و گوێگرتن لە نامەكەت، ڕاو بۆچوونی خۆم بە نابەدڵ و لاواز ئەزانم و سەرناسیی خۆم بە هەڵە بردووە، كە گفتوگۆم لەگەڵ تۆ كردووە، ئەوەی كە ڕاستە تۆ هەوڵی بەردەوام ئەدەی، كە وەڵامت بدەمەوە و دانوستانت لێ نەبڕم و داوای دوبارە گفتوگۆ و خوێندنەوەی دێڕی نامەكانت، وا دێتە بەر بۆچوونم وەك كابرای خەوخۆش و خەوقورس، حەزی

بەخەبەربوونـەوە نییـە، کـە بـە زۆری خـەوی خۆشـبین ڕاسـت ئەبێتـەوە و ئـەزانیٚ خەوەکەی درۆی لەگەڵ کردووە، یان وەك ئـەو سەرلێشێواو و سـەرگەردانەیە لەسـەر کارێك، کە بـوونی لـەو شـوێن و جێگەیـە بـە شایـستە نـازانیٚ و لـە نێـوان دەسـت لـیٚ هەڵگرتن و لەسەر مانـەوەی لەگومانـدایـە لـە سـەری بـیٚ، یـان دەسـتی لـیٚ هـەڵگریٚ و پاشەڕۆژی نادیارە بۆی، یان سەر ئەکەویٚ، بەڵام لە دڵا سـەرگەردانیت، ئـەزانی حـەق لای ئێمەیە، بەڵام وەك ئەو کار ئەکەی، بـەڵام بـاش بزانـە سـوێند ئـەخۆم بـە خـودا، هەنـدیٚ تێڕامـان و تێـدامان نەبوایـە، کـە نامـەویٚ لـە نـاوت بـەرم و مانـەوەت لام مەبەستە، ئەوە نەبیٚ، لە منەوە بۆ تۆ کاری کەمەرشکێن و ئێسقانوردکەر هەیـە، کە پەیکـەری لەشـت وردوخـاش بکـات و گۆشـت و مۆخـت بتوێنێتـەوە و ئـەوەش بـاش دەزانم، کە شەیتان چووەتە دەروونتەوە و ماوەت نادات، کە بەکارەکانتـدا بـچیتەوە و دوبارە بیری لیٚ بکەیتەوە، کە باشترین کار ئەوەیە فەرمانی ئێمە جێبـەجیٚ بکـەیت و گوێبیستی قسە و فەرمانی ئێمە بیت، کە پەند و ئامۆژگاریت ئەکەین، ئیتر سـەلام و ئارامیی بۆ ئەوە بێت، کە شایستەیە بۆ سەلام.

( ٧٤ )

## نامەیەك لە بارەی پەیماننامەیەك لە نێوان یەمەن و ڕەبیعەدا کە لە دەستنووسی هیشامی کوڕی کەلبییەوە هاتووە

ئـەوە، ئـەو پەیمانەیـە، کـە دانیـشتوانی یەمـەن ڕێکـەوتوون لەسـەری، بـە شـار و لادێیـەوە، لەگـەڵ ڕەبیعـە، بـە شـاریی و گوندنـشینیی و دەشـتەکییەوە، هـەر دوولا کۆکن لەسەر قورئان، کە کتێبی خودایە و بانگەشـەی بـۆ دەکـەن و خـەڵکی بـۆ بـانگ دەکـەن و بـە فـەرمانی پەیوەنـد دەبـن بـەدەم هەرکەسـەوە، کـە پابەنـد بـیٚ بـە فەرمانییەوە دەچن، هەرگیز ئامادە نین بە هەر نرخیٚ بیفرۆشـن و ئامـادە نـابن بـە گۆڕینـەوەی بـە هـیچ شتێك، هـەر دوولا یـەك هێـزن، دژی ئـەوەی پێچەوانەیەتی و ڕەدی دەکاتـەوە، یارمەتیـدەر و هاوکـار دەبـن بـۆ یەکـدی، یـەك دەنگـن، پـەیمان هەڵناوەشـێنن بـۆ لۆمـەی هـیچ لۆمـەکارێك و تـوڕە بـوونی هـیچ تـوڕە و نـەیارێك و سەرکوتکردنی هیچ هۆزێك بۆ هۆزێکی تر، یان بۆ دژایەتیی خێڵێك بۆ خێڵێکی تـر،

لەسەر ئەم پەیمانە ڕێككەوتوون، حازروبزریان و ئامادە و نائامادە، نەفام و زانایان و خاوەن عەقڵ و گێلیان، لەسەر ئەم پەیمانە خودایان كردووە بە ڕاگری پەیمان و سوێندخواردن و بەڵێنیان و هەر بەڵێنێك بە خودا بدرێ جێگەی پرسینەوەیە، نوسینی عەلی كوڕی ئەبوتالیب.

( ٧٥ )

## نامەیەك بۆ مەعاوییە، سەرەتای پەیمانپێدان بە خەلافەت، واقیدی لە كتێبی جەمەلدا نوسیوەیە

لە بەندەی خودا عەلی میری موسڵمانان بۆ مەعاوییەی كوڕی ئەبی سوفیان

ئەوجا و پاش ئەوە... زۆر چاك دەزانی ڕادەی عوزر و بەهانەی من لەگەڵ ئێوە و پشتهەڵكردنی من لە كاروباری ئێوە و بێلایەنییم، هەتا ئەوەی دەبوو ڕوو بدات و توانای لادانی نەبوو، ڕوویدا و ئەو داستانە دوور و درێژە قسەی زۆری لەسەركراوە و زۆری لەسەر وتراوە، ئەوەی چوو چوو، ئەوەی هات هات، تۆش پەیماننامە و قەولپێدان وەربگرە، لەوانەی لای تۆیە و خۆت هەندێ لە یارویاوەران لەگەڵ خۆت بێنەوە و وەرە بۆ لام، سەلام.

( ٧٦ )

## نامەیەك بۆ عەبدوڵڵای كوڕی عەباس، كە كردی بە نوێنەر لە بەسرە

با جێگە و ڕێگەت جێگەی لێقەماو و كەسی تێدا بێتەوە، بە یەكسانیی ڕووت و دەموچاوت و دانیشتنت و فەرمانەكانت، نەكەی تورە بوونت هەبێ، چونكە ئەوە ڕەشبینییە لە شەیتانەوە، ئەوەش بزانە هەتا لە خودا نزیك بیت، لە ئاگر دووری و ئەوەندەی لە خودا دووربیت، لە ئاگر نزیكی.

( ٧٧ )

## نامەیەك بۆ عەبدوڵلای کوڕی عەباس،
## کە ڕێنوومایی پێدا و ناردی بۆ لای خەواریج

ئاگاداربە، موناقەشە و گفتوگۆیان بە قورئـان لەگـەڵ مەکـە، چونکە قورئـان بـۆ خۆی هەڵگری چەند لێکدانەوە و مانا و مەبەستە، زۆر ڕوو هەڵئـەگرێ، تـۆ ئـەڵێی و ئـەوانیش دەڵـێن و ئـەنجامی نییـە، بـە فـەرموودەی درووسـت قـسەیان لەگـەڵ بکـە، چونکە ناتوانن لە ڕاستیی و ناوەڕۆکی دەرچن و ڕابکەن.

( ٧٨ )

## نامەیەك بۆ ئەبی موسای ئەشعەریی،
## وەك وەڵامێك بۆ کار و دوو حەکەمەکە بۆ ناوبژی،
## سەعیدی کوڕی یەحیای ئەمەوی کە لە کتیبی ( مەغـازی )دا بـاسی کردووە

ئەوە ئاگاداربە، کە خەڵك گۆڕاوە بە زۆریی و زۆریان دەستیان ناوە بـە بـەخت و بەختەوەریی خۆیانەوە و بە هەموو جۆرێ ڕوویان لە دنیا کردووە و بەدەم هەرچی ئارەزوویان بێ ئەیلێن، من بۆ ئـەم کـارەی لـە ئەسـتۆمە لـە جێگەیـەکی زۆر سـەیر و سەمەرەدا کۆمەڵێك، کە بە خۆیاندا ئەنازن کـۆکن و یـەك بـاوەڕن لەسـەری، مـن زۆر بە جددی هەوڵی تیمارکردنی زامی ئـەوانم داوە، کە گـەنیوە و ترسـم هەیـە خوێنـە پەنگخواردوو وشکبووەکەی ئەو زامە بووبێتە لەپارەگۆشتی گەنیوو و بـۆنکردوو، کـە دەبێتـە تەشـەنە بـۆ هـەموو لەشـیان و هـیچ کـەس، بـاش بزانـە، لەسـەر یـەکێتیی و یەکپارچـەیی ئۆمـەتی محەممـەد (صـلی اللە علیـە وسـلم) و پێکـەوە ژیانیـان لـە مـن چاکتر و باشتر و ڕاست بێ، ئەوەش تەنها و تەنها بە ئومێد و هیوای پاداشتی جوان و گەڕانەوەی سەربەرزانە بۆ لای خودا و بەو ئەرك و فەرمانەی لەسەر خۆم داناوە بـە ئەمەك و بەوەفا دەبم، هەرچەندە تۆ وەرچەرخایت و گۆڕایت و لەسەر ئەو بـەڵێن و پەیمانە، کە ڕێککـەوتین و لەیـەك جیابووینـەوە لەسـەری پابەنـد بیـت، ئـاخر شـڕ و داماو ئەو کەسەیە، کە سوود لـە ئـەزموونی ژیریـی خـۆی وەرنـەگرێ و تاقیکردنـەوە پشتگوێ بخات، من زۆر لەوە زیاتر ڕقئەستوور دەبم، کە بە گفتی نـەزان و نادروست

وتارکاری لەناو بەرم، کە خودا چاکی هێناوە و بە چاکی داناوە، ئەوەی بێئاگا و ناحاڵیی و تێی ناگەی وازی لێ بێنە، هەموو پیاوخراپ و ناپەسەند و نارەسەنەکان قسەی زۆرت بەدەمەوە ئەکەن و بۆتۆی حەواڵە ئەکەن، ئیتر سەلام.

(٧٩)

## نامەیەك بۆ فەرماندەی هەموو سوپاو سەربازەکان

ئەوجا پاش ئەوە... ئەوە بزانن ئەوانەی کەوتن و شکستیان هێنا لە پێش ئێوە، هۆکارەکەی ئەوە بوو، کە حەق و مافیان بەخەڵك نەدا و مافیان لێ زەوتکردن و ڕاستییان شاردەوە و بە بەرتیل خەڵك مافی خۆی دەست نەکەوت و بە زۆر ناڕاستییان بە سەردا دەسەپاندن و ئەو ناحەقیی و بێ دادیەیان بە میرات جێهێشت بۆ نەوەی نوێ و ئەوانیش لەسەر هەمان هەڵە ڕۆیشتن.

## سوپاس بۆ خودا تەواو بوو

ئەوە کۆتایی مەبەستە بۆ ئێمە لە بارەی فەرمایشتەکانی میری باوەڕداران(صلی الله علیه وسلم)، سوپاس و ستایش بۆ خودای پاك و بێگەرد، کە یارمەتیی ئێمەیدا ئەو فەرمایشتە پرشوبڵاوە کۆ بکەینەوە، لەملاو ئەولاوە و هەندێ شوێن بە سپی جێماوە، ئەگەر دەستمان کەوت بە وتاری ئەو پڕی ئەکەینەوە، بۆ کۆکردنەوەی ئەوەی دیار نییە و بەدەستی بێنین و پەیوەستی بکەین بەم نوسینەوە، خودا خۆی هەموو شاراوەیەك ئاشکرا بکات و دەستی ئێمە بکەوێ، تەوفیق تەنها بەدەستی خودایە و هەر ئەومان بەسە بۆ هاوکاریی و بریکاریی.

شێخ محەممەد عەبدە دەڵێ:

ساڵی چوارسەد ئەو کتێبە نوسراوە لە لایەن شەریفی ئەلڕەزیی و لە پاش هەر باسێك چەند پەڕەیەکی سپی جێهێڵاوە، تا بەڵکو دەقێك دەست بکەوێ.

سوپاس بۆ خودای سەرەتا و کۆتا و ستایش بۆ ئەو لە خۆشیی و ناخۆشیی و درود لەسەر ڕۆحی خاتەم و ئال و یار و یاوەر، کە ڕەگی جوامێریی و لقی بەرزیی و شکۆ لای ئەوانە، ئامین.

## دەرگایەکی تر لە بژاردەی وتە بەنرخەکانی میری موسڵمانان

# عەلی کوڕی ئەبو تالیب

## پەند و ئامۆژگارییەکانیی،وەڵامی پرسیارەکانی، کورتە وتەکانی

**ئەفەرموێ:**

١- لە کاتی ئاژاوەدا وەك پارێنەبە١٠ نە بۆ سواربوون ئەشێ و نەگوانی هەیە بۆ شیر.

٢- ئەو کەسەی چاوچنۆکیی بکات خۆی سووك و ترۆ ئەکات، حەزی بە پەستییە ئەو کەسەی ناتەواویی بۆ خەڵك باس ئەکات، ئەوەی زمانی گەورە بێ، خۆی ئەکات بەگاڵتەچیی خەڵك، ڕژدیی شورەییە، ترسنۆکیی بێنرخییە، هەژاریی زمان ئەبڕێ، هەژار لە نیشتمانی خۆی نامۆیە، بێتوانایی نەخۆشییە، خۆڕاگریی ئازایەتییە، کەمتەماعیی سامانە، خۆپارێزیی قەڵغانە، دۆستی پەسەند باشترین هاودەمە، زانست میراتێکی بەهادارە، ئەدەب خشڵی ڕازاوەیە، بیروهۆش ئاوێنەیەکی بێگەردە، سنگی مرۆڤ سندووقی نهێنیەکانییەتی، ڕووگەشیی داوی خۆشەویستییە، خۆگریی گۆڕی هەموو شورەییەکانە.

٣- لە پێشەوا گێڕراوەتەوە، کە لە هەمان مانای ئەم دەستەواژەیە دووبارە فەرموویەتی: بێزیانی چاڵی عەیبەکانە، ئەوەی لەخۆباییە دوژمنی زۆرە، خێرو چاکە دەرمانێکی سوودبەخشە، نامەی کرداری خەڵك ئەمڕۆی بۆ دوا ڕۆژ لەبەرچاوە.

٤- ئەو بەشەرە زۆر سەیرە بە چەوریی ئەبینێ، بەگۆشت ئەدوێ، بە ئێسقان ئەبیستێ، لە دەلاقەوە هەناسە ئەدات.

٥- ئەگەر دنیا ڕووی لە هەر کەس کرد، چاکەی کەسانی تری دەداتێ، ئەگەر دنیا پشتی تێ کرد هەموو چاکەکەی لێ ڕائەماڵێ.

٦- هامشۆی خەڵك و تێکەڵاویی بکەن، بە جۆرێ کە مردن بە سەرتانەوە بگرین، ئەگەر ونبوون بۆتان بگەڕێن.

٧- ئەگەر توانات بەسەر دوژمنتا پەیدا کرد، لێخۆشبوون بکە بە سوپاسی تواناکەت بە سەریا.

٨- بێتواناترین کەس ئەو کەسەیە، کە نەتوانێ برا و دۆست پەیدا بکات، لەو بێتواناتر ئەو کەسەیە، کە برا و دۆستی هەیە و لەناویان ئەبات.

---

[10] پارێنە : بەچکە وشتر، کە دو ساڵی تەواو کردبێ.

٩- ئەگەر سەرەتای نازونیعمەت هات بۆتان، کارێ مەکەن، کە بە تەواویی نەگات بە هۆی ناشوکرییەوە.

١٠- ئەو کەسە خزمی نزیکی گوێی پێ نەدا، بیانیی دووری بۆ پەیدا ئەبێ.

١١- پێویست نییە هەر کەس لەناو ناژاوەدا سەرزەنشت بکرێ.

١٢- هەموو کارەکان پەیوەستە بە قەزا و قەدەرەوە، هەتا مردن چاری ئەکات.

١٣- لە مانای فەرمایشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکراوە: مووی سپی بگۆڕن، بەڵام لاسایی جوو مەکەنەوە، فەرموی: ئەوەی بۆیە فەرمووە، کە ئیسلام کەم و لاواز بوو، بەڵام ئێستە پشتێنی قەویی بووە و گەردنی درێژ کردووە، خەڵك ئارەزووی خۆیەتی.

١٤- لە بارەی ئەوانەی، کە پاشەکشەیان کرد لە یارمەتیی، ئەوانە حەقیان دایە دواوە و یارمەتیی باتڵیان نەدا.

١٥- ئەوەی جڵەوی دایە دەستی هیوای بێ جێ، پێی هەڵئەکەوێ لە ئەجەلی.

١٦- بەهانە و بیانووی جێگەداران وەربگرن لەکاتی پێهەڵکەوتنیان، چونکە هەر کەس لەوانە پێی هەڵبکەوێ و نووچ بدات، دەستی خودا ڕاستی ئەکاتەوە.

١٧- ترس هەمیشە هاوڕێی بێئومێدییە، شەرم پەیوەندە بە بێبەشیی، هەل وەك هەور ئەڕوا، بۆیە هەمیشە هەلی چاك بقۆزنەوە.

١٨- ئێمە خاوەن حەقین، ئەگەر پێمان ڕەوا ببینرێ، دەنا ئەگەر دەستمان نەکەوت، لەپاشکۆی حوشترەوە سوار ئەبین، هەر چەندە ئازارمان پێ دەگات.

١٩- ئەوەی کردەی بێبەش بێت، نەسەبی ناگاتە فریای.

٢٠- بۆ لابردنی تاوان و گوناح، بەدەمەوە چوونی لێقەوماو و پرسە و دڵدانەوەی کۆستکەوتووە.

٢١- ئەی نەوەی ئادەم ! کە تەماشا ئەکەی خودای پەروەرندەت بەردەوام نیعمەتت بەسەردا ئەدا و تۆش نافەرمانیی ئەکەی، زۆر بترسە !.

٢٢- هەرکەس هەرچی لەناخی خۆیدا حەشاردا، لە زمان خەڵەتاندندا دەرئەکەوێ و لە ڕوویدا بە ڕوونیی دیارە.

٢٣- لەگەڵ بیمارییدا برۆ، هەتا لەگەڵت ئەڕوا.

٢٤- لە دنیانەویستییدا باشتر ئەوەیە بیشاریتەوە.

٢٥- تۆ بەرەو دوای تەمەن و مردن بەرەو ڕووت دێت، زۆر زوو بەیەك ئەگەن!.

٢٩- ئاگاداربە، ئاگادار...! قەسەم بە خودا، ئەوەندە تاوانی پۆشیوی، وا ئەزانی لێتخۆش بووە.

٢٧- لە پرسیارێکدا فەرمووی: باوەڕ چوارپایەی هەیە: خۆڕاگریی، یەقین، دادپەروەریی، جیهاد.

خۆڕاگریی چوار بەشە: بە شەوق، بە ترس، بێتەماعیی، بە چاوەڕوانیی.

ئەوەی شەوقی بەهەشتی هەبێ، خۆی لەکاری گومانـاویی لائەدا، ئەوەی ترسی ئاگری هەبێ، لە قەدەغە دوور ئەکەوێتەوە، ئەوەی بێتەماع بێ، لە دنیا گوێ ناداتە کارەسات و ڕوداو، ئەوەی چاوەڕوانی مردن بکات، پەلەیەتی بۆ چاکە.

یەقین چوار بەشە: چاوتیژیی زیرەکیی، توێژینەوە لە جوامێریی، پەند وەرگرتن لە ئامۆژگاریی، ڕەویەی پێشینەکان.

ئەوەی چاوی ژیری زیرەك بێ، لایەنی جوانی جوامێریی بۆ دەرئەکەوێ، ئەوەی جوامێریی بۆ دەرکەوت پەند وەرئەگرێ، ئەوەی پەندی وەرگرت، وەك ئەوە وایە، کە لە پێشینەدا ژیابێ.

دادپەروەریی چوار بەشە: شۆڕبوونەوە بۆ زانست، قوڵایی زانین، جوانیی جوامێریی، بنجداری لەسەرخۆیی.

ئەوەی تێدەگات، دەزانێ قوڵایی زانست، ئەوەی قوڵایی زانست فێربوو، لەسەر چاوەی شەرعەوە فەرمان ئەدا، ئەوەی لەسەرخۆیی هەبوو، زیادەڕۆیی ناکات لە حوکمدا و لەناو خەڵکدا ڕێزدارە.

جیهاد لەسەر چوارپایەیە: فەرمان بە چاکە، نا لە خراپە، ڕاستیی لە وتنی حەقدا، دژایەتیی پیاوخراپان.

ئەوەی فەرمان بدا بە چاکە پشتی باوەڕداران بەهێز ئەکات، ئەوەی نا لەخراپە بکات لووتی دووڕووەکان شۆڕ ئەکات، ئەوەی ڕاست بێ لە حەقوێژییدا، هەرچی لەسەرە ئەنجامی دەدات، ئەوەی دژی پیاو خراپ بێت و ڕقی تەنها بۆ خودا بێت، خوداش بۆ ئەو ڕقی دەبێ و لەو دنیا ڕازی ئەکات.

بێباوەڕیی چوار پایەی هەیە: بە دوای وەهم کەوتن، بە دوای دووبەرەکیی، لادان لە ڕاستیی، عیناد و کەللەڕەقیی.

**ئەوەی دوای وەهم بکەوێ و خەیاڵبازیی بکات، ڕێی لە حەق ناکەوێ، ئەوەی جەدەل و ناکۆکیی زۆر بێ بە نەفامی، لە ئاستی حەق کوێرە، ئەوەی لە حەق لابدات، چاکەی بە خراپە دێتە بەرچاو و خراپەش بە چاکە و هەمیشە سەرخۆشی گومراییە، ئەوەی حەزی بە ئاژاوە و دووبەرەکیی بێت، ڕێگەی هەمیشە سەخت و دژوارە و ماندووی ڕێگەیە و دەرچوونی سەختە.**

**گومان چوار بەشە: حەزی لە جەدەل و موناقەشەیە، سەرلێشێواوە، دوودڵیی، زوو خۆبەدەستەوەدان.**

**ئەوەی حەزی لە جەدەل بێت، شەوی ڕۆژی نییە، ئەوەی سەرلێشێواو بێ، هەنگاوی بە ترسەوەیە و ڕوو لەدوایە، ئەوەی لە گوماندا بژی، ئەسپی شەیتان ئەیکات بەژێرسمیەوە، ئەوەی خۆیدا بەدەستەوە بۆ دنیا و قیامەت، تێدا چووە.**

**٢٨- چاکەکار لە چاکە چاکترە، خراپەکار لە خراپە خراپترە.**

**٢٩- دەستگوشادبە، دەستبلاو مەبە، ئەندازیاری بەخشین بە، دەستقوچاو مەبە،**

**٣٠- جوانترین سامانداریی، بێتەماعییە.**

**٣١- ئەوەی کاری ئەوە بێ هەرچی خەڵك پێی ناخۆشە بیکات، ئەوانیش ئەوەی نایزانن بۆی هەڵدەبەستن.**

**٣٢- ئەوەی هیوای درێژبێ، کاری خراپی زۆرە.**

**٣٣- کۆمەڵێ لە جوتیارەکانی کورد لە ئەنبار لەو کاتەی لە کوفەوە بۆ شام دەچوو توش بوو، هەموو لە ئەسپەکان دابەزین و بە پێ ڕایان کردبوویە بەردەمی، فەرمووی: ئەمە چی بوو ئەنجامتاندا؟ وتیان: ئەوە عادەتی خۆمانە، ڕێزی گەورەی خۆمان دەگرین. فەرمووی: گەورەکانتان سوودی لێوەرناگرن و ئێوەش لە دنیادا خۆتان ماندوو ئەکەن، لە قیامەتدا تووشی کوێرەوەریی ئەبن، ئەزانن ناخۆشیی لە جەزای دوایی چەندە قورسە و هێمنیی و لەسەرخۆ ڕۆیشتن، دووریی ئاگری تێدایە.**

**٣٤- بە حەسەنی کوڕی فەرموو: کوڕم چوار شتم لێوەربگرە، ئەو چوارە هەتا کاری پێ بکەی تووشی زیان نابیت: دەوڵەمەندترین دەوڵەمەند، دەوڵەمەندی عەقڵە، گەورەترین هەژاریی، گەمژەیی و گێلییە، ناموٚترین نامۆیی، لەخۆباییبوونە، چاکترین ڕەسەنایەتیی، باوباپیرە و ڕەوشتبەرزییە.**

كورِم نەكەی هەرگیز دۆستی پیاوی گەمژە بیت، چونكە ئەگەر بیەوێ قازانجت پێ بگەیەنێ زیانت لێئەدا، نەكەی دۆستایەتیی داوێنپیس بكەی، چونكە بە هەرزان ئەتفرۆشێ، نەكەی هاورێی درۆزن بیت، چونكە وەك تراویلكە وایە، نزیكت بۆ دوور ئەكات و دوورت بۆ نزیك.

٣٥- هەرگیز ناكرێ بە سوننەتكردن نزیك بیتەوە بە زیانگەیاندن بە فەرزەكان.

٣٦- زمانی پیاوی ژیر لە پشتی دڵەوەیە، دڵی بێعەقڵ لە پشتی زمانییەوەیە.

٣٧- دڵی بێعەقڵ لە دەمیدایە و زمانی عاقڵ لەدڵیدایە.

٣٨- لە ڕووی یەكێ لە یارانیدا، كە تووشی نەخۆشی بووبوو: خودا هەموو هاوارێكت لە تاو ئێش و ئازاردا بكاتە نەهێشتنی خراپەكانت، چونكە نەخۆشیی كرێی نییە، بەڵام خراپە لا ئەبات و وەك گەڵای دار ئەیوەرێنێ، كرێ تەنیا قسەی زمانە و كارە بە دەست و بە پێوە، خودای بەرز و بێهاوتا، بە نیازی باش و نهێنی ناو دڵی حاڵ، هەر كەس ئارەزوو بكات ئەیخاتە بەهەشتەوە.

٣٩- خودا ڕەحم بكات بە (خوباب)، كە بە ئارەزوو ئیسلامی وەرگرت و بە ئارەزوو كۆچیكرد و بەكەم قانیع بووە، لە خودا ڕازی بوو، بە موجاهیدیی ژیا، بەهەشت بۆ ئەو كەسەیە، یادی دوا ڕۆژی هەیە، كار بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە ئەكات و بە كەم قانعە و لە خودای خۆی ڕازییە.

٤٠- ئەگەر بەم شمشێرە بدەم لە لووتی باوەڕدار بۆ ئەوەی ڕقی لێم بێ، هەرگیز ڕقی لێم نابێ، ئەگەر ئاوی دنیا بكەم بەسەر دووڕوودا، بۆ ئەوەی منی خۆش بوێ، خۆشی ناوێم، چونكە لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیە وسلم) هاتووە: عەلی! موسڵمان ڕقی لێت نییە و دووڕوو خۆشی ناوێی.

٤١- ناخۆشییەك، كە ناڕەحتت بكات، باشترە لە چاكەیەك لە خۆباییت بكات.

٤٢- ڕێزی هەر كەسێك بە ئەندازەی ویستییەتی، ڕاستیی هەر كەس بە ئەندازەی جوامێرییەتی، ئازایەتیی هەر كەس بە ئەندازەی ورەیەتی پاكداوێنیی هەر كەس بە ئەندازەی غیرەتییەتی.

٤٣- سەركەوتن بە ویستە، ویست بە بیركردنەوەی تیژە، بیكردنەوەی تیژ بە شاردنەوەی نهێنییە.

**٤٤- ئاگادار بن لە پەلاماری دەرونگوشاد، ئەگەر برسیی بوو، ئاگاداری ڕژد بن، کە تێر بوو.**

**٤٥- دڵی مەردان کێوییە، هەر کەس دەستەمۆی بکات، بۆ لای ئەچێت.**

**٤٦- عەیب و عارت شاراوەیە، هەتا بەختت بەختەوەر بێت.**

**٤٧- چاکترین کەس، کە شایستە بێت بە لێبوردن، باشترین کەسە بۆ توانای تۆڵە.**

**٤٨- سەخاوەت لە سەرەتاوەیە، بەڵام ئەگەر بە داوا کردن بوو، ئەوە شەرم و ترسە.**

**٤٩- سامان نییە وەك عەقڵ، هەژاریی نییە وەك نەفامیی، میرات نییە وەك ئەدەب، پشتیوان نییە وەك ڕاوێژکاریی.**

**٥٠- خۆگرتن دوانە: خۆگرتن لەسەر ئەوەی پێت خۆش نییە، خۆگرتن لەسەر ئەوەی حەزت لێیە.**

**٥١- سامان لە غەریبیدا نیشتمانە، هەژاریی لە نیشتماندا غەریبییە.**

**٥٢- قەناعەت سامانێکە بێکۆتایی.**

**٥٣- سامان کەرەستەی بزواندنی ئارەزووە.**

**٥٤- ئەوەی ئاگادارت ئەکات، وەك ئەوەیە مژدەت پێ ئەدات.**

**٥٥- زمان دڕندەیە، ئەگەر بەرەڵلاکرا، ئەگەزێ.**

**٥٦- ئافرەت- ژن دووپشکە، پێوەدانی خۆشە[11].**

**٥٧- ئەگەر سڵاوت لێ کرا وەڵامی شیرین بدەرەوە، ئەگەر دیارییت پێدرا، بە زیاتر پاداشتی بدەرەوە، لەگەڵ ئەوەی چاکە بۆ یەکەم کەسە.**

**٥٨- واسیتە باڵی داواکارە، پێی ئەفڕێ.**

**٥٩- خەڵکی ئەم دنیایە وەك کاروانێکە، بەڕێوەبرێن بە خەوتوویی.**

**٦٠- لەدەستدانی خۆویستان، غەریبییە.**

---

[11] چواندنی ئافرەت بە دوپشك، ناگونجاوە و ناشیرینە، پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرمویەتی: (حبب إليّ من دنياكم النساء والطيب ... لە دنیای ئێوە ئافرەت و بۆنی خۆشم لەلا خۆشەویست کراوە) نەسائی و ئەحمەدو حاکم گێڕاویەتیانەوە، هەروەها دەفەرموێ: (استوصوا بالنساء خيراً... ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ ئافرەتان باش بن و چاکە بکەن) بوخاری و موسلیم . گەر ئافرەت وەك دوپشك بایە، پێغەمبەر خۆشی نەدەویست و ڕای نەدەسپارد، کە چاکەیان لەگەڵدا بکرێت. بڕواش ناکەین ئەمە ڕای ئیمام عەلی بێت .

(بلاوکار)

٦١- شەرم مەكە لە بەخشینی كەم، بێبەشكردن لەو كەمترە.

٦٢- لەدەستدانی پێویستیی، سووكترە لە داوا كردن لە نائەهل.

٦٣- پاكداوێنیی خشڵی هەژارە، سوپاسگوزاریی جوانیی دەوڵەمەندە.

٦٤- ئەگەر ئەوەی ویستت دەستت نەكەوت، گوێ مەدەیە وەك خۆیەتی.

٦٥- نەفام، یان كورت ڕەوە، یان تیژڕەوە.

٦٦- ئەگەر ژیریی فرە بوو، قسەمەكە.

٦٧- زەمانە لەش دائەڕزێنێ، تەما و ئومێد زۆر ئەكات و تازە ئەكاتەوە، مەرگ نزیك ئەكاتەوە، ئاوات دوور ئەخاتەوە، ئەوەی دەستی بكەوێ ماندوو ئەبێ، ئەوەی دەستی نەكەوێ شەكەتە.

٦٨- ئەوەی خۆی ئەكات بە پێشەوا بۆ خەڵك، دەبێ خۆی فێر بكات پێش فێركردنی خەڵك، دەبێ كردەی چاك بكات پێش ڕامكردنی زمانی، فێرخواز بۆ خۆی و فێركار بۆ خۆی لە فێركاریی خەڵك چاكترە.

٦٩- هەناسەی مرۆڤ هەنگاوە بۆ ئەجەلەكەی.

٧٠- هەموو ژمێریارێك كۆتایی هەیە و هەموو چاوەڕوانكراوێك دەگات.

٧١- ئەگەر كارەكان گوماناویی بوون، كۆتایی وەك سەرەتایە.

٧٢- زەراری كوڕی زەمرەی زوبابیی، كە لای مەعاوییە پرسیاری میری باوەڕدارانی لێ كرد وتی: من شایەتیی ئەدەم بەچاوی خۆم دیومە لە هەندێ هەڵوێستی، كە پەردەی تاریكیی شەو هاتووە، بە پێوە لە میحرابەكەیدا دەستی لەسەر ڕیشی داگرتبوو وەك مارانگاز ئەینالاند، وەك كۆستكەوتوو ئەگریا و ئەیوت: دنیا...دنیا...! وازم لێبێنە بڕۆ!، بۆ ڕێگەم لێ ئەگری؟ یان حەزت لە منە؟ یاخوا كاتی هاتنت نەیەتە پێشەوە، زۆر دوورە لە دڵم نزیك بێتەوە ! بڕۆ خەڵكی دیكە بخەڵەتێنە، من پێویستم بە تۆ نییە، سێ بە سێ تەڵاقم داوی و پەشیمان نیم لێی، چونكە ژیوارت كورتە، خۆشییت كەمە، ئاواتت پەستە، ئاخ ! چەندە بێ تێشووم، ڕێگە دوور و درێژە، سامناكە كاتی گەیشتنم.

٧٣- وتارێكی لە وەڵامی پرسیارێكدا: ڕۆیشتنی بۆ شام بە قەزاوقەدەری خودا بوو، فەرمووی: خودا بتكوژێ، ڕەنگە وا بزانی قەزایەكی پێویست بۆ قەدەری حەتمیی بوو، ئەگەر وا بوایە پاداشت و سزا نامێنێ، مژدە و هەڕەشە بێ كەڵكە، خودای

پاك و بێگەرد فەرمانی داوە بە ئارەزوو و ویستی بەندەكانی و ترسی ناوەتە بەریان و تەكلیفی كەمی كردووە و ئەركی قورسی دانەناوە، بۆ كاری كەم پاداشتی زۆری داناوە، لە بێدەسەڵاتیی، نافەرمانیی ناكرێ و فەرمانبەرداریی بە زۆر بە خەڵك ناكات، بە هەوانتە پێغەمبەرانی(درودو سلاٌوی خودایان لەسەر بێت) نەناردووە و كتێب و پەیامی بەخۆڕایی ڕەوانە نەكردووە، ئەرز و ئاسمانی بە بەتاڵیی درووست نەكردووە، (ئێمە ئاسمان و زەویمان و ئەوەش، كە لە بەینیادایە بە خۆڕایی درووست نەكردووە، ئەو كەسانەی وا بیردەبەن خودا نەناسن، های لەوانەی خودا نەناسن بۆ ئەو ئاگرەی دەیچێژن).

٧٤- حیكمەت وەربگرە لەهەركوێوە هات، چونكە ئەگەر حیكمەت كەوتە دڵی دووڕوو، ناوەستێ و ئەبزوێ بۆ دڵی باوەڕدار.

٧٣- حیكمەت ونبوویەكی بە نرخە بۆ باوەڕدار، حیكمەت وەربگرە ئەگەر لە دووریش بێ.

٧٦- نرخی هەر مەردێك وابەستەیە بە شارەزاییەكی درووست.

٧٧- ڕاسپاردەتان ئەكەم بە پێنج: ئەگەر ئاوزەنگی بدەن و لە بنباڵی حوشتر بۆی بڕۆن هێشتا هەر شایانە، بە تەمای غەیری خودا مەبن، ترستان تەنیا لە گوناهەكانتان بێ، لە هیچ شەرم مەكەن تەنها لەوە نەبێ پرسیاركرا لە شتێ، كە زانیارییت نبیە بڵێی نازانم، شەرم مەكەن لە شتێ، كە زانیاریت نییە بڵێی نازانم، شەرم مەكەن لە شتێ، كە نایزانی و دەبێ فێری بی بە خۆگریی، چونكە خۆگریی بۆ باوەڕ وەك سەردارە بۆ لاشە، لاشە نرخی كامەیە، كە سەری نەبێ، هەروەها بڕوا نرخی چییە، كە خۆگریی لەگەڵ نەبێ.

٧٨- بە پیاوێ كە زۆر مەدح و سەنای كرد و خۆی جێگەی گومان بوو، فەرمووی: من كەمترم لە گوتارەكەت و گەورەتر لەوەی لە دڵتە.

٧٩- ئەوانەی لە دەمی شیروتیر دەرچوون، ژمارەیان زۆرتر ئەبێ و نەوەیان زۆر ئەبێ!

٨٠- هەركەس واز لە گوتنی (نازانم) بێنێ، تووشی كوشتنی خۆی ئەبێ.

٨١- ڕاوێژی پیرم لە ئازایی لاو پێ چاكترە.

٨٢- لام سەیرە لەو كەسەی ناهومێدە و وشەی.. داوای لێ خۆشبوون ئەكەم.

٨٣- دەگێڕنەوە لە ئەبو جەعفەری كوڕی محەممەد باقر، كە فەرمویەتی: لە زەویدا

دوو پەناگا هەیە لە سزای خودای پاك، یەكێكیان بەرز كراوەتەوە، یەكێك ماوە و بە توندیی ڕایبگرن، ئەوەی چووە بۆ لای خودا، ئەوە پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم)، ئەوەی ماوە پەشیمانیی و داوای لێخۆشبوونە، خودا ئەفەرموا: ( هەتا تۆیان لەناو دابێ، خودا جەزرەبەیان نادا، هەتا داوای بووردن بكەن لەگوناهیش خودا هەر ئازاریان نادا).

٨٤- هەركەس نێوانی خۆیی و خودا چاك ڕابگرێت، خودا نێوان ئەو و خەڵك چاك ڕادەگرێت، هەركەس چاكە بۆ ئەو دنیا بكات، خودا دنیای بۆ چاك ئەكات، هەركەس ئامۆژگاری خۆی بێت، خودا پارێزگاریی بۆ دادەنێت.

٨٥- زانای شەرعزان و زۆر زانا ئەوەیە، كە خەڵك لە لوتفی خودا بێئومێد نەكات و كەمتەرخەمیشیان نەكات لە تۆڵە و سزای خودا.

٨٦- سووكترین زانست ئەوەیە لەسەر زار بێت، بەرزترین زانست ئەوەیە، كە لە دەست و ئەندامەكانەوە كاری پێ بكرێت.

٨٧- دڵ و دەروون ماندوو ئەبێ وەك چۆن لەش ماندوو ئەبێ، ئێوەش بە نوكتە و قسەی نەستەق ماندوێتییان دەربكەن.

٨٨- نەڵێن خودایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لە تاقیكردنەوە و ئاژاوە، چونكە كەس نییە ئەوەی تێدا نەبێ، بەڵام ئەگەر داوای پەناتان كرد، پەنا بگرن لە كێشە و دەرئەنجامەكانی، خودا دەفەرموێ: ( بشزانن ماڵ و منداڵتان هۆی ئەزموونن، پاداشتی زۆر لای خودایە)، مانای ئەوە ئەمە ئەگەیەنێ، كە خودا خەڵك بە ماڵ و سامان و منداڵ تاقی ئەكاتەوە، تابزانێ كێ تووڕەیە لە بەشی خۆی و كێ وا نییە، ئەگەر چی خودا لە خۆیان باشتر ئەزانێ، بەڵام كردار و ڕەفتاریان، كە شایستەی پاداشت و سزایە، هەندێكیان حەزیان لە كوڕە و ڕقیان لە كچە، بازێك حەزی لە كۆكردنەوەی ماڵی زۆرە و پێی ناڕەحەتە كەم بكات.

٨٩- لە وەڵامی پرسیاری خێردا...، كامەیە؟ فەرموی: خێر ئەوە نییە، كە ماڵ و منداڵت زۆر بێ، خێر ئەوەیە زانستت زۆر بێ، حیلمت گەورە بێ، شانازی بە خوداپەرستییەوە بكەیت، ئەگەر چاكت كرد سوپاسگوزار بیت، ئەگەر بەدكارییت كرد، داوای لێبووردن بكەیت لە خودا، لەم دنیای ڕۆشنەدا خێر بۆ دوو كەسە: یەكێك گوناح و تاوانی كردبێت و هەمیشە لێی پەشیمان بێ و كەسێك هەمیشە

**پەلەی بێ لە خێر و خێراتدا، لەگەڵ تەقوادا کاری بچووك نییە ئیتر ئەوەی وەردەگیرێ چۆن کەمە؟**

**٩٠- نزیکترین کەس لە پێغەمبەرانەوە(درودو سلاَوی خوایان لەسەر بێت)، کامەیان زیاتر زانا بێ بە پەیامەکەیان، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئەو کەسانەی لە هەموو کەس لە ئیبراهیم نزیکترن ئەوانەن، کە ئەوسا شوێنی ئەو کەوتن و ئەم پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم) و ئەوانەش، کە بڕوایان پێ هێناوە، خوداش یاری هەموو خاوەن باوەڕانە).**

**ئەوجا وتی: یاری محەممەد(صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە فەرمانی خودا بەجێ بگەیەنێ، هەرچەندیش نەژادی لێ دوور بێ، دوژمنی محەممەد(صلی الله علیه وسلم) ئەو کەسەیە فەرمانی خودا جێبەجێ ناکات، هەرچەندە خزمایەتیی زۆر نزیك بێت.**

**٩١- کاتێ گوێی لێبوو یەکێك لە خەواریجی حەروری شەوبیدار قورئانخوێن بوو فەرموی: خەوێك لەگەڵ یەقیندا باشترە لە نوێژێك لەگەڵ گوماندا.**

**٩٢- گوێبیستی کابرایەك بوو، کە وتی: ئێمەش هەر هی خوداین و هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە، ئەوجا فەرموی: گوتەی ئێمە: ئێمەش هی خوداین دان پێ دانانە، کە ئێمە موڵکی خوداین و گوتەی ئێمە: دەچینەوە بۆلای ئەو دان پێنانە بە نەمان بۆ ئێمە.**

**٩٤- گوێبیستی مەدح بوو لە لایەن کەسێکەوە لە ڕووی خۆیدا فەرمووی: خودا تۆ لە خۆم زانا تری بە خۆم، من لەوان زانا ترم لە خۆم، خودایە لە بۆچوونی ئەوانم باشتر بکە، لێمخۆشبە، ئەوەی ئەوان نایزانن.**

**٩٥- جێبەجێ کردنی پێویستی خەڵك ڕاست نییە، مەگەر بە سێ مەرج:**

**زۆر بە کەمی بزانی هەتا گەورەش بێ، زۆر هەوڵی شاردنەوەی بدەی هەتا خۆی دەرکەوێ، زۆر پەلە بکرێ هەتا جێگەی خۆی بگرێ بە خۆشیی.**

**٩٦- ڕۆژێ دێ بەسەر خەڵکدا، کەس بە ئەندازەی سیخوڕ نزیك نییە لە گەورەوە، قسەخۆش نابێ، مەگەر ئەو کەسەی زۆر بە ئینساف و دادوەر بێ، لەو کاتەدا خێر و حەسەنە زیان و بژاردنی بە زۆرە، هاتوچۆی خزم بە منەتە، بەندایەتیی خودا خۆهەڵکێشانە بەسەر خەڵکەوە، ئا لەو ڕۆژەدا ڕاوێژ هەمیشە بە مێینە دەکرێ و**

پێشەوایی بۆ زارۆیە و ڕاوتەگیر بە خەساوەکانە.

٩٧- جارێك کەوایەکی شڕ و پینەکراوی لەبەر بوو، ڕەخنەی لێگیرا، وتی: ئەوە زۆر چاکە دڵ پێی ئەشکێ، نەفس پێی نزم دەبێ، خەڵك لاسایی ئەکاتەوە.

٩٨- ئەوەی ڕاست بێت دنیا و قیامەت دوو دوژمنی بەیەکدا هەڵگژاون، دوو شەقامی جیاوازن، ئەوەی دنیای خۆشبوێ و بەگەورەی خۆی بزانێ ڕقی لەو دنیایە و دوژمنایەتیی ئەکات وەك ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، هەتا لە یەکێ لەو دوانە نزیك بێ، لەوی تر دوور ئەبێ، ئەو دوانە هەوێی یەکن.

٩٩ - نەوفی بەکالیی دەڵێ: شەوێ میری باوەڕدارانم دی، کە لە شوێنی خۆی دەرچووبوو، تەماشای ئەستێرەکانی ئەکرد، بە منی وت: نەوف..! بە خەبەری، یان نوستووی؟ منش وتم: بە خەبەرم میری موسڵمانان. فەرمووی: ئەرێ، نەوف..! بەهەشت بۆ دنیانەویستانە، خوازیارانی ئەو دنیا ئەوانەی زەوییان ڕاخستووە و خاکیان کردووە بە ڕایەخ و بۆنی خۆشیان ئاوە و قورئانیان لەبەردایە و نزا و پاڕانەوەیان پۆشیوە و دنیایان هەڵکردووە لە نموونەی مەسیح.

نەوف وتی: داودپێغەمبەر(درودو سەلامی خودای لەسەربێت) ئا لەم کاتەدا بوو لە شەودا هەستاوە و فەرمویەتی: دەمژمێرێك هەر بەندەیەك نزا بکات نزاکەی وەرگیراوە، مەگەر کابرا باجگیر بێ، یان یاساوڵی دەسەڵات بێ، یان دەهۆڵژەن بێ، یان جوزەلەلێدەر بێ.!

١٠٠- خودای بەرز و پاك داینـاوە لەسەرتان هەندێ ئەرك مەیانفەوتێنن، سنوورگەلێکی بۆ داناون مەیشکێنن، (نا)ی کردووە لە هەندێ کار ئەنجامی مەدەن، هەندێ شتی باس نەکردووە لەبەر لە بیرچوونەوە نەبووە، خۆتانی پێ شەکەت و ماندوو مەکەن.

١٠١ هەر کاتێ خەڵك لەبەر دنیاپەرستیی ئەرکی ئەو دنیای پشتگوێ خست، خودا دەرگای خراپتریان لەسەر ئەکاتەوە.

١٠٢- زۆر زانا هەیە نەفامیی کوشتویەتی، زانستەکەی سوودی نەبووە.

١٠٣- ئەم مرۆڤە ڕەگی پەیوەستە وەك بەنۆکە، پارچەگۆشتێکە، کە لە هەموو سەرسوڕهێنەرترە، کە ناوی (دڵ)ە، لەوێدا جوامێرو دژەکانی تێدایە، ئەگەر زۆر بە ئومێد بوو بۆ دنیا، چاوچنۆکیی پەست و خواری ئەکات، ئەگەر چاوچنۆکیی

هاری کرد، پەلامار و هێرشی لەناوی ئەبات، ئەگەر نائومێد بوو، خەفەت و کەسەر ئەیکوژێ، ئەگەر ڕقی هەستا، کینە و بوغز توندی ئەکات، ئەگەر ڕازی بوون بەختەوەری بکات لەبیری ئەچێ خۆپارێزیی لە خراپە، ئەگەر بیر و هۆشی لە لای ترس بوو، خۆپاراستن سەرگەرمی ئەکات، ئەگەر هێمن و ئارامیی بڵاوی هەبێ گوێنەدان تاڵانی ئەکات، ئەگەر کارەساتێك هاتە ڕێی، هاتوهاوار ئابڕووی ئەبات، ئەگەر ماڵێکی دەستکەوت، بەو سامانە لەخۆی ئەگۆڕێ و بایی ئەبێ، ئەگەر هەژاریی چزەی لێبدا، هەمیشە بە بەڵاوە ئەناڵێنێ، ئەگەر برسییەتیی شەکەتی بکات، لاوازیی دایئەنیشێنێ، ئەگەر تێری بێ ئەندازەی هەبوو، ورگزلیی ئەیگەزێ، هەموو کەموکورییەك زیانبەخشە، هەموو زیادەڕۆییەك گەندەڵییە.

١٠٤- ئێمە پاڵپشت و بالیفی ناوەڕاستین، ئەوەی دێت پاڵی پێوە ئەدات و ئەوەی بەرزە بۆی دێتەوە.

١٠٥- کەس ناتوانێ فەرمانی خودای بەرز ئەنجام بدات، مەگەر ئەو کەسەی، کە ڕووپامایی ناکات و لاسایی ناکاتەوە و دوای تەماحباز ناکەوێ.

١٠٦- سەهلی کوڕی حونەیف لە کوفەدا مردبوو، پاش گەڕانەوە لە سیفین، لای میر خۆشەویست بوو، فەرمووی: ئەگەر کێویش منی خۆش بوێ ئەڕوخێ.!

١٠٧- ئەوەی ئێمەی ئالوبەیتی خۆشئەوێ، خۆی ئامادە بکات بۆ بەرگی هەژاریی.

١٠٨- سامان نییە بە قەدەر عەقڵ بە سوود بێ، تەنهایی نییە بە قەدەر لەخۆبایی چۆڵەوانیتر، عەقڵ نییە لە تەگبیر و ڕاوێژ چاکتر، بازرگانیی نییە بە قەدەر کاری چاکە باشتر، قازانج نییە بە قەدەر پاداشتی خودا چاکتر، سەخاوەت نییە لە تەقوا چاکتر، هاوڕێ نییە بە قەدەر ڕەوشتبەرزیی، میرات نییە لە ئەدەب باشتر، ڕابەر نییە لە کار ڕێکخستن باشتر، دووری لە خراپە نییە باشتر لە وەستان لە ڕووی کاری گوماناوییدا، دنیانەویستیی نییە وەك نەویستنی قەدەغە و حەرام، زانست نییە بە قەدەر بیرکردنەوە بێ، هیچ بەندایەتییەك نییە بگاتە ئەنجامدانی فەرزەکان، باوەڕ نییە باشتر لە حەیا و شەرم و خۆڕاگریی، ڕەسەنیی نییە بگاتە کەمفیزیی و شەرەف و گەورەیی نییە بگاتە زانست، کۆڕ و کۆمەك نییە بگاتە ڕاوێژکردن.

١٠٩- ئەگەر باری چاکیی و پاکیی باڵی کێشابوو بەسەر کات و زەمان و خەڵکی ئەو

كات و وەختە و كەسێك گومانی خراپی بە كەسێ برد، كە كارێكی ئابڕووبەری لێ دیاری نەدابوو، ئەوە ستەمی لێكردووە ! وە ئەگەر گەندەڵیی و پۆخڵیی باڵی كێشابوو بەسەر چەرخ و كات و خەڵكەكەیدا و كەسێك وەهمی باشی بە كەسێكەوە دی، ئەوە خۆی هاویشتووەتە ناو مەترسییەوە.

١١٠- وترا: چۆنی میری باوەڕداران؟ فەرمووی: چۆنە كەسێ مانەوەی بەرەو نەمانی دەبات و تەندروستیی بەرەو نەخۆشیی و بیماریی دەبات و لەو جێگەوە زۆر دڵنیایە پەلامار دەدرێ!!.

١١١- ئای كە زۆر كەس هەیە بە خۆشیی داباریین بەسەریدا چەشەی بۆ دانراوە و گومڕایە بە حەشاردانی و شاردنەوەی لە تاوانەكانی و فیزی زلە بە ناوبانگی چاكە و باشە لەگەڵ ئەوەش كەس بە قەدەر ئەو كەسە خودا مۆڵەتی پێ دابێ و بەرەو ملشكاندنی بردبێ.

١١٢- دوو كەس بەهۆی منەوە فەوتاون: كەسێك زیادەڕۆییكارە لە خۆشەویستیی مندا و كەسێك بێئەندازە ڕق و كینەی لێمە.

١١٣- هەل لەدەستچوون، بەربینگیران و خنكاندنە.

١١٤- ئەم دنیایە وەك مارە، بە دەستلێدان نەرم و شلە و ژەهری كوشندەی تێدایە، هەرزەی نەفام خۆشی ئەوێ و ژیر و بەفام خۆی لێ ئەپارێزێ.

١١٥- لە بارەی قورەیشەوە لێیان پرسی، فەرمووی: كوڕانی مەخزوم ڕەیحانەڕەشەی قورەیشن، حەزمان لە گفتولفتی پیاوانیانە و مارە كردنی ژنانیان، كوڕانی عەبدولشەمس ڕاو بۆچوونیان ورد و قووڵە و پشتیان زۆر پتەوە، بەڵام ئێمە (كوڕانی هاشم) زۆر دەستگوشاد و بەخشندەین بەوەی بەدەستمانەوە هەیە، لە بەخشینی گیانی خۆمان گەشبینین، ئەوان لە زۆرییدا زۆرن و فێڵباز و كەللەڕەق و ئینكارن، ئێمەش زمانپاك و ڕەوانبێژ و دڵسۆز و ڕووگەشین.

١١٦- نێوانی دوو كار، زۆرە و بلاوكاریّ خۆش و زوو بڕوات و باری قورسی بمێنێ و كاریّ ماندوو بوونی زوو تەواو بێ و كرێی هەر بمێنێ.

١١٧- لەگەڵ جەنازەیەك ڕێگەی دەكرد و گوێی لێی بوو پیاوێ پێدەكەنی، فەرمووی: وا گومان ئەبرێ مردن تەنها لەسەر كەسانی تر نوسراوە، وا گومان ئەبرێ حەق لەسەر خەڵكی تر دانراوە، وا بۆچوونی هەیە كە مردووەكان بۆ سەفەر دەڕۆن

و زوو دەگەڕێنەوە بۆلامان! دەیانخەینە ناو گۆڕەوە و میراتیان نۆش ئەکەین وەك ئەوەی ئێمە نەمرین، لە بیرمانە ئامۆژگاری نێرو مێ، کەچی بەرتیری کوشندە کەوتوین.

١١٨- بەهەشتی بەرین بۆ کەسێکە خۆی لە خۆییدا بەکەم دانێ و کەسایەتیی چاك و پاك بێ و شاراوە و نهێنیساز و باش بێت، ڕەوشتی جودا بێت، ماڵی زیادەی بەخشراو بێ و زمانی لە قسەی زیادەپارێزراو بێ، خراپەی لە خەڵك دووربێت و پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بێت و بە کاری نەوباوی ناپەسەندەوە ناوی دەرنەکردبێ.

١١٩- (خانەگومانی)غیرەی ژن بێباوەڕییە، غیرەی پیاو باوەڕە.

١٢٠- پێناسەیەکی ئیسلام ئەکەم، کەس پێشی من نەیکردبێ: ئیسلام گوێڕایەڵییە، گوێڕایەڵیی یەقینە، یەقین دانپێدانانە بە دڵ و زمان، دانپێدانان بڕیارە، بڕیار ئەنجامدانە، ئەنجامدان کارە.

١٢١- سەرم سوڕدەمێنێ لە ڕەزیل، کە بە قەرز لە هەژاریی ئەترسێ، کە لە دەستی هەڵهاتووە، دەوڵەمەندیی لەدەست دەدات، کە داوای کردووە لە دنیا وەك هەژار ئەژی لە ڕۆژی قیامەتدا حسابی دەوڵەمەندی بۆ ئەکرێ، سەیرم بە خۆبەزلزان دێ، کە دوێنێ دڵۆپێك تۆو بووە و سبەی کەلاشێکە، سەیرم بەو کەسە دێ گومانی لە بوونی خودایە و بە چاوی خۆی درووستکراوی دەبینێ، سەیرم بەو کەسە دێ، کە مردن لە یاد ئەکات و ئەو هەموو مردووەی بینیوە، سەیرم دێ بەو کەسەی بڕوای بە درووستبوونی دووەم نییە و یەکەم دەبینێ، سەیرە ئەوەی ماڵی بەرەو ڕوخان ئاوەدان دەکات و ماڵی فرەخایەن وێران دەکات.

١٢٢- هەر کەس کەمتەرخەمیی بکات لە کاری باش، تووشی خەم وغەم و هەم دەبێ، خودا پێویستی نییە لەو کەسەی بەشی خودای لا نییە لە خۆی و لە ماڵیدا.

١٢٣- لە هەوەڵەوە خۆتان لە سەرما بپارێزن، لە کۆتاییدا پێشوازیی لێبکەن، چونکە سەرما کار ئەکات لە لەش وەك کاری لە درەخت کردووە، لە هەوەڵەوە ئەیسوتێنێ و لە دواییدا گەڵای پێئەکات.

**١٢٤- شکۆی خودای ئافەریدەکار[12] لات بوو، بچووکیی بوونەوەرت لەبەرچاوە.**

**١٢٥- کە گەڕایەوە لە سیفین و بەلای گۆڕستانی کوفەدا تێپەڕی، فەرموی: ئەی دانیشتوانی ماڵە چۆڵەکان! گەڕەکە بێ نیشتەجێکان، گۆڕە تاریکەکان، ئەی خەڵکی ناو گڵ، ئەی خەڵکی غەریب و بێکەس، ئەی خەڵکی ژووری تەنیایی، ئەی خەڵکی چۆڵەوانیی، ئێوە پێشینەی پێشکەوتووی ئێمەن و ئێمەش شوێنکەوتووی پاش ئێوەین، ماڵ و خانووەکانتان خەڵکی تری تێچووە، ژنەکانتان شوویان کردووەتەوە، سامانەکەتان دابەشکراوە، ئەوە هەواڵی ئێمەیە بۆتان، ئاخۆ هەواڵی ئێوە چی بێت؟.**

**ئەوەجا ڕووی کردە لای یارانی و فەرموی: ئەگەر مۆڵەتی قسەکردن هەبێ بۆیان، ئەو هەواڵە دەدەن: (چاکترین توێشو بۆ ئێوە، خۆ لەگوناح پاراستنە).**

**١٢٦- گوێی لێبوو کابرایەك زەمی دنیای ئەکرد، فەرموی: کابرای زەمکەری دنیا، دەستە خەرۆی دنیا و خەڵەتاوی پڕوپاڵنتەکانی، تۆ خەڵەتاوی بە دنیا و زەمیشی ئەکەی؟ تۆ بە ناحەق تاوانباری ئەکەی، ئەو مافی هەیە تۆ تاوانبار بکات، کەی ئەو عەقڵ و هۆشی تۆی بردووە؟ ئەو کام وەخت تۆی خەڵەتاندووە و لە خشتەی بردوی؟ ئایا بە کەوتنی باوباپیرت و ڕزینیان بە پاڵکەوتنی دایك و داپیرت لە ژێر گڵ، چەندجار بە دەستەکانت تیمارت کردون؟ چەندجار برینەکانیانت بە دەستی خۆت چارەکردووە؟ حەزت کردووە چاك ببنەوە و دەرمانت لە پزیشك و برینساز بۆ هێناوە، کەسیان سوودیان نەبوو دۆست دەرکەن و، کەس پێویستی جێبەجێ نەکردی و بە هێزو توانا نەتتوانی مەرگی لە سەر لابەی، ئێستە بە ڕاستی ئەو دنیایە بەوانە نمونەی نیشانداوی، بە کەوتنی ئەوان و مردنیان ئاگاداری تۆی کردووە، باش بزانە دنیا خانوویەکی ڕاستگۆیە بۆ ئەوەی ڕاستی لەگەڵ بکات، ماڵێکی خۆشە بۆ ئەو کەسەی لێی تێبگات، خانوویەکی پڕ لە سامان و گەنجینەیە بۆ ئەوەی تێشووی بۆ هەڵبگرێ، شوێنی ئامۆژگارییە بۆ ئەوەی پەندی لێوەربگرێ، مزگەوتی خوداخۆشەویستەکانە، بەردەنوێژی فریشتەکانی خودایە، شوێن دابەزینی سروشی خودایە، دوکانی بازرگانیی پیاوچاکانی خودایە،**

[12] ئافەریدەکار: بەدیهێنەر، خالق .

لەوێدا بەزەییان دەستکەوتووە، لەوێدا بەهەشتیان قازانج کردووە.

کێ ئەتوانێ زەمی بکات، کە خۆی ئامادەیە بۆ ماڵئاوایی و بانگی ئەکات بۆ خواحافیزیی و هەواڵی مردنی خۆی، دانیشتوانی بڵاو کردوومتەوە و بەڵا و کاری ناخۆشیی، بە خودی بەڵا و ناخۆشیی نیشانداون و بە ئاهەنگ و ڕابواردن ڕایکێشاون بۆ خۆشیی! ئێوارەی بە خۆشییە و بەیانی بە شیوەنە، بە ترساندن و مژدە پێدان، بە ترس و هەڕەشە، خەڵکانێ دژی قسە ئەکەن، کە پەشیمانن خەڵکی تر سوپاس و ستایشی ئەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا، دنیا فێری یادی کردن و ئەوانیش یادیانکرد، دنیا قسەی بۆ کردن، ئەوانیش بە ڕاستیی تێگەیشتن، ئامۆژگاری کردن و پەندیان وەرگرتن.

١٢٧- خودا فریشتەیەکی هەیە هەموو ڕۆژێ بانگەوازی ئەمەیە: نەوە بنێنەوە بۆ مردن، کۆکەنەوە بۆ نەمان، درووستکەن بۆ ڕووخان.

١٢٨- دنیا ڕێڕەوێکە بۆ ماڵێکی هەمیشەیی، خەڵکەکەش دوو جۆرە: کەسێك خۆی فرۆشتووە بە هەوا و ئارەزووی و خۆی فەوتاندووە، کەسێك نەفسی خۆی کڕیوە و پاش کڕین ئازادی کردووە.

١٢٩- دۆست و هاوڕێ نابێتە دۆست هەتا بۆ برای خۆی سێ شت نەپارێزێ: لە لێقەوماندا، لە پاشملە، لە مردندا.

١٣٠- هەر کەس خاوەنی چوار بێ لە چوار بێ بەش نابێ: نزا بێ قەبوڵ، پەشیمانیی بێ وەرگرتن، داوای لێخۆشبوون بێ لێبوردن، سوپاس بێ زیادبوون، قورئان بۆ ئەمە دەفەرموێ: بۆ نزا (نزام بۆ بکەن منیش قەبووڵی ئەکەم). بۆ داوای لێخۆشبوون (هەر کەس کارێکی خراپ بکات و ستەم لە خۆی بکات و داوای لێبوردن بکات خودا زۆر لێبووردە و بە بەزەییە). بۆ سوپاس (ئەگەر ئێوە سوپاسگوزار بن ئێمەش بۆتان زیاد ئەکەین). بۆ پەشیمانیی (پەشیمانیی لای خودا قەبووڵە بۆ هەر کەسێ خراپەکاریی ئەکات بە نەفامیی و پاشان پەشیمان دەبێتەوە بە نزیك و پەلە، خودا پەشیمانی لێ وەردەگرێ، خودا زانا و کارزانە).

١٣١- نوێژ قۆچی قوربانی هەموو پارێزگارێکە، مەرجی جیهادی هەموو بێ دەسەڵاتێکە، هەموو شت زەکاتی هەیە، زەکاتی بەدەن ڕۆژووە، جیهادی ژن پێکەوە ژیانی مێردە.

١٣٢- ڕۆزی خۆتان داوا بکەن بە بەخشین، ئەوەی بڕوای بەپاشەکەوت هەبێ، دەستی گوشادە بۆ بەخشینی.

١٣٣- هاوکاریی بە پێی پێویستە.

١٣٤- هەژار نابێ ئەوەی دەستپێوەدەگرێ.

١٣٥- کەمیی خێزان یەکێك لە دوو سامانەکەیە، ڕووگەش و ڕووخۆش نیوەی عەقڵە، خەفەت نیوەی پیرییە.

١٣٦- خۆگرتن دێت بە قەدەری کۆست، هەر کەس دەستی بدات لەسەر ئەژنۆی، کاتی کۆستکەوتن لە کرێی بێبەش دەبێ.

١٣٧- زۆر ڕۆژووەوان هەیە لە ڕۆژووەکەی تەنها تینوێتی بۆ ماوەتەوە، زۆر شەوبێدار هەیە لە شەودانیشتندا، تەنها ماندووبوونی بۆ هەیە، چەند خۆشە خەوی عاقڵ و شکاندنی ڕۆژووی ژیر!.

١٣٨- ڕامیاریی بکەن لەگەڵ باوەڕتان بە خێر و حەسەنە، شوێنی قایم بۆ سامانەکەتان درووست بکەن بە زەکاتدان، شەپۆلی بەڵا و کارەساتی چاوەڕوانکراو بکەن بەپاڕانەوە و نزا.

١٣٩- فەرموی بە کومەیلی کوڕی زیادی نەفەعی: کە دەڵێ میر دەستی گرتم و فەرموی: پاش ئەوەی بردمی بۆ گۆڕستانەکە، لەوێشەوە بۆ دەشت، کومەیلی کوڕی زیاد.. ئەم دڵانە وەك دەفر وایە، باشتریان ئەوەیە زۆر پتەو بێ و زۆر بگرێ، لە منی وەربگرە ئەوەی پێت ئەڵێم: خەڵك سێ بەشە: زانای خوداویست، فێرخوازی ڕێگای ڕزگاریی، هەرچی و پەرچی و گێل و گەمژە و هەرزە و نەفام و کاڵفام و قەلی ڕەشبین و بەدکار، کە لەگەڵ هەموو بایەکدان، تیشکی زانست ڕوناکیی پێنەداون و پاڵیانداوە بە پایەیەکی قایم و پتەو، کومەیل..! زانست لە سامان باشترە چونکە زانست پاسەوانی تۆیە، بەڵام تۆ پاسەوانیماڵی، سامان بە بەخشینی کەم ئەکات، بەڵام زانست گەشە و پەرە ئەسێنێ، هاوڕێ و هاوکاری سامانت بە نەفامی لات چۆڵ ئەکات، کومیلی کوڕی زیاد..! زانست و ناسینی وەك ئاین وایە پاداشتی بە هۆیەوە هەیە، گوێگریی بۆ مرۆڤ پەیدا ئەکات و ناوبانگی پاش مردن بۆ خاوەنەکەی، زانست دادوەرە، سامان کەتنکارە، کومەیلی کوڕی زیاد..! خاوەن گەنجینەی سامان ڕۆیشتووە لەو کاتەی، کە زیندووە، بەڵام زانا هەر

ماوه ناوی، لەشیان ونه و وێنەیان لەناو دڵانە، ئاگاداربە، ئا لێرەدا زانستی زۆر هەیە (دەستی بۆ سنگی ڕاكێشا)! خۆزگە كەسانێك دەبوو هەڵیگرێ بۆم!، بەڵێ هەیە زیرەك، بەڵام جێگەی متمانە نییە، لەوانەیە ئامێری ئاینی بەكاربێنێ بۆ دنیاخۆریی و خۆی هەڵكێشێ بەسەر بەندەكانی خودا و بیكاتە بەڵگە بەسەر پیاوانی خودا، یان مەیلی بۆ لای ئەوانە بڕوا، كە خۆیان بە خاوەن حەق دەزانن و چاوڕۆشنیان نییە، لەوانەیە گومان پەیدا بێ بۆیان لە یەكەم پەیدابوونی تەنها گومانێكدا.

ئاگاداربە هیچ كام لەم دوانە و چڵێس و زۆر خۆر و بێتوانا، لە بەرامبەر هەواوئارەزوو و عاشقی كۆكردنەوە و زەخیرەكردنی سامان، ئەمانە نابن بە شوانی ئاین لە هیچ كارێكیاندا، ئەوەی بەم دوانە بچێت ئاژەڵ و مەڕو مالاتی ناو لەوەڕگەیە، لەبەر ئەوە زانست بە مردنی زانا فەوت ئەكات.

دەی خودایە خۆ ئەمە وایە! زەوی هەرگیز چۆڵ نابێ لەو كەسەی شانی داوەتە بەر كارەكانی خودا و بەڵگەیە لەسەر خەڵك بۆ ئەمانی بیانویان دەركەوتوون و ئاشكرایان شاراوە و نەناسراو، لەبەر ئەوە نیشانە و بەڵگەكانی خودا پەكی ناكەوێ،

ئەوانە چەندن و چۆنن و لە كوێن؟ بە خودا ئەوانە ژمارەیان زۆر كەمە، ڕێز و قەدریان زۆر گەورەیە، خودا بە هۆی ئەمانە نیشانە و دیاردەكانی خۆی دەپارێزێ، هەتا بەدەستی هاوشێوەی خۆیانی دەسپێرن و لە دڵ و دەروونی شێوەكانی خۆیانی دەچێنن، زانست پەلاماری ڕاستی پێداون و لەگەڵ گیانی یەقیندا دەستەملانن، ئەوەی دەوڵەمەندە بەختەوەرەكان بە زبری ئەزانن، ئەوان بەلایانەوە زۆر نەرم و ئاسكە، هۆگر بوون بەو كارانەی نەفامەكان لێی بێزارن و هاوڕێی دنیا دەكەن تەنها بە لەش و ڕۆحیان بەستراوە بەلایەنی بەرزەوە، ئەوانە جێگر و دەمڕاستی خودان لە زەوی و بانگەوازخوازی ئاینن، ئای ئای..!! چەند حەز دەكەم لە بینینی ئەوان! ئەگەر حەز ئەكەی بڕۆ خوات لەگەڵ.

١٤٠- مرۆڤ شاراوەی ژێر زمانی خۆیەتی.

١٤١- فەوتاو ئەو كەسەیە، كە قەدری خۆی نەزانێ.

١٤٢- كابرایەك داوای كرد ئامۆژگاری بكات، فەرموی: لەوانە مەبە بێكاری باش بەتەمای بەهەشتە و پەشیمانی دوا ئەخا بە خوازیاری درێژ و ئەڵێ بە قسەی

دنیانەویستان و کار بە جۆری تەماعکاران ئـەکات، بەشـی بـدرێ پێـی تێـر نابـێ و بێ بەش بـێ قەناعـەتی نییـە، بـێ توانایـە لـە سوپاسـی ئـەوەی پێیـدراوە و داوای زیادەش ئەکات لـەوەی مـاوە، (نـا) لـە خراپـە ئـەکات و بـەگوێی ناکـات، پیاوچاکی خۆشئەوێ و کاری ئەوان ناکات و ڕقی لە تاوانبارانە و خۆی یەکێکە لەوان، حەزی لە مردن نییـە لەبـەر گوناحبـاریی، بـەردەوام لەسـەر ئـەو کارمیـە، کـە حـەزی لـە مردن نییە لە بری ئەو، ئەگەر نەخۆش کەوت گازنـدەیـە بۆچـی لـە تەندروسـتیدا کاری نـەکردووە، ئەگـەر لەشـساغ بـوو بێپـەروا و بێگوێیـە، بـە خـۆی ئـەنازێ، کـە ئەگەر لە بەڵا ڕزگاری بوو، بێ وورەیە ئەگەر تووش بوو، ئەگەر تووشی بـەڵا بـوو دەکەوێتـە پاڕانـەوە، ئەگـەر تووشـی دەوڵەمەنـدیی بـوو لـەخۆبایی دەبـێ، نەوسـی ڕایدەکێشێ بۆ کاری گوماناویی، حەزی بۆ لای کـاری ڕاسـت و بێگـرێ نییـە، تـرس دەخاتـە بـەری غـەیری خـۆی بـە تـاوانی بـچووك و بـۆ خـۆی بـە تـەمای زیـاد لـە کارەکەیەتی، ئەگەر دارا بوو خۆی لێئەگۆڕێ و بایی دەبێ، ئەگـەر کەمدەسـت بـوو بـێ ئومێـد و داڕوخـاو ئـەبێ، ئەگـەر ئـیش بکـات کـورتی ئـەکات و داواش بکـات زیادەڕۆیی ئەکات، ئەگەر خەیرێکی بۆ هەڵکەوت گوناح پـێش ئـەخات و تۆبـە دوا ئەخات، ئەگەر کارێکی ناخۆشی تووش بوو لە مەرجی پیاوچاکان دەرئەچێ، باسی پەند و ئامۆژگاریی ئەکات و خۆی کاری پێ ناکات، لە ئامۆژگاریدا زۆر زیادە ئەڵێ و خۆی ژیر نابێ پێی، لە قسەدا زۆر بڵێیە و لە کاردا کـەمکار، کێبـەرکێ لـە شـتێ ئەکات، کە مافی نییـە و لـەوەی کـە مـاوەدارە گوێی پـێ نـادا، دەسـکەوت بـە زیـان دادەنـێ و زیان بـە دەسـکەوت، لـە مـردن ترسـی هەیـە و کـاری بـۆ ناکـات، گونـاهی خەڵك بە گەورە دادەنێ، گەورەی خۆی بە کەم دادەنێ، فەرمان بەجهێنانی کـەمی خۆی بە زۆر دادەنێ و هی خەڵکی تر بە کەم، هەمیـشە تانەوتەشـەر لـە خـەڵکیی دەدات و بۆ خۆی بێمنەتە، ڕابواردنی لەگەڵ دەوڵەمەند پێباشـترە لـە یـادی خـودا لەگەڵ هەژاراندا، هەمیشە بڕیاری لەسەر خەڵك بـۆ سـوودی خۆیـە و لەسـەرخۆی بۆ خەڵك نییە، ڕێنیشاندەری خەڵکە بۆ چاکە و خۆی لادەرە، بـە گـوێی ئـەکرێ و خۆی بەگوێی خۆی ناکات، حەقی خـۆی بـە تـەواویی وەرئـەگرێ و حـەقی خـەڵك نـادات، زۆر لـە خـەڵك ئەترسـێ لـە بریتیـی خـودای خـۆی، لـە خـودا نەترسـێ بـۆ خەڵك.

١٤٣- هەموو كەسێك سەرئەنجامێكی هەیە، شیرین یان تاڵ.

١٤٤- هەموو داهاتوویەك پشتتێكردنی تێدایە، ئەوەی چوو ئەڵێی نەبووە.

١٤٥- خۆڕاگر هەرگیز بێبەش نابێ لە پیرۆزیی و سەركەوتن.

١٤٦- ڕەزامەندیی لەكاری گەلێكدا وەك بەشداری وایە تێیدا و ئەوەش، كە تێیدایە دوو گوناهی هەیە، ئەنجامدانی كارە خراپەكە و گوناهی ڕازیبوون.

١٤٧- بە توندیی دەست بگرن بە پەیمانەوە لەگەڵ ئەوانەی وەك مێخ پابەندن.

١٤٨- پێویستە فەرمانی ئەوانە جێبەجێ بكەن، كە بیانووتان نییە لە نەفامییان.

١٤٩- نیشانتاندراوە ئەگەر ببینن، ڕێگەتان نیشاندراوە ئەگەر ڕێ بكەن، بە گوێتاندا دراوە ئەگەر بیسەر بن.

١٥٠- سەرزەنشتی براكەت بە چاكەكردن بدەرەوە، خراپەشی بە بەخشینی بدەرەوە.

١٥١- هەركەس خۆی نایە شوێنی گومانەوە، با سەرزەنشتی خۆی بكات، ئەگەر خراپ باسی كرا.

١٥٢- هەركەس دەسەڵاتی هەبوو ستەمی لێ چاوەڕوانە، هەركەس ستەمی هەبوو فەوتاوە، هەركەس ڕاوێژی كرد ژیرەكان دەكاتە هاوبەش، هەركەس نهێنیی خۆی پاراست كاری لەدەستی خۆیدایە.

١٥٣- لاتیی و كەمدەستیی مەرگی قورسە.

١٥٤- هەركەس حەقی ئەوەی دایەوە، كە حەقی نادات، كردوویەتی بە بەندەی خۆی.

١٥٥- فەرمانبەرداریی نییە بۆ ئەوەی لە بێفەرمانی خودا دایە.

١٥٦-گلەیی و گازندە لەوە ناكرێ، كە مافی خۆی دوا دەخات، بەڵكو گلەیی لەوەیە، كە مافی خۆی نییە و بردوویەتی.

١٥٧- لەخۆباییبوون ڕێگرە لە گەشەكردن و فرەبوون.

١٥٨- ڕۆژی دوایی نزیكە و پێكەوە ژیان كەم.

١٥٩- ڕۆژهەڵهاتووە بۆ ئەوەی دوو چاوی هەبێ.

١٦٠- وازهێنان لە گوناح سووكترە لە پەشیمانبوونەوە.

١٦١- زۆر تیكە و لوقمە هەبووە ڕێگەی لە چەندان تیكە گرتووە.

١٦٢- خەڵك دوژمنی ئەوەن، كە ئەیزانن.

١٦٣- هەركەس ڕووبەڕووی هەموو بۆچوونەكان بوویەوە، شوێن هەڵەكان ئەزانێ.

١٦٤- هەرکەس ڕمی بۆ خودا تیژ بێت، توانای لەناوبردنی باتڵە گەورەکانی هەیە.

١٦٥- ئەگەر ترست لەکارێ هەبوو بچۆرە ناوی، چونکە ترسی تێکەوتنی لە خۆپاراستنی ناخۆشترە.

١٦٦- ئامێری مەزنایەتیی، دەروونفراوانییە.

١٦٧- تەمێی خراپەکار بە پاداشتی چاکەکار بدەرەوە.

١٦٨- درەوی خراپە لە دەروونی غەیری خۆت، بە ڕیشەکێشە لە دەروونی خۆت.

١٦٩- چەنەبازیی و دانووسانی بێسوود، بۆچوون نەخۆش دەخات.

١٧٠- چاوچنۆکیی، کۆیلەیەتیی هەمیشەییە.

١٧١- بەرهەمی توندڕەویی پەشیمانییە و بەهەرهەمی لێبڕان سەلامەتییە.

١٧٢- هیچ چاکەیەك لە بێدەنگیی لە حەقدا نییە، وەك قسەکردن لەسەر ناپەسەند.

١٧٣- جیاوازیی لە نێوان دوو شتی دژ بەیەکدا یەکێکیان ناپەسەندە.

١٧٤- گومانم لە حەقدا نەبووە لەو کاتەوە نیشانمدراوە.

١٧٥- نە درۆمکردووە و نە بەدرۆخراومەتەوە، نە کەسم گومڕاکردووە، نە کەس گومڕای کردووم.

١٧٦- ستەمکاری زۆردار، سبەی گاز لە دەستی دەگرێ.

١٧٧ _ کۆچ نزیکە!!.

١٧٨- هەرکەس ڕووی لەحەق وەرگێڕا، فەوتاوە.

١٧٩- هەرکەس خۆڕاگریی ڕزگاریی نەکات، هات و هاوار ئەیکوژێ.

١٨٠- زۆر سەیرە: جێنشێنیی بە هاوڕێی ببێ، بەڵام بە یارویاوەری و خزمایەتی نەبێ؟ ئەم دەستەواژەی خوێندەوە:

ئەگەر بەڕاوێژ بوویتە سەردار (چۆن بوویت کە ڕاوێژکاران بزربوون).

ئەگەر بە خزمایەتیی نەیارانت بۆڕ داوە، غەیری تۆ بە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) نزیکتر و خزمترە.

١٨١- مرۆڤ لەم دنیادا نیشانەیەکە دانراوە بۆ پێکانی مەرگ،ماڵێکی تالانییە کێشەکان هێرشی بۆ دێنن، لەگەڵ قومەناوێکدا گەرووگیرانێکی تێدایە، لەگەڵ هەموو لوقمەیەکدا قورگگیرانی هەیە، هەر نیعمەتێك بە لە دەستدانی نیعمەتێکی دیکەیە، بەرەو ڕووی هەر ڕۆژێك دەبێت بە جیابوونەوە لە ڕۆژێك بەرەو ئەجەل،

ئێمه خزمەتگوزاری مەرگین و خۆمان ناوەتەوە بۆ مردن، ئیتر کەی بە تەمای مان بین، ئەم شەو و ڕۆژە هیچ شتێك بەرز ناکەنەوە هەتا زۆر زوو نەیڕمێنن و بڵاوی دەکەن بەکۆ.

١٨٢- ئەوەی ئادەم..! جگە لە بژێویی خۆت هەرچی پەیدا بکەی، بۆ خەڵکی هەڵ ئەگری.

١٨٣- دڵ، حەز و ئارەزوو و ڕووتێکردن و پشتتێکردنی هەیە، ئێوەش پێشبینی بکەن.

١٨٤- کەی چارەسەری ڕقی خۆمم پێدەکرێ؟ ئایا لەو کاتەی، کە ناتوانم تۆڵە بستێنم و دەڵێن بریا خۆت ڕابگرتایە؟ یان ئەو کاتەی توانام هەیە و دەڵێن بریا لێبووردنت هەبوایە؟.

١٨٥- دای بەلای سەنێرگەیەکدا[١٣]، فەرموی: ئەوە ئەو بەشەیە کە ڕەزیلەکان ڕەزیلییان تێدا دەکرد. بە شێوەیەکی تر: ئەمە ئەوە بوو، کە ئێوە لەسەری ناکۆك بوون.

١٨٦- ئەوەی ئامۆژگاریت بکات، سامانی لێ زەوت نەکردوی.

١٨٧- دڵ، ماندووبوونی هەیە وەك بەدەن، بۆیە پێویستی بە قسەی خۆشە.

١٨٨- بیستی خەواریج دەڵێن: حوکم تەنها بۆ خودایە. فەرموی: وشەیەکی حەقە و مەبەست ناحەقە.

١٨٩- لە پێناسەی خەڵکی ئاژاوەگێڕاندا: لەکاتی کۆبوونەوەدا سەرکەوتوو دەبن و لە بڵاوەکردندا ناناسرێن. یان دەڵێن: لە کۆبوونەوەدا زیانبەخش و لە بڵاوییدا سوودبەخش. وتیان ئەوە زیانەکەیان دیارە ئەی قازانجیان؟ فەرموی: خاوەنپیشەکان سەرگەرمی پیشە دەبن و خەڵك سوودیان لێوەردەگرێ، وەستا بەنا دەچێ بۆ کاری بیناسازیی و نووسەرەکان ئەچن بۆ نوسینگە و نانەوا ئەچێ بۆ کورەی نانەکەی.

١٩٠- پیاوێکی تاوانباریان هێنا و قرەقرپی زۆر پەیدا بوو، فەرموی: نە مەرحەبا لەو دەموچاوەی لەکاتی خراپەکارییدا دەبینرێ.

١٩١- لەگەڵ هەموو ئینسانێ دوو فریشتە هەیە دەیپارێزن، بەڵام کە قەدەر هات لێی

[١٣] سەنێرگە: زبڵ خانە، بەمانای ئەو شوێنەش دێت کە سەنێر و شیاکەی ئاژەڵانی لێ کۆ ئەکرێتەوە .

جیا دەبنەوە و دەیدەنە دەست قەدەر و ئەجەل، قەڵغان و مەحکەمە.

١٩٢- تەڵحە و زوبەیر وتیان: قەولت پێدەدەین بە مەرجێ هاوبەش بین لەم کارەدا، فەرمووی نا! بەڵام هاوبەش بن لە هێز و هاوکاریی و یارمەتیدەر بن لە بێدەسەڵاتیی و کەموکوڕیی و لاوازییدا.

١٩٣- ئەی خەڵکینە..! لە خودا بترسن، کە ئەو دەبیستێ، ئەگەر قسەتان کرد، ئاگادار و زانایە، ئەگەر لە دڵدا نیازتان کرد، هەوڵ بدەن چاکە بکەن بۆ مردن، ئەگەر ئێوەش لە دەستی ڕابکەن، ئەو پێتان دەگات، ئەگەر نەڕۆن و دانیشن ئەتانبات، ئەگەر ئێوە ئەوتان لەبیر کرد، ئەو لەیادی ئێوەدایە هەمیشە.

١٩٤- با چاکە و بەخشندەییتان کەم نەبێ بۆ ئەوانەی سوپاستان ناکەن، لەوانەیە کەسانێ کە سوودتان بۆیان نییە سوپاستان بکەن، لەوانەیە سوپاسی سوپاسگوزار زۆرتر بێ لە ناشوکریی بێباوەڕ و خوداش دەفەرموێ: ( خودا چاکەکارانی خۆش لێ دێ).

١٩٥- هەموو کاسەیەك پڕ بوو لێی دەڕژێ و نایگرێ زیاد لە خۆی، جگە لە کاسەی زانست، هەتا تێی بکەی فروانتر ئەبێ.

١٩٦- یەکەم پاداشتی خاوەن حیلم و حەوسەڵە ئەوەیە، کە خەڵکی دەورووبەر هاوکاری دەبن دژی نەفام و خوێڕی.

١٩٧- ئەگەر حیلمت نییە خۆت بە حەلیم نیشان بدە، چونکە هەرکەس لاسایی تاقمێك بکاتەوە نزیکە لەوان هەژمار بکرێ.

١٩٨- هەرکەس پرسینەوە لە خۆی بکات قازانج ئەکات، هەرکەس گوێ نەدات بە خۆی زیانی لێئەکەوێ، ئەوەی خۆپارێزیی بکات بێوەی دەبێ، ئەوەی پەند وەربگرێ بەرچاوڕوونە، ئەوەی بەرچاوڕوون بوو تێگەیشتووە، ئەوەی تێگەیشتووبوو زانایە.

١٩٩- دنیا وەك حوشتری چەمووش و هاروهاجە، هەندێ جار نەرم و نیانە و شیردەرە، وەك کاتی شیردانی بە نۆماکەی، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ... بڕیارمدا ئەوانەی لەو زەمینەدا زەبوونکران بەچاکەوە، یان خوێنین و بیانکەینە پێشەوای خەڵك و لە دوایشدا بۆ خۆیان بمێنێتەوە).

٢٠٠- لـە خـودا بترسـن وەك ئـەوەی خـۆی تـەرخان کـردووە و ئامادەیـە و بـاڵی لێ هەڵماڵیوە و بە ئارامیی و هێمنیی کار ئـەکات بـۆ خـۆی و بـە تـرس و بیمـەوە لـە ئەجـەل دەڕوانـێ و کـاری چاکەی پێیـە بـۆ شـوێنی حەوانـەوەی و سـەرئەنجامی دواڕۆژیی و جێگەی پشووی هەمیشەیی.

٢٠١- دەستگوشادیی و بەرچاوتێریی، پاسەوانی نامووس و شەرەفە و حیلم دەمبەستی بێعەقڵە، لێبـوردن بـاجی سـەرکەوتنە، لەبیربردنـەوەی کرێـی غـەدرە، ڕاوێـژکردن ڕێنیـشاندانە، ئـەو کەسـەی تـەنها بـە ڕای خـۆی کـار بکـات خـۆی ناوەتـە بـەر مەترسیی، خۆگرتن و ئارامگرتن بەرگرییە لە ڕوداوی زەمانە، بەڵام هاتووهاوار و داد و فیغان خزمەتکاری زەمانەیـە، بـە نـرخترین بەخـشین منـەت نەکردنـە، زۆر عەقڵ و ژیریی دیلە بە دەست ئەمیرەوە، ڕێکەوتی باش ئەوەیە سوود لە ئەزموون وەربگری، دۆستایەتیی خزمایەتیی دەستکەوتووە، زۆر ئـەمین مەبـە لـەو کەسـەی کە مۆن و ڕووگرژە.

٢٠٢- خۆبەباشزانینی مرۆڤ یەکێکە لە وانەی ئیرەیی بە عەقڵ دەبا.

٢٠٣- خۆت ڕابگرە لەبەر ئێشی پووش لەچاوکەوتن، هەمیشە خەڵك لێت ڕازییە.

٢٠٤- هەرکەس نەرم و نیان و لەسەرخۆ بێ، خەڵفولقی چڕوپڕی زۆرە.

٢٠٥- دووبەرەکیی ڕای باش ئەڕوخێنێ.

٢٠٦- هەرکەس بەخشندە بێ، سەروەر ئەبێ.

٢٠٧- لە گومڕاییدا چەرخ و زەمەن زانستی گەوهەری پیاوانە.

٢٠٨- حەسادەت و ئیرەیی دۆست، نەخۆشیی خۆشەویستییە.

٢٠٩- زۆربەی گەلان و تیاچوونی ژیریی لە ژێر بروسکەی تەماع و چاوچنۆکییدایە.

٢١٠- دادپەروەریی نییە حوکم بکەی بەگومان.

٢١١- خراپترین توێشوو بۆ قیامەت دەستدرێژییە لەسەر بەندەکان.

٢١٢- جوانترین کاری جەوانمەردیی بێئاگاییە لەوەی دەیزانێ.

٢١٣- هەرکەس شەرم و شۆی شورەیی داپۆشی، خەڵك عەیبی نابینێ.

٢١٤- بە بێـدەنگیی زۆر، قورسـیی و زەنگێنیـی زۆر دەبـێ، بـە ئینـسافی زۆر، دۆسـت و برادەر زۆر دەبێ، بە دەستگوشادیی زۆر، ڕێز و قەدر زیاد دەبێ، بـە بێفیزیـی نـاز و نیعمەت گەشە دەکات، بـە هـەڵگرتنی ئـەرکی خـەڵك، گـەورەیی زیـاد ئـەبێ، بـە

دادپەروەریی زاڵ ئـەبی بەسـەر نەیاراندا، بـە حـیلم و لەسـەرخۆیی هاوکـار زۆر ئەبێ، لەسەر نەفام.

٢١٥-سەیر و سەمەرە لەوەدایە ئیرەیی نابرێ بە تەندروستیی.

٢١٦- تەماعباز دەست و پێ بەستراوە بە پەستی خۆی.

٢١٧- پرسـیاری لێ کـراوە لـە بـارەی بـاوەڕەوە، فـەرموی: بـاوەڕ زانـستی دڵـە، بڕیـار و توتنی زمانە و کارکردنە بە ئەرکەکان.

٢١٨- هەرکـەس خەفـەت بـۆ مـاڵی دنیـا بخـوات، نارازییـە بـە قـەزا و قـەدەری خـودا، هەرکەس سکاڵای هەبوو لەکارێکی ناخۆش، کە بەسـەری هـاتبێ، سـکاڵا لـە خـودا ئەکات، هەرکـەس لای دەوڵەمەنـد کزیـی بنـوێنێ و خـۆی بەکـەم بگـرێ، سـێیەکی دینی لەدەستداوە، هەر قورئانخوێنێك بمرێ و بڕوات بۆ دۆزەخ، ئەوە لەو کەسـانە بووە قورئانی بۆ گاڵتـە خوێنـدووە، هەرکـەس کـەیفخۆش بـوو بـە خۆشەویـستیی دنیا دڵی دەنووسێ بە سێ شتەوە: خەم و خەیاڵی هەمیشە لێی نابێتەوە، تەماع و حەسوودیی بۆ تەرك ناکرێ، هیوای بەربڵاوی هەیە و وەدەستی ناهێنێ.

٢١٩- قەناعەت باشترین سامانە، ڕەوشتبەرزیی جوانترین نیعمەتە.

٢٢٠- پرسـیاری لێکـرا لـە مانـای ئـەم ئایەتـە: (ئێمـە ژیـانێکی پـاك و خـاوێنی پێدەدەین).فەرموی: ئەوە قەناعەتە.

٢٢١- هاوبەشی ئەو کەسە بکەن، کە ڕزق و ڕۆزیی ڕووی تێکردووە، چونکە ئەو کەسە سامان داباریوە بەسەریدا و شایستەیە بۆ ساماندەستکەوتن و بەختی باش و هـات ڕووی تێکردووە.

٢٢٢- لە فەرمودەی خودا لەم ئایەتە: ( خودا فەرمان ئەدا بە داد و چاکە). فەرمووی: داد ویژدانە، چاکە بەخشینە.

٢٢٣- خەڵکینە..! وا خۆتان نیشانبدەن لەکاتی ناز و نیعمـەت و خۆشگوزەرانییدا، کـە ترستان هەیە و لەکاتی بەڵا و ناخۆشیی و هەژارییدا دڵتان بترسێ، چونکە ئەوەی سامانی زۆر بوو، دەبێ وا بزانێ، کە ئەوە چەشـە و داوە بـۆی دانـراوە و دەبـێ بـە ترسەوە کار بکات و ئەوەش، کە دەستی کورت دەبێ وا بزانێ ئەوە تاقیکردنـەوە و ئەزموونە و نابێ بێئومێد بێت.

٢٢٤- دیلەکانی هەوا و ئارەزوو..! بەسە کۆتایی پێبێنن لەو کـارە، چـونکە ئـەوەی زۆر

لایداوە بەلای دنیادا نایترسێنێ هیچ شتێ، مەگەر دانەکرەی ڕوداوەکانی وەخت و زەمان، خەڵکینە.. خۆتان خۆتان پەروەردە بکەن و بیپارێزن.

٢٢٥- ئەگەر داوایەکت هەبوو لە خودای بەرز و بێهاوتا، لە سەرەتادا درووود ڕەوانە بکە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، ئەوجا داوای پێویستیەکەت بکە، چونکە خودا خاوەندادە هەرگیز نابێ لەدوو داواکاریی یەکێ قەبوڵ بکا و یەکێ ڕەد بکاتەوە.

٢٢٦- هەرگیز ئەگەر وشەیەك لە دەمی کەسێ دەرچوو بە خراپ لێکی مەدەرەوە، کە بتوانی باری بۆ بدۆزیتەوە.

٢٢٧- هەرکەس بە تەنگ شەرەف و ناموسی خۆیەتی، با واز لە مجادەلە بێنێ.

٢٢٨- زۆر گێلیی و گەمژەییە پەلەکردن لەکارێ پێش پەیداکردنی توانا بە سەریا و تەمبەڵیی و خاوی پاش ئەوەی هەلی لەبار هاتە پێش.

٢٢٩- هەوڵی ئەوەی کە نابێ مەدە، ئەوەی کە هەیە خۆتی پێوە خەریك بکە.

٢٣٠- بیرکردنەوە ئاوێنەی پاکە، پەند وەرگرتن لە خەڵك ئامۆژگاریی دڵسۆزە، چاکترین ئەدەب ئەوەیە خۆت بپارێزی لەوەی لە خەڵك بە ناشیرین دەیبینی.

٢٣١- زانین هاوتایە بە کار، ئەوەی زانی کار ئەکات، زانین بانگی کار ئەکات، ئەگەر وەڵامی نەبوو بار ئەکات و ئەڕوا.

٢٣٢- خەڵکینە..! بزانن کەرەستەی ژیانی دنیا پووش و پەڵاشی درماوییە، خۆتان لابدەن لە وەراندن لە ناویدا، کەپرسەوزیی لە ناویدا بەختەوەرییترە لە دانیشتن لە سەری و بژی و نەمریی خۆشترە لە سامانی زۆر، سامانی زۆر وەك بێسامان هەوڵی هەیە، ئەوەی گوێی پێ نەدا هاوکاریی کراوە بۆ ژیانی ئارامیی، ئەوەی جوانیی دنیا لەبەرچاو بگرێ تووشی شەوارە دەبێ، هەرکەس ئەویندار بێ بە دنیا، دڵی هەمیشە پڕە لە خەفەت و خەم و لەسەر کاکڵە و کرۆکی دڵی هەڵپەرکێ دەکەن، هەمیشە لە خەم و خەیاڵە، خەفەت دڵی تەنگ ئەکات، بەم شێوە دەژی هەتا هەناسەی توند دەبێ و بەرەو خنکان دەڕوا، هەر دوو بەنۆکەی دڵی ئەپچڕێ، لای خودا سووك و بێنرخ دەبێ بۆ فەوتانی و دەبێ براکانی فڕەی دەدەنە دەرەوە، بەڵام باوەڕدار تەماشای ئەم دنیا بە چاوی پەند و ئامۆژگاریی دەبینێ، بژێویی خۆی بە سکی پێویست بەکار دێنێ، بەگوێیەکی پڕ لە ڕق و

کینەوە تەماشای دەکات، ئەگەر وتیان کاورا دەوڵەمەندە ئەڵێن هەژارە، ئەگەر شایی بکەن بۆ مانی، شیوەن دەکەن بۆ نەمانی، ئەوە هێشتا ڕۆژی نائومێدیی و دەستبەتاڵیی نەهاتووە.

٢٣٣- خودای پاك و بێگەرد پاداشتی بۆ گوێڕایەڵی خۆی داناوە و تۆڵە و سزایشی بۆ بێفەرمانی داناوە، ئەوەش بۆ بەرگریی لە بەندەکانی خۆی لە ڕق و تۆڵە و بۆ ماشینەوەیان بۆ بەهەشت.

٢٣٤- دەگێڕنەوە پێشەوا هەرکات لەسەر دوانگە دانیشتبێ پێش وتار دەفەرموێ: خەڵکینە.. لە خودا بترسن و خۆپارێزبن لە تاوان، ئەو خەڵکە بە خۆڕایی دروست نەکراوە بۆ گەمە و یاریی، دەستی لێهەڵنەگیراوە، بەکەڵك نایە ئەم دنیایە، کە لەبەرچاو شیرین بووە، جێگەی قیامەتی بۆ ناگرێ، کە لە بەرچاوی ناشیرینە، ئەو بایەوایە، کە دنیای دەسکەوتووە گەورەتر نییە لەوەی قیامەتی هەیە.

٢٣٥- هیچ پلە و پایەیەك لە ئیسلام بەرزتر نییە، هیچ سەروەرییەك لە خۆپارێزیی شکۆدارتر نییە، هیچ قەڵا و دژێك قایمتر لە خۆلادان لە گومان مەحکەمتر نییە، هیچ واسیتەیەك سەرکەوتووتر لە پەشیمانیی نییە، هیچ خەزنەیەك زۆرتر لە قەناعەت نییە، هیچ سامانێك بە ئەندازەی قووتی پێویست لابەری هەژاریی نییە، هەرکەس بە دەستخستنی بژێویی ڕازی بوو ژیانی هێمنیی و ئارامیی بۆ خۆی ڕێکخستووە و لەسەر فەرشی نەرم و گەرم دانیشتووە، حەزی بێ جێ کلیلی ماندوو بوونە، ولاخی سواری ئازارو و ئەشکەنجەیە، چاوچنۆکیی و حیرس و تەماع و ئیرەیی و فیزکردن هۆکارن بۆ خۆهاویشتنە ناو گوناحەوە، خراپەکاریی و سەرسەریی هۆی کۆبوونەوەی هەموو عەیب و شورەییەکە.

٢٣٦- زەمانێ دێت بەسەر خەڵکدا لە قورئاندا تەنها ڕێنووسەکەی ماوە، ئیسلام تەنیا ناوەکەی، مزگەوتەکان لەو ڕۆژەدا ئاوەدانە، پۆشتەیە، ڕازاوەیە لە ڕووی ساختمانەوە، بەلام ویرانە لە ڕێنیشاندانەدا، دانیشتوو و ئاواکارانی، خراپانی سەرزەوین، لەوانەوە ئاژاوە و ناکۆکیی و دووبەرەکیی پەیدا ئەبێ، لەوانەوە تاوان و کۆکوژیی دروست ئەبێ، ئەوەی لە ڕایان دەرچێ بە زۆر دەیگێڕنەوە بۆ ناوی، ئەوانەش، کە خۆیان دوائەخەن دەهاژونەوە بۆ ناوی، ئەو کات دەفەرموێ:

(سوێند بەخوٚم ئەخوٚم: دەبێ ئاژاوەیەکی وایان بوٚ بنێرم بە حیلم سەرگەردان بن، ئەوە ئەمە هاتووتە دی و ئێمەش بە سەرسم و نووچدان ڕوو لە خوداین).

٢٣٧- بە جابری کوڕی عەبدوڵڵای فەرموو: جابر..! پەیوەندیی دنیا و دین بە چوارە: زانایەك کار بە زانینی بکات، نەزانێك شورمیی پێ نەبێ خوٚی فێر بکات، سەخیی و دەستگوشادێك، کە ڕەزیلیی نەکات لە چاکەکردندا، هەژارێك، کە ئاین نەگوٚڕێتەوە بە دنیا، بەڵام ئەگەر زانا زانستی لە دەستدا، نەزان عەیبی لا ئەبێ فێربێ، دەوڵەمەند ڕەزیلە بوٚ هەژار، ئاینی دەگوٚڕێتەوە بە دنیا.

جابر..! هەر کەس نیعمەتی خودای زوٚربێ، پێویستی مەردم زوٚر ئەبێ لەسەری، جا هەرکەس ئەرکی سەرشانی بوٚ خودا ئەنجامدا لەو پێویستیانەی سەر نیعمەتەکان، ئەوە خودا نیعمەتەکانی بوٚ هەمیشە و مانەوە درێژ ئەکاتەوە، ئەوەش ئەرکی خوٚی ئەنجام نەدا بوٚ خودا بوٚ ئەو پێویستیانە، ئەوە بەرەو نەمان و تیاچوونی دەبات.

٢٣٨- کوڕی جەریری تەبەری دەگێڕێتەوە لە کتێبە مێژووەکەیدا لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلای شەرعزانەوە، کە کاتی خوٚی لەگەڵ کوڕی ئەشمەس دژی حەجاج، ئەڵێ: لەو فەرمایشتەی، کە خەڵکی هەڵدەنا بوٚ شەڕ دژی شام ئەمە بوو، فەرموی: باوەڕداران..! هەرکەس کارێکی دوژمنکاریی بینی، یان بوٚ خراپەیەك خەڵك بانگدەکرا، ئەگەر بە دڵ پێمان ناخوٚشبوو ئەوە بە سەلامەت دەرچووە، بێ تاوانە و هەرکەس بە زمان دژی قسەی کرد ئەوە ئەجر و پاداشتی هەیە و لەوەی پێشوو باشترە، هەرکەس بە شیر و بە زوٚر دژی بوو بوٚ ئەوەی وتە وگفتی خودا سەربکەوێ و گوتاری ستەمکاران سەرنەکەوێ، ئەوە بە ڕاستیی ڕێگەی ڕاستی گرتووە و لەسەر حەقە، خودا دڵی بە ڕوناکیی یەقین ئاوەدان کردووەتەوە.

٢٣٩- هەر لەسەر هەمان مەبەست دەفەرموێ: ئەوەی دژی کاری نادرووست و ناجوٚرە بە دەست و زمان و دڵ، ئەوە هەموو سیفەتە چاکەکانی جوامێریی تەواو کردووە، ئەوەی بە زمان و دڵ دژ و بەدەست نایکات، ئەوە دوو سیفەتی باشەی هەیە و یەکێکی، کە ئەوەی بە دڵ دژە بە دەست و بە زمانی نییە، ئەوە دوو چاکەی کەمە و تەنها یەکی هەیە، بەڵام ئەوەی هەرسیانی نییە، ئەوە مردووی ناو زیندانە، کاری چاکە هەمووی لە تای ترازووی جیهاددا لە ڕێگەی خودا و

کاتی فەرمان بە چاکە، نا لە خراپە وەك ئەو تۆزە تەڕاییەیەکە لەگەڵ هەناسە دەر ئەچێ، هاوتا لە ناو دەریایەکی زۆر قووڵدا، فەرمان بە چاکە و نا لە خراپە، ئەجەل نزیك ناکەنەوە و ڕزق کەم ناکەنەوە، لەوانە گەورەتر وشەیەکی داد و حەقە لە بەردەم گەورەیەکی ستەمکاردا.

٢٤٠- ئەوەی ئێوە دەستان ئەکەوێ لە پاداشت لە سەرجیهاد، جیهادە بە دەست، ئەوجا بە زمان، ئەوجا بە دڵ، ئەوەی چاکەی بە دڵ نەبێ و دژی خراپە نەبێ بە دڵ ئەوە سەربەرەوخوار هەڵواسراوە.

٢٤١- حەق وتن و کردن قورس و ڕەقە، بەڵام تامی خۆشە و خۆشخۆرە، ناحەق و ناجۆر سووك و ئاسانە، بەڵام دەرداویی و درماوییە.

٢٤٢- بێترس مەبن لە ئازار و ئێشی خودا لەسەر پیاوچاکانی ئەم میللەتە، چونکە خودا دەفەرموێ: (فَلاَ يَـأْمَنُ مَكْـرَ اللَّـهِ إلاَّ الْقَـوْمُ الْخَاسِـرُونَ ... خۆ بە غەیرەز زیانباران کەس بێئاگا نابێ لە تۆڵە و سزای خودا). هەروەها پیاوخراپانیش بێئومێد نەبن لە پاداشتی خودا، چونکە ئەفەرموێ: (إنَّهُ لاَ يَيْـئَسُ مِـنْ رَوْحِ اللَّـهِ إلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ ... هەر ئەوانەی بێباوەڕن لە بەزەیی خودا نائومێدن).

٢٤٣- ڕەزیلیی و قرچۆکیی، کۆمکاری هەموو عەیب و عارەکانە، هەوسارێکە خەڵك ڕائەکێشێ بۆ هەموو خراپەیەك.

٢٤٤- ڕۆزیی دوانە: یەك تۆ هەولی بۆ ئەدەی و یەك ئەو هەولی تۆ ئەدا، ئەگەر تۆ نەچی بۆ لای، ئەو دێت بۆ لات، لەبەر ئەوە خەمی ساڵێك بارمەکە لەیەك ڕۆژدا ! بەسە بۆ هەر ڕۆژێ خەمی خۆی بخۆی، ئەگەر ویستت خەمی ساڵێك بخۆی، ئەوە خودای بەرز و بێهاوتا بۆ هەر ڕۆژێ ڕۆزیی خۆی تازە ئەکاتەوە و بۆت ڕەوانە دەکات، ئەگەر ئەو ساڵە بۆ تۆ نەبوو بۆچی خەمی ساڵێك ئەخۆی، کە بۆ تۆ نییە، کەس ناتوانێ ڕۆزی تۆ ببات و کەس ناتوانێ لە دەستت وەربگرێ، ئەوەی بۆ تۆ بێ سستی ناکات بۆت.

٢٤٥- زۆر کەس ڕۆژێ بەرەو ڕووی دێ و ڕۆژی تری لە دوا نایە، ڕۆژ هەیە خەڵك خۆزگە ئەخوازێ بۆی لە هەوەڵەوە، لە ئاخری ڕۆژەکەدا شیوەنگێڕان بۆی دەگرین.

٢٤٦- هەموو بێژمیەك بەستراوە بە خۆتەوە هەتا نەبێژی، ئەگەر بێژات تۆ دەبیتە ژێردەستی، ئەو کۆت و زنجیرت ئەکات، دەخیلت بم زمانت بشارەوە وەك زێڕ و زیوو دەشاریتەوە، زۆر جار وشەیەك دەبێتە هۆی بڕینی نیعمەتێك و بە سەرهاتنی ناخۆشییەك.

٢٤٧- قسە لەسەر شتێك مەکە، کە زانیاریت لەسەری نییە، بەڵکو هەرچیش دەزانی هەمووی مەڵێ، چونکە خودای بەرز و بێهاوتا لەسەر هەموو ئەندامەکانی داناوی کاری پێویست، کە بەڵگەیە بەسەرتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا.

٢٤٨- ئاگادار و وریابە، کە خودا لەسەر گوناح نەتبینێ و بێفەرمانیت پێوەدیار نەبێت، ئەو کاتە لە کەسانی زیانلێکەوتوو بیت، ئەگەر خۆت بەهێز هاتە بەرچاو، با هێزت لە جێبەجێکردنی فەرمانی خودابێت، ئەگەر بێهێز و لاواز بوویت، با بێهێزیت لە ئەنجامنەدانی گوناح و بێگوێی خودا بێت.

٢٤٩- لە دنیا ئەوەی هاتە دەستت وەریبگرە، ئەوەی چوو چوو، ئەگەر واتنەکرد مەردانە هەوڵبدە.

٢٥٠- زۆر دەستەواژە هەیە لە پەلامار کاریگەرترە.

٢٥١- هەرچی ئەزانی باسی مەکە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ئەوەی ئەیزانی هەمووی مەڵێ، چونکە خودا لەسەر ئەندامەکانی داناوی لە قیامەت شایەتیی بدەن لە سەرت.

٢٥٢- بترسە، کە لەسەر گوناحت بمێنی و لەسەر جێبەجێ کردنی هەرمانت نەمێنێ، ئەوکاتە تۆ زیانلێکەوتوو دەبی، ئازابە لەسەر خوداپەرستیی، ئەگەر بێهێزبووی، با لەسەر گوناح بێهێزبی.

٢٥٣- چاوچنۆکیی بۆ دنیا لەسەر ئەو هەموو عەیبەی نەفامییە، کەمتەرخەمیی بۆ چاکەکردن، کە بە تەمای پاداشت بی، زیانکەوتنە.

٢٥٤- لە سووکیی ئەم دنیایە، کە تەنها لەوێدا بێفەرمانیی دەکرێ، کەس ناگات بە پاداشتی خودا، مەگەر بە تەرکی ئەو نەبێ.

٢٥٥- هەرکەس داوای هەرچی بکات، یان بە تەواویی یان کەمی دەست دەکەوێ.

٢٥٦- ئەو چاکە چاکە نییە، ئەگەر پاداشتی دۆزەخ بێ، ناخۆشیی ناخۆشیی نییە، ئەگەر پاداشتی بەهەشت بێ.

٢٥٧- ئاگــادارن، كــە هــەژاریی زۆر بەڵایــە و لــە بــەڵا خــراپتر لەشــبیماریيە، لەشــبیماریيش خــراپترین نەخۆشــیی دەروونییــە، لــە نیعمەتــە باشــەکانە سامانداریی.

٢٥٨- هەرکەس کارەکانی هۆی دوورکەوتنی بێ ئەسڵ و نەسەب ناگاتە فریای.

٢٥٩- هەرکەس کرداری خۆی بە چاکیی لە دەست دەرچێ، چاکەی باوباپیری سوودی نییە بۆی.

٢٦٠- هەر شتێك، کە سوودت لێوەرگرت، بەکەڵکت هاتووە و بەستە.

٢٦١- مردن نەك سەرشۆڕیی، کەمدەستیی نـەك پاڕانـەوە، هەرکـەس لـە دانیـشتنیدا شتی دەست نەکەوێ، بە پێوە دەسـتی ناکـەوێ، زەمانـە دوو ڕۆژە، ڕۆژێ بـۆ تۆیـە و ڕۆژێ دژی تۆیە، ئەگەر ڕۆژت بوو بایەوا مەبە، ئەگەر دژت بوو خۆت بگرە.

٢٦٢- جوانترین بۆنی خۆش میسکە، هەڵگرتنی سووکە و بۆنی خۆشە.

٢٦٣- واز لە شانازیی بێنە، فیزت کەم بکەرەوە و یادی گۆڕت بکە.

٢٦٤- مافی منداڵ لەسەر باوك و هەم باوك لەسەر مناڵ هەیە، مافی باوك لە سەر منـداڵ گوێرایەڵییە، مەگەر بۆ گوناح و مافی منداڵ لەسەر باوك ناوی جوان و فێرکـردن و قورئان پێخوێندنە.

٢٦٥- چاوی پیس هەیە، دوعاش هەیە و جادوگەریی هەیە، گەشـبینیی هەیـە، ڕەشـبینیی نییە، تووشبوونی نەخۆشی نییە، بۆنی خۆش مـژدەی خۆشییە و هـەنگوین مـژدەی چاکبوونەوەیە، هاتووچوون بە سواریی خۆشییە و تەماشـاکردنی سـەوزایی، مـژدە و ڕوناکییە.

٢٦٦- لە یەك نزیکیی لە خووڕەوشت دڵنیاییە لە خراپەی یەکتریی.

٢٦٧- لە دانیشتندا کەسێ قسەیەکی کرد لەبەر ئەوە ئەو جۆرە قسەیە ناگونجێ لە کەسی وەك ئەو، فەرموی: بە زەرنەقوتەیی فڕیت و بە منداڵی لەگەڵ ڕەو دانرای.

٢٦٨- ئەوەی دەیەوێ دژەکان نزیك بکاتەوە فرت و فێڵی لە دەست دەدا.

٢٦٩- پرسیاری لێکرا کە مانای ( لاحول ولا قوە إلا باللە) چۆنە؟ فـەرموی: ئێمـە لـە ڕووی خودادا خـاوەنی هـیچ شـتێك نـین، ئـەوەی ئـەو پێمـان نـەدا نیمانـە، ئەگـەر شـتێکی پێداین دەسەڵاتی بە ئێمەشداوە کاری پێ بکەین، هـەر کـات بردیـەوە ئـەرکی لەسـەر لابردوین.

**٢٧٠- جارێك عەمماری كوڕی یاسر گفتوگۆی ئەكرد لەگەڵ موغەیرەی كوڕی شوعبەدا، لە كردمیەكدا فەرموی: وازبێنە عەممار، ئەو لە ئایین ئەوەندەی وەرگرتووە، كە لە دنیای نزیك بكاتەوە، هەمیشە كاری لەناو كاری گومانـاویی كردووە، بۆ ئەوەی كەوتنەكانی لەسەرگومان پینە بكات.**

**٢٧١- ئای چەند جوانە خۆ بەكەمزانین، دەوڵەمەند لە ڕووی هەژاردا، تەنها لەبەر ڕەزایەتی خودا، بەڵام لەو جوانتر فیزی هەژارە بەسەر سامانداردوە بە پشتبەستن بە خودا و قەناعەت.**

**٢٧٢- هەركات خودا عەقڵی بە كەسێ بەخشی، ڕۆژێ دەبێ بە هۆیەوە لە بەدبەختی دنیاو قیامەت ڕزگاری بكات.**

**٢٧٣- هەركەس زۆران لەگەڵ حەقدا بگرێ ئەیدا بە زەوییدا.**

**٢٧٤- دڵ، كتێبی چاوە.**

**٢٧٥- تەقوا و ترس لە خودا، سەرۆكی هەموو ڕەوشتەكانە.**

**٢٧٦- زماندرێژیی مەكە بەسەر ئەوەی فێری قسەی كردی، ڕەوانبێژیی مەنوێنە بەسەر ئەوەی فێری كردوی.**

**٢٧٧- ئەدەب ئەوەیە، ئەوەی لە خەڵك بێزاری خۆت نەیكەی.**

**٢٧٨- یان ئارام بگرە وەك مەردی ئازا و ئازا، یان بە درێژیی كات ئارام دەبیتەوە.**

**٢٧٩- بە ئەشعەسی كوڕی قەیسی وت: بۆ پرسە ئارام بگرە وەك مەردی پیاومەرد، یان وەك بێزمان گوێ مەدەرێ.**

**٢٨٠- سیفەتی دنیاخەڵەتاندن، زیانبەخش و تیژڕەو، خودا دای نەناوە بۆ پاداشتی پیاوچاكان و تۆڵە لە خراپەكاران، وەك كاروانێكە كەمێ بۆ پشوو لایانداوە و كاروانچیی پێیاندەڵێن دەی زوو بار بكەن.**

**٢٨١- بە حەسەنی كوڕی فەرموو: كوڕم پاش خۆت هیچ شتێ جێمەهێڵە لەم دنیایەدا، چونكە بۆ دوو كەسی جێدێڵی: بۆ پیاوی باش، كە بەختیارە پێی و تۆ داماوی و بۆ پیاو خراپێك، كە پێی داماو ئەبێ و تۆ ماندوو بووی بە كۆكردنەوەی و تۆ هاوكاری گوناهی، ئەوی لەم دوانە كەسیان ئەوە نییە خوتیانی بۆ ماندوو بكەی. بە ڕیوایەتێكی دیكە، بەم جۆرەیە:**

**پاش ئەوە.. ئەوەی لە دەستەكانی خۆی ماڵی كەسی تر بووە و پاش تۆش دەچێ بۆ**

خەڵکی دیکە، تۆش کۆی ئەکەیتەوە بۆ دووکەس، بۆ کەسێ لە فەرمانی خودا بە کاری بێنێ و بەختەوەر بێ و تۆ بۆی ماندوو بووی، یان پیاوێك بۆ نافەرمانی خودا بەکاری بێنێ و داوا و کوێرەوەریی تۆش بێ هیچ کەسیان، ئەوە نایەنێ تۆ لە خۆشیان باش بزانی، کەواتە داوای ڕەحمی خودا بۆ ڕۆیشتوو ورزق بۆ هاتوو بکە.

٢٨٢- کابرایەك وتی: داوای لێخۆشبوون لە خودا (ئەستەغفیروڵڵا)یە؟ فەرموی: دایکت شیوەنت بۆ بکات، ئەزانی داوای لێخۆشبوون چییە؟ داوای لێخۆشبوون پلەی مرۆڤە بەرزەکانە و ئەو وشەیە شەش مانای هەیە: یەکەم پەشیمانیی لە ڕابردوو، دووەم جەخت لەسەر نەگەڕانەوە بۆی، سێیەم مافی ئەوانە بدەی، کە حەقیان لاتە، بۆ ئەوەی کە چویت بۆ لای خودا ساف و ساغ بیت، چوارەم هەر فەرزێك، کە لەسەرتە بیگێڕیتەوە وەك خۆی، پێنجەم ئەو قەڵەوییە بە حەرام درووستت کردووە بتوێتەوە بە داخ و خەفەت، هەتا پشتت ئەلکێ بە ئێسقانەوە و گۆشتی تر پەیدا ئەبێ، شەشەم ئیشی ماندووبوون بە فەرمانبەرداریی پێ بدەی، وەك خۆشی بێ ئەمریت پێ بێدا، ئەو کات بڵێ: (ئەستەغفیروڵڵا).

٢٨٣- حیلم و لەسەرخۆیی، هۆز و خێڵە.

٢٨٤- زۆر هەژارە ئینسان، کە کاتی مردنی نادیارە، نەخۆشکەوتنی ونە، هەموو کاری تۆمارە، مێشوولەیەك ئازاری ئەدا، قومێ ئاو ئەیخنکێنێ و دڵۆپێ ئارەق بۆنی لەشی ناخۆش ئەکات.

٢٨٥- لە کۆڕێکدا بوو ژنێك، کە جوان بوو ڕابورد و هەموو بۆیان ڕوانی بە چاوی هەوەس، فەرمووی: چاوی ئەم کەڵەحوشترە زۆری حەز لە کەسی دووەمە، هەر ئەوەشە دەیانجوڵێنێ، ئەگەر حەزتان لە ژنێك بوو بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان، ژن هەر ژنە لەو کاتەدا.

کابرایەکی خەواریج وتی: دەك خودا بە کافریی بتکوژێ چەند خوێندەوارە، خەڵك پەلاماریاندا، کە بیکوژن، فەرموی: مەکەن، جنێو بە جنێوە، یان جنێو بە لێبوردنە.

٢٨٦- ئەوەندە عەقڵت بەسە، کە ڕێگەی چاکەت بۆ لە خراپە جیا بکاتەوە.

٢٨٧- چاکە بکەن و هیچ لە چاکە بەکەم مەزانن، چونکە چاکە بچووکی گەورەیە و کەمی زۆرە، بۆ چاکە مەڵێن ئەو کەسە باشترە لە من بۆ ئەو چاکەیە، چونکە قسەکە ڕاستە، هەموو چاکە و خراپەیەك پیاوی خۆی هەیە، ئەوەی تۆ نەیکەیت

خەڵکی خۆی ئەیکات.

٢٨٨- هەرکەس نهێنیی چاك بکات، خودا ئاشکرای چاك ئەکات، هەرکەس بۆ ئایین چاك بێ، خودا دنیای بۆ چاك ئەکات، هەرکەس بەینی خۆی و خودای چاك بوو، خودا بەینی ئەو و خەڵکی بۆ چاك ئەکات.

٢٨٩- حیلم پەردەیەکی ئەستوورە، عەقڵ شمشێری تیژە، تۆش ڕەوشتەکانت بە حیلم داپۆشە، بە عەقڵ ئارەزووەکانت ببڕە.

٢٩٠- خودا بەندەی هەیە بۆ سوودی خەڵکی و لەناو دەستی داناون هەتا ئەنجامی بدەن، ئەگەر نەیانکرد دەیگوێزێتەوە بۆ خەڵکیتر.

٢٩١- پێویست نییە خەڵك متمانە بە دوو شت بکات، لەشساغیی و ساماندارییی، دەبینی کابرا ساغ و سەلیمە و نەخۆش دەبێ و دەوڵەمەندە و هەژار دەبێ.

٢٩٢- هەرکەس سکاڵای بردە لای باوەڕدار، ئەوە بۆ لای خودای بردووە و هەرکەس بردیە لای بێباوەڕ، ئەوە دژی خودا سکاڵای کردووە.

٢٩٣- لە جەژنێکدا ئەفەرموێ: ئەوە جەژنی ئەو کەسەیە، کە خودا ڕۆژووی وەرگرتووە و شەونوێژی قەبووڵە، هەر ڕۆژێ گوناحی تێدا نەکرێ ئەوە جەژنە.

٢٩٤- گەورەترین داخ و خەفەت بۆ کابرایەکە لە قیامەتدا، کە ماڵی پەیدا کردبێ لە بێئەمریی خودا و کابرایەکی تر بە میرات وەریگرتووە لە فەرمانی خودا سەرفی کردووە، ئەمەیان بۆ بەهەشت و ئەویتر بۆ دۆزەخە.

٢٩٥- لە هەموو کەس زیان لێکەوتووتر و نائومێدتر کەسێکە لەشی خۆی داڕزاندووە، لە کۆکردنەوەی سامان و ماندووبوون بە شوێنی ئاواتەکانیداو نەگەیشت بە مەرامی خۆی و لە دنیا دەرچوو بە خەفەتەوە و تۆڵەی لەسەرە بۆ قیامەت.

٢٩٦- ڕۆزیی دوانە: یەك بە شوێنتەوەیە و یەك بەشوێنیەوەی، ئەوەی داوای دنیا بکات مەرگ داوای ئەکات هەتا لە دنیا دەری ئەکات، ئەوەی قیامەت داوا بکات، دنیا داوای ئەکات، هەتا بە تەواویی ڕزقی خۆی پێئەدا.

٢٩٧- پیاوانی خودا بە دڵ لە ناوەڕۆکی دنیا دەڕوانن کە خەڵك، تەنها تەماشای دەرەوەی ئەکەن و بۆ پاشەڕۆژی دەڕوانن، کە خەڵك بۆ حازرەکەی دەڕوانن، ئەوەی ترسیان هەبوو بیانکوژێ ئەوان کوشتوویانە و ئەوەی، کە دەیانزانی وازیان لێدێنێ، ئەوان وازیان لێهێنان، ئەوەی خەڵك زۆری لێبار نەکرد ئەوان کەمیان لێدەبرد، دوژمنی

ئـەوەی خـەڵك دۆسـتی ئـەكرد و دۆسـتی ئـەوەی خـەڵك دوژمنـی ئـەكرد، بـە هـۆی ئەوانەوە قورئان دەزانرێ و بە هۆی ئەوانەوە زانرا مانای قورئـان، مانـەوەی قورئـان بە هۆی ئەوانەوە بوو، ئەوانیش مانیان بە قورئـان بـوو، جگـە ترسـی خۆیـان ترسـی كەسیان نەبوو، جگە ئومێدی خۆیان ئومێدیان بەكەس نەبوو.

٢٩٨- هەمیشە بیر لەوە بكەنەوە، كە خۆشیی لادەبات و ناخۆشییەكانی دادەنێ.

٢٩٩- تاقی بكەیتەوە ڕقت لێی دەبێ.

٣٠٠- خـودا، كـە دەرگـای ستایـشی لـە بەنـدە كـردەوە، دەرگـای فراوانـی لێئەكاتـەوە، كـە دەرگـای نـزای لێكـردەوە، دەرگـای قـەبووڵی لێئەكاتـەوە، كـە دەرگـای گەڕانـەوەی لێكردەوە، دەرگای لێبووردنی لێئەكاتەوە.

٣٠١- شایستەتر بە جوامێریی ئەوەیە جوامێرانی پێ بناسرێ.

٣٠٢- لە وەڵامی پرسیاری (داد باشترە یان سەخاوەت؟)، فەرموی: داد هەر شتێ لە شوێنی خـۆی دادەنـێ، سـەخاوەت شـت لـە شـوێنی خـۆی لادەبـا، داد ڕامیـاریی گـشتییە، سەخاوەت پێشانگەی تایبەتە، داد چاك و باشە.

٣٠٣- خەڵك دژی ئەوەیە، كە نایزانێ.

٣٠٤- دنیانەویـستیی لـە نێـوان دوو ڕسـتەی قورئاندایـە: (بـۆ ئـەوەی ئێـوە بـۆ شـتی لەدەستدەرچـوو خـەم نـەخۆن و بـە دەسـتكەوت دڵخـۆش نـەبن)، چـونكە ئـەوەی بێئومێـد نـەبوو لـە ڕابـردوو و دڵخۆش نـەبوو بـە داهـاتوو، ئـەوە هـەردوو لای دنیـا نەویستی بەدەست هێناوە.

٣٠٥- كار بەدەستگرتن وەك گۆڕەپانی ئەسپتاودانە.

٣٠٦- خەو هێمنیی پیاو پوچەڵ دەكاتەوە.

٣٠٧- هیچ وڵاتێك بۆ تۆ لەویتر چاكتر نییە، بەڵام چاكترە هەڵتبگرێ.

٣٠٨- كە دەنگۆی وەفاتی ئەشتەری نەفەعیی پێگەیشت، فـەرموی: مالیـك دەزانـن مالیـك كێیە؟ قەسەم بە خودا، ئەگەر چیا بوایـە زۆر بـەرز ئـەبوو، ئەگـەر بـەرد بوایـە زۆر سـەخت ئـەبوو، هـەرگیز سمـی بـە سـەردا نـەهاتووە و هـەرگیز باڵنـدە لەسـەری نەنیشتووەتەوە.

٣٠٩- كەمیی بەرەكەت باشترە لە زۆریی ماندووكەر.

٣١٠- ئەگەر كەسێ ڕەوشتێكی بەرزی هەبوو، چاوەڕوانی دیكەی لێبكە.

٣١١- به غالبى كورِى سەعسەعەى باوكى فەرزدەقى فەرمووْ: حوشترەكانت چى بەسەر هات؟، وتى: ميرى باوەرِداران ! مافى زۆر بلاوەى پێكرد. پێشەوا فەرمووى: ئەوە باشترين رِێگەيەتى.

٣١٢- هەركەس نەيزانى بازرگانيى بكات، ئەكەوێتە كەندەلانى سووخواردنەوە.

٣١٣- هەركەس بەلاى بچووك بە گەورە بزانێ، خودا تووشى گەورەى ئەكات.

٣١٤- هەركەس خۆى پێ گەورە بێ، ئارەزووى لا سووك ئەبێ.

٣١٥- هەركەس گالتە و گەپ بكات، بە دەمى خۆى عەقلى فرِێ ئەدا.

٣١٦- گوێنەدانت بە كەسێ كە خۆى نزيك دەكاتەوە، دەستنانە بە بەختى خۆتەوە، ئارەزووت بۆ نزيك بوونەوە لە كەسێ حەزى لە چارەت نييە، پەستيى و سەرشۆرِييە.

٣١٧- بەنى ئادەم چييە؟ سەرەتاكەى دلۆپێ و كۆتايى لاكێ و خۆى ناتوانێ رِۆزيى خۆى بدات و مردن لە خۆى دوور بخاتەوە.

٣١٨- دەولەمەنديى و هەژاريى، كاتى دادگايى بەردەم پەروەردگارە.

٣١٩- لە وەلامى كێ لە شاعيرەكانى پێشين  لە هەموويان شاعيرترە؟ فەرمووى: ئەوانە لە گۆرەپانى رِمبازييدا نين، هەتا بزانى كاميان لە پێشە، بەلام ئەگەر بتەوێ ئەوە (پاشايەتى ليۆنبووە): كە ئيمرەئولقەيسە.

٣٢٠- ئەوە كەس نييە ئەم تيكەيە فرِێ بدات بۆ خاوەنەكەى نرخى ژيان تەنها بەهەشتە، مەيفرۆشن بەو تيكەيە.

٣٢١- دوو كەسى نەوسن هەيە تێر ناخۆن، يەك فەقێى زاناكار، دوو دنياويست.

٣٢٢- نيشانەى باوەرِ رِاستيى وتنە لەگەلْ زيانيدا، بەسەر درۆ كە سوودى هەبوو، لە گفتوگۆدا بەپێى زانيارى بێ و لە خوا بترسى لەگێرِانەوەدا بۆ قسەى خەلك.

٣٢٣- هەميشە قەدەر لە برِيار بەهێزترە، هەتا رِادەيەك رِاوێژ بێسوودە.

٣٢٤- حيلم و لەسەرخۆيى دوو كارن هيممەت بەرزيى دروستى دەكات.

٣٢٥- پاشملە وتن چەكى بێدەسەلاتە.

٣٢٦- زۆركەس بايەهواى مەدحى خەلكە.

٣٢٧- دنيا بۆ خۆى درووستنەكراوە، بۆ خەلكيتر دروستكراوە.

٣٢٨- كورِانى ئومەييە مۆلەتيان هەيە تا ماوەيەك، هەرچەند لەناو خۆيان ناكۆكن، پاش

ئەوە کەمتیار فێڵیان لێبکات و زاڵ بێ بە سەریانا.

٣٢٩- لە ستایشی ئەنساردا ئەفەرموێ: ئەوانە، قەسەم بە خوا، ئیسلامیان پەروەردە کرد وەك نۆمای تازە بمۆچێنی، لەگەڵ دەوڵەمەندیی دەستیان و زمانی تیژ و ڕەوانیان.

٣٣٠- چاو دەمبەسی پاشووە.

٣٣١- لە باسی عومەردا ئەفەرموێ: سەردارێك کاری گرتە دەست خۆی ڕاست و داوای ڕاستی ئەکرد، هەتا ئایین ملی ڕاکێشا و پشوویدا.

٣٣٢- کاتێك دێ کە گازگرە دەوڵەمەند، گاز ئەگرێ بە سامانەکەیەوە و ئەوەشی پێنەسپێراوە، خودا دەفەرموێ: (چاکە کردن لە نێوانتان لەبیرنەچێ). لەو زەمانەدا پیاوخراپ لەسەرەوەیە و پیاوچاك دواکەوتووە و بە زۆر پەیمان لە کەسان وەردەگیرێ.

٣٣٣- دوو کەس بە هۆی منەوە تووشی فەوتان دەبن: خۆشەویستیی زیاد لە سنوور، بوختانچیی درۆزن.

٣٣٤- لە وەڵامی پرسیار لە (یەکتاپەرستیی و داد؟)، فەرموی: یەکتاپەرستیی ئەوەیە گومانی لێنەکەی، داد ئەوەیە، کە تانە لە کردارەکانی نەدەی.

٣٣٥- بێدەنگیی لە فەرمان بە حەقدان باش نییە، وەك قسە لەسەر نەزانین.

٣٣٦- لە دوعای باراندا، فەرموی: خودایە... هەوری نەرم و نیان، نەك تووش و سەرکەش.

٣٣٧- گوتیان بۆ مووی خۆت ناگۆڕی فەرموی: ئەوە بۆ ئێمە جوان نییە، کە لە کارەساتداین.

٣٣٨- جیهادکەری شەهید لە ڕێی خودا، گەورەتر نییە لەوەی بۆی ڕێکدەکەوێ و خۆی دەپارێزێ، پاکداوێن وەك فریشتەیە.

٣٣٩- قەناعەت سامانی بێکۆتاییە.

٣٤٠- بە زیادی کوڕی باوکی خۆی گوت: دادپەروەربە، ستەم مەکە، زۆردارمەبە، ستەم وڵات چۆڵ ئەکات، زۆرداریی شیری تێدایە.

٣٤١- خراپترین گوناح ئەوەیە خاوەنەکەی بە سووکی بزانێ.

٣٤٢- خودا داینەناوە لەسەر نەزان فێربێ، هەتا داینەنابێ لەسەر زانا کە فێری بکەن.

٣٤٣- خراپترین هاوکاریی و برادەر ئەوەیە زیادەڕۆیی تێدا بێت.

٣٤٤- ئەگەر باوەڕدار برای خۆی تورەکرد، جیابووەتەوە لێی.

## شەریف ئەلرەزیی دەڵێ:

ئەوە کۆتا وتەی میری باوەڕدارانە سەلامی خودای لەسەر بێت، زۆر ستایش و سوپاس بۆ خودا کە تەواوم کرد.

## شێخ محەممەد عەبدە دەڵێ:

لە ساڵی چوارسەدی کۆچییدا تەواو کراوە.

## عەبدوللەتیف بامۆکی دەڵێ:

سوپاس بۆ خودا، درود لە گیانی پاکی پێغەمبەر، کە شاگردی وەك عەلی هەبووە، خودا بارانی ڕەحمەتی خۆی بۆ سەرگوڵشەنی عەلی بنێرێ، کە کوڕەزای وەك شەریف بووە، ڕەحمەت لە گیانی پاکی شێخ محەممەد عەبدەش بێت، کە ڕابەری هۆشیاریی ئیسلامیی بوو لە سەدەی بیستەمدا، مەبەستی عەبدوللەتیفیش تەنها خزمەتە بە ئیسلام و موسڵمان و کورد.

یەك شەممە ٢٠٠٩/١/١١
هەڵەبجەی شەهیدان

# پاشبەندێکی زۆر پێویست و گرنگ

لەکاتی تەرجەمە و وەرگێڕانی (نهج البلاغة)دا، کە من دەستەواژەی(ڕێبازی ڕەوانبێژیی)م بۆ داناوە، بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی هەتا ئێستە ئەم شاکارە نەکراوە بە کوردیی، لەبەر قورسیی فەرمانایی زمانەکەیە؟ یان لەبەر ئەوەیە کورد هەرچەندە زۆر پێشەوای خۆش ئەوێ، بەڵام نایەوێ دەم و قەڵەم و پەڕە و مەرەکەبی لە ناکۆکیی نێوان یارویاوەراندا تێکەڵاو بکات، کە خودا بە بەزەیی خۆی دەستی کوردی لەو خوێنە ڕژاوەدا نەگلاندووە، یان لەبەر ئەوەیە ئەو لایەنەی خۆی بە نەژادی ئال و بەیت ئەزانێ، نایەوێ بۆ کوردی سادە و دڵساف دەربکەوێ، کە هۆکاری شکستی پێشەوا، ڕاستیی و ئازایەتیی و دادپەروەریی و پەیڕەوی مەعاوییە نەبووە لە قورئان و فەرموودە، بەقەدەر ئەوەی پەیڕەوانی پێشەوا نارێك و بێگوێ و ترسنۆك و نادڵسۆزی پێشەوا بوون، ئەو هەموو هاتوهاوار و گریانە، بەشێك بووە لە پەشیمانیی و پەنجەی خۆگەستن و لە ئەژنۆدان بۆ ئەو کەمتەرخەمییە، کە پێشەوا لەم کۆمەڵە دەقەدا ئاشکرای کردووە، چونکە ئەگەر بە ئینسافەوە ئەم دەقە لەبەرچاوی کورد بێت، لەوانەیە بە جۆرێکیتر تەماشای ئەو کات و زەمەن و کەسانە بکات، کە لەو ڕۆژەدا لەناو ڕامیاریی و کارگێڕیی و دەوڵەتداریی بوونە، هیچ باوەڕدارێك نییە بێئاگا بێت لە (عەلی ئامۆزای پێغەمبەر و خزم و نزیك و پەروەردەی ناو ماڵی پێغەمبەر، درود و سڵاوی خوایان لێبێت)، چ ئەو کاتەی دوای مردنی باوك و دایك و باپیری محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (صلی الله علیه وسلم)، چ ئەوکاتەی وەك پاراستن و بەخێوکردن و بەرگری لێکردنی ئەبوتالیب، چ ئەو کاتەی لەبەر دەستکورتیی مامی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، عەلی دەباتە ماڵی خۆی و

بەخێوی ئەکات، بە سامانی خێزانی پاك و بەرز و بە شكۆی خاتوو خەدیجە، چ ئەوكاتەی كە عەلی تەنها كەس دەبێ نان و ئاو دەبات بۆ كورە مامی خۆی لە ئەشكەوتی حیرا، هەموو ساڵێ لە مانگی ڕەمەزاندا، چ ئەوكاتەی كە مژدەی بوون بە پێغەمبەری محەممەد(صلی الله علیه وسلم) و باوەڕهێنانی حەرەمی بەڕێزی، سێیەم كەس عەلی بوو گەرماوگەرم بۆنی پەیام و سرووش و یەكەم پێغەمبەر بۆ عەرەب و دوا پێغەمبەر بۆ مرۆڤایەتیی و داپۆشینی هەموو ئاین و كتێبە ئاسمانییەكان، ئەوەشمان لەبیربێت عەلی لەناو حەرەمی كەعبەدا لەدایكبووە و نەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) تەنها لەوەوە زۆر و فراوان و بە بەرەكەتە، هەتا قیامەت هەر ئەمێنێ و خودا بە زۆری داناوە بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە سورەتی (كەوسەر)دا، كە لە عەلی و فاتیمەی كچیەوە، نەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)پێشەوا و ڕابەری هەموو جیهانی ئیسلام بوون.

هەرچەندە بە منداڵیی و لاویی، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) عەلی بەخێو كرد، عەلی لەگەڵ پێغەمبەری خۆی(صلی الله علیه وسلم)، ڕاستگۆ و دڵسۆز و گیانبەختكار و جەنگاوەر و پاڵەوانی گشت داستانەكان بووە، كە كوڕی ئازا دڵی لە ئاستیدا دەلەرزیی و قارەمان و پاڵەوان تێیدا پێی دەخزا و لە شەوی كۆچكردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ یاری ڕاستگۆ و ڕاستكردار ئەبوبەكر، تەنها عەلی بوو لە جێگەكەیدا ڕاكشا، كە دەیزانی بێباوەڕان بە شمشێری ڕووتی لە كێلان دەرهاتووی گەنجانی هەموو هۆزەكان، ئەو شەوە بە یەكدەست و بێپرس و لێكدانەوە، ئەو شوێنخەوتنەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە شیروتیر هەنجن هەنجن دەكەن، ناپرسن كێ لە ژێر ئەو جێگەدا خەوتووە !! ئەو نهێنییە تەنها پێغەمبەر و ئەبوبەكر و عەلی پێی ئەزانن، خودا بە جوبرەئیل(سەلامی خودای لەسەر بێت)ی ڕازگری سروش و پەیام ئاگاداری كردوون و زۆر نهێنییە و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەو ساتەوەختەی بە ساڵی خەم و پەژارە ناو بردووە، چونكە خاتوو خەدیجە و ئەبوتالیب وەفاتیان كردووە !.

عەلی لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بووە، لە هەموو مەفرەزەكاندا، تەنها لە شەڕی تەبوكدا نەبێ، كە كردی بە خاوەنماڵ و فەرمووی: تۆ بۆ من وەك هاروونی بۆ موسا (درودو سڵاوی خوایان لێبێت)، بەڵام پاش من پێغەمبەر نییە.

له غەزوەی بەدریشدا بوو، کە گەورەپاڵەوان و دەست و بازوو شمشێر بە هێزی وەك (عەمری کوڕی ود)ی کوشت.

له شەڕی خەندەقیشدا یەکێك بوو لەوانەی دەوری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی چۆڵ نەکرد.

لە ئوحود و حونەینیشدا قارەمان و پەرچەمبەشانی ڕۆژی خەیبەر بوو، سورەتی (بەرائە) لەکاتی وتاری حەجدا عەلی خوێندیەوە، کە ویستنی خودا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و قورئان و ئیسلام و نەویستنی بتپەرستیی تێدا دیاریکرا بوو.

خودا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و قورئان فەرمانڕەوایی داوەتە دەست میللەت و خۆی بەو مەرجەی پەیڕەوی ڕێبازی ئیسلام بن و یاسای داناوە بۆ پێشەوا و ڕابەر و سەرکردەی گشتیی باوەڕداران، لەبەر ئەوە هەر پاش بلاوبوونەوەی وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ڕەبیعی دووەمی ساڵی (١١)ی کۆچییدا، نەوەی هاشم حەزیان لێبوو عەلی ببێتە جێنشین و جێگەدار و پێشەوا بێ و گەورە و پیاوی نەوەی هاشم عەباسی کوڕی عەبدولموتەللیب بە عەلی وت: دەست بدە پێم پەیمان دەدەمین تۆ خەلیفەی موسڵمانانی، بەلام گەورەیی و مەزنیی عەلی ئەوە نییە بەپەلە پەلاماری دەسەلات بدات، بۆیە خۆی بۆ کاری بەڕێکردنی زاتی پیرۆزی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەرخان کرد بۆ شۆردن و کفنودفن کردن لە ژوورەکەی دایکی باوەڕداران عائیشەی حەرەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و گەورە ژنی یارویاوەر بۆ پرسەکانی ژنان لە ئیسلامدا، زۆر بە هێمنیی و ئارامیی هەردوو ئەرکە گەورەکەی بەڕێ کرد و دانانی خەلیفە لەچەند کاتژمێرێکدا تەواو بوو، کە بەکۆی دەنگ و بڕیار ئەبوبەکر کرا بە خەلیفە، عەلی خۆی نەگرت، جگە لەماوەیەکی کەم دەستیدا بە دەستی ئەبوبەکر، ئەبوبەکریش قەدرو شکۆی عەلی لەبەرچاو بوو، بۆ پرس و ڕاوێژ لە وەزیر گەورەتر ڕێزی بۆ دانا، ڕاستە عەلی خۆی بە شایستەتر دەزانی بۆ خەلافەت، بەلام لەبەر نەفسبەرزیی و ڕوونەدانی ئاژاوە و پشێوی، بۆ ئەوەی ئیسلام نەبێتە میرات تەنها بۆ خزم و نزیکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و نەبوونی ڕاسپاردە بە دەقی ڕوون و ئاشکرا، کە کێ خەلیفەیە و هەرکات و زەمانێك میللەت پەیڕەوی جوانترین شێواز بکەن بۆ دیاریکردنی ڕابەر و

پێشەوا، ئەو گەورەمەردە ئەو کەڵەپیاوە، دەبێتە ڕاوێژکاری خەلیفەی یەکەم و پاش ڕاسپاردنی یەکەم، بۆ عومەر، بەیعەت بە عومەریش دەکات، عومەریش زیاتر خۆشەویستیی و شکۆی بۆ عەلی بڕیار ئەدا لە کاروباری جەنگ و یاساو گشت پرسەکانی دەسەڵات، هەمیشە ئەم ڕستەیە دەڵێتەوە (خۆ ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر فەوتابوو).

پاش زامار بوونی عومەر بە دەست کۆیلەیەکی مەجووسیی لەکۆتایی ساڵی (٢٣)ی کۆچییدا، وای بەباش زانی شورایەکی ناوەندیی کە هەموو لە لایەن پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) مژدەی چاکیی و پاکیی و بەهەشتیان پێدرابوو درووست بکات، کە ئەمانە بوون: (عەلی کوڕی ئەبوتالیب گەورەی نەوەی هاشم، عوسمانی کوڕی عەفان پیاوە بە تەمەنەکەی کوڕانی ئومەییە، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا گەورەی هۆزی تەمیم، زوبەیری کوڕی عەوام سەرداری نەوەی ئەسەد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف سەرۆکی نەوەی زوهرە).

زۆر پێ دەچێ کە خەڵکی ئەوکاتە کە ئەو شەش کەسە بە کۆمیتەی ڕاوێژکار دانران یەکێك لەناو خۆیاندا هەڵبژێن بۆ خەلافەت، کە عوسمان پاڵێوراوی خاوەن بەخت دەبێت بۆ دەرچوون بە خەلیفە، چونکە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف زاوای بوو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس خزمی بوو، خۆیشی جگە لە پێشینەی ئیسلامبوونی و دوو کچی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ی هێنابوو، گەورە ساماندارى حەڵاڵی ئەو سەردەمەی بازرگانیی بوو، ئەم دوانە بە دەستی خۆیان وازیان لە خۆپاڵاوتن لادا، مایەوە عەلی و عوسمان و تەڵحە و زوبەیر، تەنها عەلی و عوسمان خۆیان پاڵاوت و بە زۆرینەی دەنگ عوسمان لە ساڵی (٢٤)ی کۆچییدا لە سەرەتای مانگی موحەڕەم دەستنیشان کرا.

ڕاستە عەلی پێیگران بوو ئەم دەستنیشان کردنە، بەڵام ئەوە عەلییە هەمیشە لەگەڵ تەبایی و یەکڕیزیی موسڵمانانە و حەزی بە ئاژاوە نییە و ئەویش پەیمانی بەست لەگەڵ عوسمان و فەرمووی: (هەرچەندە پووش لە چاومایە و گەرووم پڕە لە خەم و پەژارە).

عوسمان لە ماوەی شەش ساڵی یەکەمدا زۆر بە چاکیی و پاکیی و بە وردیی بەرنامەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و هەردوو خەلیفەکەی پێشووی

جێبەجێ دەکرد، بەڵام پاش (٣٠)ی کۆچیی، کەمکەم خزم و هۆزی خۆی کۆکردەوە لە دەزگاکانی خەلافەتدا و عەلی زوو زوو ئامۆژگاریی ئەوکارانەی لە بەرچاو ڕوون دەکردەوە و لەکاتی هاتنی ئاژاوەگێڕەکانی دەوروبەر هەردوو کوڕی خۆی حەسەن و حوسەینی دەنارد بۆ پاسەوانی، بەڵام یاخیی و لە یاسا دەرچوان زیاتر بەهێز بوون و عوسمان شەهید بوو ! ئەو خەڵکە زۆر بە پەلە دەستی عەلیان گرت و پەیمانیان پێدا، بکوژانی عوسمانیش لە ترسی تۆڵە و بۆ ئەوەی نە خەلیفە و نە خاوەنخوێن نەیانپەرژێ بۆ تۆڵە و دادگایی و (قیصاص)، عەلیان وا لێکرد کە هەموو کارگێڕە دیارەکانی لابدات و هەموو بە فەرمانی خەلیفە ڕازی بوون، جگە لە مەعاوییەی کوڕی ئەبی سوفیان، کە کراسە خوێناویەکەی عوسمانی لەسەر مینبەری شام بەرز کردەوە و داوای تۆڵەی کرد و خەلافەتی عەلی قەبوڵ نەکرد، ئا لەم کاتە ناسکەدا خاتوو عائیشە و تەڵحە و زوبەیر ڕۆشتن بۆ بەسرە و داوای خوێنی عوسمانیان کرد، لە شەڕێکی خوێناوییدا لە بەسرە، وشتری کەژاوەکەی عائیشە کوژرا، تەڵحە و زوبەیر کوژران و عەلی زۆر بە قەدرو ڕێزەوە عائیشەی ڕەوانەی مەدینە کردەوە و لەو ژوورەی، کە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)ی تێدا نێژراوە دەستی دایە خوداپەرستیی و پەشیمانیی.

ئەوجا شەڕ لە نێوان عەلی خەلیفەی ڕاستیی و بە حەق و مەعاوییە بە سەختیی ڕوویدا، لایەنی مەعاوییە بە هاوکاری عەمری کوڕی عاص و ئەهلی شام، کە زانیان بە جەنگ و شەڕ و حەقبەدەستیی توانای عەلییان نییە، داوای ناوبژیی بە قورئانیان کرد و سوپای عەلی بوو بە دوو بەشی سەرەکییەوە: یەکەم: (خەواریج)، کە ئەمانە ئەوانە بوون بڕوایان بە حەکەم نەبوو. دووەمیش: (شیعە) کە ئەمانیش هاوڕای عەلی بوون...

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچییدا پێشەوا عەلی لە میحرابی کوفەدا بە دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی مەلجەمی موڕادیی، کە عەرەبێکی توندڕەوی خەواریج بوو شەهید کرا، کە ئێستا مەزارەکەی لە شاری نەجەفی پیرۆزە.

ئەم کتێبەی ڕێبازی ڕەوانبێژیی لە مانگی زیلحەجەی ساڵی (٣٥)ی کۆچییدا هەتا ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچیی لە لایەن بەرزەمەردی ئیسلام لە گەورە خەلیفەی موسڵمانان وەك وتاری هەینی و گۆڕەپانی جەنگنامە و نووسراو بۆ

لایەنەكان دانراوە.

ئـەم پاشـبەندە زۆر پێویـستە بـۆ تێگەیـشتن لـەم تۆمـارە مـەزن و بـە نرخـە، بەنــدەش وەك دوا وشــەم ئــەڵێم: ئــەو ڕوداوە چــووەتە بــازاڕی خــودا و كــەس و لایەنەكان وەلآمی خۆیان داوەتەوە، نابێ ئەمڕۆ ئەو ڕوداوە ببێتە مایـەی نـاكۆكیی و دووبـەرەكیی وەك پێـشەوا خـۆی ئەفـەرموا: (ئـەوەی چـوو چـوو، ئـەوەی نـەهاتووە نـەهاتووە، ڕۆژی ئـەمڕۆ بـۆ ئێمەیـە !)، سـەلامی خـوات لەسـەر بێـت پێـشەوا ..، لـە دایكبوونت و لە ڕۆژی شەهیدبوونت و لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەت.

مەلا عەبدوللەتیف بامۆكی

٢٠٠٩/٢/٢

# پاشبەندی دووەمی زۆر گرنگ

لەکاتی تەرجەمەی (ڕێبازی ڕەوانبێژیی)دا هەندێ لە ڕستەکان زیاتر پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، بۆ ئەوەی ڕوداوی مێژوویی و ڕامیاریی زیاتر لەبەر زەینی خوێنەردا دیار بێت، لەم پاشبەندەدا بە پێی پێویست نوسینەکانی محەممەد عەبدە بە کوردی دەنووسین.

ئەو بەڕێزە بۆ شیکردنەوەی مەبەستی پێشەوا، سوودی وەرگرتووە لە چەند سەرچاوەیەك، منیش لە هەندێ سەرچاوە و شەرحەکانی ئەم کتێبە و فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیی سوودم وەرگرتووە، ئەو هەموو بۆچوونە چڕو پڕو کورت و پڕمانایەم لە زمانی کوردیدا جێگە کردووەتەوە.

سەید شەریف (٣٥٩- ٤٠٤ك) کە دەستی داوەتە ئەم ئەرکە، ئەو ئەرکە گەورەی خستووەتە سەرشان، کە گێڕانەوەکەی پەسەندی هەموو لایەك بێت، ئەویش ناوی ناوە (نهج البلاغة)، پاش خۆی زانایان و نوسەران و خەتخۆشەکان زۆریان لامەبەست بووە بۆ بلاّوبوونەوەی، جگە لە مەبەستی سیاسیی، مەبەستی وێژەیی و مێژوویی و سیاسی تێدا هەبووە، زۆر کەس لەبەریکردووە و بۆ پیرۆزیی، لەناو کتێبخانەکەی داناوە، زیاتر لە پەنجا شەرح و پەراوێزی لەسەر نوسراوە، لەوانە ئەبولحەسەنی بەیهەقی کە (٤٥٨)ی کۆچیی وەفاتی کردووە، ئیمام فەخری ڕازیی کە (٦٠٦)ی کۆچیی وەفاتی کردووە، قوتبی ڕاوەندیی، کەمالەددین بەحرانیی، ئیبنو ئەبیلحەدیدی مەدائینیی کە (٥٨٦- ٦٥٥)ی کۆچیی ژیاوە کە لە هەموو درێژترو بە تواناتر بووە چونکە فەقیهەئوسولّییە، عەقائیدییە، کە لە مانگی ڕەجەبی سالّی (٦٤٥)ی کۆچیی دەستپێکردووە و لە سالّی (٦٤٩)ی کۆچیی تەواوی کردووە، واتە شەش سالّ پێش وێرانکردنی بەغداد بە دەستی هۆلاکۆ خان لە سالّی (٦٥٦)ی کۆچیی، بەلاّم ئەوەی سەرەنجی تویژەری سەردەم ڕادەکێشێت، ئەو زانا پێشینە

بەرێزانەیە، کە زۆر گرنگییان بە بەراوردکاریی نێوان نوسخەکان نەداوە، تەنها گرنگییان داوە بە شیکردنەوەی وشەو ڕستە و دەستەواژە، لە ڕووی (نەحو، سەرف، بەلاغە) وە، زیاتر ماندوو بوون لەم ڕەوەوە و لایەنی مێژوویی و شەرع و ئایەت و فەرموودەیان پشتگوێ خستووە، بەلاّم ئێمە لەم کارەماندا زۆر شتمان لەسەر شان سووك بووە، زۆر کاری قورس لە توێژەری عەرەبەوە گرانبووە، وەك پێڕستی وشە عەرەبییە قورسەکان، کە (٥٠٠٠) وشەیە، پێویستی بە تەماشاکردنی فەرهەنگی عەرەبی هەیە، یان دانانی پێڕست بۆ سەرباسەکان و ناو و شوێن و ڕووەك و خێڵ و زاراوەی شەرعیی، کە ئەوکاتە پێشەوا لە ڕووی ئامۆژگاریی و ڕەخنە و وەلاّمدانەوەوە و سەرزەنشت و کاروباری فەرمانداریی و سەربازیی و دادوەریی، ئەم گفت و نامە و نوسراوانەی ناردووە و نوسیوە بۆ گشت سەرکردەکانی.

ڕێبازی ڕەوانبێژیی دەریایەکی بێ بن و بێ کەنارە، سەخت و پڕ لە شەپۆڵ و زریانە، کاتەکەی سەختترین کاتی خوێناویی مێژووی ئیسلام بووە، ئەوەندەی پێشەوا بە حیکمەت و قورئان و فەرمووده وابەست بووە و ڕەوشتی لەسەرچاوەی پێغەمبەرەوە وەرگرتبوو، دە ئەوەندە دوژمنەکانی دووربوون لە ڕەوشت و سروشت و نەریتی فەرمانڕەوایی بە پێی دەستووری ئیسلام، بەڵکو تەنها لە ڕێگەی پیلان و کڕین و فرۆشتنی ویژدانی خەڵك کاریان دەبرد بەڕێوە.

# تیشکێك لەسەر ژیاننامەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب

ئەگەر بڵێم قەڵەم، زمان، خەیاڵ، وشە... ناتوانن ژیننامەی عەلی بنوسن، لە منداڵیی و ساوایی، لە لاوێتیی و گەنجیی و مێردمنداڵیی، لە پیاوەتیی و سەری ناوسەران، لە قورئان و دەستووری ئیسلام، لە شارەزایی لە زمان و مێژوو و سەرناسیی، لە خوداپەرستیی و بێفیزیی و خاکیی و زبرژیان، لە ئازایەتیی و نەترسیی و بوێریی و دڵ و دەرونبەرزیی، تەنها وەك ئاماژە نەك ژماردن، بە دانەی گەوهەر و مرواریی، کە هەریەکەیان جیهانێکی سەربەرخۆیە و پێویستی بە دەیان داستان و باستان هەیە، ئەوا زیادەڕۆییم نەکردووە.

ئەم بەندەی خودایە(عەلی)، زۆر لە خودا نزیکە و خاکییە، زۆر نزیکە لە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) و نەوەی پێغەمبەر لەمەوە خاوەن میراتن، لە کەعبە لە دایك بووە و لە میحرابدا شەهید بووە، لە سەردەمی زێڕینی ئیسلامدا سەرباز و موجاهید بووە، ڕێگەی ڕاستی بۆ خەڵك و دوژمنەکانی ڕوونکردووەتەوە، یارویاوەری کەم بووە، ئەوەندەی شوێن نەیارانی کەوتبوون، شوێن ئەم بکەوتنایە ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی جیهان لە دەستی ئیسلامدا بوو.

ئەم هەموو ڕووداوە لە ڕێبازی ڕەوانبێژییدا هەیە، لەناو وتار و نامە و گفتە شیرینەکانی پێشەوا ڕووندەبێتەوە، ئەوانەی لە دەوری بوون بۆ داخ و خەفەت و بێفەرمانیی لە دوژمنەکانی کەمتر نەبوون.

# دواقسەم

لەم چەرخە نوێیەدا لەلایەن شێخ محەممەد عەبدە و محەممەد نائیل ئەلەرسەفی، ڕافەی وشە قووڵەکانی کراوە، بە وشەی سووکتری عەرەبی، ئەوەی شێخ محەممەد عەبدە زۆر بە وردیی مانای کردووە، پاش خۆی دەیان جار چاپکراوە و خزمەتی بووژانەوە و ژیانەوەی بیرو زمانی عەرەبی زۆر کردووە، لەم دواییەدا توێژەری گەورە محەممەد ئەبولفەزل ئیبراهیم، چاپی زانستیی و توێژینەوەی بۆ کردووە، لەسەر نوسخەی مەتحەفی بەریتانی و ڤاتیکان و کتێبخانەی زاهیرییە لە بیست بەرگدا چاپی کردووە.

ئەم ڕێبازەی پێشەوا، کە هەموو جیهانی سەردەم و پێشینی گرتووەتەوە و دەقەکەی لە دووتوێی کتێب و لەسەر زمانی وێژەواندا بووە، زۆربەی ڕۆشنبیرەکانی کۆن ئەزبەریان کردووە، لەبەر ئەوە زۆر کەم جیاوازیی تێدا هەبووە، بە گێڕانەوەی ئەوە دوای ئەوە پاراستویانە لە دەستکاری نوسەران و کتێبفرۆشان و خۆشنووسان وەك پێشەوا خۆی دەڵێ: (دوو کەس بە هۆی منەوە هەڵخلیسکاون و وێڵ بوون، ئەوەی زۆری خۆشدەوێم و ئەوەی زۆر ڕقی لێمە).

زۆر لە دۆستەکانی و دوژمنەکانی هەندێ ڕستە و وشەیان بە مەبەستی خۆیان ڕافە کردووە، یان گۆڕیویانە، لەبەرئەوە پێدەچێ هەندێ دەستەواژەی بۆ زیاد کرابێ، وەك (..... بەر نەفرەتی خودا بکەوێ، خودا لە ڕێگەی ڕاست لایبەرێ،... سەلام و درود لەسەر ئال و بەیت،... خودا بەزەیی پێدا بێتەوە)، جگە لەوەش کاتی خۆی توێژینەوەی بۆ کراو وردەکاریی و گەڕانەوەی بۆ سەرچاوەی قورئان و فەرموودە و مێژووی پیاوانی فەرموودە و سیرەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکانیش لە شیکردنەوەدا هەموو جۆرە هەواڵ و گێڕانەوەیەکیان بۆ کردووە، بێ ئەوەی خۆیان ماندوو بکەن بۆ وردەکاریی ڕاست و ناڕاست و ڕەسەن و ناڕەسەن، یان هەندێ جار لەسەر یەك نوسخە کاریان کردووە و نەگەڕاون نوسخەیەکی دی

پەیدا بکەن و سروشتی زمانی عەرەبی و فراوانی وشە و هاووشە و دژەوشە و لادان لە مانای پێشین بۆ مانای تازە و زاراوەکانی نەوباوی ئیسلام ئاوێتە بووە بە مانا پێشینەکەی دیکە ئەعرابییەکی دەشتەکیی بەکاری هێناوە، ڕاڤەکەرانی ڕێباز لەسەر وشەیەك دەیان لاپەڕەیان نوسیوە و نەیانتوانیوە لەم دەقە بەرزە یاسای فەرمانڕەوایی ئیسلام و ڕامیاریی دەوڵەتداریی و ڕەگی جیاوازیی نێوان سوننە، شیعە، خەواریج... جیابکەنەوە و ڕێبازەکانی فیقهیی و عەقائیدیی و فەلسەفیی زۆر گرنگیی پێدراوە و زۆربەی شیکردنەوەکانی ڕێباز وەك کەشکۆڵی لیهاتووە و تۆماری دەقی شاعیران و چیرۆك و پەندی پێشینان و ئەفسانە و ژیانی گیاندار و دارا و خەلیفە و میری ساتەوەختی خۆی بووە، کاکڵە وکرۆکی دەقەکە و مەبەستی پێشەوا ون و نادیارە، بۆ نموونە ئەو دەقەی کە دکتۆر سوبحی چاپی کردووە، پێڕستەکانی ئەوەندەی دەقەکە و زیاتریشە، چونکە دەقەکە بە گەورەیی و بە سەروبۆروژێر نوسیوە و زۆر شاشە، بەلام پێڕستەکان نووسراوە و چڕوپڕ و سادەیە، بەلام دەقەکە بە پاکیی و پوختیی و بێهەڵەی زمانەوانیی لەبەرچاو و دڵ و زماندا داناوە و بۆ گۆڕینی بۆ هەر زمانێ وەرگێڕ تووشی کۆسپ و چاڵیی و بەرزیی و نزمیی نابێ و تەنها پێویستی بە گۆڕینی وشەی ناو دەقەکەیە، یان چەند وشە یان دەستەواژەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی پێشەوا.

بۆ دەربڕینی دەست و نیازپاکیی ئێمەش تەنها وشەی عەرەبی ناو دەقەکەمان گۆڕیوە بۆ کوردی، ئەگەر وشەیەك دەستکەوتبێ ئەوە باشە، خۆ ئەگەر نەبێ بە دەستەواژە تەرجمە کراوە و خۆشبەختانە زمانی کوردی لەو بارەوە باڵی کێشاوە بەسەر زمانی عەرەبیی و فارسیی و تورکییدا و بۆ گۆڕین نوسەر زۆر ماندوو ناکات.

بۆ ئەو دەقەی کە محەممەد عەبدە لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە عەرەبی وەك هەژار موکریانی دەڵێ: نانی کوردی بە ساوەری کوردییەوە دەرخواردی نەوەی گەلی عەرەب کردووە، گەڵێ خزمەتی کردووە بە فێرکردن و ڕامکردن و پەروەردەکردن و دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری عەرەب لە زمانی عەرەبی و خزمەتی دەقی ڕێبازی بە جوانی کردووە، لەگەڵ باسکردنی هەندێ ڕووداوی مێژوویی بەپێی گێڕانەوەی هەواڵگیری نوسەرەکان و زۆر بێلایەن و دادوەرانە دەقەکەی نوسیوەتەوە.

ژیانی شێخ محەممەد عەبدە زۆر لەوە گەورەترە کە لێرەدا جێگەی بێتەوە، لە

(۱۸٤۹ - ۱۹۰۵) ژیاوە، سیاسەتوانێکی ئیسلامیی نوێخوازی میسرییە کە زۆر بە توانا و زانا بووە و لەگەڵ جەمالەددینی ئەفغانییدا دەستی داوەتە نوێکردنەوەی بیرو هۆشیاریی ئیسلامیی کە ئەوکات خەلافەی عوسمانیی لە گیانەڵلآدا بووە و لە پاریس رۆژنامەی (ئەلعوروەتولوسقا)ی دەکردووە و موفتیی میسر بووە و ماوەیەك لە بەیروت بووە، لەو کاتەی لە بەیروت مامۆستا بووە، رێبازی پێشەوای کردووە بە هاورێی و هاودڵی خۆی و ئەو کاتەش رۆشنبیرانی عەرەب حەزیان لەوە بووە کە زمانی عەرەبیی لە رەقی و گرانیی و وشکیی و کۆت و زنجیری زانستەکانی نەحو و سەرف و وشەئارایی دەرباز بکەن، ئەم کتێبە چاکترین و باشترین سوودی گەیاندووە بە نەوەی هاوچەرخ و نەوەی پاش خۆی و دەیان و سەدان کەڵەپیاوی هۆشیاری ئیسلامیی سوودیان وەرگرتووە، لە تەفسیر و رۆژنامە و وانە و وتارەکان و فەتوا و بۆچوونەکانی، هەتا ئێستەش کاریگەری هەر ماوە، جیهانی ئیسلامیی و نیشتمانی عەرەب و زانایانی کوردیش زۆر سەرسام بوون بە بۆچوونەکانی، بە تایبەت زانای گەورە مەلا محەممەدی کۆیە و شێخ محەممەدی خاڵ و قازی رەشاد موفتی هەولێر و ئەمجەد زەهاویی و مەلا محەممەدی قزڵجیی و عەلائەددینی سەجادیی و کۆی ئەوانە زۆر سوودیان لە بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانیی و محەممەدعەبدە و رەشید رەزا و زانایانی میسر وەرگرتووە.

لەراستیدا گرنگی رێبازی رەوانبێژیی بۆ باوەردانی ئیسلامە، زۆر گرنگیی دەبوو ئەگەر وەك کۆمەڵە بنەمایەك پەیرەو بکرایە و ئەوەی پێشەوا پەسەندی کردبوو بە پەسەند و پەیرەوی ئەوەی بە دژو لادان و دەرچوون لە سەرەتاکانی ئیسلام دانراوە نەکرایە بە رێباز و هۆی جیابوونەوە و شوێنکەوتنی نەتەوە و نەژادپەرستەکان.

خاڵێکی تر کە من لە تەرجەمەی رێبازدا پەیرەوم کردووە لە هەندێ شوێن سەید شەریف ئەلرەزی هەندێ وشەی قورسی دەقەکە بە وشەیەکی تر یان بە چەند دەستەواژەیەك روون ئەکاتەوە، ئەو کارە بۆ خوێنەری کورد پێویست نییە، چونکە ئەم کتێبە وا تەرجەمە کراوە کە پێشەوا بۆ کورد وتار ئەخوێنێتەوە و بە کوردی نامە ئەنوسێ و بە کوردی ئامۆژگاریی خەڵك و کارگێر یان نەیار و یان بە کوردی نزا ئەکات و ئەپارێتەوە لە خودا.

هەرچەندە پێشەوا لەوە مەزنتر و بە شکۆترە بە نازناوی قەبە و گەورە یان بە

ناوهێنانی درورد ڕەوانەی گیانی زیندوی بکەیت و یان نەفرەت بکەی لە نەیارەکانی، لەبەر ئەوە زۆر سادە و ڕووت لەم هەموو نازناوە ناوم هێناوە و خۆی هەر بە هەمان ناو باسی خۆی ئەکات و خودا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یش لە قورئان و فەرموودەدا، وشەی ( بەڕێز، ڕێزدار، گەورە، قارەمان...هتد)، بەکار نەهێناوە و ڕستەکانی( خودا لێی خۆشبێ، خودا بەزەیی بە سەریاندا بهێنێ، خاوێن و جوان بێت ڕووی، خودا لێی ڕازی بێت و ڕازیشی بکات)، من لە تەرجەمەکەدا ئەمانەم لابردووە بۆ دوو مەبەست: یەکەم خوێنەر بۆ ئەوەی زەینی لەلای فەرمایشی عەلی بێت و بە وشە و ڕستەی لەو شێوە خوێنەر ماندوو و شەکەت نەکەم و ئەو وزە و توانایە لە بیرکردنەوەی قوڵ بێت، بۆ واتا و مەبەستەکان، هەروەها توێژەران گرنگی زۆریان بە شیتاڵی ڕێزمانی عەرەبی و شوێنی ڕستەکان و لێکدانەوەی زاراوەکانی ڕەوانبێژیی و ناسکبێژیی و جوانبێژیی کردووە کە لە ڕێزمانی کوردییدا نییە، وەك (فاعل، حال، تمییز، اعلال، تشبه، مجاز، کنایە، استعارە، ایجاز).

دووەمیش ئەوەی ماوە جوگرافی ناوچەکە و ناوی شوێنەکان، ڕووبارەکان، هەرێمەکان، نەتەوەکان، مێژووی ئەو کەسانەی ناویان هاتووە، ناوی هۆز و خێڵ و کۆمار، شوێنی لەوەڕگە و هاتووچۆیان بۆ نیوەدوورگەی عەرەبی، ناوی گژوگیا و درەختەکانی تایبەت بە وڵاتی عەرەبنشین، لە یەمەن و حیجاز و کەنداوی فارسی، نەخشەی لەشکرەکەی پێشەوا و نەیارەکانی و جۆری چەکەکانیان، کە تەنها چەکی ساردی سەردەم بووە، ئەوکاتە باروت نەبووە، بۆ ئەمانە هەموو لە توانا و کێشی مندا نییە و ناتوانم، خۆ ئەگەر بتوانم پاش یەکگرتنەوەی بەشەکانی و ڕیزبەندی باسەکان ئەوەی پێویست بێت وە لە وزەی مندا بێت هەوڵ ئەدەم هەندێ گوڵچنیی و خاکەڕۆ و مڵۆی بکەم و لە شاراکەی بخەمە سەر ئەم خەرمانە پڕ لە خێر و بەرەکەتەی سەروەر و پێشەوام عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ڕێبازی ڕەوانبێژیی و کۆتایی ئەم پاشبەندە بەم سوورەتە دێنم، کە هەژاری ڕەحمەتیی لە قورئانە وەرگێڕدراوەکوردییەکەیدا باسی دەکات، کە وەك شارەزایانی قورئان دەڵێن لە باسی پێشەوا عەلییدا هاتووەتە خوارەوە.

# وە ناوی خوا کە -دەهەندە و دلۆڤانە

۱. سوێندێ دەخۆم بەم باژێرە، ۲. تۆش نیشتەجێی ئەم باژێرەی، ۳. بە باب و نەتەوەکەشی، ٤. ئێمە جسناتی مرۆمان دەگەڵ خەمان وەدی هێنا، ٥. ئاخۆ ئێستا وا بیردەبا هەرگیز کەس دەرۆستی نایە؟٦. ئێژێ: سامانێکی زۆرم لە دەستداوە، ۷. ئاخۆ و لۆ خەیاڵ دەکا کە هیچ کەس ئەوی نەدیوە؟۸. ئەدی ئێمە دوو دیدەمان پێنەداوە؟۹. زمانێکیش و جوتێ لێو؟ ۱۰. ڕێگەی هاتونەهاتیشمان نیشان نەدا؟ ۱۱. وەلێکان ئەو خۆی لە ڕێگەی هەڵەت نەدا؟ ۱۲. کو دەزانی مەبەست لە ڕێی هەڵەت چییە؟ ۱۳. ئازادکردنی کۆیلەیە. ۱٤. یان ناندانە لە ڕۆژی قاتیی و قڕییدا. ۱٥. بە هەتیوێکی بێکەسی نزیکی خۆی. ۱٦. یان هەژارێکی خاکەسەر.۱۷. دیسان ئەبێ لەوانەش بێ، کە بوونە خاوەن باوەڕ و بۆ خۆگریی و دلۆڤانیی یەکتریان ڕاسپاردووە.۱۸. ئەوانە بەختەوەرانن.۱۹. کەسانێکیش، کە بە نیشانانی ئێمە بێ بڕوا بوون، ئەوانە بەدبەختەکانن. ۲۰. چارەنووسیان ئاگری بێدەرەتانە. سورەتی بەلەد (ل ٥٩٤) قورئانی پیرۆز.

مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی
٦-۲-۲۰۰۹

# ناوەڕۆك

## عەبدوللەتیف مەولود عەبدولکەریم

### (مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی)

لەدایك بووە لە دێی بامۆکی نزیك بە شاری هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٣٩

خوێندنی زانستە شەرعییەکانی تەواو کردووە و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٥٩

پاش ساڵێك لە خولی مامۆستایی، بڕوانامە بەدەست دێنێ و دەبێتە مامۆستای زمانی عەرەبی و کوردی و پەروەردەی ئیسلامی

بەشداری یەکەمی شۆڕشی ئەیلووله ساڵی ١٩٦١

ئەندامی دامەزرێنەری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووە ساڵی ١٩٦٢

بەڕێوەبەری ئەوقافی سلێمانی بووە ساڵی ١٩٩٣

سەرنووسەری گۆڤاری (خۆری ئیسلام) و بەڕێوەبەری نوسین و دەستەی نوسەرانی گۆڤاری (دەنگی زانا) بووە لە ساڵی ١٩٩٢ بۆ ٢٠٠٤

سەرپەرشتیاری پسپۆڕیی قوتابخانە ئامادەییەکانی ئیسلامیی هەرێمی کوردستان بووە ساڵی ١٩٩٤

ئەندامی پارلەمان بووە لە خولی یەکەمدا

### لەبەرهەمەکانی نووسەر و وەرگێڕ:

١-وەرگێڕانی کتێبی (سراج القلوب)ی شێخ عوسمان سراج الدین، لە فارسیەوە بۆ عەرەبی. ١٩٨٩.

٢-بانگەوازێك لە میحرابی عەبابەیلێ وە ڕاڤەی دەقێکی شیعریی شێخ بابا رەسوڵی بێدەن. ٢٠٠٨.

٣-سروودی بیابان و شاخ (شەنفەرا توغرایی)، وەرگێڕان و ڕاڤەکردن. ٢٠٠٩.

٣-لامیەی کورد، وەرگێڕان و ڕاڤەکردن. ٢٠١٠.

٤- هانەسوورە و بنەماڵەی هانەسوورە لە مێژوودا، ٢٠١٠

٥- قەسیدەی بوردە (بانت سعاد بە کوردی)، وەرگێڕان و ڕاڤەکردن. ٢٠١٠

٦-معلقات عشرە، وەرگێڕان و ڕاڤەکردن. ئامادەیە بۆ چاپ.

نوسینگەی تەفسیر




بەرگ: ئەمین مخلص